# جەژن و یادەکان

## لەدیدی ئیسلامدا

ئاینییەکان: سەری ساڵی کۆچی ، عاشورا ، مەولود ، نیوەی شەعبان
ئیسراو معراج ، لیلة القدر ، جەژنی ڕەمەزان ، عەرەفە ، جەژنی قوربان

نیشتیمانییەکان: نەورۆز ، ڕاپەڕین

جیهانییەکان: کریسمس ، ڤالانتاین ، 8ی مارس ، جەژنی دایك ، درۆی نیسان ، ڕۆژی جیهلنی نازداران
جەژنی کرێکاران ، ڕۆژی بەرەنگاربوونەوەی جگەرە ، ڕۆژی جیهانی منداڵان ، ڕۆژی جیهانی ژینگە
ڕۆژی جیهانی پەنابەران ، ڕۆژی جیهانی بەرانگەربوونەوەی ماددە هۆشبەرەکان
ڕۆژی جیهانی مامۆستایان ، ڕۆژی جیهانی بەرەنگاربوونەوەی ئایدز
ڕۆژی جیهانی بەرەنگاربوونەوەی گەندەڵی ، جەژنی لەدایکبوونی منداڵ

نووسینی:
علی محمد هێرۆیی



# جەژن و یادەکان

# لە دیدی ئیسلامدا

## ئاینیەکان   نەتەوەییەکان

## جیهانیەکا

# پێشکەش کردن

ئەم پەڕتوکە پێشکەشە بە:

١ـ گەورەو سەروەرو نوری چاومان محمدی المصطفیﷺ و ئال و بەیت و یار و یاوەرانی و خێزانە بەڕێزەکانی بەگشتی.

٢ـ ئەو مامۆستا بەڕیزانەی کە بۆ ساتێکیش بێت لە خزمەتیاندا خوێندومە و لێیانەوە فێری زانست و زانیاری و ئەدەب و ڕێز بووم.

٣ـ هەر موسڵمانێکی دڵسۆز کە بەڕاستی خەمخۆری ئەم ئاینە پیرۆزەیە و کار دەکات لە سەر یەکڕیزی موسڵمانان و گێڕانەوەی شەریعەتی ئیسلام بۆ مەیدانی کار.

٤ـ ئەو گەنجە خۆشەویستانەی کە هەرگیز ئامادە نین بۆ بەدەستهێنای چەند کاتێکی خۆش و یادکردنەوەی جەژنێکی بێباوەڕان خودای پەروەردگاریان لە دەست بدەن" بەڵکو تەنها خۆشی و جەژنێکیان دەوێت کە لە سنوری شەرعدا بێت و بەس.



# پێشەکی

الحمدُ لله الّذي جَمَّلَ الأعيادَ بِالسُّرُورِ، وَضاعَفَ لِلمُتَّقِينَ جَزِيلَ الأُجُورِ، أَحْمَدُهُ عَلى جَمِيعِ نِعَمائِهِ وَأَستَغفِرُهُ، وَأَشهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلا اللهُ مُعِزُّ أَولِيائِهِ، وَأَشهَدُ أَنَّ سَيِّدَنا مُحَمَّداً رَسُولُ اللهِ سَيِّدُنا وَسَيِّدُ رُسُلِهِ وَأَنبِيائِهِ صَلّى اللهُ عَلَيهِ وَعَلى آلِهِ وَصَحبِهِ وَأَتباعِهِ، وَسَلَّم تَسلِيماً كَثِيراً.

أما بعد:

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺ لە چەندین فەرموودەدا هەواڵی پێداوین کە ڕۆژگارێك دێت ئوممەتەکەی چاو لە بێباوەڕان بە گشتی و گاورو جولەکەکان بە تایبەتی دەکەن و هەنگاو بە هەنگاو شوێنیان دەکەون و هەنگاوەکانیان هەڵدەگرن، ابوسعیدی خودریرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(لَتَتَّبِعُنَّ سَنَنَ مَنْ كانَ قَبْلَكُم شِبراً شِبراً وَذِراعاً بِذراعٍ حَتَّى لَو دَخلُوا جُحرَ ضَبٍّ تَبِعتُمُوهُم، قُلنا يا رَسُولَ اللهِ الْيَهُودَ وَالنَّصارى؟ قال: فَمَنْ)[1]واتا: بەڕاستی ئێوە شوێن داب و نەریت و هەڵسوکەوتەکانی ئوممەتانی پێش خۆتان دەکەون، هەنگاو بە هەنگاو بست بە بست، هەتا ئەگەر ئەوان بچنە کونی بزنەمژەوە ئێوەش بەدوایان دەکەون، گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ مەبەستت شوێنکەوتنی جولەکەو مەسیحیەکانە؟ فەرمووی: ئەی جگە لەوان کێی تر هەیە؟

جا بەڕاستی ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ لەم ڕۆژگارەدا وەکو خۆی هاتۆتە جێ، لەم ڕۆژگارەدا موسڵمانان شوێنکەوتنی داب و نەریتی ئەمریکاو ئەوروپا بە پێشکەوتن و ڕۆشنبیری و ڕۆشنفکری دەزانن، وە ئێمەی موسڵمان لە چەندین داب و نەریتدا شوێن ئەوروپاو ئەمریکا کەوتووین کە زۆر خراپترە لـە شوێنکەوتنیان بۆ نـاو کونی بزنە مژە، وە لە زۆر بواردا ئێمـەی موسڵمان باشتر و چاکترمان هەیە، بەڵکو ڕەنگە ئەوەی ئێستای ئەوروپـا پاشماوەی ئێمە بێت"

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

بەڵام ئێمەی موسڵمان هەر سەرسوڕماوین بەوەی لە ئەورووپـــاو ئەمریکاو وولاّتانی کوفر هەیە و پشتمان کردۆتەوەی ئەوەی لای خۆمان، وادەزانین کە ئەمە پێشکەوتنە!! دەستکەوتەو سەرکەوتنە!! نازانین کە هەموو شوێنکەوتنێك دواکەوتنە، نامەردیەو مردنە!! دڵخۆشکردنی دوژمنە!! هەر ئەوەش حاڵی ئێمەی موسڵمانی بە باری ئێستا گەیاندووە، داماوین، بێناوین، بەردەوام هەڵخلیسکاو و نەگریساوین. داپلۆساوین،

دکتۆر علی شەریعەتی دەربارەی ئەو چاولێکەریەی موسڵمانان لە ئەورووپاو ئەمریکاو وولاّتانی تری کوفر دەدوێت و دەڵێت:

ڕۆژێ کە ئیسلام باوی بوو.. لە ناو گەلاندا ناوی بوو .. زێڕی هەبوو، زۆری هەبوو.. چی بگوتایە" هەر ئەوە بوو.. مامۆستاکانی ڕۆژئاوا- لە فێرگە، لە زانستگایان، لەناو کۆڕی کەیخودایان.. کاریان لاسای موسڵمان بوو.. دابی ئەوەنیان پێجوان بوو.. کەوای شۆڕیان دەبەر دەکرد.. عەمامەیان لەسەر دەکرد.. ئەدای ڕازی و ئەبو عەلی و دینەوەریان و غەزالی و کێ کێی دیکەیان دەردێنا، چۆن ئێستا مامۆستاکانمان ـ کە نەدارین ـ لاسای ئەوان دەکەنەوە" قەرزی کۆنە دەدەنەوە!! لە جێژنەدا کلاّوی لەنگەری لەسەر.. جبەی قۆڵ فش و فۆڵ دەبەر.. ئەدای ڕۆژاوا دەردێنن" ئۆروپاییانە دەنوێنن... .

دەس ڕەنگینانی خاچ پەرست کە دەسکردێکیان ڕێکدەخست" فێڵیان دەکرد، مۆری (الله)یان لێدەدا.. ڕەنگی ئیسلامیان پێدەدا، تا وابزانن ئەو کارانە هی وولاّتی موسڵمانە" کاری شام و بوخارایە.. کرگاری بەڵخ و بەغدایە.. " ئەستەنبوڵە، توسە، ڕەیە" کاری وەستای غەرناتەیە. تەنانەت خاچی گەردنبەند" (الله)یەکیان لێهەڵدەکەند. ئەوا ئێستاش لە ڕۆژهەلاّتی بار کەوتوو، لەناو گوێچکەی گادا خەوتوو،(made in) لە دەسکاریان دەدەن، لاسای ڕۆژاواییان دەکەن.[1]

١ـ چوار نامیلکەی دکتۆر علی شەریعەتی، یەك لە پەنای خاڵ و سفری بێ برانەوە: ٥ـ٦

بەڵێ بەڕاستی کاتێك موسڵمانان شوێنکەوتنی ئیسلام و داب ونەریتە ئیسلامیەکانیـــان بە سەربەرزی و شانازی دەزانی" وە کەس لە داب و نەریتی بێباوەڕانی نەدەبانی، ئەوکات ئەوروپاو ئەمریکا پێویستی دەستی ئێمە بوون، ئەوان نەبو و زەبون بون، وە شوێنکەوتن و هەڵگرتنی داب و نەریتی ئێمەیان بە پێشکەوتن و دەستکەوت دەزانی.

أبوالحسنی نەدەوی لە پەڕتوکە بەناوبانگەکەیدا (ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين) چەندین نمونەی باس کردووە کە لەسەردەمی درەوشانەوەی ئیسلامدا جولەکەو مەسیحیەکان و بێباوەڕانی تر لاسایی موسڵمانانیان کردوتەوە لەوانە:

* مامۆستا احمد أمين دەڵێت: لە ناو نەسرانیەکان زۆر کێشە کە ئاسەواری ئیسلامیان بەسەرەوە دیاربو سەریان هەڵدا ، یەکێك لەوانە بزاڤێك بو لە سەدەی دووەم و سێیەمی کۆچیدا لە (سێپتیمانیا) ـ کە موقاطـــعەیەکی کۆنی فەرەنسایە ـ سەری هەڵداو بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە نابێت مرۆڤ لە بەردەم قەشەدا ئیعتراف بە تاوانەکانی بکات و قەشە ئەو مافەی نیە و مرۆڤ بۆ پاکبونەوە لە تاوانەکانی دەبێت تەنها لە خودا بپاڕێتەوە، ئەمەش وەك چاولێکەری لە ئیسلام، چونکە ئیسلام قەشەو مالم و ڕەبەنی تێدا نیە" بۆیە ئیعترافیشی بە تاوان تێدا نیە.

* وە لە سەدەی سێیەم و چوارەمی کۆچی ڕەوتێکی نەسرانی پەیدابوو کە بە پیرۆز زانینی وێنە و پەیکەری ڕەتدەکردەوە، هەتا ئیمپراتۆریەتی ڕۆمانی(لیۆ)ی سێیەم لە ساڵی (٧٢٦ز) بڕیاری قەدەغەکردنی بە پیرۆز زانینی وێنە و پەیکەری دەرکرد. جا هەندێك لە مێژوو نوسان پێیان وایە بانگەوازکارانی نەهێشتن و تێکشکاندنی وێنە و پەیکەرەکان بە ئیسلام کاریگەر بوون، چونکە دەڵێن: (کلۆدیۆس) کەلە ساڵی (٨٢٨ز)دا کراوەتە ئۆسقۆفی (تورین) و وێنە و خاچەکانی دەسوتاند و نەیدەهێشت بپەرسترێن" لە ئەندەلوسی ئیسلامدا لە دایکبووە و گـــەورە

١ـ ماذا خسر العالم بانحطاط المسلمين ،أبو الحسنی نەدەوی ، ئامادەی گەلالی کردویەتە کوردی : ١٨٨

بووە، وە هەڵوێستی ئیسلامیش زۆر ڕون و ئاشکرایە دەربارەی وێنە و پەیکەر و بێ پێچ و پەنا قەدەغەی کردووە.[1]

* مەسیحیەکان لە دوای دەستکاری کردنی ئاینەکەیانەوە بڕاوایان بە سێ خوای ـ أقانم الثلاثة ـ هەبووە، بەڵام دوای درەوشانەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، تایفەیەکی نەسرانیەکان بەشێوەیەك ڕاڤەی ئەم سێپەرستیەیان دەکرد کە نزیك بێت لە یەکتا پەرستی ئیسلامەوە، وە نکوڵیشیان دەکرد لە خوایەتی مەسیح علیه السلام.[2]

جا ئەم سێ نمونەم بۆ ئەوە باسکرد تۆی خوێنەری خۆشەویست بزانیت کە لەو سەردەمەی کە موسڵمانان دەستیان بە ئاینەکەیانەوە گرتبو بێباوەڕان لە هەستیارترین بابەتیشدا کە بابەتی بیرو باوەڕ و عەقیدەیە لاسای موسڵمانانیان دەکردەوە، وە لە مەیدانەکانی تری ژیاندا ئەوەندە لاسایی موسڵمانانیان دەکردەوە کە لە ئەژمار نایەت، بە شێوەیەك:

ڕۆبەرت بریفۆلت لە پەرتوکەکەیدا بەناوی: (The Making of Humanity)دا دەڵێت: هیچ لایەنێك لە لایەنەکانی پێشکەوتنی ئەوروپا نیە کە چاکەی شوێنەواری کاریگەرێتی ژیاری ئیسلامی بەسەرەوە نەبێت) لە شوێنێکی تردا دەڵێت: ( ژیاری ئیسلامی هەر لەو ڕۆژەی کە گزنگی بەسەر ئەوروپادا پەخش کردووە کاریگەری گەورەو جۆراو جۆری خستوتە سەر ژیانی ئەوروپا)[3]

بەڵام بەداخەوە لەم ڕۆدا بەهۆی دورکەوتنەوەمان لە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هاوکێشەکە تەواو پێچەوانە بۆتەوە، جا یەکێك لەو بابەتانی کە لەم ڕۆژگارەدا ئێمەی موسڵمانان تێیدا زۆر بەوردی شوێنی بێباوەڕان کەوتووین بابەتی جەژن و یاد بۆنەکانە، بەشێوەیەك هەر جەژن و یاد و بۆنەیەك

١ـ ماذا خسر العالم بإنحطاط المسلمين ،أبو الحسنى ندەوی ، ئارامی گەلاڵی کردویەتە کوردی : ١٨٨

٢ـ هەمان سەرچاوە : ١٩٠

٣ـ هەمان سەرچاوە : ١٩٢

لە ئەوروپاو ئەمریکا سەرهەڵبدات" ئەوە بۆ ساڵی دواتر دەگاتە ناو موسڵمانان و یادی دەکرێتەوە، وەهەر ڕۆژێکی ساڵ لەلایەن وولاتێك یان ڕێکخراوێکی بێباوەڕانەوە بۆ چینێك یان بابەتێك دیاری بکرێت" ئەوە بێ سێ و دوو و پێچ و پەنا لەناو وولاتی موسڵمانانیش بڕیاری لەسەر دەدرێت، ئەمەش لە کاتێکدایە کە ئاینە پیرۆزو بێ کەم و کوڕیەکەی خۆمان هیچ کەلێنێکی نەهێشتۆتەوە بۆ ئەو شوێنکەوتن و چاولێکەریە" چونکە جەژنت دەوێت؟ ئیسلام هەیەتی، یاد و بۆنەت دەوێت؟ ئیسلام هەیەتی، بەدوای مافی چین و توێژێکدا دەگەڕێیت؟ وەرە لە ئیسلامدا بیدۆزەرەوە، کەواتا: ئێمەی موسڵمان هیچ بەڵگەیەکمان بەدەستەوە نیە لە بەرامبەر خودای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا ئەگەر شوێن بێباوەڕان بکەوین و جەژن و یادو بۆنەکانیان زیندو بکەینەوە، پاشان حیکمەتی جەژنەکان لەوەدایە ئەگەر کەم بن و ساڵانە تەنها چەند جەژنێك بن، ئەگەر هاتوو ئێمە هەموو ڕۆژێك جەژن بەهۆی بۆنەیەکەوە بگێڕین ئەوە هیچ حیکمەتێك بۆ جەژن نامێنێتەوە، زین العابدین الآمدی دەفەرمووێت: (**فالألماس غالٍ لأنهُ قليلٌ، ولو صارَ كلُ حجرٍ في الأرضِ الماساً لصارَ الألماسُ حجراً، و لو صارتِ الأيامُ كلها أعياداً لرجعَ العيدُ يوماً عادياً كسائرِ الأيامِ**)[1] واتا: ئەڵماس گران قیمەتە" چونکە کەمە، ئەگەر هاتباو هەموو بەردێك ئەڵماس بوایە" ئەوکات ئەڵماس دەبو بە بەردو ئەو قیمەتەی نەدەما، بەهەمان شێوە ئەگەر بێت و هەموو ڕۆژێك جەژن بوایە ئەوکات جەژن دەبو بە ڕۆژێکی ئاسایی وەك هەر ڕۆژێکی تری ئاسایی و ئەم گرنگیەی نەدەما. (**وكثرةُ الأعيادِ تذهبُ بَهجتَها، و تهدر قِيمتَها**)[2] واتا: زۆری جەژنەکان قیمەت و تایبەتمەندی جەژن ناهێڵن.

لەبەر ئەوە با ئێمەی موسڵمان بە جەژن و یادو بۆنە ئیسلامیەکان حەزی جەژن و خۆشیمان

---

٢ـ فتاوى الآمدية : ٢/ ١٧٦.

٣ـ هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.

بشکێت و تێربین لە دڵخۆشی و خۆشی گێڕانی جەژن، با ئێمە مەردی خودای بین و پشت بکەینە لاسایی کردنەوە و شوێنکەوتنی نەریتی وولآتانی بێباوەڕان و هەوڵبدەین سوننەت و داب و نەریتی ئیسلامەتی زیندوو بکەینەوە، بە هیوای ئەوەی دەست لەناو دەست و پشتیوانی لە خودا ئیسلام بکەینەوە بە ئیسلامی جاران و بیکەینەوە پێشەنگ و بیهێنینەوە مەیدانی کار.

**وصلی الله علی سیدنا وقائدنا وقدوتنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم.**



# پێناسەی جەژن

هەرسێك ووشەی ـ العید ـ یاد و ـ الذکریات ـ بۆنەکان ـ المناسبات ـ، بەپێی ووشە و واتا جیاوازن، وە لەناو نەریتی کۆمەڵایەتیش وەك سێ ووشەی جیاواز ئەژمار دەکرێن، بۆنمونە: جەژن (العید) بۆ ڕۆژە خۆشی و شادیەکان بەکار دێت، وە یادەکان و بۆنەکانیش (الذکریات، المناسبات) بۆ یادکردنەوەی ئەو ڕوداوە خۆش و ناخۆشانە بەکاردێن کە لە ڕابردودا ڕویاندوەو لە بیرو هۆش و هزری نەتەوەیەك یان پەیڕەوکارانی ئاینێکدا ماونەتەوە و ساڵانە یادیان دەکرێتەوە. بەڵام کە وردبینەوە دەبینین کە:

یەکەم/ هەردوو ووشەی یاد وبۆنە زیاتر بەدەست لەملانی دێن، بۆنمونە: کاتێك لایەنێك پیرۆزبایی یان هاوخەمی دەنێرێت بۆ یادێك یان بۆنەیەك دەڵێت: بەبۆنەی یادی (بمناسبة الذکری) کەواتا: هەردووکیان زیاتر بە یەکەوە دێن، بەڵام دەتوانین بڵێین بۆنەکە خودی ڕوداوەکەیە، بەزیندوو بەزیندویی هێشتنەوەشی لە یادکردنەوەیدایە. وە ئێمەش هەر لەبەر ئەوە لە ناوی ئەم پەرتوکەدا ناوی بۆنەکانمان نەهێناوە، بەڵکو تەنها ناومان ناوە:(جەژن و یادەکان)

دووەم/ لە ناوەڕۆك و بنچینەدا هەرسێکیان دەچنەوە ژێر واتای پێناسەی جەژن ـ العید ـ لەبەر ئەوە لێرەدا هەڵوەستەیەك لەسەر پێناسەی(عید) دەکەین.

لە کتێبی (تهذیب اللغة)دا خلیل دەفەرموێت: (والعیدُ کلُّ یَومٍ مَجمع، مِنْ عادَ یَعُودُ إلیه، ویقال: بل سُمّي لأنّهم اعتادُوه)[1] واتا: جەژن بە هەر ڕۆژێك دەگوترێت کە خەڵکی تێیدا کۆببنەوە، وە ووشەکە لە گەڕایەوە دەگەڕێتەوە بۆی (عاد یعود)وەیە، وە بەشێك دەڵێن بۆیە پێی دەگوترێت: (عید) چونکە خویان پێوە گرتووە لە (إعتاد)یە.

---

١ـ تهذیب اللغة ١٣١/٣

وە ابن أعرابی دەفەرمووێت: (سمّي عيدًا لأنّه يعودُ كلَّ سَنةٍ بِفَرَحٍ مُتَجَدِّد)[1] لەبەر ئەوە پێی دەگوترێت: (عید) چونکە هەموو ساڵێك بە خۆشیەکی تازەوە دەگەڕێتەوە.

وە فخرالدینی الرازی لە کتێبی (مختار الصحاح) دا دەفەرمووێت: ووشەی (عید) چاوگی ووشەی (عاد)یە، عادەش ئەصلەکەی (عَوَدَ) بووە.

جا بە پێی ئەو پێناسانەی ڕابردوو هەر ڕۆژێکی خەڵکی تێیدا کۆببنەوە و یادی ڕوداوێکی خۆش یان ناخۆش بکەنەوە و ئەو بۆنەیەش ساڵانە دووبارە ببێتەوە" ئەوە پێی دەگووترێت: جەژن(عید)، بەو پێیەش بێت هەرسێك ووشەی جەژن و یاد و بۆنەکان لە ژێر ئەو پێناسەیەدا جێیان دەبێتەوە، چونکە لە هەرسێکیاندا ساڵانە خەڵکی کۆدەبنەوە یادی ڕوداوێك یان بۆنەیەك دەکەنەوە.

١ـ تهذيب اللغة ١٣١/٣

# جەژن و یاد و بۆنە ئاینیەکان

جەژن و یادو بۆنـــە ئاینیەکان بە هەموو ئەو ڕۆژانەی ساڵ دەگـــوترێت کە موسڵمانان تێیاندا کۆدەبنەوە بۆ گێڕانی جەژن و خۆشی، وە یان یادکردنەوەی ڕوداوێکی گرنگی ژیانی پێغەمبەرﷺ یان پێشەوایەکی ئوممەت، وە یان بۆ زیندوکردنەوەی ئەو ڕۆژە یان ئەو شەوە بە عیبادەت و خودا پەرستی، جا ئەم جەژن و بۆنەو یادانە یان لە لایەن خوداو پێغەمبەرەکەیﷺ بە جەژن دانراون، وەك: جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان و عەرەفە و جومعە...، وە یان زانا موجتەهیدەکانی ئوممەت لە قورئان و سوننەت هەڵیانهێنجاوە و خەڵکیان هانداوە لەسەر زیندو کردنەوە و یادکردنەوەیان، وەك یادەکانی: سەری ساڵی کۆچی و لەدایکبونی پێغەمبەرﷺو ئیسراو میعراج و...هتد.

بەپشتیوانی خودا ئێمەش لە ژێر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت و بەتێگەیشتنی زانایانی موجتەهیدی ئوممەت یەکە یەکە باسی ئەم جەژن و یادو بۆنە ئاینیانە دەکەین.

# یادی سەری ساڵی کۆچی

خودای پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿ وَإِذْ يَمْكُرُ بِكَ الَّذِينَ كَفَرُوا لِيُثْبِتُوكَ أَوْ يَقْتُلُوكَ أَوْ يُخْرِجُوكَ وَيَمْكُرُونَ وَيَمْكُرُ اللَّهُ وَاللَّهُ خَيْرُ الْمَاكِرِينَ﴾(الأنفال: ٣٠)

# یادی سەریساڵی کۆچی

ڕۆژ ژمێری کۆچی بە کۆدەنگی هاوەڵان و لەسەردەمی جێنشینایەتی گەورەمان عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه لە ساڵی حەڤدەمی کۆچی دانرا، هۆکارەکەشی ئەوەبو: بەڵگەنامەیەکی قەرزیان هێنایە بەردەستی گەورەمان عمری کوڕیخطاب رضي الله عنه تیایدا نوسرابوو دەبێت قەرزدارەکە لە مانگی شەعباندا قەرزەکەی بداتەوە، جاگەورەمان عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه فەرمووی: کام شەعبان؟ شەعبانی ئەمساڵ یان هی پار یان هی ساڵێکی تر؟ بەم هۆیەوە گەورەمان عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه بیری لەوە کردەوە کە ڕۆژ ژمێرێك بۆ موسڵمانان دابنێت، بۆ ئەوەی کاروباری ڕۆژانەی خۆیانی لەسەر ڕایی بکەن ، بۆ ئەم مەبەستەش ڕاوێژی بە هاوەڵە بەرێزەکان کرد، جا هەندێك لەهاوەڵان فەرموویان: با لەسەر ڕۆژ ژمێری ڕۆم بڕۆین، بەڵام هەندێکیان فەرمویان: ڕۆژ ژمێری ڕۆمەکان دور و درێژە و ئەوان لەسەردەمی (ذي القرنين)ەوە دەنوسن و کار بەم ڕۆژژمێرە دەکەن، بەشێکی تر فەرموویان: با لەسەر ڕۆژ ژمێری فارسەکان بڕۆین، گووتیان: ئەویش نابێت، چونکە هەر پادشایەکی فارس هاتبێت پێشنیازی ئەوەی خۆی کردووە،[1] ئینجا هاتنە سەر ئەوەی کە ڕۆژژمێرکی تایبەت بە موسڵمانان دابنێن، بۆ ئەو مەبەستە چەند پێشنیازێك کرا، بەشێکیان بۆ دەستپێکی ڕۆژژمێری ئیسلامی لە دایکبونی پێغەمبەریان ﷺ دیاریکرد، هەندێکی تر ڕۆژی هاتنی وەحی و بونی بە پێغەمبەر، وە هەندێکی تر ڕۆژی وەفاتی، وە کۆمەڵێکی تر ڕۆژی کۆچی پێغەمبەر ﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینەیان دیاریکر، جا گەورەمان عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه ڕای کۆتایی پێپەسەند بوو و ئەوی هەڵبژارد و فەرمووی: کۆچی پێغەمبەر ﷺ حەق و ناحەقی لێك جیاکردەوە، وە ئەم ڕووداوەی ژیانی پێغەمبەر ﷺ لە هەمـــوو ڕووداوەکانی تـــری

---

١ـ عمری کوڕی خطاب ، دکتۆر علی محمد الصلابی: ١٣٨

ژیانی دیارترە، لەبەر ئەوە کۆچی پێغەمبەرﷺ دەکەینە دەسپێك و سەرەتای مێژوو و ڕۆژ ژمێری ئیسلام، جا هاوەڵانیش بە کۆی دەنگ ئەم هەڵبژاردنەی جێنشینی پێغەمبەریان قەبوڵ کرد، پاشان گەورەمان عومەرکوڕیخطاب رضي الله عنه ڕاوێژی پێکردن تایا کام مانگ بکەین بە یەکەم مانگی ساڵی کۆچی؟ هەردوو هاوەڵی بەڕێز گەورەمان عثمان و علی رضي الله عنهما فەرموویان: با مانگی موحەڕڕەم بکەین بە یەکەم مانگی کۆچی، ئەمەش لەبەر دوو هۆکار:

١ـ چونکە پێغەمبەرﷺلە مانگی موحەڕڕەمەوە دەستی کرد بە ئامادەسازی بۆ کۆچ کردن.

٢ـ وە پێش ڕۆژ ژمێری ئیسلامیش موحەڕڕەم هەر یەکەم مانگی سەرەتای ساڵ بووە.

جا گەورەمان عمر رضي الله عنه ڕای ئەم دوو هاوەڵە بەڕێزەی قبوڵ کرد و مانگی موحەڕڕەمیان کرد بەیەکەم مانگی سەرەتای ساڵ.[١]

پێشەوا سوهەیلی رحمه الله دەفەرمووێت: هاوەڵە بەڕێزەکان دانانی مێژووی ئیسلامیان بە ناوی ڕووداوی کۆچەوە لەم ئایەتەی قورئان وەرگرتووە کە دەفەرمووێت: ﴿لَّمَسْجِدٌ أُسِّسَ عَلَى التَّقْوَى مِنْ أَوَّلِ يَوْمٍ ﴾[٢]واتا: ئەو مزگەوتەی دامەزرێندراوە و دروستکراوە لە یەکەم ڕۆژەوە. لەسەر لە خوا ترسی. بەواتای: لە یەکەم ڕۆژی سەربەرزی ئیسلام کە هاتنی پێغەمبەرﷺو هاوەڵان رضي الله عنهم بوو بۆ مەدینە، وە لەم ڕۆژەدا بۆ یەکەم جار پێغەمبەرﷺ بەئارامی خودای خۆی پەرست، وە لەم ڕۆژەدا دەستکرا بە دروستکردنی مزگەوتی(قباء)، ئێمەش وەها لە کردەوەی هاوەڵە بەڕێزەکان گەیشتین کە مەبەست لەم ئایەتە سەرەتای مێژووی ئیسلامە.[٣]

جا بەشێك لە موسڵمانان ساڵانەو لە یەکی موحەڕڕەمدا یادی کۆچی پێغەمبەرﷺ دەکەنەوە،

---

١ـ فتح الباری: ٧/ ٣٣٥-٣٣٦

٢ـ التوبة: ١٠٨

٣ـ فتح الباری: ٣٣٥

ئەم ڕۆژەداو بەم بۆنەیەوە ئاهەنگ و مەراسیمی تایبەت ڕێکدەخەن و چەندین چالاکی تری جۆراو جۆر ئەنجام دەدەن و پیرۆزبایی کۆچی پێغەمبەرﷺ نوێبونەوەی ساڵی کۆچی لە یەکتری دەکەن.

## حوکمی یادی سەری ساڵی کۆچی

یادکردنەوەی کۆچی پێغەمبەرﷺ لە مەککەوە بۆ مەدینە و سازکردنی ئاهەنگ و مەراسیمی تایبەت بۆی، وەك یادی مەولود دەچێتە باسی نەریتەکانەوەو دروستەو هیچ ڕێگریەکی شەرعی نیە، وە خودی دانانی کۆچی پێغەمبەرﷺ وەك دەستپێکی ساڵی کۆچی لەلایەن هاوەڵانەوە بۆ خۆی جۆرێك بوو لە بەزیندویی هێشتنەوەو یادکردنەوەی ئەم ڕووداوە گەورەیەی مێژوو.

دکتۆر یوسف قەرزاوی دەربارەی یادکردنەوەی سەری ساڵی کۆچی دەفەرمووێت: (إذا انتهزنا هذِهِ الْفُرصَةَ لِلتذكيرِ بِسيرةِ رَسُولِ اللهﷺ،وَبِشَخصيَةِ هذا النَّبِي الْعَظيمِ، وَبِرسالَتِهِ الْعامةِ الْخالِدَةِ الّتِي جَعلَها اللهُ رَحْمَةً لِلعالَمِينَ، فَأيُّ بِدعَةٍ فِي هذا وَأَيَّةُ ضَلالَةٍ ؟! إننا حِينَما نَتحدَّثُ عَنْ هذِهِ الأحداثِ نُذكِّرُ الناسَ بِنعمةٍ عَظيمةٍ، وَالتَّذكيرُ بِالنِّعَمِ مَشروعٌ وَمَحمودٌ وَمَطلوبٌ، وَاللهُ تَعالى أَمَرَنا بِذلِكَ فِي كِتابِهِ﴿يا أَيُّها الذِينَ آمَنوا اذْكُروا نِعْمَةَ اللهِ عَلَيكُمْ إِذْ جاءَتْكُمْ جُنودٌ فَأَرْسَلْنا عَلَيهِم رِيحاً وَجنوداً لَمْ تَرَوها وَكانَ اللهُ بِما تَعْمَلونَ بَصيرًا ، إِذْ جاءوكُم مِن فَوقِكُم وَمِن أَسفَلِ مِنْكُم وَإِذْ زاغَتِ الأَبْصارُ وبَلَغَتِ القُلوبُ الحَناجِرَ وَتَظُنُّونَ بِاللهِ الظُّنونا﴾[1][2] واتا: ئەگەر بێتو ئەم بۆنانە بقۆزینەوە بۆ یادکردنەوەی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺو باسکردنی کەسایەتی ئەم پێغەمبەرەﷺ گەورەیەو ئەم پەیامە گشتیە بەردەوامەی کە خودا وەك

١ـ شبكة الشفاء الإسلامية.

٢ـ الأحزاب : ٩ـ١٠

ڕەحمەتێك بۆ هەموو جیهانیـــــــان ناردوویەتی ئەمە چ بیدعەیەك و چ گومڕاییەکی تێدایە؟!
وە بێگومان کاتێك ئێمە باسی ئەم ڕوداوانە دەکەین بۆخۆی بیرکردنەوەی ئەو نیعمەتە گەورانەیە کە خودای گەورە بەم ئوممەتەی داوان، وە یادکردنەوەی نیعمەتەکانی خوداش کارێکی باش و داواکراوە، وە خودای بالآدەست لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانمان پێدەکات بەم کارەو دەفەرموێت: ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە یادی نیعمەتی خودا بکەنەوە لەسەرتان ـ مەبەست پێی جەنگی خەندەقە کە خودای گەورە فریای موسڵمانان کەوت ـ کاتێك سەربازانی کوفر هاتنە سەرتان، ئێمەش ڕەشە بایەکی بەهێز و سەربازانێکمان ناردنە سەریان کە ئێوە نەتان دەبینین،وە خودای گەورە بینا بوو بە هەوڵ و کۆششتان.

وە ابوحسنی مەقدیسی رحمه الله دەربارەی پیرۆزبایی کردن بەبۆنەی هاتنی سەری مانگ وسەری ساڵی کۆچی دەفەرموێت: (لَم يَزَلِ الناسُ مختلِفينَ في ذلكَ، والذى أراهُ أنّهُ مباحٌ، ليسَ بِسُنةٍ و لا بِدعةٍ)[1]واتا: بەردەوام زانایان دەربارەی ئەم بابەتە جیاڕا بوون، بەڵام ئەوەی من بە پەسەندی دەزانم ئەوەیە: ئەم کارە ڕێگاپێدراوـ مباح ـ ە، نە سوننەتە و نە بیدعەشە.

وە دار الإفتاو میصری دەربارەی یادی هیجرەت دەفەرموێت: (وَالعُقَلاءُ مِنَ النّاسِ هُمُ الذينَ يَحرِصُونَ على اغتِنامِ فُرصِ الْمُناسباتِ الاسلامِيةِ لِيَقفوا عِندَها وَيَتَدَبَّروا فِي اَسرارِها وَمَعانِيها، ثُمَ لِيَستَفِيدوا مِن كُلِّ تِلكَ الْجَوانِبِ الْعَطِرَةِ فِي السِّيرةِ النَبويةِ الشَّرِيفَةِ فِي هذا الْمَجالِ، وَذلكَ لأن هذهِ الدُروسِ تُساعِدُ عَلى تَتبعِ جَوانبِ السِّيرةِ النَبويةِ الْعَطِرةِ، وَأَخذِ الدُّروسِ مِنها وَالتَعرُّفِ عَلَيها وَتَعلِمها وَمتابَعةِ اَحداثِها وَبِالتالي تَعلِيم أَولادِنا وَتَلاميذِنا وَمَن حَولَنا جَوانِبَ مِن تِلكَ الاسرارِ فِي مِثلِ هذهِ الْمُناسباتِ الْعَظيمةِ)واتا: مرۆڤە هۆشمەندەکان ئەوانەن کە بۆنە ئاینیەکان وەك هەلێك دەقۆزنەوە، بۆ ئەوەی دەربارەی ئەم بۆنەیە بدوێن و لێی

١ـ الفتاوى الآمدية: ٢/ ٥٧

ورد ببنەوە و حیکمەتەکانی باس بکەن، وە پاشان بەهۆیەوە سود وەر بگرن لە هەموو ڕویەکی ژیانی بوّن خۆشی پێغەمبەرﷺ، چونکە بێگومان باس کردنی ئەم وانانە یارمەتیدەرە بۆ شوێنکەوتنی هەموو ڕوەکانی ژیانی پێغەمبەرﷺ، وە پەند لێوەرگرتنیان و ناسینیان و فێر بونیان و بە دواکەوتنی ڕوداوەکانیان، وە ئەمەش هۆیەکی باشە بۆ فێر کردن و ئاشنا کردنی منداڵەکانمان و قوتابیەکانمان وئەوانەی لە دەورو بەرمانن بەژیاننامەی پێغەمبەرﷺو نهێنیەکانی و پەندو ئامۆژگاریەکانی.

## کۆچی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵان بۆ؟

کاتێك خودای پەروەردگار سروشی بۆ پێغەمبەرﷺ نارد و پاشان فەرمانی پێکرد پەیامەکەی ئاشکرا بکات ، پێغەمبەری خوداﷺ چۆ سەر کێوی (صەفا)و بانگی هۆز و بنەماڵەکانی مەککەی کرد و فەرمووی: هۆ بنەماڵەی فلاّن ، هۆ بنە ماڵەی فلاّن، هۆ بنە ماڵەی عبدالمناف، هۆ بنە ماڵەی عبدالمطلب، ئەوانیش لە دەورەی کۆبونەوە، پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أرأيْتُكُم لَو أخبَرتُكُم أنَّ خَيلاً تَخرجُ بِسفحِ هذا الجَبَلِ أكُنتُم مُصدِّقِيّ؟ قالوا: ما جَرَبنا عَلَيكَ كِذباً . قالَ: فإنّي نذيرٌ لكُم بَينَ يَديَّ عذابٌ شَديد. فقالَ أبو لهب: تباً لكَ ! أمّا جَمَعتَنا إلا لِهذا؟ ثُمَّ قام، فنزلت هذه السورة:﴿تَبَّتْ يدا أبي لَهَبٍ و تَبَّ﴾[1][2] واتا: ئەگەر هەواڵتان بدەمێ کە چەند سوارچاکێك دەیانهەوێت لە قەدپاڵی ئەم چیایە بێن و بدەن بەسەرتاندا، ئایا بڕوام پێدەکەن؟ گوتیان: بەڵێ، چونکە هەرگیز درۆمان لێت نەبینیوە.

١ـ پێشەوا ابن ابی حاتم گێڕاویەتەوە ، وە ابن هیشامیش لە کتێبی سیرەدا باسی کردووە، وە ابن حجریش لە (فتح)دا دەفەرمووێت: (حسن) بڕوانە: الجامع لأحكام القران: ٢٠/٢١٦

٢ـ المسند: ١

فەرمووی: دەبزانن کە من پێغەمبەری خودام و هاتووم ئاگادارتان بکەمەوە، وە هەرکەسێك بڕوا نەهێنێت ئەوە سزای خودا زۆر توندە،جا ئەبو لەهەب گووتی: هەی تیابچیت تەنها بۆ ئەوە کۆت کردبوینەوە، پاشان لە جێگای خۆی هەڵستا. خودای پەروەردگاریش لە وەڵامی ئەبولەهەبدا ئەم سورەتەی دابەزاند: لە ناو بچێت هەر دووك دەستەکانی ئەبو لەهەب، وە بێگومان تیاش دەچێت.... .

جا هەر لەم ڕۆژەوە پێغەمبەری خوداﷺ هەتا نزیکەی سیانزە ساڵ بەنهێنی و ئاشکرا لەگەڵ خەڵکی مەککە و خزم و کەسەکانی خەریك بوو بۆ ئەوەی ڕێنموونی خودا وەربگرن و بێنە ناو دینی ئیسلامەوە، بەڵام خەڵکی مەککە بە گشتی و کاربەدەستەکانیان بەتایبەتی زۆر بەتوندی داواکەی پێغەمبەریانﷺڕەتکردەوەو بەجۆرەها شێوە دەستیان کرد بەپیلان گێڕان دژی پێغەمبەر ﷺو ئاینی پیرۆزی ئیسلام، وە بە چەندین شێوە دەستیان کرد بە ئازاردانی پێغەمبەرﷺ هاوەڵە بەڕێزەکان، ئەمەی خوارەوە چەند نمونەیەکە لە ئازاردانی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵە بەڕێزەکان:

یەکەم/ ئازاردانی پێغەمبەرﷺ: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (ما أُوذِيَ نَبِيٌّ بِمِثْلِ ما أُوذِيتُ)[1]واتا: هیچ پێغەمبەرێك بە ئەندازەی من ئازار و ئەشکەنجە نەدراوە. جا شێوەکانی ئازاردانی پێغەمبەرﷺ لە لایەن هاوبەشدانەرەکانەوە زۆرن بەڵام ئێمە لێرەدا لە ترسی درێژبوونەوەی باسەکە لە دوو شێوەدا کورتی دەکەینەوە:

١ـ ئازاردانی دەرونی: هاوبەش دانەرەکان بەچەندین شێوە ئازاری دەرونی پێغەمبەریانﷺ دەدا لەوانە:

أـ ناو ناتۆرە لێنان: کافرەکانی قورەیش چەندین ناو و ناتۆرەیان لە پێغەمبەری خوداﷺ نابوو، لەوانە: ساحر، شاعیر، کاهین، درۆزن، وەجاخ کوێر .... ئەم ناو ناتۆرانەشیان لە زۆر کات

١ـ پێشەوا أبو نعیم بە سەنەدێکی (حسن) گێڕاویەتەوە.

و زۆر جێگای هەستیاردا بەکار دەهێنا، طاریقی مەحاریی و ڕەبیعی دەیلی دەفەرموون: لە سەردەمی نەفامیدا پیاوێکم بینی بە بازاڕی(ذی المجاز)دا دەهات و دەیگووت:(أیها الناسُ قُولوا: لا إلهَ إلا اللهُ تُفْلَحُوا)واتا: ئەی خەڵکینە بڵێن لا إله إلا الله سەر فراز و بەختەوەر دەبن، وە بینیم دەچوو ناو کوڵانەکانی بازاڕاوە و هەر بانگەوازی بۆ ئەم ڕستەیە دەرکرد، وە خەڵکی بەسەریاندا هاوار دەکرد ئەویش هەر بێدەنگ نەبوو، وە پیاوێکی لە دوا دەڕۆیشت دەیگووت: گوێی بۆ مەگرن و بڕوای پێمەکەن ئەوە درۆزنە!! منیش پرسیم ئەوە کێیە بانگەشە بۆ لا إله إلا الله دەکات؟ گووتیان: ئەوە محمدی کوڕی عبدالله یە، گووتم: ئەی ئەوە کێیە بە درۆی دەخاتەوە؟ گووتیان: ئەوە مامیەتی أبو لهب!![1]

وە یەکێکی تر لەو کاتانەی کە زۆر هەستیار بوو و تیایدا ئازاری دەروونی پێغەمبەریانﷺ دەدا" کاتی حەج بوو، لەم کاتە هەستیارەدا کە ساڵانە ژمارەیەکی زۆری خەڵکی لە ناوچەکانی تری دەوروبەری مەککە سەردانی ماڵی خودایان دەکرد بۆ مەبەستی حەج، هاوبەشدانەرەکانی قوڕەیش بەسەرکردایەتی وەلیدی کوڕی موغەیرە هەڵمەتێکی ڕاگەیاندن و چەواشەکاری توندیان دەست پێدەکرد دژی پێغەمبەرﷺ و جۆرەها ناو و ناتۆرەیان بەدوا دەخست. جا بەر لەوەی کاتی حەج بێت وەلیدی کوڕی موغەیرە کافرەکانی قوڕەیشی کۆکردەوەو پێی گووتن: وا کاتی حەج نزیکبۆتەوە، با ئێمە هەموومان لەسەر قسەیەك ڕێك بکەوین بۆ ئەوەی بیخەینە دوای محمد، چونکە ئەگەر بێتو لەسەر قسەیەك ڕێك نەکەوین و هەر کەسەمان قسەیەکی بۆ هەڵببەستێت ئەوە یەکتر بە درۆ دەخەینەوە و خەڵکیش دەزانێت کە ئێمە درۆ دەکەین!! کافرەکان گووتیان: تۆ ڕای خۆتمان پێبڵێ ئەی أبو عبدالشمس، گووتی: نەخێر ئێوە پێشتر ڕای خۆتانم پێبڵێن تاخۆ چی بەدوا بخەین، گووتیان: پێی دەڵێن: کاهین، گووتی: نەخێـــر بە کەڵك نایەت، چونکـــە ئێمـــە

١ـ پێشەوایان ابن خزیمە و ابن حبان لە صەحیحەکانیاندا گێڕاویانەتەوە.

کاهینمان بینیون، ئەو قسەکانی بە ئاوازی کاهینەکان و بە سەروا ـ سجع ـ ناکات. گووتیان پێی دەڵێین: شێت !! گووتی: ئەمەشیان نابێت، چونکە محمد هیچ صیفەتێکی شێتانی نیە" نە دەست دەنێتە بینی خەڵك، نە بێهۆشی و بێئاگایی بەسەردا دێت، نە قسە دەبزرکێنێت و توشی وەسوەسە دەبێت. گووتیان: باشە پێی دەڵێین: شاعیر!! گووتی: ئەمەشیان نابێت، چونکە هەموومان گوێمان لە شیعر بووە، شیعر هۆنراوەیەکە کێش و قافیەی هەیە، شاعیرەکانیش هەندێك جوڵەی تایبەت دەکەن، قسەکانی ئەویش ئەمانەی نیە، کەواتا شاعیریش ناگونجێت. گووتیان پێی دەڵێین: جادوگەرە ـ ساحرـ ە !!گوتی: ئەوەش نابێت چونکە ئێمە جادوگەرەکانمان بینیوە گرێ لە شت دەدەن و فوی پێدا دەکەن ، گوتیان ئەی چی پێبڵێین ئەی أبو عبدالشمس؟ گووتی: (واللهِ إنَّ لِقَولهَ لَحَلاوةٌ وإنَّ أصلَهُ لَعذقٌ' وإنَّ فَرعَهُ لجناةٌ، وما أنتُمْ بِقائِلينَ مِن هذا شَيئاً إلا عُرِفَ أنَّه باطلٌ، وإنَّ أقربَ القولِ لأن تَقولوا: ساحِر، فقولوا: ساحرٌ يَفرقُ بينَ المرءِ وبينَ أبيهِ، وبينَ المرءِ وأخيهِ، وبينَ المرءِ وزوجهِ، وبينَ المرءِ وعَشيرتهِ)واتا: سوێند بەخودا کاتێك قسە دەکات"قسە زانە و قسەکانی شیرینن، وە قسەکانی خەڵك ڕادەکێشن و خەڵکی شێت دەکەن، لەبەر ئەوە ئێوە هەر کامێك لەم قسانەی پێبڵێن خەڵکی بڕواتان پێناکات، بەڵام قسەیەکی پێبڵێن کە لە قسەی خۆتانەوە نزیکە، پێیبڵێن: ئەو پیاوە ساحیرێکە ئیشی ئەوەیە کوڕ و باوك، وە براو برا، وە ژن و مێرد، وە پیاو لە خزم و کەسەکانی جیادەکاتەوە. جا خودای پەروەردگار لە دژی ئەم بێباوەڕە پیلان دانەرە ئەم کۆمەڵە ئایەتەی دابەزاند ﴿ذَرْنِي وَمَنْ خَلَقْتُ وَحِيدًا ۞وَجَعَلْتُ لَهُ مَالاً مَّمْدُودًا ۞وَبَنِينَ شُهُودًا..... فَقَالَ إِنْ هَذَا إِلاَّ سِحْرٌ يُؤْثَرُ ۞ إِنْ هَذَا إِلاَّ قَوْلُ الْبَشَرِ ۞سَأُصْلِيهِ سَقَرَ﴾[1][2]

---

١ـ المدثر: ١١ـ ٢٦

٢ـ الجامع لأحكام القران: ١٩/٦٨ـ٦٩

# ویمکرون و یمکرالله والله خیرالماکرین!!

ئێمە گوێمان ڕۆژانە بە گشتی وسالانە کاتی حەج بە تایبەتی کافرەکانی قورەیش دەستیان دەکرد بە دانانی پیلانی تازە و نوێ دژی پێغەمبەرﷺ بەڵام خودای پەروەردگار هەموو پیلانەکانی بەسەر خۆیاندا دەشکاندەوە، ئێمە لێرەدا کەسێك باس دەکەین کە بەهۆی بانگەشەی کافرەکانەوە لە پێغەمبەرﷺ نزیك بۆوەو دواتر موسڵمان بوو:

* ضـــمادی ئەزدی: ضـــماد کاتێك هاتە ناو مەککەوە بانگەشەکانی کافرەکان کاری تێکرد کە پێیان دەگووت: محمد شێتە، ئەم ضـــمادەش ئیشی ئەوەبو کە ئەجینەی لە لاشەی مرۆڤ دەردەکرد، بۆیە لە دڵی خۆیدا گووتی: دەچم بۆ لای محمد بەڵکو خودای گەورە لەسەر دەستی من شیفای بدات و چاك ببێتەوە، بۆ ئەو مەبەستە هاتە لای پێغەمبەرﷺ و گووتی: ئەی محمد من نوشتە دەکەم بۆ ئەو کەسانەی کە شێت بوون، جا ئایە تۆ ڕێگام دەدەیت نوشتە بوتۆش بکەم بەڵکو خودا شیفات بدا؟ پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: (إنَّ الحمدَ لِلهِ، نَحمدُهُ ونَستعِينُهُ، وَمَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضِلَّ له وَمَنْ يُضلِلِ فلا هاديَ لهُ، وَأشهَدُ أنْ لا إله إلا اللهُ وَحدهُ لا شريكَ لَهُ. وَأنَّ مُحمدًا عَبدُهُ وَرَسُولُه، أما بعد) کاتێك ضـــماد گوێی لەم فەرموودانە بوو گووتی:(أعِد علي كَلِماتكَ هؤُلاءِ)واتا: ئەم ووشانەم بەسەردا دووبارە بکەرەوە، پێغەمبەری خوداشﷺ سێ جار دووبارەی کردنەوە، ئینجا ضـــماد گووتی:(لقد سَمِعتُ قولَ الْكَهنةِ وقولَ السَحَرَةِ وقَولَ الشُعراءِ، فَما سَمِعتُ مِثلَ كَلماتِكَ هؤلاءِ، ولقد بَلَغنَ قاموسَ البَحرِ)واتا: بەڕاستی من گوێم لە قسەی کاهینەکان بووە، وە گوێم لە قسەی جادوگەر و شاعیرەکان بووە، بەڵام هەرگیز گوێم لەم جۆرە ووتانە نەبووە، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (هات يدك أُبايِعُكَ على الإسلامِ قال: فبايعه، فقال رسول الله وعلى قومك قال: وعلى قومي)[1] واتا: دەستتم بدەرێ بۆ ئەوەی پەیمانی ئیسلامت

[1] ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

بدەمێ،ئەویش پەیمان ـ بەیعەتی ـ پێدا، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: پەیمانم پێبدە گەلەکەشت دەکەیتە موسڵمان، ئەویش پەیمانی گەلەکەشی پێدا. جا کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ کۆچی کرد بۆ مەدینەو دەوڵەتی ئیسلامی دامەزراند و سوپای دەنارد بۆ دەوروبەری مەدینە، سوپاکە بەلای گەلی ضـــەمادا تێپەڕین، سەرۆك سوپایەکە گووتی: هەرکەسێك هەر شتێکی لێرە دەست داوەتێ بابیگێڕێتەوە، چونکە ئەمە گەلی ضـــەمادە. جا ئەمە نمونەیەکە لە دەیان نمونە، چەندین جاری تر بەهۆی بانگەشەی کافرەکانەوە خەلکی لە پێغەمبەرﷺ نزیك دەبونەوە پاشان موسڵمان دەبوون.

ب ـ بە درۆ دانانی قسەکانی پێغەمبەرﷺ و ڕەتکردنەوەی قسەکانی لە دانیشتنەکان و لە ناو خەلکدا: یەکێکی تر لە شێوەکانی ئازاردانی دەرونی پێغەمبەرﷺبریتی بوو لە ڕەتکردنەوەی فەرموودەکانی لەناو دانیشتگا و خەلکیدا،ابن هیشام لە سیرەدا دەفەرموێت:کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە دانیشتگە و مەجلیسێك دادەنیشت و بانگەوازی خەلکەکەی دەکرد بۆ ئیسلام و قورئانی بۆ دەخوێندن و دەیترساندن بە باسکردنی چۆنیەتی لەناوچونی گەلانی پێشوو، لەو کاتەدا نـــەضری کوڕی حاریث دەستی دەکرد بە قسەکردن و باسی ڕۆستەم و ئەسفەندیار و پادشاکانی فارسی دەکرد و دەیگوت: سوێند بەخودا قسەکانی محمدیش وەك قسەکانی من وان، قسەکانی وەکو قسەکانی من باس و بەسەرهاتی گەلانی پێشوون و هیچی تر، جا خودای پەروەردگار ئەم قسانەی نـــەضری ڕەتکردنەوەو ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿وَقَالُوا أَسَاطِيرُ الْأَوَّلِينَ اكْتَتَبَهَا فَهِيَ تُمْلَى عَلَيْهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا * قُلْ أَنزَلَهُ الَّذِي يَعْلَمُ السِّرَّ فِي السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ إِنَّهُ كَانَ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[١][٢]

١ـ الفرقان: ٥ـ ٦

٢ـ السـيرة النبوية، لإبن هيشام: ١/٢٢٨

٢ـ ئازاری لاشەیی پێغەمبەرﷺ: جۆرێکی تر لە جۆرەکانی ئازاردانی پێغەمبەرﷺبریتی بو لە ئازاردانی لاشەی پێغەمبەرﷺ ئەمەشیان بەچەند جۆرێك:

أـ ئازاری لاشەیی بە لێدان و پێدادان و چقڵ چاڵ خستنە سەر ڕێگای و بەسەردادانی شتی پیس و ...هتد عبداللە ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ لە سوجدەدا بوو، خەڵکیشی بەدەورەوە بوو ، لەو کاتەدا عوقبەی کوڕی أبی معیط هات پسدان وسلای[1] حوشتری بە دەستەوە بوو، خستیە سەر پشتی پێغەمبەرﷺ، ئەویشﷺ نەیتوانی پشتی بەرز بکاتەوە ، هەتا فاطمەی کچی رضی الله عنها هات و لەسەر پشتی لایبرد و دووعاشی لەو کەسە کرد کە ئەم کارەی کردووە.[2]

ئوبەی کوڕی خەلەف و عوقبەی کوڕی أبی معیط بەیەکەوە دۆستایەتی و برادەرایەتیەکی توندیان هەبوو، ڕۆژێکیان عوقبە چوو بۆ لای پێغەمبەرﷺ گوێی بۆ فەرموودەکانی گرت، ئوبەی ئەمەی بیستەوە، لەبەر ئەوە بە عوقبەی گووت: بیستوومە چوویت لە لای محمد دانیشتویت و گوێت بۆ ووتەکانی گرتووە، جا ئێستا ڕوم لە ڕوی تۆ حەرام بێت وە قسەت لەگەڵ ناکەمەوە ئەگەر جارێکی تر گوێ بۆ ووتەکانی محمد بگریت، وە ڕوم لە ڕوی تۆ حەرام بێت ئەگەر نەچیت تف نەکەیتە ڕوی محمد!! عوقبەش (نەفرینی خودای لێبێت) ئەم کارەی کرد و هات تفی کردە دەم و چاوی پیرۆزی پێغەمبەرﷺ.

ب ـ ئازاردانی لاشەی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵان بە برسی کردن و گەمارۆی ئابوری: لە مێژوودا یەکەم کەس و یەکەم گەل کە گەمارۆی ئابوریـان خرابێتە سەر" پێغەمبەری ئیسـلامﷺ

١ـ پسدان و سلا: لەو پیسیەیە کە لەگەڵ بێچوی حوشتردا دێتە دەرەوە، وەك ئاوەڵ منداڵی‌سکی ئافرەت وایە و خوێن و پیسەکی زۆری لەگەڵدایە!!.

١ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

گەلەكەی بووە، دوای ئەوەی هەردوو پاڵەوانی ئوومەت عمر و حەمزە رضي الله عنهما هاتنە ناو ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە، وە جگە لەوانیش خەڵكی پەیتا پەیتا دەهاتنە ناو ئیسلامەوە، كافرەكانی قورەیش هەستیان بە مەترسی بڵاوبونەوەی ئاینی ئیسلام كرد، لەبەر ئەوە بڕیاریاندا كە پێغەمبەری خواﷺ بكوژن، جا كاتێك أبوطالب ئەمەی زانی خزمەكانی كۆكردەوە و فەرمانی پێكردن كە پێغەمبەرﷺ بپارێزن، ئیتر كە كافرەكان ئەمەیان بیست بڕیاریاندا كە گەمارۆی ئابوری و كۆمەڵایەتی بخەنە سەر پێغەمبەرﷺ و خزمەكانی كە بریتی بوون لە بنەماڵەی عبدالمطلب و بنەماڵەی هاشم، جا گەمارۆیەكەش بەم جۆرە بوو:

بڕیاریاندا: كە لەگەڵیان دانەنیشن، سەردانیان نەكەن، شتیان پێنەفرۆشن، شتیان لێنەكڕن، ژنیان نەدەنێ، ژنیان لێ نەخوازن، ڕێگا نەدەن كەس ئازوقەیان بداتێ، وە سوڵحیشیان لەگەڵ نەكەن هەتا پێغەمبەرﷺ ڕادەستی ئەوان دەكەن بیكوژن.

ئیتر كافرەكان لەسەر ئەم ستەم كاریە پەیمانیان بەستوو لە پەڕە كاغەزێكدا نوسیان و نوسراوەكەشیان لە ناو كەعبەدا هەڵواسی. وە پاشان كافرەكان بەمەشەوە نەوەستان بەڵكو پێغەمبەرﷺ و خزمەكانیان لە شاری مەككە كردە دەرەوە، پێغەمبەرﷺ و خزمەكانیشی چون لە شیوی أبوطالب دا نیشتەجێ بوون، جا ئەم گەمارۆیە هەتا سێ ساڵان بەردەوام بوو، بەشێوەیەك برسی بوون گەڵای درەخت و پێستەی ئاژەڵیان دەخوارد، وە دەنگی گریانی منداڵەكانیان دەگەیشتە ئەودیوی شیوەكە، ئینجا كە سێ ساڵ تەواو بوون، پێغەمبەرﷺ بە ابوطالبی فەرموو: (يا عمّ إنّ ربي الله قد سلّط الأرضةَ على صحيفةِ قريش ، فَلَمْ تدعْ فيها اسماً هو لِلِه إلاّ أثبَتَتْهُ فِيها ، ونَفَت مِنْهُ الظُلْمَ والقَطِيعةَ والبُهتانَ)واتا: ئەی مامە، خودای گەورە مۆرانەی ناردوّتە سەر نوسراوەكەی قورەیش، تەنها ناوی خودای تێدا هێشتوّتەوە، هەرچی ستەم و پچڕانی صیلەی ڕەحم و بوختانیشە هەمووی خواردووە!! مامی گووتی: خودایەكت ئەم

هەواڵەی دایتێ؟ پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، أبوطالب گووتی: سوێند بە پڕشنگدارەکان تۆ قەت درۆت لەگەڵدا نەکرددوم، بۆیە یەکسەر أبوطالب لەگەڵ کۆمەڵێك پیاوی (بنی هاشم و بنی عبدالمطلب هاتنە کەعبە و لەوێ بە کافرەکانی گووت: هۆ کۆمەڵی قورەیش کوڕە برایەکەم ـ محمد ـ پێی گووتم: کە مۆرانە نوسراوە ستەمکارانەکەی ئێوەی خواردووە و جگە لە ناوی خودا هیچی لێنەهێشتوەتەوە، کەوابو ئێوەش نوسراوەکەتان بێنن و سەیری بکەن، جا ئەگەر کوڕە برایەکەم ڕاستی گوتبێت " ئەوە ئێوە واز لەو ستەم و گەمارو دانەی ئێمە بهێنن، ئەگەر درۆشی کردبێت " ئەوە کوڕە برایەکەم دەدەمە دەستتان. کافرەکانیش گووتیان: ئێمەش بەوە ڕازینە، ئیتر نوسراوەکەیان هێنا و تەماشایان کرد، بینیان مۆرانە هەمووی خواردووە تەنها ڕستەی (باسمك اللهم)ی هێشتوەتەوە، کە دیتیان پێغەمبەرﷺ ڕاستی فەرمووە، هەندێکیان زیاتر گومڕابوون و گووتیان: ئەمە سیحری کوڕە برایەکەتە، بەڵام لەو جەماعەتە پێنج پیاو کە بریتی بوون لە: (هیشامی کوڕی عەمر و زوهەیری کوڕی بەنی ئومەییە و موطعیمی کوڕی عەدی و ئەبولبەختەری کوڕی هیشام و زومعەی کوڕی ئەسوەد) شەوێ بە نهێنی کۆبونەوە و بڕیاریاندا ئەم نوسراوە هەڵبوەشێننەوە، ئینجا بۆ سبەینێ چونە دانیشتگەی کافرەکانی قوڕیش و زوهەیر گووتی: ئایا ڕەوایە ئێمە خواردەمەنی بخۆین و پۆشاك لەبەر بکەین و بنەماڵەی هاشم و عبدالمطلبیش بە هیلاك بچن و هیچیان نەدرێتێ؟! با ئەو گەمارۆیە کۆتایی پێبهێنین،أبو جهل وەڵامی دایەوە و گووتی: درۆ دەکەی والله ی نابێت کۆتایی پێبهێنرێت. ئینجا چوار کەسەکەی تریش لەسەر زوهەیریان هەڵدایەو پشتگیریان لێکرد، پاشان مطعم هەڵستا و نوسراوەکەی هێنا و دڕاندی بەمەش گەمارۆی سەر پێغەمبەرﷺ و خزمەکانی کۆتایە پێهات، والحمد لله.[1]

ج ـ هەوڵدان بۆ تیرۆر کردنی پێغەمبەرﷺ: چەندین جار کافرەکانی قوڕەیش هەوڵی تیرۆر

١ـ بڕوانە: البدایە والنهایە: ٣ـ٤/ ٨٥، وە ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار:٩٨ـ١٠٠

کردنی پێغەمبەریانﷺ داوە لەوانە: کافرەکانی قورەیش جوانترین گەنجی مەککەیان هێنا بۆ لای أبوطالب کە عەمارەی کوڕی وەلیدی کوڕی موغەیرە بوو و گوتیان: ئەی أبوطالب ئەوە عەمارەی کوڕی وەلیدە جوانترین لێهاتوترین گەنجی قورەیشە بۆمان هێناویت، بیکە بە کوڕی خۆت با یارمەتیت بدات، لە بەرامبەریشدا تۆ محمدی برازاتمان بدەیە کە هاتووە لە دینی تۆ و باوك و باپیرانت لایداوە و ئێمەی لە یەکتری کردووە بۆ ئەوەی بیکوژین، ئەو کات پیاوێك بەرامبەر بە پیاوێك دەبێت!! أبوطالبیش گوتی: (واللهِ لَبِئسَ ما تَسُومُونَني، أَتعطُوني ابْنَكُم أَغْذُوهُ لَكُم وأَعطيكُمْ اِبنِي فَتَقتُلُونَهُ، هذا واللهِ ما لا يَكونُ أبداً)[1] واتا: سوێند بەخودا ئەوە خراپترین پێشنیازە کە بۆ منی دەکەن، ئێوە کوڕەکەتان دەدەن بەمن بۆتان بەخێو بکەم، منیش کوڕەکەی خۆمتان بدەمێ بۆ ئەوەی بیکوژن؟! سوێند بە خودا ئەوە هەرگیز نابێت.

جانەجارە بۆ کوشتنی پێغەمبەرﷺ ڕاوێژیان بە أبوطالب کرد، بەڵام دوای ئەوەی أبوطالب وەفاتی کرد، ئەو جار ڕاوێژیان بەکەس نەکرد و بڕیاریاندا لەهەر بنەماڵە و پاڵەوانێك دەست نیشان بکەن و بەیەك دەست لە پێغەمبەری خوداﷺ بدەن و شەهیدی ـ تیرۆری ـ بکەن، بەڵام خودای گەورە پێغەمبەرەکەیﷺ خۆی پاراست و چاوی کافرەکانی لە بینینی پێغەمبەرﷺ کوێر کرد، ئەمەش لە شەوی کۆچی پێغەمبەرﷺ و أبوبکری ڕاستگۆدارضي الله عنه ڕوویدا.

جا ئەی گەنجی خۆشەویست موسڵمانی ئازیز: بزانە کە ئیسلام و موسڵمانان تیرۆرست نین بەڵکو ئیسلام و موسڵمانان بەردەوام تیرۆریان بەرامبەر کراوە، ئەوەتا زیاتر لە ١٤٣٤ساڵ لەمەو بەر هەوڵی تیرۆر کردنی پێغەمبەرﷺدراوە، ئینجا ئەو کەسەی لە دونیادا مافی پێشێل دەکرێت و ستەمی لێدەکرێـ هەر موسڵمانانن، ئەوەتا زیاتر لە ١٤٤٠ساڵ لەمەو بەر گەماروی ئابوری خراوەتە سەر موسڵمانان، لەبەر ئەوە تۆی موسڵمان بە قسەی باق و بریقی عەلمانی و جولەکە و

١ـ البداية والنهاية: ٣ـ٤/ ٤٩

گاورەکان هەڵمەخەڵەتیّ و حەق و ناحەقت لیّ تێکەڵ نەبێت، کاتێك ئەوان دەڵێن: ئیسلام تیرۆرستە، تۆش زۆر بە دڵنیای و متمانە بە خۆ بونەوە بڵیّ: ئێوە تیرۆرستن، ئێوەن پێشلکاری مافی موسڵمانان، پێیان بڵیّ: هیتلەر یەك ملیۆن خەڵکی کوشت، بەڵام چونکە مەسیحی بوو بۆ کەس پێی ناڵێت تیرۆرست؟ ستالین بیست ملیۆن کەسی کوشت" بۆ پێی ناڵین تیرۆرست؟! مۆسۆلین چوار سەد هەزار کەسی کوشت" بۆ کەس پێی ناڵێت تیرۆرست؟! ئەمریکا شاری هێرۆشیمای بە چەکی نەوەوی کولاَند و خەڵکەکەی کوشت" بۆ کەس پێی ناڵێت تیرۆرست؟! ئیسرائیل ڕۆژانە دەیان کەس لە موسڵمانانی فەلەستین تیرۆر دەکات بۆ کەس پێی ناڵێت تیرۆرست؟! لە بۆرما موسڵمانان بە دڕیل پشتیان کون دەکرێت، بە زیندویی دەسوتێندرێن، بۆ کەس پێیان ناڵێت تیرۆرست؟! بەڵیّ و سەد جار بەڵیّ ئێوەی عەلمانی و جولەکە و گاور تیرۆرستن نەوەك ئێمەی موسڵمان و دینە ئاشتیەکەمان.

جا ئەمەی ڕابرا چەند نمونەیەکی زۆر کەم بوو لە ئازاردان و ئەشکەنجەی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ، ئێستاش دەچینە سەر باسی ئازارو ئەشکەنجەی هاوەڵان بە دەستی بێباوەڕانەوە:

## دووەم/ ئازار و ئەشکەنجەی هاوەڵان رضي الله عنهم:

بێباوەڕە هاوبەش دانەرەکانی قوڕەیش بەچەندین شێوەی ئازاری ئەو کەسانەیان دەدا کە دەهاتنە ناو دینی ئیسلامەوە، ئەمەش بۆ ئەوەی: یەکەم/ کەس نەوێرێت ببێتە موسڵمان. دووەمیش/ بۆ ئەوەی بەڵکو ئەوانەی موسڵمان بوون پەشیمان ببنەوە، جا ئەوەی خوارەوە چەند شێوەیەکە لە شێوازەکانی ئازاردانی موسڵمانان بە دەستی کافرانەوە، وە هەر یەکەی نمونەیەکیشی لێباس دەکەین:

١ـ ئازاردانی لاشە: بێباوەڕو هاوبەش دانەرەکان هیچ کات دەستیان نەدەپاراست لە ئازاردانی لاشەیی هاوەڵە بەڕێزەکان، لەبەر ئەوە مێژووی ئیسلام پڕیەتی لە گیان فیدایی و خـــۆ

بەخت کردنی هاوەڵان ئێمە لێرەدا تەنها دوو نمونە باس دەکەین:

یەکەم/ خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێت: کاتێك ژمارەی موسڵمانان گەیشتە نزیکەی سی و شەش کەس، أبوبکری صدیق رضي الله عنه تۆبزی لە پێغەمبەری خوداﷺ کرد بەوەی ئاینەکەیان ئاشکرا بکەن، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (یا أبا بكر إنا قَلیلٌ)واتا: ئەی أبابکر ئێمە ژمارەمان کەمە، بەڵام ئەبوبەکری ڕاستگۆ رضي الله عنه هەر سور بو لەسەر داواکاریەکەی، هەتا پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگای پێدان بە ئاشکرا کردنی ئاینەکەیان، جا موسڵمانان بە قوڕنەکانی مزگەوتدا بڵاو بوونەوە، ئەبوبەکری ڕاستگۆش رضي الله عنه لە مزگەوتی حەڕامدا هەستاو قسەی بۆ قوڕەیشیەکان کردوو بانگەوازی کردن بۆ لای خودا و پێغەمبەرەکەیﷺ، کافرەکان کاتێك گوێیان لەو قسانەی ئەبوبەکر بوو، زۆر تووڕە بوون و هەستان زۆر بە توندی دەستیان کرد بە لێدانی ئەبوبەکر رضي الله عنه و موسڵمانەکانی تر، وە بەتایبەت عەتەبەی کوڕی ڕەبیعە لە ئەبوبەکر رضي الله عنه نزیکبۆوە و خۆی هەڵدایە سەر زگی ئەبوبەکر و بە نەعلەکانی کە زبرو گرێیاوی بوون دەستی کرد بە لێدان لە دەم و چاوی، تا ئەوەندەی لێدا دەم و چاو و لوتی لێك جیا نەدەکرانەوە، هەتا نەوەی تەمیم هاتن و ئەبوبەکریان رضي الله عنه لە چنگی ئەوان دەرهێناو بە عەباکەی خۆی پێچایان و بردیانەوە بۆ ماڵەوە، وە دڵنیا بوون لەوەی کە دەمرێت، پاشان نەوەی تمیم هاتنەوە بۆ کەعبەو بە کافرەکانیان گووت: سوێند بە خودا ئەبوبەکر بمرێت" ئێمەش عەتەبەی کوڕی ڕەبیعە دەکوژین، دواتر گەڕانەوە بۆ لای ئەبوبەکر و هەر بانگیان دەکرد، هەتا لە دەمەو ئێوارە بەهۆش خۆی هاتەوە، وە یەکەم قسە کە کردی فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ چی لێ بەسەر هاتووە!! ـ سبحان الله!! لەم خۆشەویستی و باوەڕە، خەمی ئەم هەموو ئازارەی خۆی نیە، بەڵکو خەمی پێغەمبەریەتیﷺ!!ـ جا قەومەکەی کاتێك گوێیان لەم قسەی بوو سەرزەنشتیان کرد و لە لای دایکی بەجێیانهێشت، ئینجا ئەبوبەکر رضي الله عنه پرسیاری لە دایکی کرد کە ئایا پێغەمبەرﷺچی لێ بەسەرهاتووە؟دایکی گووتی:

ـسوێند بە خودا نازانم، بەڵام هەر سور بوو لەسەر ئەوەی دەبێت کە هەواڵی پێغەمبەرﷺ بزانێت، ئەبەر ئەوە فەرمووی: برۆ بۆ لای(أم جمیل)ی کچی خەتتاب و هەواڵی پێغەمبەریﷺ لێ بپرسە، دایکیشی هاتە لای (أم جمیل) و پێی گووت: ئەبوبەکر هەواڵی محمد دەپرسێت، ئەویش گووتی: من نە ئەبوبەکرو نە محمد ناناسم، بەڵام ئەگەر حەز دەکەی ئەوە لەگەڵت دێم بۆ لای ئەبوبەکر- ئەم قسەی بۆیە کرد چونکە متمانەی بە دایکی ئەبوبەکر نەبوو- جا ئوم جمیل لەگەڵیدا هات بۆ لای أبوبکر رضي الله عنه، کاتێك بینی أبوبکر چی لێ بەسەرهاتووە"هاواری لێ هەستاو فەرمووی: سوێند بە خودا هەر کەسێك ئاوای لە تۆ کردووە لە خودا یاخیە،داواکارم لە خودای گەورە تۆڵەی تۆی لێبکاتەوە، ئەبوبەکر رضي الله عنه فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ چۆنە؟ أم جمیل فەرمووی: ئاخر دایکت دانیشتووە، فەرمووی: ترست نەبێت لێی، فەرمووی: ساغ و سەلامەتە، فەرمووی: ئێستا لە کوێیە؟ فەرمووی: لە ماڵی ئەرقەمە، ئەبوبەکر رضي الله عنه فەرمووی: پەیمانی خودا بێت دەم نابەم بۆ خواردن و خواردنەوە هەتا نەمبەن بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، ئەوانیش خۆیان گرت هەتا ترپەی پێی خەڵك نەماو خەڵکی چونەوە ماڵەکانیان، ئینجا چونە ژێر باڵی و بردیان بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ، هەر کە بردیانە ژورەوە پێغەمبەرﷺو هاوەڵان باوەشیان پێدا کرد و ماچیان کرد، جا پێغەمبەرﷺ زۆر دڵی پێ سوتا، ئەبوبەکریش فەرمووی: بە دایك و باوکمەوە بە قوربانت بم من هیچم نیە تەنها جێی نەعلەکانی ئەم لە خودا یاخیە بە دەم و چاومەوە ئازاری هەیە، ئینجا فەرمووی: ئەمەش دایکمە زۆر چاکە لەگەڵمدا بانگەوازی بکە بۆ ئیسلام و دووعای خێریشی بۆ بکە، چونکە تۆ پیاوێکی پیرۆزیت، بەڵکو خودا هیدایەتی بدات و موسڵمان ببێت، پێغەمبەریشﷺ دووعای بۆ کرد و بانگێشتی کرد بۆ ئیسلام ئەویش موسڵمان بوو.[1]

---

١- خەلیفەی یەکەم ئەبوبەکری صدیق رضي الله عنه، دکتۆر محمد علی صلابی: ٤٣

٢ـ کوشتن: یەکێکی تر لە شێوەکانی ئازاردانی هاوەڵە بەڕێزەکان بریتی بوو لە کوشتن، ئەمەش تەنها لەبەر ئەوەی دەیانگووت: الله خودامانە و تاك و تەنهایە، وە جگە لەم ووتە ڕاستە هیچ تاوانێکیان نەبوو، سومەییە و یاسررضی الله عنهما دایك و باوکی عەممار بوون، هەر لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە موسڵمان بوون، کاتێك بەنی مەخزوم زانیان کە موسڵمان بوون، زۆر بەشێوەیەکی دڕندانە ئەشکەنجەیان دەدان، بەشێوەیەك کاتێك ڕۆژ گەرم دەبوو، دەیانهێنانە دەرەوە و لەبەر هەتاو و لەسەر ئەم لەی بیابان وەریان دەخستن و سك و پشتیان ئەودیو ئەودیو دەکردن، لەگەڵ ئەمەشدا ئەشکەنجەیەکی توندیان دەدان، پێغەمبەریشﷺبەلایاندا تێدەپەڕی و سکی پێیان دەسوتا، بەڵام هیچی پێنەدەکرا تەنها ئەوە نەبێت دەیفەرموو:(صبراً آل یاسر، موعدکم الجنة)[1]واتا: دان بە خۆتاندا بگرن ئەی ماڵی یاسر چونکە بێگومان جێگای ئێوە بەهەشتە. جا لەگەڵ ئەم هەموو ئەشکەنجە لاشەییەشدا ئەشکەنجەی دەرونیشیان دەدان، ئەبوجەهل(لعنه الله) هاتە لای سومەییە و پێی گووت: تۆ تەنها لەبەر ئەوە بڕوات بە محمد هێناوە چونکە عەشقی جوانیەکەی بوویت!! سومەییەش رضي الله عنها زۆر بە توندی وەڵامی دایەوە، ئەبو جەهلیش تووڕە بوو نێزەیەکی لە سومەییە داو شەهیدی کرد، جا سومەییە رضي الله عنها بو بەیەکەم شەهیدی ئیسلام، وە هەرچی یاسری مێردیشی بوو، پاش ماوەیەك لە ژێر ئەشکەنجەی کافرەکاندا گیانی دەرچو و شەهید بوو.[2]

٣ـ هەڕەشە لێکردن بە کوشتن ئەگەر جوێن و قسەی ناشیاو بە پێغەمبەرﷺ نەڵێن: جۆرێکی تر لە جۆرەکانی ئازاردانی هاوەڵەکان لە لایەن بێباوەڕانەوە بریتی بوو لەوەی کە بێچاریان دەکردن بەوەی دەبێت جوێن بە خودا و پێغەمبەرﷺ بڵێن و زەمی ئاینی پیرۆزی

---

١ـ پێشەوا ابن اسحاق گێراویەتەوە (صحیح)

٢ـ البدایه والنهایه: ٣/٦٠

ئیسلام بکەن، هەرچەندە زۆرینەی هەرە زۆری هاوەڵەکان لە ژێر ئەشکەنجەدا خۆیان دەگرت و هیچیان نە دەگووت، بەڵام بە هۆی توندی سزا و ئەشکەنجەوە هەندێك بێچار دەبوون کە ئەم قسانە بکەن، لەوانە عەمماری کوڕی یاسر رضي الله عنهما، دوای ئەوەی بەبەر چاوی خۆیەوە دایك و باوکیان شەهید کردن، ئینجا کافرەکان هاتنە لای عەممار و دەستیان کرد بە ئەشکەنجەدانی بە ئاگر، پێغەمبەریشﷺ بەلایدا تێدەپەڕی و دەیفەرموو: (يا نارُ كوني بَرداً و سلاماً على عمار كَما كُنتِ على إبراهيمَ)[1] واتا: ئەی ئاگر ساردبە و سەلامەت بە لەسەر عەممار، هەروەك چۆن سارد و سەلامەت بووی لەسەر إبراهیم. جا ئەم ئەشکەنجەی عەممارﷺ بەردەوام بوو، هەتا بێچاریان کرد کە قسەی ناشیرن بە ئیسلام و پێغەمبەرﷺ بڵێت و باسی چاکەی بتەکانی کافرەکان بکات، جا پێغەمبەری خوداﷺ هات و پێی فەرمووی: (ما وراءكَ؟)واتا: چ هەواڵێکت لایە؟ فەرمووی: هەواڵی خراپ، سوێند بە خودا وازیان لێنەهێنام هەتا بە خراپ ناوم بردیت و بە چاك ناوی خواکانی ئەوانم برد، پێغەمبەرﷺ فەرمووی:(ما تَجِدُ قَلْبَك؟)واتا: ئەی دڵت چۆنە؟ گووتی: دڵم پڕە لە باوەڕ، فەرمووی: (فَإِنْ عادُوا عُد)[2] واتا: هەرکاتێك ئاوا ئەشکەنجەیان دایت" تۆش ئەم قسانە بکەوە.

٤ـ دەنگ وەرگرتن: دەنگ وەرگرتن یەکێکی تر بوو لە شێوازی ئەشکەنجەدانی هاوەڵان، سەعدی کوڕی أبی وەقاصﷺ دەفەرمووێت: من کەسێکی زۆر چاك بووم لەگەڵ دایکمدا، کاتێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات و منیش موسڵمان بووم، دایکم گووتی: ئەی سەعد تۆ ناڵێیت ئاینەکەمان فەرمانمان پێدەکات لەگەڵ دایکمان باش بین؟ منیش گووتم: بەڵێ، دایکیشم گووتی: دە بزانە یان دەبێت لە ئاینەکەت پاشگەز ببیتەوە، وە یان من هیچ ناخۆم و ناخۆمەوە هەتاکو

١ـ پێشەوا ابن سعد گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان حاکم و ابن سعد گێڕاویانەتەوە و بە صحیحان داناوە.

دەمرم، وە کاتێك خواردنێکیان بۆ دەهێنا ئەو دەمی پێکەوە دەنا و نەیدەخوارد، وەزۆر جار دەرونی ئەزیەت دەدام بەوەی بانگی دەکردم و دەیگووت: ئەی کوڕەری دایکی خۆت!! ئەمە تا چەند ڕۆژێك بەردەوام بوو، منیش ڕۆژێکیان گووتم: (يا أُمّاه لَو كانَتْ لَكِ مائة نَفسٍ فَخَرَجَتْ نَفساً نفساً ما تَرَكتُ دِيني هذا فَإنْ شئتِ فَكُلي وَإنْ شئتِ فَلا تَأكُلي فَلَمّا رَأتْ ذلكَ أكَلَتْ وَنَزَلَتْ:﴿وَإِنْ جَاهَدَاكَ لِتُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا﴾[2][3]واتا: ئەی دایکی خۆم بزانە ئەگەر سەد ڕوحت هەبێت، یەك بە یەك ڕوحەکانت دەر بچێت ئێستا من واز لە دینەکەم ناهێنم، جا ئەگەر پێت خۆشە نان بخۆ، وە ئەگەر حەزیش دەکەیت نان مەخۆ، جا کاتێك دایکم لە من دڵنیا بو دەستی کردەوە بە نان خواردن، وە خودای گەورەش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ئەگەر زۆریان لێکردیت بۆ ئەوەی هاوبەش دابنێیت بۆ من و تۆش زانیاریت دەربارەی نەبوو" ئەوە گوێڕایەڵیان مەکە.

٥ـ بەند کردن: یەکێکی تر لە شێوازەکانی ئازاردانی هاوەڵە بەڕێزەکان بریتی بوو لە بەندکردن و دەستگیر کردن، کاتێك بێباوەڕان دەیانزانی کە موسڵمانێك بە نیازی کۆچە بۆ مەدینە، ئەوە لە ماڵێکدا دەست بەسەریان دەکرد، وە بەتایبەت ئەوانەی لە ڕێگای کۆچدا دەگیران دەیانهێنانەوە بۆ مەککەو دەست بەسەریان دەکردن و ئەشکەنجەشیان دەدان، یەکێك لەو نمونانە أم سەلەمەرضی الله عنها بوو، دوای ئەوەی لەگەڵ مێردەکەیدا ابوسلمە ویستیان کۆچ بکەن بۆ مەدینە،خزمە بێباوەڕەکانی ام سلمە رضي الله عنها هاتن و گووتیان: بە هیچ شێوەیەك ڕێگا نادەین کچەکەمان لەگەڵ خۆت بەریت، وە کەس و کارە بێباوەڕەکانی ابو سلمەش رضي الله عنه گووتیان: ئێمەش ناهێڵین کە منداڵەکەت لەگەڵ خۆت بەریت، ئیتر ابو سلمە رضي الله عنه کۆچی کرد بۆ مەدینە،

---

٢ـ الجامع لأحكام القرآن : ١٣/ ٢٩١

٣ـ العنكبوت: ٨

ـ سلمەش رضی الله عنها هەتا یەك ساڵ لە ماڵی باوکیدا دەستبەسەر بوو و لە دوری مێرد و منداڵەکەی بە ئاهو حەسرەتەوە ژیانی بردە سەر و بەردەوام دەگریا، پاش ساڵێك ڕێگایان پێدا کۆچ بکات.[1]

٦ـ پچڕاندنی پەیوەندی خزمایەتی و سزای ئابوری و برسێتی و نەهامەتی: وەك ئەو سزا ئابوریەی کە باسمان کرد،کە لە ساڵی حەوتەمی پێغەمبەرایەتی خرایە سەر پێغەمبەرﷺ و هەوڵە بەرێزەکانی و خزمەکانی لە شیوی ابوطالب دا.

جا ئەمەی ڕابرا بەشێکی زۆر کەم بوو لە وێنەکانی ئەشکەنجەدانی پێغەمبەرﷺ هاوەڵان لە لایەن کافرەکانەوە، جا دوای ئەوەی کە ئەشکەنجەو ئازاری کافرەکان لەسەر موسڵمانان چڕ بۆوە، وە بە شێوەیەکی سەخت تر لە جاران بڕیاریان کردەوە لەوەی پێغەمبەرﷺشەهید بکەن، وە دوای ئەوەی کە پێغەمبەرﷺ بێ ئومێد بوو لەوەی کە خەڵکی مەککە باوەش ناکەنەوە بۆ ئیسلام، بە فەرمانی خودا پێغەمبەرﷺ ڕێگای دا کە موسڵمانان یەك یەك و دوو دوو کۆچ بکەن بۆ مەدینە، پاشان بۆخۆشی بە هاوڕێیەتی ابوبکری صدیق کۆچی کرد بۆ مەدینە و لەێ دەوڵەتێکی پڕ لە دادپەروەری و یەکسانی و ئازادی بۆ موسڵمانان بە تایبەتی و سەرجەم مرۆڤایەتی بەگشتی بنیات نا، کە هەتا ئێستاش سەرجەم جیهان سودمەندە لەم دەوڵەت و بنچینەکان و یاساو ڕێساکانی،

کەواتا: هۆکاری کۆچی پێغەمبەرﷺو هاوەڵان" بێباوەڕان بوون، ئەوان ڕێگایان نەدەدا کە هەرگیز بۆ چرکەیەکیش پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵان بە ئاسودەیی دابنیشین، ئەوان ڕێگایان نەدەدا کە ئەم ئاینە پیرۆزەی ئیسلام لە مەککەوە بەسەرجەم جیهان بگات و بەردەوام هەوڵی

---

١ـ پێشەوا ابو اسحاق گێڕاویەتەوە. بڕوانە : سیره النبویه لإبن هیشام:٢٩٧

کوژاندنەوەی نوری خودایان دەدا، نەیاندەزانی﴿وَاللَّهُ مُتِمُّ نُورِهِ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ﴾[1]

جا لێرەدا باسی ئێمە تەنها لەسەر کۆچی پێغەمبەرە ﷺ، لەبەر ئەوە تەنها باسی چەند موعجیزە و بەسەرهاتێك دەكەین لە ڕێگای کۆچی پێغەمبەر ﷺ لەگەڵ ابوبکر رضي الله عنه دا.

## کۆچی پێغەمبەر ﷺ بە هاوڕێیەتی ابوبکر رضي الله عنه بۆ مەدینە

دوای ئەوەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕێگای دا بە هاوەڵان کۆچ بکەن بۆ مەدینە، هاوەڵە بەڕێزەکان یەك یەك و دوو دوو و زیاتر دەستیان کرد بەکۆچ کردن بەرەو شاری مەدینە، جا وەك باسمان کرد بێباوەڕان زۆر هەڵیاندا ڕێگری بکەن لەم کۆچەی هاوەڵان بەڵام سەرکەوتوو نەبوون، هەتا وای لێهات زۆرینەی هاوەڵان کۆچیان کرد، بەشێوەیەك کۆڵانەکانی مەککە چۆڵیان پێوە دیاربوو، جا کاتێك بێباوەڕان سەرکەوتوو نەبون لە ڕێگری کۆچی هاوەڵان هەموو هێزێکی خۆیان چڕکردەوە لەسەر ڕێگری کردن لە کۆچکردنی پێغەمبەری خودا ﷺ لەبەر ئەوە پیلانێکیان داڕشت بۆ شەهید کردن و تیرۆر کردنی پێغەمبەر ﷺ بەڵام وەك باسمان کرد خودای پەروەردگار پێغەمبەرەکەی خۆی پاراست و چاوی پاڵەوانەکانی قورەیشی نابینا کرد، لەولاشەوە پێغەمبەری خودا ﷺ دەستی کرد بە خۆڕێکخستن و ئامادەسازی بۆ کۆچ کردن بۆ شاری مەدینەی نورانی.

خاتو عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: ڕۆژ نەبوو ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ سەردانی ماڵی ئێمە نەکات، یان بەبەیانیان دەهات وە یان بە ئێواران، بەڵام ئەو ڕۆژەی کە خودای گەورە مۆڵەتی کۆچکردنی پێدا لە نیوەڕۆدا هات، کاتێك ابوبکر رضي الله عنه پێغەمبەری ﷺ بینی فەرمووی: ئەگەر لەبەر ڕوداوێك نەبێت پێغەمبەر ﷺ لەو کاتەدا نەدەهات، خاتوو عائیشە دەفەرموێت: کاتێك پێغەمبەر ﷺ هاتە ژورەوە ابوبکر رضي الله عنه جێگاکەی خۆی بۆ چۆڵ کردو ئەویش ﷺ دانیشت، کەسیش لەوێ نەبوو تەنها من و ئەسمای خوشکم نەبێت، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: با کەس

ێرە نەمێنێت، ئەویش فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ تەنها دوو کچەکەم لێرەیە، چی بووە حایك و باوکمەوە بە قوربانت بم؟ فەرمووی: (إِنَّهُ قَد أُذنَ لِيَ في الخُرُجِ والهِجرةِ)واتا: رێگام دراوە بۆ دەرچون و کۆچ کردن،ابوبکریش رضي الله عنه فەرمووی: کەواتا مەبەستت هاورێیەتیمە لەو گەشتەدا؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی:بەڵێ. عائیشە دەفەرموێت: سوێند بە خودا پێش ئەو رۆژە کەسم نەبینیوە لەخۆشیاندا بگریەت" هەتا ئەو رۆژە ابوبکرم بینی، ئینجا ابوبکر رضي الله عنه فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دوو حوشتری بارهەڵگری باشم ئامادە کردووە بۆ ئەم رۆژە، ئەو حوشترانەش لای عبدالله ی کوڕی ئورەیقیت بوون، وە پاشان هەر ئەویش بوو بە چاوساغیا،

جا خاتو عائیشە دەفەرموێت: ئێمەش بەپەلە ترین شێوە ئامادەکاریمان بۆ کردن و نانمان بۆ خستنە ناو کیسەیەکەوە و ئەسمای خوشکیشم پارچەیەکلە پشتێنەکەی بڕی و سەری کیسەکەی پێبەست، لەبەر ئەوە ناونرا(ذات النطاقين)[1]

ئیتر پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمانی بە پێشەوا علی رضي الله عنه کرد کە لە جێگای ئەودا بخەوێت و پاشان دوای کۆچکردنی ئەو لە مەککە بمێنێتەوە و ئەو سپاردانەی لای بوون بیانگێڕێتەوە بۆ خاوەنەکانیان، پاشان ابوبکری صدیقیش رضي الله عنه ئەو پارەو پوڵەی هەیبوو کە پێنج هەزار دیرهەم بووهەمووی لەگەڵ خۆیدا بردی و پێغەمبەری خوداش ﷺ بەشەو لەماڵ دەرچوو و لەگەڵ ابوبکردا ڕوویانکردە ئەشکەوتی ثـــەور و سێ شەوان لەوێ مانەوە، پاشان کاتێك بەرەبەیان هات و پێغەمبەر لەماڵ نەهاتە دەرەوە ئەو پاڵەوانانەی کە لەبەر دەرگای ماڵی پێغەمبەر ﷺ بوون و چاودێری دەرچونیان دەکرد۔ چونکە وەك پێشتر باسمان کرد بێباوەڕان پیلانیان دانابوو لەهەر تیرەی پاڵەوانێك بنێرن بۆ شەهید کـردنی پێغەمبەر ﷺ۔ هێرشیان بردە سەر ماڵی پێغەمبـــەر

[1]- السيرة النبوية لإبن هيشام: ١-٤/٣٠٨-٣١٠

ﷺ، بەڵام بنیان کە ئەوە عەلیە لە جێگای پێغەمبەرﷺ خەوتووە، ئەوکات بۆیان دەرکەوت کە پێغەمبەرﷺکۆچی کردووە، ئەو هەواڵە بەشاردا بڵاوبویەوە، بێباوەڕانیش بڕیاریاندا هەرکەسێك محمد و ابوبکر بەزیندوویی یان بەمردویی بگێڕێتەوە بۆ مەککە ئەوە سەد حوشتری وەکو دەستخۆشانەو دیاری پێدەدەن!!

## خۆشەویستی نیشتمان لای پێغەمبەرﷺ

کاتێك پێغەمبەری خوداﷺبەڕێکەوت بۆ کۆچ لە بازاڕی حەزوەر ڕوی کردە مەککەو بە دڵێکی پڕ لەخەمەوە خۆشەویستی خۆی بۆ ئەوخاکەپیرۆزو خۆشەویستە دەربڕی، عبدالله ی کوڕی عەدی کوڕی حمرائی زوهریرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُدەفەرمووێت: پێغەمبەری خودامﷺ بینی لە بازاڕی حەزوەر ڕاوەستابوو و دەیفەرموو: (واللهِ إنّكِ لَخَيرُ أرضِ اللهِ،وَ أَحَبُّ أرضِ الله إلي اللهِ، ولَولا أنّي أُخرِجتُ مِنكِ ما خَرَجتُ)[1] واتا: سوێند بەخودا ئەی مەککە تۆ باشترین خاك و زەوی خودای، وە خۆشەویستترین زەوی خودای لای خودا،وە ئەگەر منیان دەرنەکردبا هەرگیز جێم نەدەهێشتی!

## دڵسۆزی ابوبکررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ بۆ پێغەمبەرﷺ

کاتێك پێغەمبەرﷺو ابوبکررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُلە مەککە دەرچوون، ابوبکررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُماوەیەك لە پێش پێغەمبەروە دەڕۆیشت، ماوەیەك لە دواوە، هەندێك جار لە لای ڕاستی هەندێك جاریش لەلای چەپی، پێغەمبەری خوداﷺ لێی پرسی: ئەی ابوبکر بۆ ئاوا دەڕۆی؟ ئەویش فەرمووی: هەندێك جار بیردەکەمەوە دەڵێم: ڕەنگە بێباوەڕان لە پێشەوە بۆمان دانیشتبن، هەندێك جار دەڵێم ڕەنگە بەدوامانەوە بن، هەندێك جاریش دەڵێم ڕەنگە لەلای ڕاست یان چەپەوە هێرشمان بۆ بێنن، لەبەر ئەوە ئاوا دەڕۆم، پێغەمبەرﷺفەرمووی: کەواتا: دەتهەوێ ئەگەر شتێك ببێ لە جیاتی من بۆتۆ

---

١ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوەو دەفەرمووێت: حديث حسن غريب صحيح.

بێت؟ ابوبکریش فەرمووی: ئەرێ سوێندم بەوخودایەی تۆی بەڕاستی ناردووە.

ئینجاکاتێك گەیشتنە نزیکی ئەشکەوتەکە، پێشەوا ابوبکر فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ چاوەڕێ بکە هەتا من دەچمە ژوورەوە و دەیپشکنم نەوەك و دڕندەیەکی تێدا بێت و ئازاری تۆ بدات.[1]

وە کاتێك چونە ناو ئەشکەوت و بێباوەڕانیش هاتنە بەردەمی ئەشکەوتەکە پێشەوا ابوبکر خەمی پێغەمبەری ﷺ لێنیشتوو خەمی ئەوەی بوو کە بێباوەڕان پێغەمبەر ﷺ بدۆزنەوە و ئازاری بدەن، لەبەر ئەوە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ خۆ ئەگەر بێت و یەکێکیان سەیری بن پێکانی خۆی بکات ئێمە دەبینن، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ﴿لَا تَحْزَنْ إِنَّ اللَّهَ مَعَنَا﴾[2] واتا: دلگران و خەمبار مەبە چونکە بێگومان ئێمە خودامان لەگەڵدایە.

جا لێرەدا پێغەمبەری خودا ﷺ نەیفەرموو:(لاتخف)واتا: مەترسە،بەڵکو فەرمووی: ﴿لَاتَحْزَنْ﴾ واتا: دلگران و خەمبار مەبە. ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه نەترساوە بەڵکو خەمباری پێغەمبەر ﷺ بووە.

پاشان کاتێك لە ئەشکەوتەکە دەرچون و عبدالله ی کوڕی ئورەیقیت دوو حوشترەکانی ابوبکری هێنان، پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه کام حوشترەیان باشتر بوو ئەویانی دا بە پێغەمبەری خودا، بەڵام پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: من سواری وڵاخێك نابم کە هی خۆم نەبێت، پێشەوا ابوبکریش رضي الله عنه فەرمووی: بەدایکم و باوکمەوە بە قوربانت بم ئەوە هی خۆتە،بەڵام پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: نەخێر ئاوا وەریناگرم، بەڵکو پێم بڵێ بەچەند کڕیوتە، ئەویش فەرمووی: بەوەندەو

١ـ السيرة النبوية لإبن هيشام: ١ـ٤/٣١٠

٢ـ التوبة: ٤٠

بەوەندە کڕیومە، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئەوە بەو نرخە قبوڵم کرد.[1]

جا ئەو مەوقیفانەی پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه هەموویان دڵسۆزی و خۆشەویستی زۆری پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه دەردەخەن بۆ پێغەمبەری خودا ﷺ.

# چەند موعجیزەیەك لە ڕێگای کۆچدا

لە ڕێگای کۆچدا خودای پەروەردگار چەند موعجیزەیەکی گەورەی بەپێغەمبەرەکەی خۆی دا، کە دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ کاتێك بێباوەڕان نزیکبونەوە لەو ئەشکەوتەی کە پێغەمبەر ﷺ و پێشەوا ابوبکری رضي الله عنه تێدا بوون، ویستیان بچنە ژوورەوەو سەیری ئەشکەوتەکە بکەن، بەڵام بەفەرمانی خودا جاڵجاڵۆکەیەك هات و لەبەر دەرگای ئەشکەوتەکە تەونی کرد، ئەمەش بوو بە پارێزگارێك باش لە پێغەمبەرو پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه، چونکە کاتێك بێباوەڕان سەیریان کرد کە جاڵجاڵۆکە لەبەردەم دەرگای ئەشکەوتەکە تەونی کردووە گوتیان: بابڕۆین چونکە ئەو ئەشکەوتە زۆر دەمێکە کەسی نەچۆتە ناو، ئەگەرنا" ئەو تەونی جاڵجاڵۆکەیە خراپ دەبوو، خودای گەورە دەربارەی پارێزگاری ئەو جاڵجاڵۆکەیە دەفەرموێت: ﴿وَأَيَّدَهُ بِجُنُودٍ لَّمْ تَرَوْهَا﴾[1][2]

جا ئەمەش سوننەتی خودایە لەسەر زەوی" هەرکەسێك کێبەرکێی خودای گەورەو پێغەمبەرو ئاینەکەی بکات ئەو خودای گەورە بە سەربازێکی زۆر بچکۆلانەی خۆی لەناوی دەبات، بۆنمونە: نەمرود دەیگووت: من خودام!! نعوذ بالله! بەڵام خودای گەورە بە سەربازێکی زۆر بچوکی خۆی

١ـ السيرة النبوية لإبن هيشام: ١ـ٤/٣١٠

٢ـ التوبة: ٤٠

٣ـ پێشەوا احمد بسەنەدێکی(حسن) گێڕاویەتەوە.

لەناوی برد کەمێشولە بوو،ئەبرەهە بە سوپایەکی گەورەوە هات بۆ ئەوەی ماڵی خودا بڕوخێنێت، بەڵام خودای گەورە بە باڵندەیەکی بچوک کە(طیرالأبابیل) بوو سوپایەکەی لەناو برد. بەهەمان شێوە بێباوەڕانی مەککەش هاتبون بۆ ئەوەی پێغەمبەری خوداﷺ تیرۆر بکەن، بەڵام خودای پەروەردگار یەکێك لە لاوازترین بونەوەرەکانی خۆی کرد بە پارێزەری پێغەمبەرەکەیﷺ کە جاڵجاڵۆکەیە! پاك و بێگەردی بۆ خودای بەتواناو دەسەڵات!

٢ـ سوڕاقە یەکێك بوو لەو کەسانەی کە شوێن پێغەمبەرﷺو پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه کەوتبوو، بۆ ئەوەی بیاندۆزێتەوە و سەد حوشترەکە بەدەستبهێنێت، بەڵام کاتێك لە پێغەمبەریﷺ خودا نزیك بۆوە خودای گەورە موعجیزەیەکی گەورەی نیشاندا، سوڕاقەی کوڕی مالك بۆخۆی بۆمان دەگێڕێتەوە و دەڵێت: ڕۆژێکیان لە دانیشتگای (بنی مدلج) دانیشتبووم، پیاوێك هاتە لامان و گووتی: چەند کەسێکم بینی بەکاناری دەریادا تێپەڕین، وابزانم محمد و هاوڕێکانی بوون، سوڕاقە دەڵێت: دەمزانی ئەوانن" بەڵام بۆ ئەوە دیاریەکەی قورەیش بۆخۆم بێت لەبەر ئەوە گووتم: نا ئەوان نین" بەڵکو فلان و فلانن، پاشان کەمێك لە دانیشتگاکە مامەوەو چومەوە ماڵەوە، بەکچەکەم گوت: ئەسپەکەم بۆ ئامادە بکەو بۆم ببە بۆ سەر ڕێگا، پاشان خۆشم ڕمبەکەم هەڵگرت و بە پەنهانی بەپشت ماڵەکەماندا بەپەلە و غاردان ڕۆیشتم هەتا لە پێغەمبەر و هاوڕێکەی نزیك بومەوە، جا کاتێك لێیان نزیکبومەوە یەکسەر ئەسپەکەم خلیسکی برد و منیش کەوتم، پاشان هەڵستامەوە، دەستم برد بۆ تیرەکانم بۆ ئەوەی تیرو پشك بکەم ئاخۆ ئازاریان بدەم و شوێنیان بکەوم یان نا؟ دەستم برد بۆتیرەکان ئەوەیان دەرچوو کە لێی نوسرابوو ئازاریان مەدەو شوێنیان مەکەوە، بەڵام من گوێم پێنەدا و سواری ئەسپەکەم بومەوە و شوێنیان کەوتم هەتا ئەوەندە لێیان نزیکبومەوە گوێ ملە قورئان خوێندنی پێغەمبەرﷺبوو بەڵام ئەوﷺ هەر ئاوڕیشی نەدایەوە، دیسان ئەسپەکەم بەزەویدا کەوتو هەتا بن زگی بەزەویدا چۆ خوارەوە،

منیش لەئەسپەکەم خوڕیەوە و دیسان تیروپشکم کردەوە، هەر ئەوەیان دەرچوو کە لێی نوسرابوو شوێنیان مەکەوە و ئازاریان مەدە، بەڵام من گوێم پێنەداو وەك جاری پێشوو شوێنیان کەوتمەوە، دیسان ئەسپەکەم کەوتەوە بە زەویدا، ئەمجارەیان کە هەڵمساندەوە تۆزێکی وەکو دووکەڵ لەبن قاچەکانی بەرز بۆوە، جا کاتێك ئەوەم بینی بۆم دەرکەوت کە لە هێرشەکەم سەرکەوتو نابم" لەبەر ئەوە بانگم کردن و گووتم: من سراقەی موری جوعشم چاوەڕێم بکەن دەمهەوێت قسەتان لەگەڵدا بکەم، سوێند بەخودا دڵنیابن هیچ ئازارێکتان پێناگەیەنم، پێغەمبەر بە ابوبکری فەرموو: بزانە ئەوە چی دەوێت؟ ابوبکریش ئەوەی پێگووتم، منیش گووتم دەمهەوێت نوسراوێکی دڵنیاییم پێبدات، ئەویش فەرمووی: ئەی ابوبکر بۆی بنوسە.[1]

جا کاتێك سوراقە گەڕایەوە پێغەمبەری خودا ﷺ پێی فەرموو: (کَیفَ بِكَ إذا لبستَ سوار کسری؟!)واتا: ئایا پێت چۆنە ئەگەر هەردووك بازنەکانی کیسرا لەدەست بکەیت؟! بەڵێ ڕۆژگار ڕۆیی هەتا سەردەمی پێشەوا عمر هات، کاتێك موسڵمانان دەوڵەتی ساسانیان ڕوخاند، تاج و بازنەکانی کیسرایان هێنا بۆ پێشەوا عمر، ئەویش فەرمووی: بۆم بانگی سوراقە بکەن، سوراقە هات و پێشەوا عمەریش بازنەکانی کیسرا کردە دەستی و فەرمووی: (الله أکبر) سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەمانەی لە کیسرا وەرگرتەوە لەکاتێکدا دەیگووت: من خودای خەڵکیم، پاشان سوراقەی سواری وڵاخێك کرد و بەناو مەدینەدا سوڕایەوە بۆ ئەوەی هەموو خەڵکی مەدینە ئەو موعجیزەیەی پێغەمبەر ﷺ ببینن.[2]

جا ئەم بەسەرهاتەی سوراقە دوو موعجیزەی گەورەی تێدا بوو، یەکەمیان/ کە هەرجارێك لە پێغەمبەر ﷺ نزیکدەبۆوە ئەسپەکـــەی بەزەویدا ڕۆدەچوو!! دووەمیان/ کە پێغەمبەری خودا ﷺ

١ـ السیرة النبویة لإبن هشام/ ١ـ٤/ ٣١١ـ٣١٢

٢ـ ژیانامەی پێغەمبەر ﷺ، محمد علی صلابی: ١/٤٠٣ـ٤٠٤

پەیمانی بازنەكانی كیسرای پێداو پەیمانەكەشی هاتە جێ. والحمد لله.

٣ـ ڕەشماڵی ئوم مەعبەدومو‌عجیزەیەكی تر: لەڕێگادا پێغەمبەرﷺو پێشەوا ابوبكر رضي الله عنه لە جێگایەك كە پێی دەگوترێت (قودەید) بەلای ڕەشماڵی ئوم مەعبەددا تێپەڕین، لەوێ لایانداو داوای گۆشت و شیریان لێكرد بۆ ئەوەی لێی بكڕن، بەڵام لەبەر ئەوەی ساڵەكە نەهاتی و بێبارانی بوو" گووتی: سوێند بەخودا ئەگەر هیچمان هەبوایە پێویستی بەكڕین نەدەكرد، پێغەمبەرﷺ سەیری كرد مەڕێك لە تەنیش ڕەشماڵەكەیە،فەرمووی:ئەی ئوم مەعبەد ئەوە مەڕە چییە؟ ئەویش گووتی: لەبەر لاوازی و بێهێزی لە مێگەل دواكەوتووە و نەگەیوەتە لەوەڕگا، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئایا شیری تێدایە؟ ئەویش گووتی: ئەو مەڕە زۆر لەوە لاوازترە كە شیری تێدا بێت، پێغەمبەرﷺفەرمووی: (أتأذنِينَ لي أن أحلِبها؟)واتا: ئایا ڕێگام دەدەی بیدۆشم؟ گووتی: ئەگەر شیری تێدایە بیدۆشە! پێغەمبەریشﷺ چو بۆلای مەڕەكەو دەستێكی پێدا هێناو(بسم الله)كرد، پاشان دەستێكی بە گوانەكانیدا هێناو (بسم الله كرد) بەفەرمانی خودا گوانەكانی پڕبون لەشیر، و داوایكرد كە تەشتێكی گەورەی بۆ بهێنن، تەشتێكی گەورەیان بۆ هێنا ئەویش دۆشی هەتا لەسەریەوە ڕژا، دای بە ئوم مەعبەدو هاوەڵەكانی هەتا تێر لێیان خواردەوە پاشان بۆخۆشی لێی خواردەوە، پاشان بۆیان هێنایەوە و جارێكیتریش مەڕەكەی دۆشیەوە و تەشتەكەی بە پڕی بۆ بەجێهێشتن و لەوێ بەڕێكەوتن، زۆری پێنەچوو ابومەعبەد هاتەوە كە شیری لەماڵەوە بینی پێی سەیر بوو، بە ئوم مەعبەدی گووت: ئەو شیرەت لەكوێ بووە" لەكاتێكدا ئەو مەڕەی لات بەجێماوە ئاوس نیە و شیری تێنیە؟! ئوم مەعبەدیش گووتی: پیاوێكی زۆر پیرۆز بەلاماندا تێپەڕی بەبەرەكەتی ئەو ئەو شیرەمان پەیدابووە، ابومعبد گووتی: بۆم باس بكە ئەو پیاوە چۆن بوو، سوێند بەخودا واگومان دەبەم ئەو پیاوە بوبێت كە قوڕەیشیەكان بەدوایدا دەگەڕێن، ئوم مەعبەدیش گووتی: پیاوێك بوو جوانیەكی دیار و ئاشكرای هەبوو، ڕومەتی دەدرەوشایەوە،

ڕەوشتی جوان بوو، لاواز نەبوو، گلێنەی چاوی زۆر ڕەش بوو لەناو سپیێنەی چاویدا، برژانگەکانی درێژ بوو، دەنگێکی نەرم و نیانی هەبوو، ڕیشی پڕ بوو، برۆیەکانی درێژو باریك بوو،کاتێك بێدەنگ دەبێت شکۆدارە،وە کاتێك قسە دەکات"سەری بەرزدەکاتەوە و دەدرەوشێتەوە لە دورەوە،وەقسەکانی خۆشەو شیرینە،وەجوانترین و ڕێکوپێکترین کەسە لەدورەوە و لە نزیکەوە، وە چلێکە لەناو دوو چڵ داردا وە لەهەموشیان جوانترە، هاوەڵی هەیە و دەوریان داوە، کە قسە دەکات گوێی بۆ دەگرن، کە فەرمان دەکات بەپەلە بۆی جێبەجێ دەکەن، خەڵکی بەدەورەوەیەو خزمەتی دەکەن، نەمۆنەو نە نەزانە!! ابومەعبەد گووتی: سوێند بەخودا ئەوە ئەو پیاوەیە کە قورەیش بەشوێنیدا دەگەڕێن، ئەگەر پێی بگەم بڕوای پێدێنم و دەبمە هاوەڵی، وە هەوڵیش دەدەم پێی بگەم، عبدالملك ی کوڕی وەهەب دەفەرمووێت: پاشان ام مەعبەدو بەشێك لە بنەماڵەکەی کۆچیان کرد بۆ لای پێغەمبەرﷺو بڕوایان پێهێناو موسڵمان بوون.[١]

## پێغەمبەری خوداﷺ گەیشتە قوباء لەوێشەوە بۆ مەدینە

کاتێك باوەڕدارانی مەدینە بیستیان کە پێغەمبەرﷺلە مەککەوە بەڕێکەوتووە بەرەو مەدینە بۆ ماوەی چەند ڕۆژێك ڕۆژانە دوای نوێژی بەیانی لە ماڵەوە دەهاتنە دەرەوە و هەتا گەرمایی خۆر ئازاری دەدان چاوەڕێی پێغەمبەریانﷺ دەکرد، پاشان دەگەڕانەوە ماڵەوە، هەتا ڕۆژێکیان دوای ئەوەی لەبەر گەرمایی خۆر گەڕانەوە بۆ ماڵەوە، جولەکەیەك لەسەر قەڵایەی خۆیانەوە لە دورەوە پێغەمبەری خوداﷺو هاوڕێکانی بینی کە پۆشاکی سپیان لەبەردابوو، لەبەر ئەوە خۆی بۆ نەگیراو هاواری کردو گووتی: هۆ گەلی عەرەب ئەوە تەخت و بەختی ئێوەیە کە چاوەڕێی دەکەن، جا کاتێك گوێیان لەو بانگەوازە بوو زیاتر لە پێنج سەد کەس بەچەکی خۆیانەوە هاتنە پێشوازی پێغەمبەرﷺلە لای بەردە ڕەشەکانی ڕۆژئاوا گەیشتنە پێغەمبەرﷺ، جا موسڵمانان شوێنیان کەوتن وایانزانی دەچێتە ناو مەدینە، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ بەلای ڕاستدا لایداو

چو بۆ قوباء، لەوێ موسڵمانەکان دەستە دەستە دەهاتن بەخێرهاتنی پێغەمبەری خودایانﷺ دەکرد، بەڵام ئەوانەی پێشتر پێغەمبەریانﷺ نەدیبوو ڕویان دەکردە پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه چونکە ئەو ڕیشی سپی بوو، بەڵام پێغەمبەرﷺ ڕیشی ڕەش بوو، وایاندەزانی کە ئەوە پێغەمبەرە، بەڵام کاتێك خۆر گەرم بوو پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه بە پەشتەماڵەکەی سێبەری بۆ پێغەمبەرﷺ کرد، ئینجا زانیان کە ئەوە پێغەمبەرەﷺ، جا پێغەمبەری خوداﷺ دەشەوان لە قوباء مایەوە و لەوێ مزگەوتی(التقوی)ی دروستکرد،پاشان کاتێك ویستی بچێت بۆناو مەدینە لەدوای ئەنصاریەکانی نارد و ئەوانیش هاتن بۆ پێشوازی پێغەمبەرﷺ و پێشەوا ابوبکرو سلاویان لێکردن و پاشان بەسواری و بە پیادە لەخزمەتی پێغەمبەردا چونە ناو مەدینەوە، جا کاتێك خەڵکی هەواڵی گەیشتنی پێغەمبەریانﷺ بیست هەموویان بەدەم خۆشیەوە دەیانگووت: پێغەمبەری خودا هات، پێغەمبەری خودا هات، وە هەندێکی تریان دەیانگووت: (یا محمد، یارسول الله) وە هەندێکیان بەدەفەوە ئەم شیعرانەیان دەگووت: [1]

طَلعَ البَدرُ عَلَينا من ثنيّاتِ الـوداع وَجبَ الشُكـرُ عَلينا ما دَعا لِله داعْ

أيُّها المبعوثُ فِينا جِئتَ بالأمرِ المطاع جِئتَ شَرَّفتَ المَدينة مَرحَباً يا خيرَ داعْ[2]

ئیتر ئەو ڕۆژە ڕۆژێك بوو هیچ ڕۆژێك ئەو خۆشیەی بەخۆیەوە نەدیەوە، هیچ کەسێك ناتوانێت باسی خۆشی و شادی خەڵکی مەدینە بکات، بەشێوەیەك ئەنەسی کوڕی مالك ر دەفەرموێت: (شَهِدتُ يَومَ دخَلَ النَبيُ المَدِينَةَ فَلَم أرَ يوماً أحسَنَ ولا أضوأ مِنهُ، وفي رواية: أضاءَ مِنها كلُّ شيءٍ)[3] واتا:ئەوڕۆژەی کە پێغەمبەرﷺ هاتە مەدینە من لەوێ ئامادە بوو،هیچ ڕۆژێکم نەبینیوە

١ـ بروانە بۆ: البدایە واالنهایە: ٣ـ٤/ ١٩٨.وە ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار:١٦٢.وە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ:٤٠٤ـ٤٠٥

٢ـ پێشەوایان احمد و البیهقی گێراویانەتەوە.

٣ـ پێشەوایان حاکم و البیهقی گێراویانەتەوە.

جوانتر و درەوشاوەتر بێت لەو ڕۆژە، بەشێوەیەك ئەو ڕۆژە هەموو شتێك تیشكی دەدایەوە و دەدرەوشایەوە.

جا لەوێوە ڕۆژەکانی سەرکەوتنی ئیسلام و ئاسودەیی پێغەمبەر ﷺ دەستی پێکرد، وە لەوێ پێغەمبەری خودا ﷺ دەوڵەتێکی پڕ لە دادگەری و ئازادی و یەکسانی بەبەشداری سەرجەم موسڵمانان پێکهێنا و ئیتر لەمەودوا ئیسلام بوو بەخاوەنی خاك و دەوڵەت، پێغەمبەری خودا ﷺ ئەنصارو مهاجری کرد بە برا، ئەوس و خەزرەجی ئاشتکردەوە، دەستوری دانا، مزگەوتی دروستکرد بۆ جێی ژوانی باوەڕداران هەم لەگەڵ خودا و هەم لەگەڵ خۆیان،مرۆڤانێکی پەروەردەکرد لەسەر یەك دڵ و دەرون لەچەند لاشەیەکدا، بەشێوەیەك بەدرێژایی مێژووی مرۆڤایەتی مرۆڤ کۆمەڵگایەکی نەبینوە وەکو کۆمەڵگای مەدینە دەست پاك و داوێن پاك و دەم پاك و بێوەی و ئارام و ئاسایش و پڕ دادگەری و یەکسانی و بێ دەمارگیری و خۆ بەزلزانی و بێ ڕق و کینەو دڵ پیسی و پڕ لە خۆشەویستی و دڵسۆزی و بەسۆزی....هتد، چەندە دەنوسی بنوسە چەندە دەدوێی بدۆێ چەندە دەبیستی ببیستە هێشتا مەدحی کۆمەڵگای مەدینەو دەوڵەتەکەی پێغەمبەر ﷺ تەواو نابێت!!

# چۆن بەشداری کۆچ بکەین؟

بێگومان ئێستا هەمومان حەزدەکەین کە لە خزمەتی پێغەمبەردا ﷺ و لەگەڵ هاوەڵە بەڕێزەکاندا کۆچمان کردبا بۆ مەدینە، بۆ ئەوەی لەم هەموو خێرو پاداشتە گەورەیە بەشدار بوباین کە پێغەمبەر ﷺ هاوەڵان بەهۆی کۆچەوە بەدەستیان هێنا، بەڵام سوپاس بۆخودا هەر موسڵمانێك حەز بکات دەتوانێت بەشداری کۆچ بکات و لەم خێرو چاکانەدا بەشداربێت، ئەوەش بەوە دەکرێت کە شوێن ڕێنماییەکانی پێغەمبەر ﷺ بکەوین بۆ بەدەست هێنانی ئەم خێر و

چاکانە، پێغەمبەری خوداﷺ لە چەندین فەرموودەدا ئاماژەی بەوە کردووە کە ئێستاش خێری کۆچ هەر بەردەوامە، لەو فەرموودانە:

١ـ عبداللە ی کوڕی عەمر رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: (وَالْمُهَاجِرُ مَنْ هَجَرَ مَا نَهَى اللَّهُ عَنْهُ)[1] واتا: کۆچکار ئەو کەسەیە کە کۆچ دەکات لەو کردەوانەی کە خودا نکوڵی کردووە لە ئەنجامدانیان.

٢ـ مەعقیلی کوڕی یەسار رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: (الْعِبَادَةُ فِي الْهَرْجِ كَهِجْرَةٍ إِلَيَّ)[2] واتا: کەسێك خودا پەرستی بکات لە سەردەمی فیتنە و ئاشوب دا، خێرەکەی وەك ئەو کەسە وایە کە کۆچ دەکات بۆ لای من.

جا بەڕاستی ئەم سەردەمەی ئەمڕۆش بە شێوەیەکی کردەیی سەردەمی ئاشوب و فیتنەیە، چونکە کاتێك لە پێغەمبەری خودایانﷺ پرسی: (وماالهرج یا رسولَ اللهِ؟)واتا: هەرەج چیە ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟ قال: (القتل، القتل)[3] واتا: کوشتن کوشتن. جا بێگومان هیچ سەردەمێکیش نەبووە بە ئەندازەی ئەم سەردەمە کوشتن و کوشتار زۆز بێت، بۆیە هەر کەسێك دەیهەوێت بەشداری خێری کۆچی پێغەمبەرﷺ بێت، با دوو کار ئەنجام بدات:

یەکەم/ خۆی بپارێزێت لە کار و کردەوە حەرام و ناپەسەندەکان.

دووەم/ خۆی خەریك بکات بە خودا پەرستی و کاری چاکە بکات.

وصلى الله على سيدنا محمدٍ وعلى آله وصحبه وأتباعه أجمعين.

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

# ١٠ی محرم

# عـــــاشـــــوراء

پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (ليسَ لِيَومٍ فَضلٌ عَلى يَومٍ فِي الصِّيامِ إلا شَهرَ رَمضانَ وَيومَ عاشُوراءَ)

# ١٠ی محرم (عاشوراء)

مانگی محرم بەگشتی مانگێكی گەورە و تایبەتە لای خودای پەروەردگار، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەربارەی ڕۆژوی مانگی محرم فەرموویەتی: (أَفْضَلُ الصِّيَامِ، بَعْدَ رَمَضَانَ، شَهْرُ اللَّهِ الْمُحَرَّمُ)[١] واتا: گەورەترین ڕۆژو دوای ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان ڕۆژوی مانگی موحەڕەمە، وەلەناو مانگی موحەڕەمیشدا ڕۆژێكی تایبەت هەیە كە تیایدا موسڵمانان بەڕۆژو دەبن و یادی دەكەنەوە" ئەویش ڕۆژی دەی مانگی محرەم ـ عاشوڕا ـ یە، وە پێغەمبەری خوداشﷺ ئەم ڕۆژە بە خودا پەرستی و بەڕۆژو بون بەڕێكردووە و بە ڕۆژێكی تایبەتیش ناوی بردووە،ابن عباس رضي الله عنهما دەفەرموێت: (مَا رَأَيْتُ النَّبِيَّﷺ يَتَحَرَّى صِيَامَ يَوْمٍ فَضَّلَهُ عَلَى غَيْرِهِ إِلا هَذَا الْيَوْمَ، يَوْمَ عَاشُورَاءَ)[٢] واتا: نەمبینیوە پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆژوی هیچ ڕۆژێك لە هیچ ڕۆژێكی تر بە باشتر و گەورەتر دابنێت و زۆر هەوڵی بەدەستهێنانی بدات تەنها ڕۆژوی عاشوڕا نەبێت.وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرمویەتی: (ليسَ لِيَومٍ فَضلٌ عَلى يَومٍ فِي الصِّيامِ إِلا شَهرَ رَمضانَ وَيومَ عاشُوراءَ)[٣] واتا: بەڕۆژو بونی هیچ ڕۆژێك تایبەتمەندی زیاتر نیە لە هیچ ڕۆژێكی تر، تەنها مانگی ڕەمەزان و ڕۆژی عاشوڕا نەبێت.

## سوننەتەكانی ڕۆژی عاشوڕا

١ـ بەڕۆژو بوون: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (صِيَامُ يَوْمِ عَاشُورَاءَ أَحْتَسِبُ عَلَى اللَّهِ أَنْ يُكَفِّرَ السَّنَةَ الَّتِي قَبْلَهُ)[٤] واتا: بەڕۆژوبونی ڕۆژی عاشوڕا" وەهای ئەژمار دەكەم كە ببێتە

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا گبرانی گێڕاویەتەوە، وە پیاوەكانیش جێگای متمانەن.

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

کەفارەتی تاوانی ساڵی ڕابردوو بۆ هەر کەسێك کە تێیدا بەڕۆژو بێت.

وە سوننەتە لەگەڵ ڕۆژی دەی موحەڕڕەمدا ڕۆژی نۆی مانگیش بەڕۆژو بێت، ئەوەش بۆ ئەوەی جیاوازبین لە جولەکەکان و گاورەکان، عبداللە ی کوڕی عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا دەفەرمووێت: (حِينَ صَامَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ، قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ! إِنَّهُ يَوْمٌ تُعَظِّمُهُ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى. فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَإِذَا كَانَ الْعَامُ الْمُقْبِلُ، إِنْ شَاءَ اللَّهُ، صُمْنَا الْيَوْمَ التَّاسِعَ. قَالَ: فَلَمْ يَأْتِ الْعَامُ الْمُقْبِلُ، حَتَّى تُوُفِّيَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ)[1] واتا: کاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ ڕۆژی دەی محرم بەڕۆژو بوو و فەرمانیشی بە موسڵمانان کرد بەڕۆژو بن "گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ دەی موحەررەم ڕۆژێکە گاور و جولەکەکان بەگەورەی دەزانن، پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: ئەگەر ساڵی ئاینده هات بە پشتیوانی خودا ئێمە ڕۆژی نۆیەمیش بەڕۆژو دەبین، بەڵام هێشتا ساڵی ئاینده نەهات کە پێغەمبەری خودا ﷺ کۆچی دوایی کرد.

٢ـ سوننەتە لەڕۆژی دەی موحەڕڕەمدا موسڵمانان دەستیان بکەنەوە بۆ ماڵ و خێزانیان، وە ماڵی موسڵمانان خواردنی تایبەت ئامادەکە بکەن. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ وَسَّعَ عَلَى أَهْلِهِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ وَسَّعَ اللَّهُ عَلَيْهِ سَائِرَ سَنَتِهِ)[2] واتا: هەر کەسێك لە ڕۆژی دەی موحەڕڕەمدا دەستی بکاتەوە و بەفراوانی خواردنی خۆش بدات بە ماڵ و خێزانی" ئەوە خودای گەورە لە گشت ئەو ساڵەدا ڕزق وڕۆزی فراوان دەکات.

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان طبرانی و البیهقی گێڕاویانەتەوە.هەرچەندە ئەم فەرموودە لاوازە، بەڵام لە چەند ڕێگایەکەوە گێڕدراوەتەوە کە بەکۆی ڕێگایەکان کەمێك بەهێز دەبێت، لێرەدا ئەم فەرموودە لە بابی (ترغيب)دایە، لەبەر ئەوە ئیشی پێدەکرێت، پێشەوا البیهقی دەفەرمووێت: (هذه الأسانيد وإن كان ضعيفة فهي إذا ضمت بعضها إلى بعض أخذت قوة) بڕوانە: (الجامع لشعب الإيمان: ٥/ ٣٣١-٣٣٤)

## ڕوداوە مێژووییەکانی ڕۆژی عاشورا

١ـ لەو ڕۆژەدا باوکی مرۆڤایەتی ئادەم علیه السلام ووشەکانی خودای پێگەیشتن و لەسەر ئەو ووشانە تەوبەی کرد.[١]

٢ـ لەو ڕۆژەدا کەشتیەکەی نوح پێغەمبەرعلیه السلام گەیشتە کەنار و لەنگەری گرت. ابوهریرە ﷺ دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ بەلای کۆمەڵێك جولەکەدا تێپەڕی بینی بەڕۆژون، لێی پرسین بەهۆی چیەوە بەڕۆژون؟ گوتیان: (...وهذا يومٌ استَوَتْ فِيهِ السَّفِينَةُ عَلَى الْجُودي فَصامَهُ نُوحٌ وَمُوسَى شُكراً لِلّهِ تَعَالَى فَقالَ النَّبِيُّ ﷺ: أَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى وَأَحَقُّ بِصَومِ هذَا الْيومِ فَأَمَرَ أَصْحابَهُ بِالصَّومِ)[٢] واتا: لەم ڕۆژەدا کەشتیەکەی نوح علیه السلام لەسەر چیای جودی لەنگەری گرت، لەبەر ئەوەهەردووك پێغەمبەران نوح علیه السلام و موسا وەك سوپاسگوزاری بۆ خودا تێیدا بەڕۆژوبوون، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: ئێمە لەپێشترین بە موسا، وە لەپێشترین بۆ ئەوەی بەڕۆژو بین، لەبەر ئەوە فەرمانی بە هاوەڵە بەرێزەکان کرد لەو ڕۆژەدا بەڕۆژو بن.

٣ـ لەو ڕۆژەدا خودای پەروەردگار باوکی پێغەمبەرانی إبراهیمی علیه السلام ڕزگار کرد لە ئاگر. دوای ئەوەی کە بێباوەڕان بێ ئومێد بوون لەوەی بتوانن بەسەر پێغەمبەر إبراهیمدا علیه السلام سەربکەون، بڕیاریاندا کە ئاگرێکی گەورە بکەنەوەو بە ئاگر بیسوتێنن، خودای پەروەردگار بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: ﴿قَالُوا حَرِّقُوهُ وَانصُرُوا آلِهَتَكُمْ إِن كُنتُمْ فَاعِلِينَ﴾[٣] واتـــا:

---

١ـ ئەم ڕوداوانە جگە لە هەردوو ڕوداوی (ڕزگار بونی پێغەمبەر موساو نیشتنەوەی کەشتیەکەی نوح) لە فەرموودەیەکدا باسکراون کە ابن عباس گێڕاویەتەوە، بەڵام فەرموودەکە لاوازە، وە جگە لەوەش لە چەند کتێبێکی تریشدا باسکراون، بۆ نمونە کتێبی: (تنبیه الغافلینی سەمەرقەندی: ٢١٨)

٢ـ پێشەوا احمد لە مسندەکەیدا گێڕاویەتەوە.

٣ـ الأنبياء: ٦٨

هەندێکیان گووتیان ئیبراهیم بسوتێنن و پشتیوانی لە خواکانتان بکەن، ئەگەر ئێوە هیچتان پێدەکرێت. جا دوای ئەوەی ئاگرێکی گەورەیان کردەوە و ئیبراهیمیان علیه السلام خستە ناو، خودای گەورە فەرمانی بە ئاگر کرد نەیسوتێنێت و فەرمووی: ﴿قُلْنَا يَا نَارُ كُونِي بَرْدًا وَسَلَامًا عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾[1] واتا: ئەی ئاگر ساردبە و سەلامەتبە لەسەر ئیبراهیم. ئاگریش بە ملکەچیەوە فەرمانبەرداری خودای پەروەردگاری کردو ئیبراهیمی علیه السلام نەسوتاند، جا دوای ئەوەی پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام ماوەیەك لە ناو ئاگرەکەدا مایەوە، لە ڕۆژی دەی موحەڕڕەمدا لەناو ئاگرەکە ڕزگاری بوو.

٤ـ لەو ڕۆژەدا خودای پەروەردگار پێغەمبەر یونسی علیه السلام ڕزگار کرد لە ناو سکی نەهەنگەکەدا، دوای ئەوەی پێغەمبەر یونس علیه السلام گەلەکەی بەجێهێشت و سواری کەشتیەکە بوو، بەفەرمانی خودا کەشتیەکە لەناو دەریادە وەستا، دواتر پشکەیان کرد بۆ ئەوەی یەکێك لە ناو کەشتیەکە فڕێبدەنە ناو دەریاوە، کەچی یونس پێغەمبەر علیه السلام لە پشکەکە سەرکەوتو نەبوو و فڕێیاندایە ناو دەریاکەوە، جا خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَالْتَقَمَهُ الْحُوتُ وَهُوَ مُلِيمٌ﴾[2] واتا: جا نەهەنگێك قوتیدا لەکاتێکدا کە شایەنی سەرزەنشت کردن بوو- چونکە بێ ئەوەی خودا مۆڵەتی بدات گەلەکەی جێهێشت ـ جا دوای ئەوەی ماوەیەکی دیاریکراو لە سکی نەهەنگەکەدا مایەوە ـ پێشەوایان سەددی و کەلبی و مقاتل دەفەرموون: چل ڕۆژ مایەوە، ضـەحاك دەفەرموێت: بیست ڕۆژ مایەوە، عطاء دەفەرموێت: حەفتەیەك،مقاتل بن حیان دەفەرموێت: سێ ڕۆژ- یونس پێغەمبەر علیه السلام دەستیکرد بە تەسبیحاتی خودا و بە دەم خەم و پەژارەوە پەشیمانیەوە لەخودای گەورە پاڕایـــەوە:﴿إِذْ نَادَى وَهُوَ مَكْظُومٌ﴾[3] خودای گەورەش

١ـ الأنبياء: ٦٩

٢ـ الصافات: ٤٢

٣ـ القلم: ٤٨

پەشیمانی وەرگرت و لە سکی نەهەنگەکە ڕزگاری کرد، جا ئەو ڕۆژەی تیایدا لە سکی نەهەنگەکە ڕزگاری بوو ڕۆژی دەی موحەڕڕەم بوو.

٥- خودای پەروەردگار لەو ڕۆژەدا یوسفی پێغەمبەری علیه السلام لە ناو بیرەکـــە ڕزگار کرد.

٦- لە ڕۆژی عاشوڕادا خودای گەورە شیفای چاوەکانی یەعقوبی پێغەمبەری علیه السلام نارد و لە نابینایی چاکبویەوە.

٧- لە ڕۆژی عاشوڕادا خودای پەروەردگار پێغەمبەر موسای علیه السلام لە دەستی فیرعەون ڕزگار کردو فیرعەونی لە دەریادا خنکاند.ابن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێت: (قَدِمَ النَّبِيُّ ﷺ الْمَدِينَةَ، فَرَأَى الْيَهُودَ تَصُومُ يَوْمَ عَاشُورَاءَ. فَقَالَ: مَا هَذَا؟ قَالُوا: هَذَا يَوْمٌ صَالِحٌ، هَذَا يَوْمٌ نَجَّى اللَّهُ بَنِي إِسْرَائِيلَ مِنْ عَدُوِّهِمْ فَصَامَهُ مُوسَى. قَالَ: فَأَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى مِنْكُمْ، فَصَامَهُ وَأَمَرَ بِصِيَامِهِ)[1] واتا: کاتێك پێغەمبەری خوداﷺگەیشتە مەدینە بینی جولەکەکان لە ڕۆژی عاشوڕادا بەڕۆژو دەبن، پرسی: هۆکاری ئەو بەڕۆژو بونەتان چیە؟ گوتیان: ئەمڕۆ ڕۆژێکی پڕ لە خێرە، ئەمڕۆ ڕۆژێکە خودای گەورە نەوەکانی ئیسرائیلی لە دەستی فیرعەون ڕزگار کرد، لەبەر ئەوە موسا تێیدا بەڕۆژو دەبوو، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئێمە لە پێشترین لە ئێوە بەموسا، لەبەر ئەوە بەڕۆژو بوو و فەرمانیشی بەهاوەڵان کرد بەڕۆژو بن.

٨- لە ڕۆژی عاشوڕادا قوڕەیشیەکان بەرگی کەعبەیان دەگۆڕی و تێشیدا بەڕۆژو دەبوون، ابن حجری عەسقەلانی رحمه الله دەفەرمووێت: لە مەجلیسی سێهەمی(مجالس الباغندی الکبیر)دا بینیومە، کە لە عیکرەمەیان پرسی: بۆچی قوڕەیشیەکان لە ڕۆژی عاشوڕادا بەڕۆژو دەبوون؟ ئەویش فەرمووی: قوڕەیشیەکان لە سەردەمی نەفامیدا تاوانێکیان کرد، ئەو تاوانە زۆر لەسەر دەرونیان گرانبوو، پێیان گوتن: بۆ ئەوەی ئەو تاوانەتان لەسەر لابچێت لە عاشوڕادا

١- پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

بەرۆژوبن.[1]

٩ـ یەکێکی تر لە ڕوداوە مێژوییەکانی تری ڕۆژی عاشورا، کە لەهەموویان زیاتر لە ناو خەڵکیدابڵاوەو، زیاتر گرنگی پێدەدرێت بەتایبەت لەلایەن شیعەکانەوە" بریتیە لە شەهیدکردنی پێشەوا حسینی کوڕی علی کوڕی أبی طالب رضي الله عنهما.

## بەسەرهاتی شەهیدکردنی پێشەوا حسین رضي الله عنه

دوای ئەوەی کە پێشەوا حەسەنی کوڕی علی رضي الله عنهما لە بەرژەوەندی معاویەی کوڕی ئەبوسفیان رضي الله عنه وازی لەدەسەلات هێنا و جێنشینایەتی ڕادەستی معاویە رضي الله عنه کرد، نێوانی هەردوو لایان زۆر خۆشبوو، وە معاویە رضي الله عنه زۆر ڕێزی تایبەتی لە هەردوو ڕەیحانەکەی پێغەمبەری خودا دەگرت، وە هەرکاتێك سەردانیان بکردبایە زۆر ڕێزی تایبەتی لێدەگرتن و دەهاتە پێشوازیان، وە دوای کۆچی دوایی پێشەوا حەسەنیش رضي الله عنه ئەم پەیوەندیە لە نێوانی پێشەوا حسین و معاویەدا بەردەوام بوو، وە ساڵانە پێشەوا حسین نێردراوی دەنارد بۆلای معاویە و ئەویش زۆر ڕێزی لە نێردراوەکەی دەگرت، بەڵام دوای ئەوەی کە معاویە رضي الله عنه لە ژیانی خۆیدا دەستی کرد بە وەرگرتنی بەیعەت بۆ یەزیدی کوڕی بەشێك لە هاوەڵان وەك ابن عباس و ابن عمر ابن زبیر و عبدالرحمن کوڕی أبوبکر و حسینی کوڕی علی رضي الله عنهم ڕەتیان کردەوە بەیعەتی پێبدەن، وە دوای ئەوەی کە معاویە رضي الله عنه لە ساڵی شەستی کۆچیدا کۆچی دوایی کرد، خەڵکیش بەیعەتیان بە یەزیددا، هەردوو هاوەڵی بەرێز ابن و عمر و ابن عباسیش رضي الله عنهما بەیعەتیان پێدا، وە عبدالرحمن کوڕی ابوبکریش رضي الله عنه کۆچی دوایی کرد، لەبەر ئەوە تەنها دوو هاوەڵی بەرێز مانەوە کە بەیعەت بە یەزید نەدەن ئەوانیش ابن زبەیر و حسینی کوڕی علی رضي الله عنهما

---

١ـ فتح الباری: ٤/ ٣١٢

بوون، ئەوانیش مەدینەیان بەجێهێشت و ڕوویان کردە مەککەو لەوێدا نیشتەجێ بوون، جاکاتێك ئەو دوو هاوەڵە بەڕێزانە لە مەککە نیشتەجێ بوون، خەڵکی زیاتر ڕوویان کردە پێشەوا حسین ﷺو لە دەوری کۆبونەوە، لە هەموو لایەکەوە بۆ لای دەهاتن، ئەوەش بەهۆی ئەو پێگەیەوە بوو کە لە پێغەمبەری خوداوەﷺ نزیك بوو و نەوەی ئەوبوو، وە زۆرێك لە موسڵمانان پێشەوا حسینیان بە شیاوتر دەزانی لە یەزید بۆ بەدەستەوە گرتنی دەسەڵاتی ئیسلام و جێنشیانەیەتی، یەکێك لەو جێگایانەی کە زۆر نێردراویان دەناردە لای پێشەوا حسین و نامەیان بۆ دەنارد و داویان لێدەکرد کە بێتە لایان ولەوێوە جێنشینایەتی بگرێتە دەست خەڵکی عێراق بوون، بەتایبەت خەڵکی کوفە نامەیەکی زۆریان بۆ پێشەوا حسینﷺ نارد، هەتا گەیشتە نزیکەی سەدو پەنجا نامە، لە نامەکاندا ڕێزو سەلامی تایبەتیان بۆ پێشەوا حسینﷺدەنارد و خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕی بە بۆنەی کۆچی دوایی معاویەﷺ، وە دوپاتیان دەکردەوە کە هیچ کەسێك لە تۆ شیاوتر نیە بۆ بەیعەت پێدان، وە زۆر دڵنیاییان دەدا کە تائێستا بەیعەتیان بە یەزید نەداوە، وە داوایان لە پێشەوا حسینﷺدەکرد بچێت بۆ لایان بۆ ئەوەی بەیعەتی پێبدەن و پارێزگاری لێبکەن، دوای ئەوەی کە ئەو هەموو نامە و نێردراوانە لەلایەن خەڵکی کوفەوە بۆ پێشەوا حسینﷺهات، بڕیاریدا کە موسلمی کوڕی عەقیلی کوڕی ابی طالبی ئامۆزای بنێرێت بۆ لایان، بۆ ئەوەی ڕاستی ئەو باسە بزانێت و لەگەڵ خەڵکی کوفەدا ڕێکبکەوێت،وە پێی گووت: ئەگەر کارەکە بەوشێوە بوو کە لە نامەکاندا باسکراوە ئاگادارم بکەوە بۆ ئەوەی بە ماڵ و خێزانەوە بەرەو کوفە بێم و بتوانم لەوێوە جێنشینایەتی پێغەمبەرﷺ بەدەستبهێنمەوە، وە لەگەڵیدا نامەیەکیشی نارد بۆ خەڵکی کوفە، کاتێك مسلم گەیشتە کوفە" خەڵکی کوفە لێی کۆبونەوە و نزیکەی دوازدە هەزار کەس بەیعەتیان پێدا، پاشان ڕێژەکە بەرزبوەوە بۆ هەژدە هەزار کەس، سوێندیان خوارد کە بە سەرو ماڵیان بەرگری لە پێشەوا حسینﷺ بکەن، موسلیمیش

كاتێك ئەوەی بینی نامەیەكی بۆ حسین ناردەوە و تێدا داوای لێكرد كە ماڵ و خێزانی بهێنێت و بێت بۆ كوفە، چونكە هەموو ئامادەكاریەكی كردووە بۆ وەرگرتنی بەیعەت و كاروبارەكانی تر، كاتێك نامەكە گەیشت بە پێشەوا حسینرَضِيَ اللهُ عَنْهُ، خۆی و ماڵ و خێزانی ئامادەكرد و بەرەو كوفە بەڕێكەوت، پاشان هەواڵی بەیعەتدان بە پێشەوا حسینرَضِيَ اللهُ عَنْهُلەناو خەڵكیدا بڵاوبویەوە، هەتا گەیشتەوە بە كاربەدەستی كوفە (نوعمای كوڕی بەشیر)، هەرچەندە نوعمان پشتی كردە ئەو بابەتەو زۆر گوێی پێنەدەدا" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا خەڵكی كۆكردەوە و قسەی بۆ كردن و گووتی: نكوڵیتان لێدەكەم لەوەی كە ببنە چەند كۆمەڵێك و جیاوازی بكەوێتە نێوانتانەوە، وە فەرمانتان پێدەكەم لەسەر یەك ڕێڕەو بن لەگەڵ یەكتردا بن، وە من شەڕ لەگەڵ كەسێكدا ناكەم كە شەڕم لەگەڵدا ناكات، وە هیچ كەسێك بەهۆی گومانەوە دەستگیر ناكەم و شەڕی لەگەڵ ناكەم، بەڵام سوێند بەو خودایەی تاك و تەنیایە ئەگەر لە پێشەواكەتان جیاببنەوە و پەیمانەكەتان بشكێنن" ئەوە لەگەڵتاندا دەجەنگم هەتا دەستم شمشێر بگرێت، لەو كاتەدا پیاوێك هەڵستا كە ناوی (عبداللە ی كوڕی مسلم ی حضرمی) بوو، گووتی: بەڕاستی ئەو كارە بە زۆرداری و دەسەڵات نەبێت چارەسەر ناكرێت، وە بێگومان ئەو ڕێگایەی تۆ گرتوتەبەر ڕێگای لاواز و ترسنۆكانە، نوعمانیش گووتی: بەڕاستی ئەگەر لە فەرمانبەرداری خودادا لەڕیزی لاواز و بێهێزان بم پێم خۆشترە لەوەی كە لەڕیزی بەهێز وگەورەكان بم لە سەرپێچی خودادا!! پاشان ئەو پیاوە لەو دانیشتگایە ڕۆیشت و نامەیەكی بۆ یەزیدی كوڕی معاویە نوسی و لەو كارە ئاگاداری كردەوە، یەزیدیش نێردراوێكی ناردو نوعمانی لەكار بەدەستی كوفە خست و كوفەشی لەگەڵ بەصرەدا خستە ژێر دەسەڵاتی عبیداللە ی كوڕی زیاد، پاشان یەزید نامەیەكی بۆ ابن زیاد نوسی و فەرمانی پێكرد ئەگەر گەیشتیتە كوفە ئەگەر بوتكرا موسلیم بكوژە، ابن زیادیش لە بەصرەوە بەڕێكەوت بەرەو كوفە، كاتێك گەیشتە كوفە و سەلامی لەخەڵكی دەكرد، خەڵكەكە وایاندەزانی

ئەوە پێشەوا حوسەینەﷺ، لەبەر ئەوە دەیانگووت: (وعليك السلام مرحباً بإبن رسول الله) چونکە خەڵکی چاوەڕوانی هاتنی پێشەوا حوسەینیانﷺدەکرد، وە خەڵکی لێی کۆبونەوە، بەڵام موسلمی کوڕی عەمڕ کە لەدوای ابن زیادەوە دەڕۆیشت گووتی: ئەوە ئەمیر عبیدالله ی کوڕی زیادە، جا کاتێك خەڵکەکە ئەوەیان زانی کەوتنە خەم و پەژارەوە، دوای ئەوەی کە ابن زیاد لە کۆشکی کاربەدەستی جێگیر بوو، قاصیدێکی نارد بۆ ئەوەی بزانێت مسلیمی کوڕی عەقیل لە کوێدا نیشتەجێ بووە، ئەویش ئاگاداری کردەوە کە موسلیمی کوڕی عەقیل لە فلان ماڵەیە، موسلیمیش جێگای لە ماڵی هانئ کوڕی حمیدی کوڕی عورِوە و گواستەوە بۆ ماڵی شەریکی کوڕی ئەعوەڕ کە یەکێك بوو لە گەورە پیاوانی کوفە، بە شەریکیان ڕاگەیاند کە ابن زیاد دەیهەوێت کە سەردانی بکات، شەریکیش یەکێکی نارد بۆ لای هانئ و پێی ڕاگەیاند با موسلیمی کوڕی عەقیل بۆ لای ماڵی ئێمە بۆ ئەوەی کە ابن زیاد هات بۆ سەرداغان ئەو بیکوژێت، کاتێك موسلیم هات، شەریك پێی گووت: تۆ خۆت بشارەوە، ئەگەر گووتم ئاوم بۆ بهێنن تۆ وەرە بیکوژە، کاتێك ابن زیاد هات بۆ ماڵی شەریك بەیەکەوە لەسەر دۆشەکێك دانیشتن، دوای ئەوەی ماوەیەك قسەیان بەیەکەوە کرد، شەریك گووتی: ئاومان بۆ بهێنن وەك ئاماژەیەك بۆ ئەوەی موسلیم ابن زیاد بکوژێت، بەڵام موسلیم ترساو ئەو کارەی نەکرد، دوو سێ جار شەریك داوای ئاوی کرد وەك ئاماژەیەك بۆ کوشتنی ابن زیاد، بەڵام موسلیم ئەو کارەی هەر نەکرد، پاشان ابن زیاد ڕۆیشت، جا کاتێك ابن زیاد ڕۆیشت، شەریك بە موسلیمی گووت: بۆ نەتکوشت؟ موسلیم گووتی: فەرموودەیەکی پێغەمبەرمﷺپێگەیشتووە کە فەرموویەتی: (الإيمانُ ضد الفَتْكِ، لا يَفتِكُ مُؤمِنٌ)[1] واتا: باوەڕ دژی پەلامار وکوشتنە، هیچ باوەڕدارێك موسڵمانێك ناکوژێت. وە من پێم خۆشنەبوو لە ماڵی تۆدا بیکوژم، ئەویش گووتی: ئاخر ئەگەر بتکوشتبایە"

١ـ پێشەوایان ابوداود و احمد و البیهقی گێڕاویانەتەوە.

ئەوە تۆ بەبێ کیشە دەگەیشتیتە کۆشکی فەرمانداری و بەصرەش دەهاتە ژێر دەسەڵاتی تۆ، ئینجا تۆ ستەمکارێکی تاوانبارت دەکوشت. پاشان ابن زیاد چۆوە کۆشك و سیاسەتێکی زۆر توندی گرتە بەر بەرامبەر خەڵکی بەگشتی و بەتایبەتی ئەو کەسانەی پەیمانیاندا بوو بە موسلیم لەسەر گوێڕایەڵی پێشەوا حسین‌ﷺ، وە پاشان هەوڵی دەستگیر کردن و کوشتنی موسلیمی دا، جا کاتێك مسلیمی کوڕی عەقیل بەوەی زانی لە ژێر دروشمی (یا منصور أمت) دا بانگی خەڵکی کرد و چوار هەزار کەسی بۆ کۆبۆوە، بەرەوە کۆشکی فەرمانداری ڕۆیشتن کاتێك گەیشتنە نزیکی کۆشك عبیداللە ی کوڕی زیاد دەرگای کۆشکی داخست، سوپای موسلیمیش بەرامبەر کۆشك وەستان، بەڵام ئەو سەرۆك هۆز کەسایەتیانەی کە لەناو کۆشکدابوون لەگەڵ ابن زیاد لەوێوە بە ئاماژە هەڕەشەیان لە خەڵکی هۆزەکەیان دەکردو داوایان لێدەکردن کە موسلیم بەجێبهێڵن، وە عبیداللە نێردراوی نارد بۆ لای خەڵکی شار و لە ناو بازاڕدا خەڵکیان دەترساند لە شوێنکەوتنی موسلم هەتا وای لێهات دایك و باوك و خوشك و برا دەهاتن و خزم و کەسەکانیان لە سوپای موسلم دەهێنایە دەرەوە، هەتا وای لێهات تەنها پێنج سەد کەس لەگەڵ موسلیمدا مایەوە، پاشان ئەو ژمارەیە کەمبۆوە بۆ سێ سەد کەس و دواتریش بۆ نوێژی شێوان تەنها سی کەسی لەگەڵ مایەوە، موسلێمیش نوێژی شێوانی بە جەماعەت پێکردن، دواتر بۆ دوای نوێژی عیشا هیچ کەسێکی لەگەڵ نەما بۆ ئەوەی هاوڕێیەتی بکات، کەس نەما ڕێگای نیشان بدات، کەس نەما بیباتەوە بۆ ماڵی خۆیان، بەتەنها مایەوە، ئەویش چو بۆ بەر دەرگای ماڵێك و لە دەرگای دا، پیرەژنەیەك هاتە دەرەوە، مسلم داوای ئاوی لێکرد، پیرەژنەکە ئاوی بۆ هێنا پاشان پیرەژنەکە پێی گووت: کاکە بۆتۆ جوان نیە لێرە دابنیشیت بۆ ناچیتەوە بۆ ماڵی خۆت، موسلمیش گووتی: ئاخر من لەو شارەدا هیچ ماڵێکم نیە، گووتی: تۆ کێی گووتی: بەو مەرجە پێت دەڵێم کە ناوم نەدەیت، ئەویش پەیمانی پێدا، گووتی: من موسلیمی کوڕی عەقیلم، پیرەژنەکەش بردیە ژورێکی تایەبتەوە و زۆر ڕێزی لێگرت، پیرەژنەکە کوڕێکی هەبوو، کوڕەکەی

بینی دایکی زۆر هاتو چۆ دەکات بۆ ئەم ژورە لەبەر ئەوە لەدایکی پرسی: بۆ ئەوەندە دەچیتە ئەو ژورەوە؟ دایکیشی گووتی: کوڕم موسلیمی کوڕی عەقیلمان میوانە، بەڵام با ئەوە نهێنی بێت و لای کەس مەیدرکێنە، گووتی: باشە، بەڵام کاتێك بەیانی بوّوە ئەم کوڕە خێرا چو بۆلای عبدالرحمن کوڕی محمدی کوڕی ئەشعەس وهەواڵی پێدا، عبدالرحمانیش بە دڵخۆشیەوە چو بۆ لای ابن زیاد، ابن زیاد لێی پرسی بۆ ئاوا دڵت خۆشە؟ گووتی: لەبەر ئەوەی جێگای موسلیمم دۆزیوەتەوە، ابن زیادیش بەپەلە پۆلیسی ناردن بۆ ئەوەی موسلیم بهێنن، ئەوانیش چون دەوری ماڵی ئەو پیرەژنەیان گرت، موسلیمیش لەگەڵیان کەوتە جەنگ و سێ جار لە ماڵەکە کردنیە دەرەوە، پاشان ماڵەکەیان بەردباران کردو ئاگریان تێگرت، موسلیمیش هاتە دەرەوەو دیسان لەگەڵیان کەوتە جەنگ، بەڵام عبدالرحمانی کوڕی محمد ئەمانی بە موسلیمدا و پێی گووت: خۆت ڕادەست بکە پەیمان بێت هیچت لێناکەین، موسلیمیش خۆی ڕادەست کرد، بەڵام کاتێك خۆی ڕادەست کرد، عبدالرحمن پەیمانەکەی شکاند و موسلیمیان دەستگیر کرد و شمشێرەکەیان لێسەند، کاتێك موسلیم ئەوەی بینی دەستی کرد بەگریان، گووتیان: بۆ دەگری گووتی: سوێند بەخودا بۆ خۆم ناگریم، بەڵکو بۆ پێشەوا حسینؓ و ماڵ و خێزانەکەی دەگریم، چونکە من هەواڵم پێداون کە بەرەو ئێرە بێن، دواتر موسلیمیان برد بۆ کۆشك و پاشان لە ڕۆژی نۆی ذی‌الحجەدا کە دەکاتە ڕۆژی عەرەفە بردیان بو سەروی کۆشك و سەریان بڕی و لەوێوە هەڵیاندایە خوارەوە و شەهیدیان کرد،

ئیتر دوای ئەوە کە پێشەوا حسینؓ بەڕێکەوت بۆ کوفە لەڕێگادا خەڵکێکی زۆری لەگەڵ کەوت، بەڵام کاتێك لە ڕێگادا هەواڵی کوشتنی نێردراوەکانی پێگەیشت پێشەوا حسینؓ ئەوانەی لەگەڵی بوون سەر پشکی کردن لەنێوانی مانەوە و جێهێشتنی، ئەوانیش هەموویان جێیان هێشت، تەنها ئەو کەسانە مانەوە کە لە مەککەوە لەگەڵی کەوتبوون، کاتێك گەیشتە

نزیکی کوفە، ابن زیاد سوپایەکی گەورە ناردە پێشیان، پێشەوا حسینﷺ سێ پێشنیازی خستە بەردەمی ابن زیاد، یان ئەوەتا ڕێگایان بدەن بگەڕێنەوە بۆ ئەو جێگایەی لێوەی هاتوون، وە یان ئەوەتا ڕێگایان بدەن بچن بۆ لای یەزید، وە یان ڕێگایان بدەن لە کەلێنێکەوە لەگەڵ تورکەکان بجەنگن. ابن زیادیش گووتی: باشە من ئەو پێشنیازانەم بەدڵە، بەڵام شەمری کوڕی زی جەوشن، گووتی: نەخێر سوێند بەخودا ئەو پێشنیازانە باش نین، بەڵکو دەبێت بێنە ژێر فەرمانی تۆوە، پاشان سوپایەکی چوار هەزار کەسی کە پێشتر بۆ دەیلم ئامادەکرابوو ڕووبەڕووی پێشەوا حسینﷺو هاوەڵەکانی بونەوە کە ئەوان ژمارەیان تەنها چل پیاو بوو، سی و سێ سوار و حەوت پیادە بوون، ماوەیەك شەڕ لە نێوانیاندا بەردەوام بوو، هەتا لە لە ڕۆژی عاشوڕادا و لەساڵی شەست و یەکی کۆچیدا پێشەوا حسین شەهید کرا، پاشان سەری پێشەوا حسینیانﷺ هێنایە پێش ابن زیاد، ئەویش بە نێردراوێکدا ناردی بۆ یەزیدی کوڕی معاویە لە شام.[1]

جا ئەوەی ڕابرا بە کورتی باسی چۆنیەتی شەهید کردنی پێشەوا حسینﷺ بوو، ئەگەر بێت و سەیری ئەم بەسەرهاتە بکەین دەبینین پڕیەتی لە ناپاکی خەڵکی کوفە بەرامبەر بە موسلیمی کوڕی عەقیل و پێشەوا حسینﷺ، بەڵام ئێستا سەیر دەکەین هەر نەوەی ئەو کەسانەی کە ناپاکیان لە پێشەوا حسینﷺ کرد، هەر نەوەی ئەو کەسانەی کە پێشەوا حسینﷺو هاوەڵەکانیانی شەهید کرد ساڵانە بە ئاپۆڕای ملیۆنیەوە وەکو خواپەرستی یادی شەهید کردنی پێشەوا حسینﷺ دەکەنەوە، ئەوەش وەکو کورد دەڵێت: کەپەنکی پاش بارانە، وە لەگەڵ ئەو کەپەنکەشدا سیاسەتی شیعەگەری تێکەڵ بووە و لەڕێیەوە هێز و سەنگی خۆیان دەنوێنن و بانگەشە دەکەن بۆ شیعەگەری. خودا هەموو لایەکمان بپارێزێت. آمین

---

١- بڕوانە:(البداية والنهاية،لإبن الكثير:٧-٨/٤٩٨-٥٤٦)ئەم بابەتە بەدرێژی شیکراوەتەوە، ئێمە بەکورتی باسمان کرد.

# شیعەو عاشورا

وەك باسمان کرد کە هۆکاری سەرەکی شەهید کردنی پێشەوا حسینؓخەڵکی عێراق و کوفە بۆ خۆیان بوون، چونکە چەندین جار نامەیان بۆ پێشەوا حسینؓناردو داوایان لێدەکرد کە بچێت بۆ لایان، وە هەژدە هەزار کەسیان بەیعەتیان بە موسلیم دا لەسەر گوێڕایەڵی و بەرگری کردن لە پێشەوا حسینؓ، بەڵام کاتێك پێشەوا حسینؓ گەیشت و کەوتە جەنگەوە لەگەڵ ابن زیاد خەڵکی عێراق پشتیان تێکرد و ئەو پەیمانەی پێیان دابوو شکاندیان و ناپاکیان لەگەڵدا کرد،هەتا دەرئەنجامەکەی بە شەهید کردنی پێشەوا حسینؓکۆتایی پێهات. پیاوێکی خەڵکی عێراق پرسیاری لە عبداللە ی کوڕی عمر رضي الله عنهما کرد دەربارەی کەسێك لە ئیحرامدا بێت و مێشولەیەك بکوژێت حوکمی چیە؟! ئەویش فەرمووی: (أَهلُ الْعِراقِ يَسأَلُونَ عَنِ الذُّبابِ،وَقَدْ قَتَلُوا ابنَ ابنَةِ رَسُولِ اللهِﷺ، وقالَ النَّبِيُّ ﷺ: هُما رَيحانَتايَ مِنَ الدُّنيا)[1]واتا: سەیری خەڵکی عێراق ناکەیت هاتوون پرسیار دەربارەی کوشتنی مێشولەیەك دەکەن!! لە کاتێکدا ئەوان کوڕی کچی پێغەمبەری خودایان شەهید کرد،کە پێغەمبەری خوداﷺدەربارەیان دەیفەرموو: ئەوانە ڕەیحانە بۆنخۆشەکانی منن لە دونیادا!!

بەڵێ وەك گوتمان کورد دەڵێت: پاشی باران کەپەنکم بۆ چیە،ئەوانیش لە کاتی خۆیدا هیچ بەرگریەکیان لە پێشەوا حسینؓنەکرد، بەڵام ئێستا ساڵانە بە ئاپۆرای ملیۆنی یادی شەهیدکردنی پێشەوا حسینؓدەکەنەوە، وە چەندین کاری بیدعەو ناشەرعیان خستۆتە ناو ڕۆژی عاشوراوە کە نە خوداو نە پێغەمبەرەکەی وە نە پێشەوا حسینیشؓپێی ڕازی نین، ئەوانەی خوارەوەش بەشێکن لەو بیدعە و کارە ناشەرعیانەی کە شیعەکان و جگە لەوانیش لـــە

١- پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

ڕۆژی عاشوڕادا دایانهێناون:

١ـ شیوەن کردن و لە خۆدان و ئازاردانی جەستە بە ناوی عیبادەتەوە. ئەمەیان دوو جـــــۆر بیدعەی تێدایە:

یەکەم/ هاتوون عیبادەتێکیان داهێناوە کە دژی قورئان و سوننەتە و هیچ بەڵگەیەك لە بەڵگەکانی (مصادر التشريع الإسلامی) پشتیوانی ناکات.

دووەم/ ئەگەر بە عیبادەتیش ئەو کارە نەکەن و تەنها وەك نەریتێکیش بێت" ئەوە دیسان لە شەرعدا هەر نکوڵی لێکراوەو قەدەغەیە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (لَيْسَ مِنَّا مَنْ لَطَمَ الخُدُودَ، وَشَقَّ الجُيُوبَ، وَدَعَا بِدَعْوَى الجاهِلِيَّةِ)[1] واتا: لە ئێمە نیە هەر کەسێك لە کاتی موصیبەتدا لە کوڵمی خۆی بدات و یەخەی دابدڕێت و بە هات و هاواری سەردەمی نەفامی هات و هاوار بکات.

٢ـ سەربڕین و قوربانی کردن لە ڕۆژی عاشوڕادا و لە نەجەف و کەربەلا. پیاوێك لە سەردەمی پێغەمبەرداﷺلەسەر خۆی بە پێویست گێڕابوو- نەزری کردبوو- کە لە بەووانە حوشترێك سەر ببڕێت، هاتە لای پێغەمبەرﷺ و گووتی: (إِنِّي نَذَرْتُ أَنْ أَنْحَرَ إِبِلاً بِبُوَانَةَ فَقَالَ النَّبِيُّ ﷺ: هَلْ كَانَ فِيهَا وَثَنٌ مِنْ أَوْثَانِ الْجَاهِلِيَّةِ يُعْبَدُ؟ قَالُوا: لَا، قَالَ: هَلْ كَانَ فِيهَا عِيدٌ مِنْ أَعْيَادِهِمْ؟ قَالُوا: لَا، قَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: أَوْفِ بِنَذْرِكَ فَإِنَّهُ لَا وَفَاءَ لِنَذْرٍ فِي مَعْصِيَةِ اللَّهِ)[2] واتا: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بەڕاستی من لەسەر خۆم بە پێویست گێڕاوە کە لە بەووانە حوشترێك سەر ببڕم ـ ئایا پێت چۆنە؟ـ ئەویش فەرمووی: ئایا هیچ بتێکی سەردەمی نەفامی لێیە بپەرسترێت؟ گووتیان: نەخێـــر، فەرمووی: ئایا هیچ ڕێوڕەسم و جـــەژنێکی ئـــەوانی تێـدا

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا ابوداود گێڕاویەتەوە.

بەڕێوەچووە؟ گوتیان نەخێر، فەرمووی: کەواتا ئەوەی لەسەر خۆت بە پێویست گێڕاوە جێبەجێی بکە، چونکە هیچ بەپێویست گێڕانێك جێبەجێ ناکرێت ئەگەر سەرپێچی خودای تێدا بێت.

جا ئەم فەرموودە بەڵگەیە کە هەر کاتێك و هەر جێگایەك جەژن و یادێکی پوچی تێدا بەڕێوە بچێت ئەوە دروست نیە ئەگەر ئاژەڵی تێدا سەر ببڕدرێت و قوربانی تێدا بکرێت.

٣ـ خۆشۆردن و خەنە لەسەر دان و کل لەچاو کردن و خۆ بۆنخۆشکردن بۆ عاشوراو سازکردن و کولاندنی دانەوێڵەی تێکەڵاو. ئەمەش یەکێکی ترە لە داهێنراوە خراپەکانی ڕۆژی عاشورا کە لەناو بەشێك لە موسڵمانناندا بڵاوەو فەرموودەیەکی لەبارەوە دەگێڕنەوە کە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: ( مَنِ اكْتَحَلَ بِالإِثْمِدِ يَوْمَ عَاشُورَاءَ لَمْ يَرْمَدْ أَبَدًا)[1] واتا: هەر کەسێك چاوەکانی لە کل بدات لە ڕۆژی عاشورادا ئەوە هەتاهەتایە چاوی ئازار ناکات و لاواز نابێت.

جا ئەم فەرموودەیە لای زۆرینەی زانایان فەرموودە نیەو هەڵبەستراوە، وە کردەوەکانی تریشی وەك: دەست لە خەنە دان و....هتد، ئەوانەش هەموویان بیدعەیەکی خراپن و بکوژەکانی پێشەوا حسین رضي الله عنه هەڵیان بەستووە.[2]

٤ـ سەردان کردنی ملیۆنەها کەس بۆ نەجەف و کەربەلاو شوێنە تایبەتیەکانی تری شیعە لەو ڕۆژەدا و زیندوکردنەوەی ئەم ڕۆژە بە چەندین کارو کردەوەی بیدعەو ناشەرعی....هتد.

جانەوانەی ڕابران بەشێك بوون لەگەورەیی وتایبەتمەندی و ڕوداو وسوننەت وبیدعە خراپەکانی ڕۆژی عاشورا، بە هیوای ئەوەین کە هەموو موسڵمانێك بەپێی شەرعی خودا ئەم ڕۆژە بە کار و کردەوە سوننەتەکان زیندوو بکاتەوە و خۆی لە کارو کردەوە بیدعەو حەرەمەکان بپارێزێت.

---

١ـ پێشەوا البیهقی لە الجامع لشعب الإیماندا گێڕاویەتەوە و دەفەرموێت: ئەم فەرموودە لاوازە، وە ابن جوزی شلە (الموضوعات: ٢/٢٠٣)دا باسی کردووە، براوانە: (الجامع لشعب الإيمان:٥/ ٣٣٤.

٢ـ ڕوناکی رب العالمین:٢/٢٩٠

# یادی مەولودی

# پێغەمبەر ﷺ

# لە١٢ی ربیع الأول

# یادی مەولودی پێغەمبەرﷺ لە ١٢ی ربیع الأول[1]

سالأنە زۆرینەی موسڵمانان لە زۆرینەی وولأتانی جیهانی ئیسلامیدا لە ڕۆژی ١٢ی ربیع الأولدا بە چەندین شێوەی جۆراو جۆر یادی لە دایکبونی پێغەمبەرﷺ دەکەنەوە ، لەم ڕۆژەدا موسڵمانان بە چەندین شێواز خۆشحاڵی خۆیان دەردەبڕن بە بۆنەی ئەم ڕوداوە گەورەیەی مێژووەوە، بەشێکیان خۆشحاڵی خۆیان بە بەڕۆژو بون دەردەبڕن، بەشێکی تر بە بەخشینی خواردن و شیرین و خێر و صەدەقات، بەشێکی تر بە سازکردنی کۆڕی مەولود و قورئان خوێندن و خوێندنەوەی سرود و قصائد بە باڵای پێغەمبەرداﷺ .... هتد ، جا ئەم بۆنەیە بەم شێوەیە فراوانە بۆ یەکەم جار لە سەدەی شەشەمی کۆچی لەسەر دەستی پادشای ئازاو زانا و دانا و هۆشمەند مظفر أبو سعیدی کوکبری پادشای هەولێر داهێنراوە، لەم کاتەوە هەتا ئێستا موسڵمانان بەردەوامن لەسەر یادکردنەوەی ئەم بۆنەیە.

## حوکمی یادکردنەوەی مەولودی پێغەمبەرﷺ

لە سەرەتای پەیدابوونی ئەم یادەوە هەتا ماوەی سەدەیەك کۆدەنگی زانایان ـ إجماع ـ یان شێوە کۆدەنگی ـ شبه الإجماع[2] ـ لە سەر ئەوە بووە کە ئەم یادە کارێکی ڕەواو پەسەندە، وە نە بیستراوە لەو ماوەیەدا هیچ زانایەکی مجتهد ئەم یادەی ڕەتکردبێتەوە، وە پاشانیش ئەم یادە هەتا ئێستا بەردەوەم بووە و زۆرینەی زانایانی ئوومەت بە کارێکی باش و پــڕ خێریان ئەژمار کردووە و خەڵکیان لەسەر ئەنجامدانی هانداوە، وە لەم سەردەمەشدا لە زیاتر لە سەد وولأتی دوونیا بــە

١ـ تێبینی: لێرەدا بەکورتی باسی یادی مەولودم کردووە و بەڵگەکانیش و ووتەی زانایانیشم بەکورتی نوسیون ، بۆ بینینی زیاتری بەڵگەکان و ڕای زانایان لەسەر ئەم یادە بڕوانە بۆ کتێبی: (بەڵگە یەکلاکەرەوەکانی) نووسەر.

٢ـ بڕوانە: دار الإفتاء المصری.

مەراسیمی تایبەت ئەم یادە دەکرێتەوە ، وە لە کوردستانیش لە ئێستادا سوپاس بۆخودا (شبە الإجماع) لەسەر ڕەوایی ئەم یادە دامەزراوە" چونکە هەم زانایانی شوێنکەوتووی چوار مەزهەبەکەو وە هەم شێخان و زانایانی ئەهلی تصوف و وە هەم حیزبە ئیسلامیەکانیش بە گەرم و گوڕی ئەم یادە دەکەنەوە، هەتا مامۆستا علی باپیر ئەمیری کۆمەڵی ئیسلامی لە کتێبی: (جەژن و یاد بۆنەکان و هەڵوەستەیەك)دا لە چەندین جێگادا ئاماژەیی بە ڕەوایی ئەم یادە داوە،[1]ئەمە جگە لەوەی کە زۆرینەی هەرە زۆری موسڵمانانی کوردستان ساڵانە زۆر بە گەرم و گوڕی و هەرکەسەو لە لای خۆیەوە بە چالاکیەکی تاکە کەسی یان دەستەجەمعی ئەم یادە بەرز و پیرۆز ڕادەگرن، پێغەمبەری خۆشەویستیشﷺفەرموویەتی:(ما رآهُ المسلونَ حسناً، فهوَ عنداللهِ حسنٌ)[2]واتا: هەر شتێك موسڵمانان بە باش و جوان وچاکی بزانن ئەوە لای خودای پەروەردگاریش باش و جوان و چاکە. وە زانایانیش بۆ ڕەوایی دان بەیادی مەولود چەندین بەڵگەیان لە قورئان وسوننەت پێیە، ئەوانەی خوارەوەش بەشێکن لەو بەڵگانە:

١ـ خودای گەورە(جل جلاله)دەفەرموێت:﴿قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ﴾[3]واتا: ئەی پێغەمبەر ﷺبەموسڵمانان بڵێ بەو زانستەی خودا پێیداون و بەهاتنی تۆ خۆشحاڵ بن. گەورەمان ئیبن عباس رضي الله عنهما لە شیکردنەوەی ئەم ئایەتەدا دەفەرموێت: ﴿فضل الله﴾ العلم ﴿ورحمة﴾ محمدﷺ[4] واتا: فەزڵی خودا زانستە و ڕەحمەتەکەشی محمدەﷺوەخودای گەورە (جل جلاله) پێغەمبەری خۆشەویستیﷺبە ڕەحمەت ناوبردووەو دەفەرموێت: ﴿وماأَرۡسَلۡنَٰكَ وَمَآ إِلَّا

---

١ـ جەژن و یاد بۆنەکان و هەڵوەستەیەك ، علی باپیر: ١٠٩وە ١٣٧وە ١٤٣.

٢ـ پێشەوا احمد بەسەنەدێکی (حسن) گێڕاویەتەوە .

٣ـ یونس : ٥٨

٤ـ الدر المنثور: ٢/ ٣٠٨

رَحۡمَةٗ لِّلۡعَٰلَمِينَ﴾[1].واتا: ئەی محمدﷺ ئێمە تۆمان نەناردووە بە پێغەمبەرﷺ تەنها بۆ ئەوە نەبێت کە ببیتە ڕەحمەت بۆ هەموو جیهانیان.

٢ـ خودای گەورە دەفەرموێت :﴿وَذَكِّرۡهُم بِأَيَّىٰمِ ٱللَّهِۚ﴾[2]واتا: ڕۆژانی تایبەتی خودایان بیربخەرەوە، گەورەمان ابن عباس رضي الله عنهما، وە پێشەوایان مجاهد و قتادە رحمهما الله دەفەرمون: (بنعمِ اللهِ علیهم)[3]واتا:ڕۆژانێکیان بیربخەرەوە کە خودای گەورە تیایدا نیعمەتێکی دیاریکراوی پێداون، وە هیچ گومانێکیش نیە کە گەورەترین نیعمەت کە خودای گەورە بە نەوەکانی ئادەمی داوە ناردنی پێغەمبەری خۆشەویستەﷺ. بەواتای ئەوەی کە لەلایەن خوداوە فەرمانمان پێکراوە یادی ئەم جۆرە بۆنانە بکەینەوە . واللە أعلم .

٣ـ پێغەمبەری خۆشەویستﷺ وەك خۆشحاڵی دەربڕین بۆلەدایکبونی خۆی بەڕۆژو بووە، قتادە رحمه الله دەفەرموێت: پرسیار لە پێغەمبەری خوداﷺکرا بۆ لە ڕۆژانی دوو شەممەدا بە ڕۆژو دەبیت؟ لە وەڵامدا فەرموی: (هذا یومٌ وُلِدتُ فیهِ)[4]واتا: ئەمە ڕۆژێکە تیایدا لە دایکبووم.

* جا ئەم فەرموودەیە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ڕێزی لە ڕۆژی لەدایکبونی خۆی گرتووە و یادی کردوتەوە. واللە أعلم.

٤ـ ئیبن حجری عەسقەلانی رحمه الله دەفەرموێت: بنچینەی مەولودم لە فەرمودەی(صحیحین) ـ بخاری مسلم ـ دەرهێناوە: (أنَّ النبيَ ﷺ قدِمَ المَدینةَ فوَجدَ الیهودَ یَصومونَ یومَ العــاشوراء

---

١ـ الأنبیاء: ١٠٧

٢ـ ابراهیم : ٥

٣ـ جامع الأحکام القرطبي: ٩/ ٢٩١

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە .

فَسأَلَهم فقالوا هو يومٌ أَغرقَ اللهُ فيه فرعونَ ونَجى موسى فنحنُ نَصومُهُ شكراً لِلهِ تعالى)واتا: كاتێك پێغەمبەری خوداﷺچو بۆ مەدینە بینی جولەكەكان لە ڕۆژی عاشوراء بەڕۆژو دەبن ، پرسیاری لێكردن بۆ لەم ڕۆژەدا بەڕۆژوو دەبن ؟ گوتیان: لەم ڕۆژەدا خودای گەورە فیرعەون خنكاند و موسای ڕزگاری كرد ، بۆیە وەك سوپاس گوزاری بۆخودا بە ڕۆژو دەبین ، پێغەمبەری خوداﷺفەرمووی : ئێمە لە پێشترین بە موسا لە ئێوە بۆیە ئێمەش بە ڕۆژو دەبین .

جا ئەم فەرمودەیە سودی ئەوە دەگەیەنێ كە دەبێت بەكردەوە سوپاسی خودا بكرێت بەرامبەر ئەو منەتەی لە ڕۆژێكی دیاریكراودا بەخشیویەتی لە پێدانی نیعمەت یان لادانی نەهامەتی ، وە ئەم یادەش هەمو ساڵێك لە هەمان ڕۆژدا دووبارە بكرێتەوە،وە سوپاس گوزاری خوداش بە هەمو جۆرە خودا پەرستیەك دێتە جێ وەك : سوجدەو ڕۆژوو بەخشین و قوڕئان خوێندن ، وە چ نیعمەتێك هەیە گەورەتریێت لە پەیدا بونی پێغەمبەری ڕەحمەتﷺ بۆیە پێویستە و شایەنە ئەم ڕۆژە بە دیاری كراوی یاد بكرێتەوە ، بۆ ئەوەی هاوتا بێت لەگەڵ چیرۆكی موسا لە ڕۆژی عاشوراو [1].

جا ئەمانەی ڕابران بەشێكن لە بەڵگەی ئەو زانایانەی كە یادی مەولودی پێغەمبەرﷺ بەكارێكی باش و ڕێگا پێدراو دەزانن ، وە زۆر بەڵگەی تریش لەبەر دەستە لەسەر دروستی یادی مەولودی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ بەڵام لە ترسی درێژبونەوە نەمان نوسیون.

## ئایا یادی مەولودی پێغەمبەرﷺعادەتە یان عیبادەت؟

زۆرجار ئەم پرسیارە لای موسڵمانان دەوروژێنرێت: ئایا مەولودی پێغەمبەرﷺ عادەتە یان عیبادەت؟ ئەگەر عیبادەتە بۆ پێغەمبەرﷺ نەیكردووە؟

---

١ـ الحاوی للفتاوی : ٢٠٦

وەلاّم/ یادی مەولودی پێغەمبەرﷺ عادەتە، بنچینەی عادەتەکانیش ڕەوایەتیە:(**الأصلُ في الأشياءِ الإباحةُ**).بەواتای: عادەتەکان پێویستیان بە بەلگە نیە بۆ جێگیرکردنیان، بەلکو کەسێك ڕەتیان بکاتەوە دەبێت بەلگەی پێبێت بۆ ڕەتکردنەوەی. بەلاّم چەندین عادەت هەیە بە نیەتی باش یان بەبەکارهێنانیان لە ڕێی چاکەدا دەبن بە عیبادەت، قاعیدەیەکی أصولی هەیە دەفەرموێت: (**النيةُ الصالحةُ تحولُ المباحاتَ إلى الطاعاتِ**)واتا: نیەتی چاك کارە ڕەوایەکان دەکاتە عیبادەت. بۆ نمونە:

١ـ أبو زەڕی غەففاریرَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (... **وفي بُضعِ أحدِكُم صَدَقَةٌ**) واتا: کاتێك یەکێکتان سەر جێیی لەگەلّ خێزانی دەکات خێری بۆدەنوسرێت. هاوەلّەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئێمە بۆ دامرکانەوەی ئارەزوی خۆمان دەچینە لای خێزانمان ئایا لەگەلّ ئەوەشدا خێرمان بۆ دەنوسرێت؟! قال: (**أَرَأَيتم لَو وضَعَها في حرامٍ أكان عليهِ فيها وزرٌ، فكذلكَ إذا وضَعَها في الحلالِ كانَ لَهُ أجرٌ**)[1]واتا: ئایا ئەگەر بێت و کەسێك دامێنی لە ڕێگایەکی حەرام بەکار بێنێت و ئارەزوی لە حەرامدا دامرکێنێتەوە گوناهبار نابێت؟ بەهەمان شێوە ئەگەر کەسێکیش لە حەلاّلدا بەکاری بهێنێت ئەوە خێری بۆ دەنوسرێت.

جا هەموو کەسێك دەزانێت کە کاری سەرجێیی ـ جماع ـ عادەتە و عیبادەت نیە، بەلاّم کەسێك بە نیەتی ئەوەی خۆی لە زینا بپارێزێت، یان بە نیەتی مندالّی صالح و زیادکردنی ئومەتی پێغەمبەرﷺبچێتە لای خێزانی ئەوە بۆی دەبێت بە عیبادەت و خێری بۆ دەنوسرێت.

٢ـ زەردەخەنە و ڕوخۆشی عادەتە، بەلاّم کەسێك بە نیەت و مەبەستی دلّخۆشکردنی برایەکی موسلّمانی زەردەخەنە بکات و ڕوی خۆشبێت ئەوە خێری بۆ دەنوسرێت و بۆی دە بێتـــە

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

عیبادەت،أبو زەڕڕی غەففاری رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لەپێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (تَبَسُّمُكَ فِي وجهِ أخيكَ لكَ صدقةٌ..)[1] واتا: زەردەخەنەیەکت بەرامبەر برای موسڵمانت خێرت بۆ دەنوسرێت.

٣ـ ابن عمر رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا دەفەرمووێت: پیاوێك بەلاماندا تێپەڕی، ئێمەش سەرمان سوڕما لە هێز و تواناکەی و گووتمان: خۆزگە ئەم هێزو توانایەی لە پێناوی خودادا بەکار هێنابایە، دواتر چووین بۆلای پێغەمبەر ﷺ و بۆمان باس کرد، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (إن كانَ يَسْعى على أَبَوَيه شَيخَينِ كَبيرَينِ فَهوَ في سَبيلِ اللهِ ، وإن كانَ يَسعى على وَلَدِهِ صِغار فَهوَ في سَبيلِ اللهِ،و إن كانَ يسعى على نفســــــهِ لِيُعِنَها فهو في سبيلِ اللهِ)[2]واتا: ئەگەرکۆشش بکات بۆ ئەوەی بژێوی دایك و باوکە پیرەکەی پەیدا بکات ئەوە لە پێناوی خودا دایە، وە ئەگەر کۆشش بکات بۆ ئەوەی بژێوی منداڵەکانی پەیدا بکات ئەوە لە پێناوی خودا دایە، وە ئەگەر کۆشش بکات بۆ ئەوەی بژێوی خۆی پەیدا بکات ئەوەش لە پێناوی خودا دایە.

جا لای هەموو زانایان ئاشکرایە کە کاسبی کردن و پەیداکردنی بژێوی ژیان عادەتەو عیبادەت نیە، بەڵام لە تێگەیشتنی ئەم فەرموودە ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت : کە ئەگەر کەسێك بە نیەتی باش و بەمەبەستی پەیداکردنی بژێوی ژیانی ماڵ و خێزان و بۆ ئەوەی پێویستیان بەکەس نەبێت کاسبی بکات" ئەوە بۆی دەبێتە عیبادەت. وە جگە لەمانەش هەرکەسێك هەر کارێکی ڕەوا بە نیەتێکی خێر بکات ئەوە بۆی دەبێت بە عیبادەت بۆنمونە: کەسێك نان دەخوات بۆ ئەوەی توانای خودا پەرستی هەبێت، کەسێك دەخەوێت بۆ ئەوەی بۆ شەونوێژ هەڵسێتەوە، وەیان کەسێك منداڵەکانی پەروەردە دەکات بۆ ئەوەی لە ئایندەدا ببێتە کادیرێکی ئەم دینە، وە

---

١ـ پێشەوا ترمزی گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە.

یان خوێندکارێك هەوڵدەدات بۆ ئەوەی نمرەیەکی باش بە دەست بێنێت و ببێتە دکتۆرێك بۆ ئەوەی چارەسەری موسڵمانان بکات یان ببێتە ئەندازیارو نەخشەی بینای مزگەوتێك بکێشێت ....هتد ئەوانە هەمووی دەبێتە عیبادەتە، چونکە وەك گوتمان نیەتی باش کارە ڕەواکان دەکەن بە عیبادەت، وە پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (إنَّما الأعمالُ بالنيّاتِ)[1]واتا: هەموو کردەوەیەك بەپێی نیەتی خاوەنەکەی پاداشت و سزای لەسەرە.

جا مەولودی پێغەمبەریشﷺ عادەتە، بەڵام بە پێی نیەتی خاوەنی مەولودو وە بەو کردەوانەی کە لەناو مەولوددا ئەنجام دەدرێن وەك: قورئان خوێندن و صەلاوەت دان لەسەر پێغەمبەرﷺ و باسکردنی ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ و بەخشینی شیرینی و سازکردنی خواردن و خواردنەوە و بانگهێشتکردنی موسڵمانان، ئائەوانە مەولود لە عادەتەوە دەکەن بە عیبادەت. والله أعلم.

## شوناسی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ناوی محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب ی کوڕی هاشمی کوڕی عبدالمناف ی کوڕی قوصەی کوڕی کیلاب ی کوڕی موڕڕەی کوڕی کەعبی کوڕی لوئەی کوڕی غالیبی کوڕی فوهەیری کوڕی مالك ی کوڕی نەزری کوڕی کینانەی کوڕی حوزەیفەی کوڕی مودریکەی کوڕی ئیلیاس ی کوڕی موزەڕی کوڕی نیزاری کوڕی مەعەدی کوڕی عەدنانی .....کوڕی اسماعیلی کوڕی إبراهیم ی پێغەمبەرە علیهما السلام.[2]

دایکی ناوی: ئامینەی کچی وەهەبی کوڕی عبدالمناف ی کوڕی زوهرەی کوڕی کیلابی کوڕی

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ البداية والنهاية لإبن الكثير ، دار التوفيقية: ٢/ ٦٢٨

موڕڕەی کوڕی کعب ی کوڕی لوئەی کوڕی غالیب ی کوڕی فیهره[١].

وە دایك و باوکی پێغەمبەری خودا ﷺ لە ئادەمەوە علیه السلام هەتا دەگاتە عبدالله ی باوکی هەموویان لەسەر گرێبەستێکی شەرعی کۆبونەتەوەو هاوسەرگیریان کردووە، ابن عباس رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(ما ولدَني مِنْ نِكاحِ أهلِ الجاهليةِ شيءٌ، ما وَلدني إلا نِكاحٌ كنكاحِ الإسلامِ)[٢] واتا: من لە هیچ هاوسەرگیریەکی سەردەمانی نەفامی لە دایك نەبووم، بەڵکو باوان و باپیرانی من هەموویان لەسەر گرێبەستی هاوسەرگیری هاوشێوەی ئیسلام کۆبوونەوە و منیشیان لێ لەدایکبووە. وە لە فەرموودەیەکی تردا گەورەمان علی کوڕی ابی طالب رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (خرجتُ من نكاحٍ و لم أُخرَج من سِفاحٍ من لَدن آدمَ إلى أن وَلدَني أبي و أُمي و لم يصبني مِن سفاحِ الجاهليةِ شيءٌ)[٣] واتا: من لە هاوسەرگیری شەرعی هاتووم و لە پەیوەندی جنسی ناشەرعیەوە نەهاتووم، لە ئادەمەوە هەتا گەیشتۆتە دایك و باوکم هەموویان بە گرێبەستی هاوسەرگیری شەرعی کۆبوونەتەوە و هیچ کامێکیان لە پەیوەندی جنسی نەفامی کوتەبوونەتەوە.

## پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ هەڵبژێردراوی ناو هەڵبژێردراوەکانە

پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ بە شاهیدی خودای پەروەردگار گەورەترینی هەموو بونەوەرە، چونکە لە ناو بونەوەرەکاندا مرۆڤ لە هەموویان ڕێزدارترە، خودای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿ وَلَقَدْ كَرَّمْنَا بَنِي آدَمَ ﴾[٤] واتا: بە ڕاستی ئێمە ڕێزمان گرتووە لە نەوەکانی ئادەم. وە ئەم ڕێزە دووبارە

١ـ السيرة النبوية لإبن هشام، دار التوفيقية : ١/١٠٠

٢ـ پێشەوا طبرانی بەسەنەدێکی(حسن) گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا طبرانی بەسەنەدێکی(حسن) گێڕاویەتەوە.

٤ـ الإسراء : ٧٠

لەوە دەردەکەوێت کە: فریشتەکان پاکترین بوونەوەرن و هیچ تاوانێك ناکەن:﴿ لَا يَعْصُونَ اللَّهَ مَا أَمَرَهُمْ وَيَفْعَلُونَ مَا يُؤْمَرُونَ﴾[1] واتا: ئەو فریشتانە لە هیچ شتێکدا بێ فەرمانی خودا ناکەن و هەر فەرمانێکیان پێبکرێت جێبەجێی دەکەن. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاتێك خودای گەورە ئادەمی علیه السلام دروستکرد فەرمانی بە فریشتەکان کرد سوجدەی ڕێزی بۆ بەرن، ئەم سوجدەیەش ئەوە دەردەخات کەمرۆڤی چاك و خوا پەرست لە فریشتەکانیش ڕێزدارترە لای پەروەردگار، وە خودای گەورە لە سورەتی (البينة)دا زۆر بەئاشکرا باسی ڕێزداری مرۆڤە چاکەکان دەکات بەسەر هەموو بونەوەرەکانیداو دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ﴾[2] واتا: بێگومان ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و پاشان کردەوەی چاکە دەکەن " ئائەوانە باشترینی سەر ڕوی زەوین.

جا لەناو مرۆڤەکانیشدا پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام لە هەموانیان ڕێزداترن، وە لەناو پێغەمبەرەکانیشدا هەندێکیان لە هەندێکی تریان گەورەتر و ڕێزدارترن خودای گەورە دەفەرموێت:﴿ وَلَقَدْ فَضَّلْنَا بَعْضَ النَّبِيِّينَ عَلَى بَعْضٍ﴾[3] واتا: بێگومان ئێمە هەندێك لە پێغەمبەرانمان فەزڵ داوە بەسەر هەندێکی تردا، وە لەناو هەموشیاندا پێغەمبەری ئیسلام گەورەمان محمدی کوڕی عبدالله ﷺ لە هەموویان گەورەتر و ڕێزداتر و خۆشەویستترە لای خودای گەورە، ئەم گەورەیی و ڕێزەشی بۆ دوونیاو قیامەتە، ئەم ڕێزو گەورەیەش لەوەوە دەردەکەوێت کە خودای پەروەردگار هەر پێغەمبەرێکی ناردبێت پەیمانی لێوەرگرتووە کە ئەگەر بێت و لەسەردەمی ئەودا پێغەمبەری ئیسلام بێت دەبێت دوای بکەوێت و یارمەتی بدات و سەری بخات ﴿ وَإِذْ أَخَذَ اللَّهُ مِيثَاقَ النَّبِيِّينَ لَمَا آتَيْتُكُم مِّن كِتَابٍ وَحِكْمَةٍ ثُمَّ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مُّصَدِّقٌ لِّمَا

١- التحريم: ٦

١- البينة : ٧

٢- الإسراء: ٥٥

مَعَكُمْ لَتُؤْمِنُنَّ بِهِ وَلَتَنصُرُنَّهُ قَالَ أَأَقْرَرْتُمْ وَأَخَذْتُمْ عَلَى ذَلِكُمْ إِصْرِي قَالُوا أَقْرَرْنَا قَالَ فَاشْهَدُوا وَأَنَا مَعَكُم مِّنَ الشَّاهِدِينَ﴾[1] واتا: بیریان بخەرەوە کاتێك خودای پەروەردگار پەیمانی لە یەکە یەکەی پێغەمبەران وەرگرت لەو کاتەی کە پێغەمبەرایەتی و کتێب و حیکمەتی پێبەخشین، بەوەی کە ئەگەر هاتوو لە ئایندەدا پێغەمبەرێکم بۆ ڕەوانە کردن ئەوەی ئێوەی بەڕاست دادەنا، ئەوە دەبێت ئێوە دوای بکەون و باوەڕی پێبهێنن و یارمەتی بدەن،ئینجا خودای گەورە فەرمووی: ئایا بڕیارتان داو پەیمانی منتان بەم شێوەیە وەرگرت؟ ئەوانیش گووتیان بڕیارمان داو هەر وادەکەین، ئەوسا خودا فەرمووی: دەبەشایەت بن و منیش لەگەڵ ئێوەدا یەکێکم لە شاهیدەکان.

وە پێغەمبەری خوداﷺ دەربارەی ڕێزوە گەورەیی خۆی بەسەر پێغەمبەراندا دەفەرمووێت: (أنا سَيدُ ولدِ آدمَ يومَ القيامةِ و لا فخرَ)[2] واتا: من گەورەی هەموو نەوەکانی ئادەمم لە ڕۆژی قیامەتدا و شانازیش ناکەم.جا ئەم گەورەیەی لە ڕوی نەفسەوەیە، واتا وەك نەفسێك پێغەمبەری خوداﷺ لە هەموو کەسێك گەورەترو ڕێزدارترە.

ئینجا لە ڕوی ڕەچەڵەکیشەوە ڕەچەڵەکی پێغەمبەرﷺ لە ڕەچەڵەکی هەموو مرۆڤێکی سەر ئەم زەویە گەورەتر و پاکترە ، ئێمە پێشتر گووتمان: کە هەموو باوان و باپیرانی پێغەمبەرﷺ بە گرێبەستی شەرعی کۆ بوونەتەوە ، وە جگە لەوەش هەموو باوك و باوانی پێغەمبەر ﷺ، وە هۆزو بنەماڵەکەی هەڵبژێردراو تاقانە بوون، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ اصطَفى من وَلَدِ إبراهيم إسماعيل ، واصطَفى من بني إسماعيل بني كِنانةَ، واصطفى من بني كِنانةَ قُرَيشاً، واصطَفى من قُرَيشَ بني هاشم ، واصطَفاني مِن بَني هاشِم)[3] بەڕاستی خـــودای

١- آل عمران: ٨١

١- پێشەوا مسلم گێراویەتەوە.

٢- پێشەوا مسلم گێراویەتەوە.

پەروەردگار لە منداڵەکانی إبراهیم إسماعیلی هەڵبژارد، وە لە نەوەکانی إسماعیل نەوەکانی کینانەی هەڵبژارد، وە لە نەوەکانی کینانە قورەیشی هەڵبژارد، وە لە ناو قورەیشدا نەوەکانی هاشمی هەڵبژارد ، وە لەناو هەموو نەوەکانی هاشمدا منی هەڵبژراد.

وە لە فەرموودەیەکی تـــردا گەورەمـــان عەبباسی کوڕی عبدالمطلب رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ چۆ سەر مینبەرو فەرمووی: (من أنا؟)واتا: من کێم؟ گووتیان: (أنتَ رسولُ الله)واتا: تۆ پێغەمبەری خودای، ئینجا فەرمووی: (أنا محمد بن عبدالله بن عبدُالمطلب، إنَّ اللهَ خَلَقَ الخَلقَ فجَعَلَني في خيرِ خَلقهِ ،وجَعَلَهُم فرقَتَينِ فَجَعَلَني في خيرِ فِرقةٍ، و خَلَقَ القبائِلَ فجَعَلَني في خيرِ قبيلةٍ ، و جَعَلَهُم بيوتاً فجعَلَني في خيرِهِم بيتاً، فأنا خيرُكُم بيتاً و خيرُكم نفساً)[1]واتا: من محمدی کوڕی عبدالله ی کوڕی عبدالمطلبم ، بەڕاستی کاتێك خودا دروستکراوەکانی دروستکرد منی گێڕا بە باشترینی دروستکراوەکانی، ئینجا خەڵکی کرد بە دوو بەشەوە ، منی گێڕا لە باشترینی بەشەکانی ، پاشان هۆزەکانی دروستکرد منی گێڕا لە باشترینی هۆزەکان ، دواتر ماڵەکانی دروستکرد منی گێڕا لە باشترینی ماڵەکان. بێگومان من باشترینی ماڵ و باشترینی کەستانم.

جا ئێستا بۆمان دەرکەوت کە پێغەمبەری خوداﷺ (هو أشرف الناس نفساً و نسباً) باشترین کەسە هەم لە ڕووی ڕەچەڵەکەوە ، وە هەم لەڕوی کەسێتیەوە.

## لەدایکبون و معجیزەکانی هاوکاتی لەدایکبونی پێغەمبەرﷺ

پێغەمبەری خوداﷺ بە کۆدەنگی زانایانی مێژوو نوس لە ڕۆژی دوو شەممە لەدایکبووە، وە زۆرینەی زانایانیش لەسەر ئەوەن کە ئەو ڕۆژە(١٢ی ربيع الأول) بووە، وە یەکدەنگی هەیە لەسەر

---

١ـ پێشەوا احمد بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویەتەوە .

ئەوەی کە لە ساڵی بەسەرهاتی (فیل)دا و لە ماڵی أبو طالبي مامیدا لە دایکبووە[1]

جا لە سەرودەم و ساڵ و شەو و ڕۆژی لەدایکبوونی پێغەمبەرداﷺ دا چەندین معجیزە و ڕوداوی سەرسوڕهێنەر ڕویاندا کە هەندێکیان پێغەمبەرﷺباسی کردوون وە هەندێکیان مێژوو نوسان تۆماریان کردوون، کە هەموویان ئاماژە بوون لەسەر گۆڕانی باری دوونیا و دەرکەوتنی خۆری خۆشبەختی بۆ تەواوی دوونیا بە گشتی ومرۆڤایەتی بەتایبەتی، ئێمە لێرەدا گرنگترین ئەم ڕووداوانە تۆمار دەکەین :

یەکەم/ نوێکردنەوە و دووبارە دەرخستنەوەی ئاوی زەمزەم لە لایەن عبدالمطلبی باپیری پێغەمبەرەوە: گەورەمان علی کوڕی أبی طالبؓدەفەرموێت: عبدالمطلب گووتی: من لە حیجردا خەوم لێکەوتبو لەو کاتەدا کەسێك هات و پێی گووتم: طـەیبە هەڵکەنە،گووتم: طـــەیبە چی یە؟ ئیتر بە ئاگا هاتمەوە. دەڵێت: ڕۆژی دواتر لە هەمان جێگادا خەوتبوم هەمان کەس هاتوو گووتی: بەڕڕە هەڵکەنە، گووتم: بەڕڕە چی یە؟ دیسان بە ئاگا هاتمەوە. دەڵێت: بۆ ڕۆژی سێهەم لە هەمان جێگا خەوتم ، دیسان هەمان کەس هات و گووتی: (مضمونة) هەڵکەنە، گووتم: (مضمونة[2])چی یە؟ دەڵێت: دیسان بە ئاگا هاتمەوە، دەڵێت: بۆ ڕۆژی چوارەم چومەوە هەمان جێگاو خەوتم بەهەمان شێوەکانی ڕابردوو کەسەکە هاتەوەو گووتی: زەمزەم هەڵکەنە، گووتم: زەمزەم چی یە؟ گووتی: ئاوێکە نەوشك دەکات و نە کۆتایی دێت، حاجیانێکی زۆر کە سەردانی ماڵی خودا دەکەن ئاوی لێدەخۆنەوە، دەشکەوێتە نێوانی پیسایی و گۆشتەوە، بڕۆ لەلای قەلە ڕەشی ڕان سپی و لای شارە مێرولەکە هەڵیکەنە. جا بەمە باسەکەی بۆ ئاشکرا بوو و جێگاکەی زانی و دڵنیا بو لەوەی کە ڕاستە، بە پاچێکەوە لەگەڵ حارثی کوڕیدا کە ئەوکـــات

---

١- ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ، صلابی: ١/٧٦

٢- (المضمونة) واتا: گران بەها.

تاقانەبوو رۆیشتن دەستیان كرد بە هەلكەندنی بیری زەمزەم، كاتێك لێواری بیرەكە وەدەر كەوت عبدالمطلب گووتی:(الله أكبر)، ئەوكات قورەیش بۆیان دەركەوت كە عبدالمطلب بە مەرامی خۆی گەیشت،ئەوانیش هاتن بۆ لای عبدالمطلب و گووتیان: ئەی عبدالمطلب ئەوە بیرەكەی إسماعیلی باپیرمانە و مافی ئێمەشی تێدا هەیە و دەبێت هاوبەشمان بكەیت تیایدا، گووتی: نەخێر كاری وا ناكەم، چونكە ئەوە شتێكە تەنها من پێی تایبەت كراوم لە ناو ئێوەدا،گووتیان: سكالآت لێدەكەین،ئەویش گووتی: كێتان پێباشە بچۆنە لای ئەو، گووتیان: دەچینە لای قەشەی بەنی سەعدی كوڕی هوزەیم لە بەرزاییەكانی شام،گووتی: باشە، جا عبدالمطلب و هەندێك لە خزمانی لەگەڵ كۆمەڵێك لە هۆزەكەی بەرێكەوتن بە بیاباندا، لە رێگەدا عبدالمطلب و خزمەكانی ئاویان لێبڕا، ئەوەندە تینو بوون هەتا گەیشتنە حاڵەتی خنكان، داوای ئاویان لە هاوەڵەكانیان كرد، بەڵام رازی نەبوون و ئاویان پێنەدان، گووتیان ئێمەش لە بیابان دەترسێین وەكو ئێوەمان لێبێت و تینو ببین،جا عبدالمطلب گووتی: وای بەباش دەزانم هەتا هێزمان تێدا ماوە هەریەكێكمان چاڵێك بۆ خۆی هەڵبكەنێت، ئینجا هەركەسێكمان مرد ئەوانی تر دەیخەینە ناو چاڵەكەوەو دایدەپۆشن، هەتا دەگاتە دواهەمین كەس، چونكە ئەگەر لاشەی كەسێك بفەوتێت باشترە لەوەی لاشەی كاروانێك بفەوتێت،گووتیان بەڕاستی فەرمانێكی باشت پێمان كرد، ئینجا هەركەسێك لەوان چاڵێكیان بۆ خۆیان هەڵكەند و دانیشتن چاوەڕێی مردنیان دەكرد لە تینوان، پاشان عبدالمطلب بە هاوڕێكانی گووت: سوێند بەخودا ئەم خۆ بەدەستەوە دانەمان بۆمردن بێدەسەلاتیە،هەڵسن بەرێ بكەوین، بەڵكو لەلایەكەوە ئاومان دەست بكەوێت،كە عبدالمطلب حوشترەكەی هەڵستا لە ژێر قاچەكانیەوە كانیەكی ئاو هەڵقوڵا، هەموویان دەستیان كرد بە گوتنی:(الله أكبر)و لەو ئاوەیان خواردەوەو لێشیان پڕكرد، ئینجا بانگی هۆزەكەشی كرد و ئەوانیش ئاویان خواردەوەو گووتیان: خوای گەورە حوكمی بۆتۆ سەپاند بەسەرماندا،سوێند بە خودا تازە ناچینە لای هیچ كەسێك سكالآت لێبكەین دەربارەی زەمزەم، ئەوكەسەی ئەو ئاوەی بۆتۆ هەڵقوڵاند لەم بیابانەدا هەر

ئەوکەسەش زەمزەمی پێداوی،لەبەر ئەوە بەسەر بەرزی بگەڕێوە بۆ لای ئاوی خۆت،جا هەموویان گەڕانەوە بۆ مەککە.(١)

جا دەرکەوتنەوەی ئاوی زەمزەم یەکەم نیشانە بوو بۆ دەرکەوتن و هاتنی پێغەمبەری ئاخیر زەمان سەروەرمان محمدﷺ، چونکە: ئەم ئاوە لەسەردەمی جورهومی خاڵۆی منداڵەکانی اسماعیلی پێغەمبەرەوە علیه السلام ونبوبو، هەتا لەسەر دەستی عبدالمطلبی باپیری پێغەمبەرەوە دەرنەکەوتەوە هەر ئی ونبوو،بەواتای: دوای لاوازبونی ئاینی ڕاستی لەسەر دەستی بنی جرهمەوە هەتا نزیکبونەوەی دەرکەوتنەوەی ئاینی ڕاستی لە نەوەکانی عبدالمطلب ئەم ئاوە هەر ونبوو.

دووەم/ بەسەرهاتی فیل: گوومان یەکدەنگی زانایان هەیە کە پێغەمبەرﷺلە ساڵی فیلدا لەدایکبووە، جا بابزانین ئەمساڵەی پێغەمبەریﷺ تێدا لەدایکبوو بۆ پێی دەگوترێت ساڵی فیل: پادشایەك هەبوو ناوی ئەبرەهە بوو، لە بنەچەدا حەبەشی بوو،کڵێسایەکی دروستکرد و ناوی لێنا(قوللەیس)، بانگەشەی ئەوەی دەکرد کە دەبێت لەمەو دوا خەڵکی حەج بۆ ئەم کڵێسەیە بکەن لە جیاتی ماڵی خودا(کعبە)، بڕیاریشیدا بە سوپایەکی گەورەوە کە فیل لە پێشیانەوە دەڕۆیی بە ڕێبکەوێت بۆ ڕوخاندنی ماڵی خودا لە مەککە، جا لە ڕێگادا لە لایەن چەند خاوەن هۆز و دەسەڵاتدارێکەوە توشی بەرەنگاربوونەوە هات بەڵام بەسەر گشتیاندا سەرکەوت، لەوانە: لەگەڵ پادشای حیمیەر و نوفەیلی کوڕی حەبیبی خەسعەمی، بەشەڕ هات بەڵام بەسەریاندا سەرکەوت و بەدیلی گرتن، جا کاتێك ئەبرەهە لە حەرەم نزیك کەوتەوە، پیاوێکی لە موغەممەس نارد بەسەرکردایەتی سوارەکانی و خەڵکی حەرەمی کۆکردەوەو دوو سەد حوشتری عبدالمطلبیشی لە(عیر الأراك)دەست بەسەردا گرت، پاشان حیمیەری نارد بۆ لای خەڵکی مەککەو چاوی بە

١ـ ئەم بەسەرهاتە پێشەوا بیهقی لە دلائل النبوە گێڕاویەتەوە و سەنەدەکەی(صحیح)ە ،وە بڕوانە:البدایة والنهایة،ابن کثیر:٢/٦١٨، وة السیرةالنبویة لإبن هشام:٩٤.

عبدالمطلب كەوت و ڕاسپاردەكەی پێڕاگەیاند، عبدالمطلب گووتی: ئێمەش شەڕی لەگەڵ ناكەین، جا عبدالمطلب بەڕێكەوت بۆ لای ئەبرەهە، ئەو پادشایەی لای ئەبرەهە دیل كرابوو ناوی(ژو نفر) بوو عبدالمطلبی دەناسی، پێیگووت: من هیچم پێناكرێت، بەڵام ئونەیسی لێخوڕی فیلەكەت لەگەڵ دەنێرم بۆ ئەوەی لای ئەبرەهە باست بكات،ئونەیس لای ئەبرەهە گووتی: ئەوە سەرگەورەی قوڕەیشە،خاوەنی مەككەیە، نانەری خەڵكە لە دەشتایی و دڕندەكان،لە چیا دووسەد حوشتری گیراوە لای پادشامان، جا ئەگەر بكرێت بیدەیتەوە و داوای مۆڵەت دەكات لای پادشامان، عبدالمطلب پیاوێكی باڵا بەرزی كەتەی ڕوخسار جوان بو، ئەبرەهە ڕێزی لێگرت و لەسەر جێگای خۆی دابەزی و لەگەڵی دانیشت، عبدالمطلب پێی گووت: ماڵێكی زۆرم لاتان گیراوە داوا دەكەم بیگێڕنەوە بۆم، ئەبرەهە گووتی: كەچاوم پێت كەوت سەرسام بووم پێت" بەڵام ئێستا لەبەر چاوم كەوتیت،گووتی: لەبەر چی؟ گووتی: من هاتووم بۆ ڕوخاندنی ماڵێك كە ئاینی خۆت و باپیرانتە، باسی ئەوەم لەگەڵ ناكەیت بەڵكو باسی دوو سەد حوشترم لەگەڵ دەكەیت! گووتی: من خاوەنی حوشترەكانم و ئەوماڵەش ـ كعبە ـ خاوەنی خۆی هەیە پارێزگاری لێبكات، ئەبرەهەش گووتی: هەرگیز ناتوانیت دەست بهێنیتە ڕێگام، گووتی: باشە ئەوە تۆو ئەوەش كەعبە، گووتی حوشترەكانی بۆ بگێڕنەوە، عبدالمطلب گەڕایەوەو قوڕەیشی لە بەسەرهاتەكە ئاگادار كردەوە، داواشی لێكردن بڵاوە بكەن بە چیاكاندا، ئەبرەهەش ئامادەكاری تەواوی كرد بۆ هێرش كردنە سەر مەككەو ڕوخاندنی ماڵی خودا، بەڵام فیلەكان كاتێك ڕویان پێ لە مەككە دەكردن لە جێگای خۆیان دەوستان وبە لێدانیش ڕێیان نەدەكرد، وە كاتێك پشتیان پێدەكردنە مەككەو ڕویان پێ لە یەمەن دەكردن بە گورجی و بە غاردان ڕێیان دەكرد، دواتر فیلەكە ڕوی كردە شاخێك و خودای گەورەش كۆمەڵە باڵدارێكی زۆری لە دەریاوە نارد بە شێوەی ڕیشوڵە، هەر باڵدارێك سێ بەردی هەڵگرتبو، دوان بە قاچەكانیان و یەكێكیش بە دەنوك، بەردەكان بە ئەندازەی نیسك و نوك دەبوون،ئەو بەردانەیان بەردەدایەوە بەر هەركەسێك لە سوپایەكە كەوتبا

دەیکوشت، بەڵام بەرهەمموو سوپایەکە نەکەوت،وە خودای گەورە بەڵایەکیشی نارد بۆ لاشەی ئەبرەهە، ئیتر بە تێکشکاوی گەڕانەوە، وە ئەبرەهەش پەنجەکانی بە دوای یەکدا دەوەرین، کاتێك گەیشتەوە یەمەن وەك بەچکە چوّلەکەی لێهاتبو، پاش ماوەیەك مرد.[1]

خودای گەورە ئەم ڕوداوە گەورەی لە قورئانی پیرۆزدا تۆمارکردووە و سورەتێکیشی بە ناوی ئەم معجیزەوە ناوناوە کە سورەتی(الفیل)ە:﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ تَرْمِيهِم بِحِجَارَةٍ مِّن سِجِّيلٍ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَّأْكُولٍ﴾ وە پێغەمبەری خوداشﷺ لە فەرموودەی(صحیح)دا باسی ئەم ڕوداوەی کردووە، عورِوەی کوڕی زوبەیررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُدەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺکاتێك لە حودەیبیە دەرچوو و گەیشتە جێگایەك حوشترەکەی بەچۆکدا هات،خەڵکەکە گووتیان: حەل حەل - برِۆ برِۆ- بەڵام حوشترەکە خۆیدا بەزەویداو نەدەڕۆیشت، گووتیان (قـەصواء) پەکی کەوت، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (ما خلأتِ القصوءُ، وما ذاك لها بخُلقٍ ، ولكن حَبَسَها حابِسُ الفيل)[2]واتا: نەخێر قـەصواء پەکی نەکەوت و ئەوەش ڕەوشت و نەریتی ئەو نیە، بەڵکو ئەوەی فیلەکانی بەند کرد ئەمیشی بەندکرد.

سێیەم/ خاتوو عائیشەرضی الله عنهادەفەرمووێت: پیاوێکی جولەکە هەبوو لە مەککە دادەنیشت و کاری بازرگانی دەکرد، کاتێك شەوی لەدایکبونی پێغەمبەرﷺ هات، ئەم پیاوە جولەکە لە دانیشتگایەکی قورەیشیەکان گووتی: ئەی قورەیش ئایا ئەمشەو هیچ منداڵێك لە دایکبووە؟ قورەیشیەکان گووتیان سوێند بە خودا نازانین، پیاوەکە گووتی: (الله أكبر)ئەگەر هەڵەتان کردبێت ئەوە هیچتان لەسەر نیە، بەڵام گوێبگرن و باش لەبەری بکـەن ئەوەی پێتـان دەڵێم: ئەمشـەو

١ـ السيرة النبوية لإبن هشام:٣٣-٣٩ وە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺ، صلابی: ٦٤.

٢ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

پێغەمبەری ئاخیر زەمان لە دایکبووە، لەناو شانەکانی نیشانەی پێغەمبەرایەتی هەیە و چەند مویەکی بەدوا یەکی پێوەیە وەك مووی سەر ملی ئەسپ وان، دوو شەوان شیر ناخوات چونکە دوو عیفریت لە ئەجیننەکان قامکیان خستوتە گەرویەوە و ناهێڵن شیر بخوات، خەڵکەکە دانیشتگایەکەیان چۆڵکرد، جا کاتێك چونەوە ماڵەوە هەرکەسە پرسیاری لە ماڵ و خێزانی کرد ئایا ئەمشەو هیچ منداڵێك لە دایکبووە؟ گووتیان: ئەمشەو عبدالله ی کوڕی عبدالمطلب کوڕێکی لە دایکبوە و ناویان ناوە محمد، پاشان خەڵکەکە بەیەکگەیشتنەوە بە یەکتریان گووت: ئایا قسەکانی جولەکەکەتان بیست؟ وە ئایا بیستوتانە ئەمشەو منداڵێك لە دایکبووە؟ ئینجا چوون بۆ لای جولەکەکەو هەواڵەکەیان پێڕاگەیاند، پیاوە جولەکەکەش گووتی: وەرن لەگەڵمدا با سەیری بکەم، لەگەڵیدا ڕۆیشتن هەتا گەیشتنە لای ئامینە و گووتیان: منداڵەکەتمان بۆ بێنە دەرەوە، ئەویش هێنایە دەرەوە و سەیری پشتیان کرد، ئەو نیشانەیەی بینی کە باسی کردبو، کاتێك پیاوە جولەکەکە ئەمەی بینی بورایەوە، کاتێك بە هۆش خۆی هاتەوە گووتیان: ئەوە بۆ وات لێهات هەی تیا بچیت؟ گووتی: سوێند بە خودا پێغەمبەرایەتی لە ناو نەوەی ئیسرائیلدا نەما، وە سوێند بەخودا ئەم پێغەمبەرەﷺ سەردەکەوێت بەسەرتاندا بەشێوەیەك هەواڵەکەی دەگاتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دوونیا.[١] وە زەیدی کوڕی عەمری کوڕی نەفیل دەڵێت: یەکێك لە پیاوە ئاینیەکانی مەسیحی لە شام پێی گووتم: لە شارەکەت پێغەمبەری ئاخیر زەمان دەرچووە یان دەردەچێت، چونکە ئەستێرەکەی دەرکەوتووە، جا بچۆ بۆ لای و بڕوای پێبهێنەو شوێنی بکەوە.[٢]

چوارەم/ لە شەوی لە دایکبونی پێغەمبەرداﷺ بومەلەرزەیەك لە هەیوانی کیسرای فارسی دا

١ـ البداية والنهاية: ١ـ٢/ ٦٤٠ـ ٦٤١

٢ـ هەمان سەرچاوە: ١ـ٢/ ٦٤٢

چوارده تاقی لێڕوخاند،وه هەر لەم شەوەدا موبیزان لە خەویا بینی چەند حوشترێکی سەر شێت چەند ئەسپێکی عەرابیان لێدەخوڕین و لە ڕووباری دیجلە پەڕینەوەو لە وولات بلاوبونەوە،کاتێك کیسرا بەیانی کردەوە زۆر لەم ڕوداوە ترسا، سەرەتا دانی بەخۆداگرت، بەلام خۆی پێنەگیراو دەست و پێوەندەکەی کۆکردەوە و پێی گووتن: دەزانن بۆچی کۆمکردونەتەوە؟ گووتیان: نەخێر، مەگەر پادشا بۆمان باس بکات، جا کاتێك لەم باسانەدابوون نوسراوێك هات کە تیایدا نوسرابو ئاگری فارسەکان لەم شەوەدا کوژاوەتەوە، لە کاتێکدا ئەم ئاگرە بۆ ماوەی هەزار سال بوو نەکوژابۆوە، جا کیسرا بەمەشیان دلتەنگیەکەی زیاتر بوو، پاشان بۆی باسکردن کە هۆکاری کۆبونەوەکەیان ڕوداوەکەی ئەمشەوی هەیوانی کیسرا بوو، وە لەم کاتەداموبیزانیش باسی خەونەکەی خۆی کرد بۆ کیسرا، جا کیسرا پرسی: ئەی موبیزان چۆن لەم خەون و ڕوداوانە دەگەیت؟ گووتی: ئەمە ئاماژەیە بۆ ئەوەی کـە ڕوداوێکی گەورە لە ناو عارەبان ڕوودەدات.[1]

جا ڕوخانی چوارده تاقی هەیوانی کیسرا ئاماژە بوو بۆ نزیکبوونەوەی کۆتایی هاتنی دەولەتی ساسانی و دەسەلاتی بنەمالەی کیسرا، کە بەشێوەیەکی کردەیی لە سەردەمی جێنشینی گەورەمان عومەری کوڕی خطاب ﷺ ئەم ڕووداوە هاتە جێ و دەسەلاتی بنەمالەی کیسرا کۆتایی پێهات و ئاخیر کیسراشیان کە یەزگورد بوو کوژرا، وە ئەمە هاتنە جێی خەوکەی موبیزانیش بوو کە سوارچاکەکانی سوپای ئیسلام هاتن و وولاتی فارسیان لە ژێر ستەمی کیسرا ڕزگارکرد، وە کوژانەوەی ئاگری عیبادەت خانەی فارسەکانیش ئاماژەبوو بۆ ئەوەی کە لەمەودوا ئاگرپەرستی بەرەو لاوازی و نەمان دەچێت، چونکە واهاتنی پێغەمبەری ڕەحمەتی یەکتا پەرست نزیکبوتەوە. والله أعلم.

پێنجەم/ ڕۆچون و وشك بوونی دەریاچەی ساوە.[2] یەکێکی تر لـــە ڕوداو و موعجیزەکـانی

١ـ البداية والنهاية: ١ـ٢/ ٦٤٢

٢ـ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە.

شەوی لەدایکبوونی پێغەمبەرﷺ بریتی بوو لە ڕۆچونی دەریاچەی ساوە لە شام.

شەشەم/ ئەو بتانەی کە بتپەرستەکان لە کەعبەدا دایان نابوون هەموویان بە دەمدا کەوتن و سەرەوخون بوون. ئەمەش ئاماژەیەك بوو بۆ نزیکبونەوەی کۆتاییهاتنی سەردەمی نەفامی و بت پەرستی و هاتنی ئاینی ئیسلامی یەکتا پەرستی.

حەوتەم/ نزیکبونەوەی ئەستێرەکانی ئاسمان لە زەوی و ڕوناکی بەخشینی کەل و پەلی ناو ماڵەکان: یەکێکی تر لە موعجیزەکانی شەوی لە دایکبوونی پێغەمبەرﷺ نزیکبوونەوەی ئەستێرەکانی ئاسمان بوو لە زەوی،وە کەل و پەلی ناو ماڵەکان وەك چرا ڕوناکیان دەبەخشی[1] احمد شەوقی دەڵێت:

وُلِدَ الهُدى فَالكائِناتُ ضياءُ      وفَمُ الزَّمانِ تَبَسُّـــمُ و ثَناءُ

الرُّوحُ والملأُ الملائِكُ حَولَهُ      لِلدِّينِ والدُّنيا بِهِ بُشـــراءُ

ئەمەش ئاماژەبوو بۆ هاتنی پەیامی ڕوناکی لە ئاسمانەوە، کە بەهۆیەوە هەموو ماڵێکی موسڵمان ڕوناك دەبێتەوە. والله أعلم.

هەشتەم/ خاتوو ئامینەی دایکی پێغەمبەرﷺ لە کاتی سکپڕی بە پێغەمبەرﷺو لە کاتی لە دایکبونیشی دا چەند معجیزەیەکی بینی،لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە کە لە شەوی وەسك کەوتنی پێغەمبەرداﷺ خاتوو ئامینە لە خەودا بینیویەتی کە نورێکی لێهاتوتە دەرەوە، وە لە شەوی لە دایکبونیشیدا بە ئاشکراو بە چاوی سەر بینی کە نورێکی لێهاتە دەر، پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (أنا دعوةُ أبي إبراهيم ، و بُشرى عيسى عليهماالسلام و رأت أُمي حينَ حَمَلَت بي أنَّهُ خَـــرَجَ مِنها نورٌ)[2]واتا: من نزاکـــەی باوکـــــم إبراهيمم عليه السلام وە

١- ژیانی پێغەمبەری ڕێزدار، عبدالله هەرتەلی:٣٥

٢- پێشەوا ابن اسحاق گێڕاویەتەوە بە سەنەدێکی(صحیح)

موژدەكەی عیسام علیه السلام وە دایكم كاتێك منی لە سكدا بوو بینی كە نورێكی لێهاتە دەرەوە.

جا ئەوانەی ڕابران بەشێك بوون لەو ڕووداو موعجیزانەی كە لەشەوی لە دایكبوونی پێغەمبەرﷺدا ڕویاندا، وە لە كتێبەكانی ژیانی پێغەمبەرداﷺ كۆمەڵێكی تری موعجیزە باس كراون ئێمە لەترسی درێژبوونەوە نەمان نوسین.

## ئایا دایك و باوكی پێغەمبەری خوداﷺ بەهەشتین یان دۆزەخین؟

لەم ڕۆژگارەدا چەندین بابەتی زەروریاتی دین هەیە پێویستە زانایانی ئاینی قسەی لەسەر بكەن و موسڵمانانی لێ ئاگادار بكەنەوە، بەڵام لە جیاتی ئەوە" بەشێك لە زانایانی ئاینی ووتاری تایبەت ساز دەكەن لەسەر ئەوەی كە باوك و دایك و باپیری پێغەمبەرﷺ لە دۆزەخن! جا ئەم بابەتە هەرچەندە لەكۆنەوە جێگای مشتومڕی زانایان بووە" بەڵام پێمواية لە هیچ سەردەمێك بە ئەندازەی ئێستا تەشەنەی نەسەندووە و ئاشوبی لە نێوان موسڵمانان دروست نەكردووە، لەبەر ئەوە بە پێویستی دەزانم كە تیشكێك بخەمە سەر ئەم بابەتە،

سەرەتا دەبێت ئەوە بزانین كە زانایان دەربارەی دایك و باوك و باپیری پێغەمبەرﷺ جیاڕان و دەبن بە دوویەشەوە، بەشێكیان پێیان وایە: كە دایك و باوك و باپیری پێغەمبەرﷺ لە دۆزەخن، بۆ ئەم گووتەشیان چەند بەڵگەیەك دێننەوە، وە بەشێكی تری زانایانیش پێیان وایە كە دایك و باوك و باپیری پێغەمبەرﷺلە بەهەشتن، بۆ ئەم گووتەشیان چەندین بەڵگەیان پێیەو وەڵامی بەڵگەكانی زانایانی بەشی یەكەمیش دەدەنەوە.

ڕای یەكەم/ دایك و باوك و باپیری پێغەمبەرﷺ لە دۆزەخن، ئەمەش ڕای (ابن كثیر و بیهقی[1] و بەشێك لە زانایانی سعودیەن ) ئەوەی خوارەوەش بەڵگەكانیانن:

---

١ـ بڕوانە: البداية والنهاية: ٢/٦٥٥

١ـ أبو هريرە رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ سەردانی گۆڕی دایکی کرد، دەستی کرد بە گریان، هەتا خەڵکی دەوروبەریشی گریاند، پاشان فەرمووی:(استأذنتُ رَبِّي فِي زيارةِ قَبرِ أمي فأَذِنَ لي،واستَأْذَنتُهُ في الإِستغفارِ لها فَلَمْ يَأذَن لي،فزوروا القبورَ تُذَكِّرُكُم الآخِرةَ)[1]واتا: داوام لە خودای پەروەردگار کرد ڕێگام بدات سەردانی گۆڕی دایکم بکەم، ئەویش ڕێگای پێدام، وە داوام لێکرد ڕێگام پێبدات داوای لێخۆشبونی بۆ بکەم ڕێگای پێنەدام، ئێوەش سەردانی گۆڕستان بکەن چونکە قیامەتتان بیر دەخاتەوە.

٢ـ ئەنەسی کوڕی مالیك رضي الله عنه دەفەرموێت: پیاوێك گووتی: يا رسولَ الله أينَ أبي؟ واتا: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ باوکم لە کوێیە؟ قال: (في النارِ)واتا: لەناو ئاگرە، فَلَمَّا قَفا دَعاهُ فقال: (إنَّ أبي وَ أباكَ في النّارِ)[2]واتا: جا کاتێك پشتی هەڵکرد" پێغەمبەرﷺبانگی کردو فەرمووی: باوکی من و باوکی تۆش لە ئاگردان .

٣ـ سەعد لە باوکیەوە ر بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: پیاوێکی دەشتەکی هاتە لای پێغەمبەرﷺ گووتی: باوکم کەسێك بوو پەیوەندی خزمایەتی جێبەجێ دەکرد، ئەو خێرە و ئەم خێرەی دەکرد، ئایا ئێستا لە کوێیە؟ پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (في النّار)واتا: لە ناو دۆزەخە، وكان الأعرابي وجد مِن ذلكَ، فقال: يا رسولَ الله أينَ أبوكَ؟ قال:(حيثُما مَرَرْتَ بقبرِ كافرٍ فَبَشِّرهُ بالنارِ) واتا: پیاوە دەشتەکیەکە بەمە شتێك لە دڵیدا دروست بوو، بۆیە گووتی: ئەی باوکی تۆ لەکوێیە ئەی پێغەمبەری خودا؟ ئەویش فەرمووی: بەلای گۆڕی هەر بێباوەڕێکدا ڕۆیشتی مژدەی دۆزەخی پێبدە.(فَأَسْلَمَ الأعرابيُّ بَعدَ ذلكَ)[3]دوای ئەمە دەشتەکیەکە موسڵمان بوو.

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە.

ڕای دووەم/ دایك و باوك و باپیری پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتن ئەمەش ڕای ئەم زانایانەیە: (جلال الدین سیوطی، بیجوری، فخرالدین الرازي، أبوبکر ابن عربی، مەناوی وعزالدین کوڕی عبدالسلام و فتوای زانایانی ئەزهەرو چەند زانایەکی تریش)

## بەڵگەکانیان و وەڵامی بەڵگەکانی ڕای یەکەم

زانایانی خاوەنی ئەم ڕایە وەڵامی بەڵگەکانی زانایانی خاوەنی ڕای یەکەم دەدەنەوە و چەندین بەڵگەش دێننەوە بۆ پاڵپشتی ڕاکەیان کە دەڵێن:دایك و باوك و باپیری پێغەمبەر ﷺ لە بەهەشتن، ئەمەی خوارەوەش وەڵام و بەڵگەکانیانن:

## وەڵامەکان

پێشەوا جلالدینی سیوطی رحمه الله لە کتێبی (الحاوی)دا باسێکی ناو ناوە:(مسالك الحنفا في والدي المصطفی)،لەم باسەدا وەڵامی هەموو ئەو بەڵگانەی ڕابردووی داوەتەوە، ئێمەش لێرەدا بە دەستکاریەوە و لە چەند خاڵێکدا ئەم وەڵامانە باسدەکەین:

١ـ ئەو کەسانەی کە ئەو فەرموودەیان گێڕاوەتەوە کە دەفەرموێت:(إنَّ أبي وأباك في النار) لەسەر ئەم ووشانە یەکدەنگ نەبوون،لە گێڕانەوەی حەمادی کوڕی سەلەمە لە ثابیت لە ئەنەسەوە رضي الله عنه ئەم دەقەی ڕابردوو هاتووە، بەڵام لە گێڕانەوەی موعەممەر لە ثابیتەوە ئەم ڕستەیەی: (إنَّ أبي وأباك في النار) تێدا نیە، بەڵکو لەم گێڕانەوەیەدا پێغەمبەری خودا لە جیاتی ئەم ڕستەیە بە پیاوەکەی فەرمووی: (إذا مَرَرْتَ بقبرِكافرٍ فَبَشِّرهُ بالنارِ)واتا: بەلای گۆڕی هەر کافرێکدا ڕۆیشتی مژدەی پێبدە بە ئاگری دۆزەخ، لەم دەقەشدا هیچ ئاماژەیەکی تێدا نیە بۆ ئەوەی کە باوکی پێغەمبەر ﷺ لە دۆزەخ بێت،

جا لە ڕوی گێڕانەوەی فەرموودەوە موعەممەر جێگیرترە لە حەماد، چونکە: هەرچی حەمادە

زانایان قسەیان هەیە لەسەر لەبەرکردنی ـ حفظ ـ ی، وە هەندێك حەدیثی مونکەڕیشی گێڕاونەوە، وە هەندێك دەڵێن کە کوڕی ژنەکەی هەندێك شتی هەڵبەستراوی خستۆتە ناو کتێبەکانیەوە، وە پێشەوا بوخاری رحمه الله هیچ فەرموودەیەکی لێوە نەگێڕاوەتەوە، وە هەرچی پێشەوا موسلیمیشە رحمه الله هیچ فەرموودەیەکی لە باسی (أصول) لێوەرنەگرتووە، تەنها ئەو فەرموودانە نەبێت کە لە ثابیتەوە گێڕاونیەوە. بەڵام هەرچی موعەممەرە زانایان هیچ قسەیەکیان لەسەر لەبەرکردنی نەبووە، وە هیچ فەرموودەیەکی مونکەڕیشی نیە، وە هەردوو زانایانی فەرموودە بوخاری و مسلیم یەکدەنگ بوون لەسەر ڕاستی فەرموودەکانی و فەرموودەیان لێوەرگرتووە. لەبەر ئەوە گێڕانەوەکەی موعەممەر پێش گێڕانەوەکەی حەمماد دەخرێت.[1]

٢ـ ئەم دەقە ئەگەر جێگیریش بێت، ئەوە ڕووە ئاشکراکەی دژ دەوەستێت لەگەڵ چەند ئایەت وفەرموودەیەکی تری صحیح کە دواتر باسیان دەکەین، قورئانیش لە ڕوی بەڵگەوە لە فەرموودە بەهێزترە، بنچینەیەکیش هەیە دەفەرموێت: (الحديثُ الصَحيح إذا عارَضَهُ أدلةٌ أُخرى هيَ أرجحُ مِنهُ وجبَ تأويلهُ)واتا: هەرکاتێك فەرموودەیەکی صحیح تێکگیرا لەگەڵ بەڵگەیەکی لەخۆی بەهێزتر پێویستە لێکدانەوەیەکی تری بۆ بکرێت ـ تأويل بکرێت ـ لەبەر ئەوە ئەم فەرموودانە لێکدانەوەی تریان بۆ دەکرێت کە دیارتین لێکدانەوەکانیان ئەمانەن:

أـ کاتێك پێغەمبەری خوداﷺدەفەرموێت: (واستَأْذَنْتُهُ في الإِستغفارِ لها فَلَمْ يَأْذَن لي) واتا: داوام لە پەروەردگارم کرد ڕێگام پێبدات داوای لێخۆشبون بۆ دایکم بکەم بەڵام ڕێگای پێنەدام، دەکرێت چەند تاوانێکی جگە لە کافری ڕێگر بوبن لەبەردەم داوا کردنی لێخۆشبوون" هەروەك چۆن لە سەرەتای ئیسلام کەسێك قەرزی لەسەربایە و مردبا پێغەمبەرﷺ نوێـژی لەسەر نەدەکرد، هەموو موسڵمانێکیش دەزانێت کە کەس بە قەرزدای کافر نابێت،بەڵام ئەوە یاسایەکی

١ـ الحاوي للفتاوى: ٢/ ٢٧٣

خودا بووە بۆ قەرزداران، بەهەمان شێوە دەکرێت دایکی پێغەمبەریش تاوانێکی جگە لەکوفری هەبوبێت و بوبێتە ڕێگر لە داواکردنی لێخۆشبون بۆی لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ.[1]

ب ـ ڕێگا نەدان نابێت بە بەڵگە لەسەر ئەوەی کە بڵێین: دایکی پێغەمبەرﷺلە دۆزەخە، بەڵکو دەکرێت بڵێین تاوانی نەبووە، چونکە نەگەیشتوەتە سەردەمی پێغەمبەرﷺ.[2]

ج ـ دەکرێت بڵێین: کە مەبەستی پێغەمبەرﷺ لە باوك لە فەرموودەی: (إنَّ أبي وأباك في النارِ) مامی أبوطالب بوبێت، چونکە پێغەمبەرﷺ لەلای خەڵکی بە کوڕی أبوطالب ناسرابوو، ئەمەش چەندین جار و لەچەندین جێگا دووبارە بوەتەوە، بۆنمونە: کاتێك بێباوەڕان دەهاتنە لای أبوطالب بۆ ئەوەی سکاڵا لە پێغەمبەرﷺ بکەن دەیانگووت: (قُلْ لإبنكَ يرجعُ عن شتمِ آلهَتِنا)واتا: بە کوڕەکەت بڵێ با قسەی ناشیرین بە خواکانمان نەڵێت. وە یان دەیانگووت: (اعطِنا ابنَك نَقْتُلُهُ و خُذ هذا الوَلد مَكانَهُ)واتا: کوڕەکەتان بدەیە بیکوژین، وە لە جێگای کوڕەکەت ئەو گەنجەمان لێوەر بگرە!! وە ابوطالیبیش پێغەمبەریﷺ بە کوڕی خۆی ناو دەبرد، بۆ نمونە: کاتێك بوحەیری ڕاهیب لێی پرسی ئەو کوڕە کێیە لەگەڵتدایە؟ ابوطالیب گووتی: (هوَ ابني)واتا: ئەوە کوڕمە، بوحەیراش گووتی: (ما يَنبَغي لِهذَا الغُلامِ أنْ يكونَ أبَواهُ حياً)[3]واتا: نابێت ئەم گەنجە باوك و دایکی زیندو بن ـ چونکە ناسیەوە کە پێغەمبەری ئاخیر زەمانەﷺ ـ وە پێغەمبەریش ﷺ ابوطالیب و خێزانەکەی بە باوك دایکی خۆی ناو دەبرد، بۆ نموونە کاتێك فاطیمەی کچی ئەسەدی خێزانی ابوطالیب رضی الله عنها وەفــاتی کرد پێغەمبەری خوداﷺ چـــۆ

١ـ الحاوي للفتاوی: ٢/٢٧٤.

٢ـ چەند گوڵێك لە گوڵزاری ئیسلام پێشکەش بە گەنجی نەونەمام: ٥٧

٣ـ البداية والنهاية: ٢/ ٦٥٨. وة الحاوي للفتاوی: ٢/ ٢٧٥.

ژورەوەو لای سەریەوە دانیشت و فەرمووی: (رَحِمَكِ اللهُ يا أُمِّي...)[1]واتا: میهرەبانی خودات لێبێت ئەی دایکە...، وە کاتێك گۆڕیان بۆ هەڵکەند پێغەمبەرﷺ بەشداری گۆڕ هەڵکەندنەکەی کرد وچوو ناو گۆڕەکەی و فەرمووی: (اللهُ الذي يُحيي و يُميت،و هوَ حيٌّ لا يَموت، اغفِرْ لأُمِّي فاطِمةَ بنتِ أسَد)[2]واتا: هەرخودایە ژیان دەبەخشیت و هەرئەویش دەمرێنیت، وە هەر ئەویشە کە هەرگیز نامرێت، خودایە خۆشبە لە دایکم فاطیمەی کچی ئەسەد.

٣ـ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: ئەم فەرموودانە نەسخ بوونەوە، هەروەك چۆن ئەو فەرموودانەی باسی ئەوە دەکەن کە منداڵی کافران لە دۆزەخن نەسخ بوونەوە، جا فەرموودەکانی منداڵی کافران نەسخ بوونەوە بە ئایەتی:( وَلَا تَزِرُ وَازِرَةٌ وِزْرَ أُخْرَى)[3]واتا: کەس تاوانی هیچ کەسێکی تر هەڵناگرێت، وە هیچ کەس بەر پرسیار نیە لە هەڵەی کەسانی تر. وە فەرموودەکانی باسی دایك و باوکی پێغەمبەرﷺ نەسخ بوون بە ئایەتی:(وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولًا)[4] واتا: ئێمە سزای هیچ کەسێکمان نەداوە هەتا پێغەمبەرێکی بۆ دەنێرین، دایك و باوکی پێغەمبەریشﷺ هیچ پێغەمبەرێکیان بۆ نەهاتووە، کەواتا ئەم فەرموودانە نەسخ بوونەوە بەم ئایەتە.[5]

## بەڵگەکانیان

زانایانی خاوەنی ئەم ڕایە هەروەك چۆن وەڵامی بەڵگەکانی ڕای یەکەم دەدەنەوە" بەهەمان شێوە

١ـ پێشەاو طبرانی گێراویەتەوە.

٢ـ پێشەاو طبرانی گێراویەتەوە.

٣ـ الإسراء: ١٥.

٤ـ الإسراء: ١٥.

٥ـ الحاوي للفتاوي: ٢/٢٧٥.

چەندین بەڵگەشیان پێیە بۆ جێگیر كردنی ڕای خۆیان كە دیارترینیان ئەمانەن:

١ـ خودای پەروەردگار لە چەندین ئایەتدا جێگیری كردووە كە خەڵكانی (ئەهلی فترە)[1] هیچ تاوانێكیان لەسەر نیەو خودای گەورە سزایان نادات، هیچ گومانێكیش نیە كە دایك و باوك و باپیری پێغەمبەرﷺ ئەهلی فترە بوون" بەڵكو نێوانی پێغەمبەر عیساعلیه السلام و پێغەمبەری ئیسلامﷺ درێژترین ماوە بووە لە نێوانی دوو پێغەمبەردا، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كَانَ رَبُّكَ مُهْلِكَ الْقُرَى حَتَّى يَبْعَثَ فِي أُمِّهَا رَسُولًا يَتْلُو عَلَيْهِمْ آيَاتِنَا﴾[2] واتا: خودای پەروەردگاری تۆ هیچ كاتێك شار و وولاّتێكی كاول نەكردووە تا لە پایتەختەكەیدا پێغەمبەرێكی نەناردبێت بۆ ئەوەی ئایەتەكانی ئێمەیان بەسەردا بخوێنێتەوە. وە خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَمَا كُنَّا مُعَذِّبِينَ حَتَّى نَبْعَثَ رَسُولاً﴾[3]واتا: ئێمە هیچ كات سزای هیچ كەسێكمان نەداوە هەتا پێغەمبەرمان بۆ نەناردبێت. وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَوْ أَنَّا أَهْلَكْنَاهُم بِعَذَابٍ مِّن قَبْلِهِ لَقَالُوا رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ مِن قَبْلِ أَن نَّذِلَّ وَنَخْزَى﴾[4]واتا: ئەگەر هاتباو بە سزایەك لەناومان بردبان بەر لەوەی پێغەمبەریان بۆ بنێرین دەیانگووت: پەروەردگارا بۆچی پێغەمبەرێكت بۆ ڕەوانە نەكردین تا شوێنی بەرنامەو ئایەتەكانی تۆ بكەوین بەر لەوەی زەلیل و ڕیسوا ببین .

جا ئەم ئایەتە ئاماژەیە بۆ ئەوەی ئەگەر خودای پەروەردگار بەر لەناردنی پێغەمبەران گەلێكی لەناو بردبایە یان سزای دابان ئەوە ئەوكات ئەم گەلە لەبەردەم خـــودای پەروەردگاردا قسەیـــان

---

١ـ ئەهلی فترە: بەو كەسانە دەگووترێت كە لە نێوانی دوو پێغەمبەردا ژیاون، یان لەسەردەمی پێغەمبەرێكدا ژیاون كە بۆ ئەوان نەنێردراوە.

٢ـ القصص: ٥٩.

٣ـ الإسراء: ١٥

٤ـ طه: ١٣٤

دەبوو، دەیانگووت: خودایە بۆ پێغەمبەرێکت بۆ نەناردین؟ بەڵام خودای باڵادەست هەموو نەتەوەکانی بێ بەڵگەو بێ قسەو بێ بیانو کردووە بەوەی پێغەمبەری بۆ ناردوون، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿ رُسُلًا مُبَشِّرِينَ وَمُنذِرِينَ لِئَلَّا يَكُونَ لِلنَّاسِ عَلَى اللَّهِ حُجَّةٌ بَعْدَ الرُّسُلِ﴾[1] أبو سعیدی خدریؓ بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (الهالكُ في الفترةِ يقول: ربٌ لم يأتني كِتابٌ ولا رسولٌ) ثم قرأ هذه الآية: ﴿رَبَّنَا لَوْلَا أَرْسَلْتَ إِلَيْنَا رَسُولًا فَنَتَّبِعَ آيَاتِكَ وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[2][3] واتا: ئەو کەسەی لە سەردەمی فەترەدا مردووە دەڵێت: پەروەردگارا بۆ نەکتێب نە پێغەمبەرێکت بۆ نەناردین؟ پاشان پێغەمبەرﷺ ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ئەی پەروەردگاری ئێمە نەدەبوو پێغەمبەرێکت بۆ ڕەوانە کردبایین هەتا شوێن بەرنامە و ئایەتەکانی تۆ کەوتباینایەو لە ڕیزی باوەڕداراندا بوینایە؟

جا بە بەڵگەی ئەم ئایەت و فەرموودانە ئەهلی فترە هیچیان لەسەر نیە، دایك و باوك و باپیری پێغەمبەریش ئەهلی فترە بوون، لەبەر ئەوە ئەوانیش هیچیان لەسەر نیە.

٢ـ چەندین فەرموودەی (صحیح) لە پێغەمبەری خۆشەویستەوەﷺگێڕدراونەوە کە باس لەوە دەکەن باوك و باپیرانی پێغەمبەرﷺ هەڵبژێردراو و پاك بوون لەوانە:

أـ پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ اصطَفى من وَلَدِ إبراهيم إسماعيل، واصطَفى من بني إسماعيل بني كِنانةَ، واصطفى من بني كِنانةَ قُرَيشاً، واصطَفى من قُرَيشَ بني هاشم، واصطَفاني مِن بَني هاشِمٍ)[4] واتا: بەڕاستی خودای گەورە لە مندالەکانی ابراهیم اسماعیلی هەڵبژارد،وە لە نەوەکانی إسماعیل نەوەکانی کینانەی هەڵبژارد،وە لە نەوەکانی کینانە قورەیشی

١ـ النساء: ١٦٥.

٢ـ القصص: ٤٧

٣ـ پێشەوا ابن ابی حاتم بە سەنەدێکی (حسن) گێڕاویەتەوە، بڕوانە الحاوی للفتاوی: ٢/٢٤٦.

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە .

هه‌ڵبژارد، وه‌ له‌ ناو قوڕه‌یشدا نه‌وه‌كانی هاشمی هه‌ڵبژارد ، وه‌ له‌ناو هه‌موو نه‌وه‌كانی هاشمدا منی هه‌ڵبژراد.

وه‌ له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی تردا گه‌وره‌مان عه‌بباسی كوڕی عبدالمطلب رضي الله عنه ده‌فه‌رموێت: پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ چۆ سه‌ر مینبه‌رو فه‌رمووی: (من أنا؟) واتا: من كێم؟ گووتیان: (أنتَ رسولُ الله)واتا: تۆ پێغه‌مبه‌ری خودای، ئینجا فه‌رمووی: (أنا محمد بن عبدالله بن عبدُالمطلب، إنَّ الله خَلَقَ الخَلقَ فجَعَلَني في خيرِ خَلقهِ،وجَعَلَهُم فرقتَينِ فَجَعَلَني في خيرِ فِرقةٍ، و خَلَقَ القبائِلَ فجَعَلَني في خيرِ قبيلةٍ،و جَعَلَهُم بيوتاً فجعَلَني في خيرِهِم بيتاً،فأنا خيرُكُم بيتاً وخيرُكم نفساً)[1] واتا: من محمدی كوڕی عبدالله ی كوڕی عبدالمطلبم، بەڕاستی كاتێك خودا دروستكراوه‌كانی دروستكرد منی گێڕا به‌ باشترینی دروستكراوه‌كانی، ئینجا خه‌ڵكی كرد به‌ دوو به‌شه‌وه‌، منی گێڕا له‌ باشترینی به‌شه‌كانی، پاشان هۆزه‌كانی دروستكرد هۆزه‌كه‌ی منی گێڕا به‌ باشترینی هۆزه‌كان، دواتر ماڵه‌كانی دروستكرد ماڵی منی گێڕا له‌ باشترینی ماڵه‌كان. بێگومان من باشترینی ماڵ و باشترینی كه‌ستانم.

ئه‌م فه‌رموودانه‌ به‌ڵگه‌ن كه‌ دایك و باوك باپیری پێغه‌مبه‌ر باوه‌ڕدار بوون چونكه‌ خودای گه‌وره‌ هه‌رگیزاو هه‌رگیز مرۆڤی بێباوه‌ڕ به‌ چاك دانانێت، به‌ڵام پێغه‌مبه‌رﷺ له‌م فه‌رمووده‌دا ده‌فه‌رموێت: من له‌ (خير فرقة و خيرقبيلة خير بيت، خيرنفس)م واتا: له‌ چاكترین به‌ش و چاكترین هۆز و چاكترین ماڵ و چاكترین كه‌سم. خودای گه‌وره‌ش باوه‌ڕدارانی به‌ (خير) ناو بردووه‌: ﴿إِنَّ الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ أُولَئِكَ هُمْ خَيْرُ الْبَرِيَّةِ﴾[2] واتا: ئاته‌وانه‌ی بڕوایان هێناوه‌ و پاشان كرده‌وه‌ی چاكه‌ ده‌كه‌ن ئاته‌وانه‌ باشترین و چاكترینی خه‌ڵكی سه‌ر زه‌وین. وه‌ خودای گه‌وره‌

١- پێشه‌وا احمد بسه‌نه‌دێكی صحيح گێڕاویه‌تەوه‌.وه‌ ترمذیش هاوشێوه‌ی ئه‌م فه‌رمووده‌ی گێڕاوه‌ته‌وه‌ و به‌(حسن) داناوه‌.

٢- البينة : ٧

هەرگیزاو هەرگیز مرۆڤی بێباوەڕ هەڵنابژێریت" بەڵام لە فەرمودەکەی پێشوتردا پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: (واصطَفي من قُرَيشَ بني هاشم) بەڵکو خودای گەورە تەنها باشترین کەسەکانی خۆی هەڵدەبژێرێت وەك: ﴿انَّ اللَّهَ اصْطَفَى آدَمَ وَنُوحًا وَآلَ إِبْرَاهِيمَ وَآلَ عِمْرَانَ عَلَى الْعَالَمِينَ﴾[1] وە ﴿وَإِذْ قَالَتِ الْمَلَائِكَةُ يَا مَرْيَمُ إِنَّ اللَّهَ اصْطَفَاكِ وَطَهَّرَكِ وَاصْطَفَاكِ عَلَى نِسَاءِ الْعَالَمِينَ﴾[2]واتا: خودای گەورە ئادەم و نوح و بنەماڵەی ابراهیم بنەماڵەی عیمران و مەریەمی هەڵبژاردووە بەسەر خەڵکی دوونیادا، ئەم هەڵبژاردنەی باوك باپیرانی پێغەمبەرﷺ بەڵگەیە لەسەر بوونی باوەڕیان.

ب ـ ابن عباس لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لَم يَزَلِ الله يَنقُلُني مِن الأَصلابِ الطيبةِ إلى الأرحامِ الطاهِرةِ مصفًّى مهذَّباً ، لا تنشَعِبُ شُعبَتانِ إلا كُنتُ في خيرِهما)[3]واتا: خودای گەورە بەردەوام منی دەگواستەوە لە پشتە پاکەکانەوە بۆ منداڵدانی ژنانی پاك و بێگەرد و بەرز، وە هەرکاتێك خەڵکی بوبنە دوو پۆل من لە باشترین پۆلەکانیان بووم.

* جا لەم فەرموودەدا پێغەمبەرﷺ باسی باوك باپیرو دایك و نەنکەکانی خۆی کردووە بە پاك و بێگەرد، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر باوەڕی ئەوان چونکە بە دەقی ئایەت بێباوەڕان و هاوبەش دانەران پیسن و پاك نین، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿إِنَّمَا الْمُشْرِكُونَ نَجَسٌ﴾[4]واتا: بێگومان هاوبەشدانەران پیسن.

---

١ـ آل عمران : ٣٣

٢ـ آل عمران : ٤٢

٣ـ پێشەوا ابن نعیم لە دلائل النبوة دا گێڕاویەتەوە.

٤ـ التوبة : ٢٨

٣ـ هیچ بەڵگەیەك نیە كە جێگیری بكات كە دایك و باوك و باپیری پێغەمبەﷺ كافر بوون، بەڵكو دەكرێت ئەوان وەكو(أبوبكری صدیق و زیدی كوڕی عەمڕی كوڕی نەفیل)پێش هاتن ئیسلامیش لەسەر ئاینی یەكتا پەرستی بوبن، چونكە ئەم دوو كەسە پێش بوونی بەپێغەمبەر هاوڕێی پێغەمبەرﷺ بوون، جا بە بەرەكەتی ئەم هاوڕێیەتیە پێش هاتنی ئیسلامیش یەكتا پەرست بوون، جا دایك و باوك وباپیری پێغەمبەریش لەپێشترن بۆ ئەوەی بەبەرەكەتی پێغەمبەر ﷺ یەكتا پەرست بووبن.[1]

٤ـ چەند دەق و ووتە و پارچە شیعرێك لە باوك وباپیرو دایكی پێغەمبەرﷺ گێڕدراونەوە كە ئاماژە دەكەن بە یەكتا پەرستیان، لەوانە:

* عبدالمطلبی باپیری پێغەمبەر لەوەڵامی ئەبرەهەدا گووتی: ( إنَّ للبيتِ رباً يَحمِيهِ)[2]واتا: بێگومان كەعبە خودایەكی هەیە كە دەیپارێزێت! جا لێرەدا عبدالمطلب نەیگووت: كەعبە چەند خودایەكی هەیە دەیپارێزن" بەڵكو گووتی:كەعبە خودایەكی هەیە دەیپارێزیت، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر یەكتا پەرستی .

* أم قنال خوشكی وەرەقەی كوڕی نەوفل نوری پێغەمبەری خودایﷺ لە ناوچاوانی عبدالله ی باوكیدا بینی، ئەوە بەر لەوەی عبدالله ئامینە بێنێت، جا أم قنال بۆ ئەوەی ئەم نورەی لە عبدالله وە پێبگات داوای لە عبدالله كرد ئەگەر سەرجێی لەگەڵدا بكات، بەڵام عبدالله رازی نەبوو و لە وەڵامیدا گووتی:

أما الْحرامُ فالمماتُ دونـــهُ    والحِلُّ لا حـــلَّ فأَستَبِينَهُ
يَحمي الكَريمُ عِرضَهُ و دِينَهُ    فكيفَ بالأمرِ الذي تَبغِنَهُ[3]

٢ـ الحاوى للفتاوى : ٢/ ٢٧٣

٣ـ السيرة النبوية لإبن هيشام: ٣٥

١ـ البدايه و النهايه : ٢/ ٦٢٣وه ٦٣٦.

جا ئەم پارچە شیعرە بەڵگەیە لەسەر باوەڕو پاك داوێنی عبداللە ی باوکی پێغەمبەرﷺ.

* وە دایکی پێغەمبەرﷺ لە نەخۆشی مردنیدا گووتی:

بارك اللهُ فيكَ مِن غـــــلامِ يا ابنَ الذي منْ حَومَةِ الحَمامِ

نَجا بِعونِ المَلِكِ العـــــلام فَوُدِيَ غَداةَ الضربِ بالسهــام

بِمِاةِ مِنْ إبِلِ ســــــوامِ إنْ صَحَّ ما أبصَرتُ في المَنـــامِ

فَأنتَ مبعوُثٌ إلى الأنـــــامِ مِنْ عِندِ ذى الجلالِ والأكــرامِ

دينِ أبيكَ البَرِّ أبراهـــــامِ فاللهُ نَهاكَ عنِ الأصنـــــامِ

ألاَّ تُواليها معَ الأقـــوامِ(1)

جا ئەم پارچە شیعرەش بەڵگەیە لەسەر باوەڕی خاتوو ئامینەی دایکی پێغەمبەرﷺ.

٥- پێغەمبەری خۆشەویستﷺدەربارەی أبوطالبی مامی دەفەرموێت: (أهوَنُ أهلِ النارِ عذاباً أبوطالبٍ وهوَ مُنتَعِلٌ بِنعلَينِ يَغلي مِنهُما دِماغُهُ)(2) واتا: سوکترین سزای دۆزەخ بۆ ابوطالب دانراوە ، کە بریتیە لەوەی دوو نەعلیان لە ئاگر لەپێکردوون بەهۆیانەوە مێشکی دەکوڵێت . ئەمەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە دایك و باوك وباپیری پێغەمبەرﷺ لە دۆزەخ نین، چونکە ئەگەر باوك و دایکی پێغەمبەرﷺ ئەهلی ئاگر بن "ئەوە ئەوان لە ابوطالب لە پێشترن بۆ ئەوەی کە سوکترین سزا بدرێن(3) چونکە:

یەکەم/ سوککردنی سزای ابوطالب بەهۆی شەفاعەتی پێغەمبەرەوەﷺ بووە، دایك و باوکیشی لە پێشترن لە ابوطالب بۆ ئەوەی شەفاعەتیان بۆ بکات.

---

٢ـابو نعيم گێراویەتەوە.

١ـ پێشەوا مسلم گێراویەتەوە.

٢ـ الحاوى للفتاوى: ٢/٢٧٦

دووەم/ تاوانی ابوطالب لە تاوانی باوك و دایك و باپیری زیاترە و گەورەترە، چونكە ئەوان نەگەیشتونەتە سەردەمی پێغەمبەرﷺ بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ بڕوایان پێدەهێنا یان نا؟ بەلاّم ابوطالب گەیشتە سەردەمی پێغەمبەرﷺ بڕواشی پێنەهێنا، ئەمەش دیسان بەلگەیە لەسەر ئەوەی كە دایك و باوكی پێغەمبەر لە دۆزەخ نین ئەگەرنا سوكترین سزای دۆزەخ هی ئەوان دەبوو نەوەك هی ابوطالب. والله أعلم.

٦ـ ناوبردنی دایك و باوكی پێغەمبەرﷺ بە كافر و بێباوەڕو هاوبەش دانەر" ئازاردانی دلّی پێغەمبەرەﷺ، چونكە: ئایا كێ حەزدەكات پێی بگووترێت: كوڕە كافر؟ یان كوڕی موشریكان؟ بە دلّنیاییەوە هیچ كەسێك حەز ناكات و ڕازی نیە پێی بگووترێت، هەتا ئەگەر بێتو ئەو كەسە بە شێوەیەكی كردەییش باوك و دیكی كافر بووبن هەر پێی ناخۆشە، عیكرەمە كوڕی ابو جهل دوای ئەوەی بە موسلّمانی هاتە مەدینە، بەشێك لە موسلّمانان كاتێك عیكرەمەیان دەبینی پێیان دەگووت: (ابن فرعون هذه الأُمة)واتا: كوڕی فیرعەونی ئەم ئوومەتە، جا لەكاتێكدا عیكرمە بەشێوەیەكی كردەییش باوكی ـ ابوجهل ـ كافر بوو، وە پێغەمبەری خوداشﷺ بە فیرعەونی ئەم ئوومەتەی ناساندبوو" بەلاّم عیكرەمە هەر پێی ناخۆش بوو كە خەلكی پێی بلّێن كوڕی فیرعەون، لەبەر ئەوە هاتە لای پێغەمبەرﷺ و سكالاّی كرد، خودای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَسْخَرْ قَوْمٌ مِّن قَوْمٍ عَسَى أَن يَكُونُوا خَيْرًا مِّنْهُمْ...﴾[1][2] واتا: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە هیچ كامێكتان گالّتە بەهیچ كامێكی تردا نەكات وزەلیلی نەكات و خۆی پێ لە ئەو باشتر نەبێت ...

جا ئەگەر ئێمەی ئاسایی پێمان ناخۆشبێت پێمان بلّێن: كوڕە كافر، وە ئەگەر عیكرەمە رضي الله عنه

١ـ الحجرات : ١١

٢ـ جامع الأحكام ، تفسير القرطبي: ١٦/ ٢٧٦

پێی ناخۆشبێت بەهۆی باوکیەوە لەکەداری بکەن لە کاتێکدا بەکردەیی باوکی کافر بووە، دەبێت پێغەمبەریشﷺ چەند پێی ناخۆشبێت و چەند ئازاری دڵی بدرێت کە پێی بڵێن کوڕە کافر، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا﴾[1] واتا: بێگومان ئەو کەسانەی ئازاری خوداو پێغەمبەرەکەی دەدەن ئەوە خودای گەورە لە دوونیا و قیامەتدا نەفرینی لێکردوون، وە لە ڕۆژی قیامەتیشدا سزایەکی سەرشۆڕکەری بۆ ئامادەکردوون.

پرسیار لە ابوبکری ابن عربی رحمه الله کرا دەربارەی پیاوێك کە گوتبووی: (باوك ودایکی پێغەمبەرﷺ لە دۆزەخدان) لە وەڵامدا فەرمووی: ئەم پیاوە نەفرینی لێکراوە ـ ملعونـ چونکە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يُؤْذُونَ اللَّهَ وَرَسُولَهُ لَعَنَهُمُ اللَّهُ فِي الدُّنْيَا وَالْآخِرَةِ وَأَعَدَّ لَهُمْ عَذَابًا مُّهِينًا﴾[2] پاشان فەرمووی: هیچ ئازارێك لەوە گەورەتر نیە کەسێك بڵێت دایك و باوکی پێغەمبەرﷺ لە دۆزەخن.[3]

جا ئەوەی ڕابرا بەڵگەی زانایانی هەردوو ڕایەکە بوو دەربارەی دایك و باوك و باپیری پێغەمبەرﷺ، جا منیش وەکو خۆم جگە لەوەی لەگەڵ ڕای دووەمدام و پێموایە کە ئەم ڕایە پەسەندترە، بەڵام وای بەباش دەزانم کە ئەم بابەتە هەر قسەی لێوە نەکرێت، وە بەتایبەت بەهیچ شێوەیەك نەبرێتە سەر مینبەر و بەردەمی خەڵکی عەوام، چونکە ئەم باسە هیچ خزمەتێك بە دین ناکات، وە ناچێتە ژێر هیچ کامێك لە مەبەستەکانی شەریعەت ـ مقاصد الشريعه ـ چونکە خودای پەروەردگار هەر یاسایەکی دانابێت بۆ بەدەستهێنانی سود و لادانی خراپە بووە، ئەمەش

٣ـ الأحزاب : ٥٧

١ـ الأحزاب : ٥٧

٢ـ الحاوی للفتاوی: ٢/ ٢٧٩

لە سێ شت تێناپەڕێت کە بریتین لە: (ضروريات، حاجيات، تحسينيات) جا ضروريات بەو شتانە دەگوترێت کە ژیانی مرۆڤیان پێوە بەندە، ئەگەر یەکێکیان نەبێت ئەوە ژیانی مرۆڤ کەلێنی تێدەکەوێت، ئەوانیش بریتین لە: (دین ، نفس ، عقل، ناموس، سامان). وە حاجيات بەو شتانە دەگوترێت کە ژیانی مرۆڤ ئاسان دەکەن ، وەك: سەیارە ، تەلەفۆن، فڕۆکە.... وە تحسينيات بەو شتانە دەگوترێت کە ژیان جوان دەکەن وەك ڕەوشتە جوانەکان و نەریتە چاکەکانی کۆمەڵگا[1]

جامن لێرەدا دەپرسم: ئایا توخودا باسکردنی ئەوەی کە دایك وباوکی پێغەمبەرﷺلە دۆزەخن چ سودێك دەگەیەنێت؟ یاخود چ زیانێك لادەدات؟ وە یاخود دەچێتە ژێر کام لە (ضروريات و حاجيات و تحسينيات؟) ئایا باسکردنی ئەم بابەتە زەڕوڕە؟ وەیاخود پێویستەـ حاجيات ـ ە وە یاخود ژیان جوان دەکات و لە(تحسنيات)ە؟ نەخێرو سەد جار نەخێر ئەم باسە نە زەڕورە و نەپێویستە و نە ژیانیش جوان دەکات، بەڵکو ئەو کەسانەی ئەم بابەتانە لەسەر مینبەر باس دەکەن تەنها مەبەستیان ئەوەیە لە کەسایەتی پێغەمبەرﷺکەم بکەنەوە، وە مەبەستیان ئەوەیە کێشە و ئاشوب بخەنە ناو موسڵمانانەوەو موسڵمانان بە کێشەی لاوەکیەوە گیرۆدە بکەن.

لە خودای باڵادەست داواکارم ڕێگای ڕاست نیشانی هەموو لایەکمان بدات و بمانپارێزت لە نانەوەی کێشەو ئاشوب بۆ موسڵمانان آمین.



---

١ـ علم أصول الفقة ، عبدالوهاب خلاف: ٢٢٩ـ٢٣٠

# شه‌وی نیــــوه‌ی شــــــــه‌عبان

پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رموویه‌تی: (أَنَّ اللّهَ يَطّلِعُ عَلى عِبادِهِ فِي لَيلَةِ النِّصفِ مِنَ الشَّعبانَ، فَيَغفِرُاللّهُ لَلْمُستَغفِرِينَ، وَيَرحَمُ الْمُستَرحِمِين، وَيُؤَخِّرُ أَهلَ الْحَقدِ كَما هُمْ)

# شەوی نیوەی شەعبان (النصف الشعبان)[1]

شەوی نیوەی شەعبان کە لەناو کوردەواریدا بەشەوی بەرات بەناوبانگە یەکێکی ترە لەو شەوانەی ساڵ کە موسڵمانان بە خواپەرستی زیندووی دەکەنەوە، وە یەکێکە لەو شەوانەی کە پێغەمبەری خوداﷺ بەشێوەیەکی تایبەت و بە خواپەرستی زیندووی کردوتەوە، وە زانایانی ئیسلامیش بە یەکێك لە شەوە تایبەتەکانیان ئەژمار کردووە، هەتا عطائی کوڕی یەسار دەفەرمووێت: هیچ شەوێك نیە لەدوای شەوی قەدر گەورەتر بێت لە شەوی نیوەی شەعبان.[2]

خاتوو عائیشە رضي‌الله‌عنها دەفەرموێت: (قام رسول اللهﷺ مِنَ اللَّيلِ فصَلَّى فَأَطالَ السُّجُودَ حَتَّى ظَنَنْتُ أنّه قَدْ قُبِضَ، فَلَمّا رَأيتُ ذلِكَ قُمتُ حَتّى حَرَّكتُ إبهامَهُ فَتَحَرَّكَ فَرَجَعْتُ فَلَمّا رَفَعَ رَأْسَهُ مِنَ السُّجُودِ وَفَرَغَ مِنْ صَلاتِهِ قال: يا عائِشَةُ أَو يا حُمَيراءُ أظَنَنْتِ أنَّ النَّبِيَّﷺ قَدْ خاسَ بِكِ؟ قُلتُ لا واللهِ يارَسُولَ اللهِ، وَلكِنْ ظَنَنْتُ أنَّكَ قُبِضتَ لِطُولِ سُجُودِكَ، فَقالَ: أتَدرِينَ أيُّ لَيلَةٍ هذهِ؟ قُلْتُ اللهُ وَرَسُولُهُ أعلَمُ، قالَ هذِهِ لَيلَةُ النِّصفِ مِنَ الشَّعبانَ، أنَّ اللهَ يَطّلِعُ عَلى عِبادِهِ فِي لَيلَةِ النِّصفِ مِنَ الشَّعبانَ، فَيَغفِرُاللهُ لِلْمُستَغفِرينَ، وَيَرحَمُ الْمُستَرحِمِين، وَيُؤَخِّرُ أهلَ الْحَقدِ كَما هُمْ)[3] واتا: شەوێکیان پێغەمبەری خوداﷺ هەڵسا دەستی کرد بە نوێژ و سوجدەکەی زۆر درێژ کردەوە هەتا گومانم برد گیانی کێشراوە، کاتێك ئەوەم بینی هەڵسام پەنجەی گەورەیـــــم جولاند ئەویش پەنجەی جولاند منیش گەڕامەوە، کاتێك سەری بەرز کردەوە و لە نوێژەکەی بویەوە فەرموی: ئەی عائیشە یان ئەی سورکەڵە وا دەزانیت ناپاکیم لێکردوی ـ چومە لای خێزانەکانی ترم ـ؟ منیش گوتم: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوداﷺ سوێند بەخودا وەها

---

١ـ ئەم بابەتەم لە کتێبی (بەڵگە یەکلاکەرەوەکان)دا بە درێژی شیکردوتەوە، لەبەر ئەوە لێرەدا بەکورتی باسی دەکەم.

٢ـ لطائف المعارف: ١٦٠

٣ـ پێشەوا البيهقي لە (شعب الإيمان)دا گێڕاویەتەوە و دەفەرمووێت: مرسل جيد.

گومانم نەبرد، بەلاَم لەبەر درێژی سوجدەکە وامزانی گیانت سپاردووە، ئەویش فەرمووی: ئایا دەزانی ئەمشەو چ شەوێکە؟ گوتم: خوداو پێغەمبەرەکەی زاناترن. فەرموی: ئەمشەو شەوی نیوەی شەعبانە، لەم شەوەدا خودای گەورە بە میهرەبانی خۆی ڕودەکاتە بەندەکانی، لە هەموو ئەوکەسانە خۆشدەبێت کە داوای لێخۆشبون دەکەن، وە ڕەحم بەو کەسانە دەکەن کە داوای ڕەحمەتی لێدەکەن، بەلاَم لێخۆشبونی خاوەن کینەکان دوا دەخات هەتا تەوبە دەکەن.

وە لەفەرمودەیەکی تردا خاتوو عائیشە رضي الله عنها بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت: (فَقَدتُ رَسولَ اللهِ ﷺ ذاتَ لَيلَةٍ فَخَرَجتُ أَطلُبُهُ فَإذا هُوَ بِالْبَقيعِ رافِعاً رَأسَهُ إِلَى السَّماءِ فَقالَ: يا عائشةُ كُنتِ تَخافِينَ أَنْ يَحِفَ اللهُ عَلَيكِ وَرَسُولُهُ؟ قالَت: قُلتُ: وَما بِيَ ذلِكَ، وَلكِنِّي ظَنَنْتُ أَنَّكَ أَتَيتَ بَعْضَ نِسائِكَ، فقال: إنَّ اللهَ عَزَّ وَجَلَّ يَنزِلُ لَيلَةَ النِّصفِ مِنَ الشَّعبانِ إلى السَّماءِ الدُّنيا، فَيَغْفِرُ لِأَكثَرَ مِنْ عَدَدِ شَعرِ غَنَمِ كَلبٍ)[1] واتا: شەوێکیان پێغەمبەری خودامﷺلێ ونبوو، منیش چومە دەرەوە بەدوایدا دەگەڕام بینیم لە بەقیعە سەری بەرزکردبۆوە بۆئاسمان، فەرموی: ئەی عائیشە لەوە دەترسێی خوداو پێغەمبەرەکەیﷺ گەلە کۆییان لێکردبی؟ گوتم: نەخێر ئەو گومانەم نەبو، بەلاَم وام گومان برد چوبیت بۆلاَی هەندێك لەخێزانەکانی ترت، ئەویش فەرموی: بەڕاستی خودای گەورە لە شەوی نیوەی شەعباندا بەسۆزو میهرەبانی خۆی دادەبەزێت بۆ ئاسمانی دنیا، وە زیاتر لە ئەندازەی موەکانی مەڕو مالاَتی هۆزی کەلب لە بەندەکانی خۆشدەبێت.

جا بەپشتیوانی ئەو فەرموودانە کۆمەلێك لە زانایانی پێشینەی ئوممەت وەك خالدی کوڕی معدان و مکحول و لوقمانی کوڕی عامر... و چەندانی تریش لە تابیعیەکانی شام، وە دانیشتوانی مەککەی پیرۆزیش ئەم شەوەیان بە شەوێکی گەورە و تایبەت زانیوەو بە خواپەرستی

---

١ـ پێشەوا البیهقی لە (شعب الإيماندا) گێڕاویەتەوە و دەفەرموێت(رجاله موثوقون)

و چەند تایبەتمەندیەکی تر زیندوویان کردۆتەوە.[1]

## سوننەتەکانی تایبەت بەم شەوە

١ـ سوننەتە ئەم شەوە بە نوێژ و خواپەرستیەکانی تر زیندوو بکرێتەوە، چونکە وەك لە فەرموودەکانی ڕابردوودا باسمان کرد پێغەمبەری خوداﷺ ئەم شەوەی بەنوێژ کردن و سوجدە درێژ بەسەر بردووە.

٢ـ سوننەتە موسڵمانان لەو شەوەدا زۆر دووعا بکەن و داوای لێخۆشبون و سۆزو بەزەیی لە خودای گەورە بکەن،وە دووعای خێر بۆ مردووەکانیان بکەن،چونکە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (فَيَغفِرُاللهُ لَلْمُستَغفِرِينَ،وَيَرحَمُ الْمُستَرحِمِين)واتا: خودای گەورە لەهەموو ئەو کەسانە خۆشدەبێت کە داوای لێخۆشبونی لێدەکەن، وە ڕەحم و سۆزی بەهەموو ئەو کەسانە دەکات کە داوای ڕەحم و سۆزی لێدەکەن. وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (ألا مِن مُستَغفِرٍ فاَغفِرُ لَهُ، ألا مِن مُستَرزِقٍ فأرزُقُهُ، ألا مِن مُبتَلي فَأُعافِيهِ، ألا كَذا ألا كَذا)[2] واتا: کێ داوای لێخۆشبون دەکات هەتا لێی خۆشببم، کێ داوای ڕزقم لێدەکات هەتا ڕزقی بدەم، کێ نەخۆشەو بەلاو موصیبەتی هەیە و داوای چارەسەر دەکات" هەتا شیفای بدەم و نەهامەتیەکەی لەسەر لابدەم، کێ داوای... کێ داوای... هەتا پێی بدەم. وە لەفەرموودەکەی تریشدا خاتوو عائیشە رضی الله عنها بۆمان باس دەکات کە پێغەمبەرﷺ لە شەوی نیوەی شەعباندا سەردانی گۆڕستانی بەقیعی کردووە و دووعای خێری بۆ کردوون.

٣ـ لەم شەوەدا خۆشۆردن و لەبەرکردنی پۆشاکی جوان و خۆ بۆنخۆشکردن سوننەتە، چونکە

١ـ لطائف المعارف : ١٦١ وفتاوى الكبرى لهيثمي : ٢ / ٣٩

٢ـ پێشەوا شەوکانی لە (تحفة الذاكرين)دا هێناویەتی.

تابعیەکانی شام لەو شەوەدا خۆیان دەڕازاندەوەو خۆیان بۆنخۆشدەکردو ئەو شەوەیان بەخواپەرستی بەسەر دەبرد.

٤ـ سوننەتە لەم شەوەدا موسڵمانان گەردنی هەموو کەسێك ئازاد بکەن و ڕق و کینە لەدڵیان دەر بکەن، بۆ ئەوەی بێبەش نەبن لە لێخۆشبونی خودا، چونکە وەك لەفەرموودەکانی ڕابردوودا باسمان کرد پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: خودای گەورە لەو شەوەدا لە هەموو باوەڕدارێك خۆشدەبێت" تەنها ڕق لەدڵان نەبێت.

٥ـ ئینجا بزانە کە ڕۆژو گرتن لە ڕۆژی نیوەی شەعباندا سوننەتە، چونکە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (إذا كانَ لَيلَةُ النِّصفِ مِنَ الشَّعبانَ فَقُومُوا لَيلَها وَصُومُوا نَهارَهَا...)[1] واتا: ئەگەر نیوەی شەعبان هات ئەوە شەوەکەی زیندوو بکەنەوە و ڕۆژەکەشی بەڕۆژو بن...

جا هەر چەندە ئەم فەرموودەیە لاوازە، بەڵام لە باسی هانداندایە، لەبەر ئەوە دەکرێت کاری پێبکرێت، وە ئەگەر ئەم فەرموودەیەش نەبێت" ئەوە نیوەی شەعبان دەکەوێتە ڕۆژە سپیەکانی مانگەوە، لەبەر ئەوە بەڕۆژو بون تێیدا هەر سوننەتە.



١ـ پێشەوا ابن ماجە گێڕاویەتەوە.

# (الإسراء والمعراج)

# شەو ڕەویی و بەرزبونەوی

# پێغەمبەرﷺبۆ ئاسمانەکان

# لە ٢٧ی ڕەجەب

﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ لَيْلًا مِّنَ الْمَسْجِدِ الْحَرَامِ إِلَى الْمَسْجِدِ الْأَقْصَى الَّذِي بَارَكْنَا حَوْلَهُ لِنُرِيَهُ مِنْ آيَاتِنَا إِنَّهُ هُوَ السَّمِيعُ الْبَصِيرُ﴾

# الإسراء و المعراج لە ٢٧ی ڕەجەب

لە شەوی بیست و حەوتی مانگی ڕەجەبدا خودای پەروەردگار پێغەمبەری خۆشەویستیﷺ بەخەلاتێك خەلات کرد" کە نەپێش ئەو و نەدوای ئەویش هیچ کەسێکی پێ خەلات نەکردووە، ئەویش بانگهێشتکردنی بوو بۆ ئاسمانەکان و دیداری خۆی، جا ساڵانەو لەشەوی بیست وحەوتی مانگی ڕەجەبدا بەشێك لەموسڵمانان ئاهەنگ و مەڕاسیمی تایبەت سازدەکەن بە بۆنەی ئەو خەلات و موعجیزە گەورەیەی پێغەمبەرﷺ، لەو ئاهەنگ و مەڕاسیمانەدا زانایانی ئاینی موسڵمانان ئاشنا دەکەن بە گەورەیی ئەو موعجیزە گەورەیەی پێغەمبەرﷺو ڕوداوەکانی ئەو شەوە پیرۆزە،جا ئێمەش لێرەدا بە پشتیوانی خودا کەمێك دەچینە خزمەت ئەو موعجیزە گەورەیەی پێغەمبەرﷺو ڕوداوەکانی ئەو شەوە پیرۆزە، وە حوکمی یادکردنەوەی ئەم شەوە دەخەینە ڕوو.

## پێغەمبەرﷺ چەند جار ئیسراو میعراجی کردووە؟

پێشەوا نووی لە (المسائل المنثور)ەدا دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺدوو جار شەوڕەوی (إسراء)ی کردووە" جارێکیان بە ڕوح و لاشەو لەکاتی بە ئاگایدا، جارێکی تریان بە خەون،[1] وە بەشێکی تر لە زانایان دەفەرموون: کە پێغەمبەرﷺ زیاتر لە دووجار شەوڕەوی کردووە، بەلام تەنها جارێکیان بەڕوح و لاشە بووە، ئینجا زانایان جیاڕان لەدیاریکردنی ئەو ساڵەی کە پێغەمبەری خوداﷺ تێیدا بەلاشەو ڕوح ئیسڕاو میعڕاجی کردووە" بەشێکیان دەفەرموون: ساڵی پێنجەمی پێغەمبەرایەتی بووە، بەشێکی تـــر دەفەرموون: ســـاڵی شەشەم بووە، بەشێکی تـر

١ـ فتاوى الإمام النووي، المسماة(بالمسائل المنثورة): ٦٤

دەفەرموون: ساڵی دوازدەهەم بووە،[1] جا هەر ساڵێك بوبێت ئەوەی جێباسی ئێمەیە لێرەدا ئەو جارەیە کە پێغەمبەری خوداﷺ بە ڕوح و لاشەو بەئاگایی شەوڕەوی کردووە.

## حوکمی یادکردنەوەی ئیسراو میعراج

یادکردنەوەی ئیسڕاو میعڕاج یەکێکە لە هۆکارەکانی بانگەوازی بۆ دینی خودا و دەرفەتێکی زێڕینە بۆ ئاشنا کردنی موسڵمانان بەم موعجیزە گەورەیەی پێغەمبەرﷺو ڕوداوەکان ئەمشەوە پیرۆزە، وە دەچێتە باسی نەریتەکانەوە و هیچ پەیوەندی بە پەرستشەکانەوە نیە، بەڵکو بەهۆی بانگەوازی کردن تیایدا و ئەو کارە خێرانەی دەکەونە ناو مەڕاسیمی یـــادکردنەوەکەوە دەبێتـــە پەرستش عیبادەت، ئەگەرنا" لەخودی خۆیدا نەریت و عادەتە، لەبەر ئەوە یادکردنەوەی کارێکی پەسەندەو هیچ ڕێگرێکی شەرعی نیە، چونکە: (الأصل في الأشياء الإباحة)واتا: بنچینەی هەموو کارەکان ڕەوایەتیە. وە یادی ئیسراو میعراج قیاس دەکرێت بۆ سەر یادی مەولودی پێغەمبەرﷺ، یادی مەولودی پێغەمبەریش چەندین زانای گەورەی ئیسلام وەك: ابن حجری عەسقەلانی و سیوطی سەخاوی و قەسـطـەلانی و حافظی عێراقی و ابن العابدين و ابن الحاج و.... هتد ڕێگایان پێداوە، وە زانایانی سەردەمیش وەك: دکتۆر محمد سعيد رمضان البوطي و وەهبە زوحەیلی و شێخ سەعیدی نەورەسی و دکتۆر یوسف قەرزاوی و چەندانی تر ڕێگایان پێداوە و بەکارێکی باشیان زانیوە، وە پاشان دار الإفتاء میصری ئەو کەسانەی بە هۆشمەند و ژیر ناو بردووە کە بۆنە ئاینیەکان دەقۆزنەوە بۆ بانگەوازی کردن بۆ ئیسلام و ئاشانا کردنی موسڵمانان بە ژیاننامەی پێغەمبەرﷺو دەفەرمووێت:(وَالْعُقَلاءُ مِنَ النّاسِ هُمُ الذِينَ يَحْرِصُونَ

---

١ـ فتاوى الإمام النووي، المسماة(بالمسائل المنثورة): ٦٤

عَلى اغْتِنامِ فُرَصِ الْمُناسَباتِ الْاسلامِيَةِ لِيَقِفُوا عِندَها وَيَتَدَبَّروا فِي اَسرارِها وَمَعانِيها....) وە شێخ سەعیدی نورسی دەربارەی مەولود و زیندوکردنەوەی یادی ئیسراو میعراج دەفەرمووێت: (إنَّ قِراءةَ المولِدِ النبوىِّ وقَصِيدةُ المِعراجِ عادَةٌ إسلاميةٌ مُستَحسَنَةٌ، ونافِعَةٌ جِدّاً..)واتا: بەڕاستی خوێندنەوەی مەولودی پێغەمبەرﷺو هۆنراوەی میعراجنامە نەریتێکی ئیسلامی جوان و چاکە، وە بەڕاستی زۆر بەسودە.. وە پاشان دەفەرمووێت: (واعلَمْ أنَّ الإستماعَ إلى المَولِدِ النَّبوىِّ ومِعراجِهِﷺ... لذيذٌ ونورانيٌّ، وَ مبْعَثُ فَخرٍ لأمَّتِهِ واعتزازٌ لَهُمْ،ومُسامَرَةٌ عَلَويةٌ رَفِيعَةٌ لِلمؤمنينَ الذينَ اتَّخَذوهُ رئيساً وسيِّداً وإماماً وشَفِيعاً لَهُمْ)[1]واتا: بزانە کە گوێگرتن بۆ خوێندنەوەی مەولودی پێغەمبەرﷺو میعراجنامەکەی کارێکی بەتام و نورانین،وە مایەی شکۆ و شانازین بۆ ئوممەتەکەی،وە وتوێژێکی بەرزو بڵندن بۆ ئەوباوەڕدارانەی کە پێغەمبەریانﷺ بە سەرکردەو گەورەو پێشەواو شافعی خۆیان داناوە.

وە پاشان دووعای خێر بۆ بەردەوامی ئەم جۆرە بۆنانە دەکات و دەفەرمووێت: (نسألُ اللهَ أنْ يُديمَ هذهِ العادةَ إلى الأبدِ، و يَرحَمَ كاتِبِها السيد سُلَيمان أفَندى وأمثالِهِ مِنَ الكُتّابِ، ويَجعَلَ جنَّةَ الفِردَوسِ مَثواهُمْ آمين)[2]واتا: داواکارم لەخودای گەورە کە ئەم نەریتە بەردەوام بکات هەتاهەتایە، وە ڕەحم بەنوسەرەکەشی بکات کە ڕێزدار سلیمان ئەفەندیە وە هاوشێوەکانیشی لە ئەو کەسانەی کە مەولودنامە یان میعراجنامەیان نوسیوە، وە بە بەهەشتی فیردەوس شادیان بکات ئامین.

وە دکتۆر علی جومعە موفتی میصر لەوەڵامی پرسیارێکدا کە لێیکراوە و دەڵێت: ئایا ڕای ئاین چۆنە بەرامبەر ئەو ئاهەنگ و مەڕاسیمانەی بۆ مەولود و ئیسراو میعراج و بۆنەکانی تر

---

١ـ الفتاوى الأمدية: ٢٤٥/١

٢ـ هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە

ڕێکدەخرێن؟ ئەو دەفەرمووێت: (الإحتفالاتُ بالُمناسباتِ الدِينيةِ الُمختلِفة أمرٌ مَرَغّبٌ فِيهِ مالَم تَشتَمِل على ما يُنهَى عنهُ شرعاً، حَيثُ وَردَ الشَّرعُ الشَّريف بالأمرِ بالتَّذكيرِ بِأيّامِ اللهِ تعالى في قَولِهِ عزَّوَجلَّ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ﴾[1][2] واتا: سازکردنی ئاهەنگ ومەڕاسیمی تایبەت بۆ بۆنە ئاینیە جۆراو جۆرەکان کارێکی پەسەند و داخوازی کراوە بەو مەرجەی کاروباری بێشەرعی تێکەڵ نەکرێت، بەشێوەیەك لەشەرعی مەزندا فەرمان کراوە بەوەی یادی ڕۆژە تایبەتەکانی خودا بکرێتەوە و خودای گەورە فەرموویەتی: ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ﴾

## بەسەرهاتی موعجیزەی ئیسڕاو میعڕاج

مالکی کوڕی صەعصەعە ﷛ دەفەرمووێت: پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ باسی ئیسڕاو میعڕاجی بۆ کردین و فەرمووی: (بَينَما أنا فِي الحطيمِ ـورُبَّما قال في الحِجرِـ مُضطَجِعاً، إذ أَتاني آتٍ)[3] وە لەگێڕانەوەیەکی تری پێشەوا موسلمدا ئەنەسی کوڕی مالك ﷛ دەفەرمووێت: (أَنَّ رَسُولَ اللَّهِ ﷺ قَالَ أُتِيتُ بِالْبُرَاقِ وَهُوَ دَابَّةٌ أَبْيَضُ طَوِيلٌ فَوْقَ الْحِمَارِ وَدُونَ الْبَغْلِ يَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَى طَرْفِهِ قَالَ فَرَكِبْتُهُ حَتَّى أَتَيْتُ بَيْتَ الْمَقْدِسِ قَالَ فَرَبَطْتُهُ بِالْحَلْقَةِ الَّتِي يَرْبِطُ بِهِ الْأَنْبِيَاءُ قَالَ ثُمَّ دَخَلْتُ الْمَسْجِدَ فَصَلَّيْتُ فِيهِ رَكْعَتَيْنِ)[4] واتا: لەکاتێکدا من لە حەطیم وە یان فەرمووی: لە حیجردا پاڵکەوتبوم، یەکێك هات و فەرمووی: بابڕۆین، پاشان بوڕاقیان هێنا کە ئاژەڵێکی سپی و درێژە و لە گوێدرێژ گەورەترە و لە ئەسپ بچوکترە هەر هەنگاوێکی بە

١ موقع دار الإفتاء المصرى

٢ إبراهيم: ٥

٣ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

بینایی چاوی خۆی داده‌نێت، منیش سه‌ركه‌وتم هه‌تا گه‌یشتینه‌ مزگه‌وتی (بیت المقدس) له‌وێ دابه‌زیم و بوراقه‌كه‌م به‌و سینگه‌یه‌وه‌ به‌سته‌وه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ران علیهم الصلاة والسلام پێیان ده‌به‌سته‌وه‌، پاشان چومه‌ ناو مزگه‌وته‌كه‌وه‌ و دوو ڕه‌كات نوێژم تێدا كرد.

له‌ فه‌رمووده‌یه‌كی تردا ده‌فه‌رموێت:(فَلَمْ ألبثْ إلا يَسيراً حَتّى إجتَمَعَ ناسٌ كثيرٌ،ثُمَّ أذّنَ مؤذنٌ فَأُقيمَتِ الصَّلاةُ،فَقُمنا صُفوفاً نَنتَظِرُ مَنْ يؤمّنا،فأخَذَ بِيَدي جِبريلُ فَقَدَّمَني فَصَلَيتُ بِهِم)[1]

واتا: ته‌نها كه‌مێك له‌ (بيت المقديس) هه‌تا خه‌ڵكێكی زۆر كۆبونه‌وه‌، پاشان بانگبێژێك بانگی گوتو و قامه‌ت كرا، ئێمه‌ش چه‌ند ڕیزێكمان به‌ست و چاوه‌ڕێمان ده‌كرد یه‌كێك پێشكه‌وێت و پێشنوێژیان بۆ بكات، له‌و كاته‌دا جوبرائیل ده‌ستی گرتم منی پێش خست، منیش پێش نوێژیم پێكردن.

جا ئه‌و كۆمه‌ڵه‌ خه‌ڵكه‌ زۆره‌ هه‌موو پێغه‌مبه‌ران بوون، پێشه‌وا نه‌وه‌وی رحمه الله ده‌فه‌رموێت: (ثَبَتَ أنَّ نَبيَّنا ﷺ صَلّى بالأنبياءِ -صلوات الله وسلامه عَلَيهِم أجمَعين - لَيلَةَ الإسراءِ بِبَيتِ الْمَقدِسِ)[2]

واتا: جێگیر بووه‌ كه‌ پێغه‌مبه‌ری ئێمه‌ﷺ نوێژی به‌ پێغه‌مبه‌ران صلوات الله وسلامه عَلَيهِم أجمَعين كردووه‌ و پێش نوێژی بۆ كردوون له‌ شه‌وی ئیسراو میعراجدا له‌ (بيت المقديس).

پاشان دوای ئه‌وه‌ی نوێژی به‌ پێغه‌مبه‌ران كرد، ئینجا پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ له‌گه‌ڵ جوبرائیلدا به‌ره‌و ئاسمان به‌رز بوونه‌وه‌، مالكی كوڕی صه‌عصه‌عه‌ رضي الله عنه له‌ پێغه‌مبه‌ری خوداوه‌ﷺ بۆمان ده‌گێڕێته‌وه‌ و ده‌فه‌رموێت: (فَانْطَلَقَ بِي جِبْرِيلُ حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الدُّنْيَا فَاسْتَفْتَحَ فَقِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ وَمَنْ مَعَكَ قَالَ مُحَمَّدٌ قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ فَفَتَحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا فِيهَا آدَمُ فَقَالَ هَذَا أَبُوكَ آدَمُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ

١- پێشه‌وا النسائي گێڕاویه‌ته‌وه‌.

٢- فتاوى الإمام النووي المسماة بالمسائل المنثورة: ٦٢

فَرَدَّ السَّلَامَ ثُمَّ قَالَ مَرْحَبًا بِالِابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الثَّانِيَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ وَمَنْ مَعَكَ قَالَ مُحَمَّدٌ قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ فَفَتَحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ إِذَا يَحْيَى وَعِيسَى وَهُمَا ابْنَا الْخَالَةِ قَالَ هَذَا يَحْيَى وَعِيسَى فَسَلِّمْ عَلَيْهِمَا فَسَلَّمْتُ فَرَدَّا ثُمَّ قَالَا مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثُمَّ صَعِدَ بِي إِلَى السَّمَاءِ الثَّالِثَةِ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ وَمَنْ مَعَكَ قَالَ مُحَمَّدٌ قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ فَفُتِحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ إِذَا يُوسُفُ قَالَ: هَذَا يُوسُفُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الرَّابِعَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ وَمَنْ مَعَكَ قَالَ مُحَمَّدٌ قِيلَ أَوَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ فَفُتِحَ فَلَمَّا خَلَصْتُ إِلَى إِدْرِيسَ قَالَ هَذَا إِدْرِيسُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ الْخَامِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ وَمَنْ مَعَكَ قَالَ مُحَمَّدٌ قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ قِيلَ مَرْحَبًا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا هَارُونُ قَالَ هَذَا هَارُونُ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثُمَّ صَعِدَ بِي حَتَّى أَتَى السَّمَاءَ السَّادِسَةَ فَاسْتَفْتَحَ قِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ مَنْ مَعَكَ قَالَ مُحَمَّدٌ قِيلَ وَقَدْ أُرْسِلَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ قَالَ مَرْحَبًا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا مُوسَى قَالَ هَذَا مُوسَى فَسَلِّمْ عَلَيْهِ فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ ثُمَّ قَالَ مَرْحَبًا بِالْأَخِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ فَلَمَّا تَجَاوَزْتُ بَكَى قِيلَ لَهُ مَا يُبْكِيكَ قَالَ أَبْكِي لِأَنَّ غُلَامًا بُعِثَ بَعْدِي يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مِنْ أُمَّتِهِ أَكْثَرُ مِمَّنْ يَدْخُلُهَا مِنْ أُمَّتِي ثُمَّ صَعِدَ بِي إِلَى السَّمَاءِ السَّابِعَةِ فَاسْتَفْتَحَ جِبْرِيلُ قِيلَ مَنْ هَذَا قَالَ جِبْرِيلُ قِيلَ وَمَنْ مَعَكَ قَالَ مُحَمَّدٌ قِيلَ وَقَدْ بُعِثَ إِلَيْهِ قَالَ نَعَمْ قَالَ مَرْحَبًا بِهِ فَنِعْمَ الْمَجِيءُ جَاءَ فَلَمَّا خَلَصْتُ فَإِذَا إِبْرَاهِيمُ قَالَ هَذَا أَبُوكَ فَسَلِّمْ عَلَيْهِ قَالَ

فَسَلَّمْتُ عَلَيْهِ فَرَدَّ السَّلَامَ قَالَ مَرْحَبًا بِالِابْنِ الصَّالِحِ وَالنَّبِيِّ الصَّالِحِ ثُمَّ رُفِعَتْ إِلَيَّ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى فَإِذَا نَبْقُهَا مِثْلُ قِلَالِ هَجَرَ وَإِذَا وَرَقُهَا مِثْلُ آذَانِ الْفِيلَةِ قَالَ هَذِهِ سِدْرَةُ الْمُنْتَهَى وَإِذَا أَرْبَعَةُ أَنْهَارٍ نَهْرَانِ بَاطِنَانِ وَنَهْرَانِ ظَاهِرَانِ فَقُلْتُ مَا هَذَانِ يَا جِبْرِيلُ قَالَ أَمَّا الْبَاطِنَانِ فَنَهْرَانِ فِي الْجَنَّةِ وَأَمَّا الظَّاهِرَانِ فَالنِّيلُ وَالْفُرَاتُ ثُمَّ رُفِعَ لِي الْبَيْتُ الْمَعْمُورُ ثُمَّ أُتِيتُ بِإِنَاءٍ مِنْ خَمْرٍ وَإِنَاءٍ مِنْ لَبَنٍ وَإِنَاءٍ مِنْ عَسَلٍ فَأَخَذْتُ اللَّبَنَ فَقَالَ هِيَ الْفِطْرَةُ الَّتِي أَنْتَ عَلَيْهَا وَأُمَّتُكَ ثُمَّ فُرِضَتْ عَلَيَّ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ فَمَرَرْتُ عَلَى مُوسَى فَقَالَ بِمَا أُمِرْتَ قَالَ أُمِرْتُ بِخَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ قَالَ إِنَّ أُمَّتَكَ لَا تَسْتَطِيعُ خَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ وَإِنِّي وَاللَّهِ قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وَعَالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ الْمُعَالَجَةِ فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ لِأُمَّتِكَ فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَوَضَعَ عَنِّي عَشْرًا فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَأُمِرْتُ بِعَشْرِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ فَقَالَ مِثْلَهُ فَرَجَعْتُ فَأُمِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ فَرَجَعْتُ إِلَى مُوسَى فَقَالَ بِمَ أُمِرْتَ قُلْتُ أُمِرْتُ بِخَمْسِ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ قَالَ إِنَّ أُمَّتَكَ لَا تَسْتَطِيعُ خَمْسَ صَلَوَاتٍ كُلَّ يَوْمٍ وَإِنِّي قَدْ جَرَّبْتُ النَّاسَ قَبْلَكَ وَعَالَجْتُ بَنِي إِسْرَائِيلَ أَشَدَّ الْمُعَالَجَةِ فَارْجِعْ إِلَى رَبِّكَ فَاسْأَلْهُ التَّخْفِيفَ لِأُمَّتِكَ قَالَ سَأَلْتُ رَبِّي حَتَّى اسْتَحْيَيْتُ وَلَكِنِّي أَرْضَى وَأُسَلِّمُ قَالَ فَلَمَّا جَاوَزْتُ نَادَى مُنَادٍ أَمْضَيْتُ فَرِيضَتِي وَخَفَّفْتُ عَنْ عِبَادِي)[1]واتا: جبرائیل لەگەڵ خۆیدا بردمی هەتا گەیشتینە ئاسمانی دوونیا، جبرائیل لەدەرگای دا،گوتیان: کێ یە؟ گووتی: جبرائیل، گوتیان کێت لەگەڵدایە؟ فەرمووی: محمد، گووتیان: ئەوکەسەی کە پەیامی بۆ نێردراوە؟ فەرمووی: بەڵێ، گووتیان: بەخێر بێت بەڕاستی باشترین کەسە کە هاتووە، جا کاتێك لە دەرگا چووینە ژوورەوە ئادەم لەوێبوو،

١ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

جوبڕائیل فەرمووی: ئەوە باوکتە ئادەم علیه السلام سڵاوی لێبکە،منیش سڵاوم لێکرد و ئەویش وەڵامی دامەوە، پاشان فەرمـــووی: بەخێربێی ئەی کوڕی چاك و پێغەمبەری چاك، دواتـــر بەرزبوینەوە هەتا گەیشتینە ئاسمانی دووەم، جوبڕائیل لەدەرگای دا، گووتیان کێ یە؟ فەرمووی: جوبڕائیل، گووتیان کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: محمد، گووتیان: ئەو کەسەی پەیامی بۆ نێردراوە؟ فەرمووی بەڵێ، گووتیان: بەخێر بێت بەڕاستی باشترین کەسە کە هاتووە، جا کاتێك لە دەرگا چوینە ژورەوە هەردووك پێغەمبەران عیساو یەحیا علیهما السلام کە پورزای یەکتر بـــوون لەوێ بوون، جوبڕائیـــل فەرمووی: ئەوە عیسا و یەحیان سڵاویان لێبکە، منیش سڵاوم لێکردن، ئەوانیش وەڵامیان دایەوە و گووتیان: بەخێر بێیت ئەی برای چاك و پێغەمبەری چاك، دواتر بەرزبوینەوە هەتا گەیشتینە ئاسمانی سێهەم، جوبڕائیل لەدەرگای دا، گووتیان کێ یە؟ فەرمووی: جوبڕائیل، گووتیان کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: محمد، گووتیان: ئەو کەسەی پەیامی بۆ نێردراوە؟ فەرمووی بەڵێ، گووتیان: بەخێر بێت بەڕاستی باشترین کەسە کە هاتووە، جا کاتێك لە دەرگا چوینە ژورەوە یوسفی پێغەمبەر علیه السلام لەوێبوو، جوبڕائیل فەرمووی: ئەوە یوسفە سڵاوی لێبکە، منیش سڵاوم لێکرد، ئەویش وەڵامی دامەوە و فەرمووی: بەخێر بێیت ئەی برای چاك و پێغەمبەری چاك،دواتر بەرزبوینەوە هەتا گەیشتینە ئاسمانی چوارەم، جوبڕائیل لەدەرگای دا، گووتیان کێ یە؟ فەرمووی: جوبڕائیل، گووتیان کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: محمد، گووتیان: ئەو کەسەی پەیامی بۆ نێردراوە؟ فەرمووی بەڵێ، گووتیان: بەخێر بێت بەڕاستی باشترین کەسە کە هاتووە، جا کاتێك لە دەرگا چوینە ژورەوە ئیدریسی پێغەمبەر علیه السلام لەوێبوو، جوبڕائیل فەرمووی:ئەوە ئیدریسە سڵاوی لێبکە، منیش سڵاوم لێکرد،ئەویش وەڵامی دامەوە و فەرمووی: بەخێر بێیت ئەی برای چاك و پێغەمبەری چاك،دواتر بەرزبوینەوە هەتا گەیشتینە ئاسمانی پێنجەم، جوبڕائیل لەدەرگای دا، گووتیان کێ یە؟ فەرمووی: جوبڕائیل، گووتیان کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: محمد، گووتیان: ئەو کەسەی پەیامی بۆ نێردراوە؟ فەرمووی بەڵێ، گووتیان:

بەخێر بێت بەڕاستی باشترین کەسە کە هاتووە، جا کاتێك لە دەرگا چوینە ژورەوە هاڕونی پێغەمبەر علیه السلام لەوێبوو، جوبڕائیل فەرمووی: ئەوە هاڕونە سڵاوی لێبکە، منیش سڵاوم لێکرد، ئەویش وەڵامی دامەوەو فەرمووی: بەخێر بێیت ئەی برای چاك و پێغەمبەری چاك،دواتر بەرزبوینەوە هەتا گەیشتینە ئاسمانی شەشەم، جوبڕائیل لەدەرگای دا، گووتیان کێ یە؟ فەرمووی: جوبڕائیل، گووتیان کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: محمد، گووتیان: ئەو کەسەی پەیامی بۆ نێردراوە؟ فەرمووی بەڵی، گووتیان: بەخێر بێت بەڕاستی باشترین کەسە کە هاتووە، جا کاتێك لە دەرگا چوینە ژورەوە موسای پێغەمبەر علیه السلام لەوێبوو، جوبڕائیل فەرمووی: ئەوە موسایە سڵاوی لێبکە، منیش سڵاوم لێکرد، ئەویش وەڵامی دامەوەو فەرمووی: بەخێر بێیت ئەی برای چاك و پێغەمبەری چاك، کاتێك لێی تێپەڕین گریان، گووتیان: بۆ دەگری؟ فەرمووی: خودای گەورە لەدوای من ئەو گەنجەی ناردووە کەچی ئوممەتەکەی ئەو لە هی من زیاتر دەچنە بەهەشتەوە.

(جا زانایان دەفەرموون: ئەم ئاخ هەڵکێشان و گریانەی موسای پێغەمبەر علیه السلام لەبەر حەسودیان نەبوو" چونکە پێغەمبەران پاکن لەو صیفاتە خراپانە، بەڵکو بۆ پەرۆشی ئەو پاداشت و پلەو پایەی بوو کە بەهۆی زۆری سەرپێچیەکانی ئوممەتەکەی لەدەستی چوون)[1]

دواتر بەرزبوینەوە هەتا گەیشتینە ئاسمانی حەوتەم،جوبڕائیل لەدەرگای دا، گووتیان کێ یە؟ فەرمووی: جوبڕائیل، گووتیان کێت لەگەڵ دایە؟ فەرمووی: محمد، گووتیان: ئەو کەسەی پەیامی بۆ نێردراوە؟ فەرمووی بەڵی، گووتیان: بەخێر بێت بەڕاستی باشترین کەسە کە هاتووە، جاکاتێك لە دەرگا چوینە ژورەوە ئیبراهیمی پێغەمبەر علیه السلام لەوێبوو، جوبڕائیل فەرمووی: ئەوە باوکتە سڵاوی لێبکە، منیش سڵاوم لێکرد، ئەویش وەڵامی دامەوەو فەرمووی: بەخێر بێیت ئەی کوڕی

---

١ـ فتح الباری: ٧/ ٢٦٥

چاك و پێغەمبەری چاك، پاشان بەرزکرامەوە بۆ(سدره المنتهى)كە دارێكە میوەكەی وەكو گۆزەی شاری هەجەر وەهایە ـ ئەوە كنایەیە بۆ گەورەیی میوەكەی ـ وە گەڵاكانی وەكو گوێی فیل وەهابوون، جوبرائیل فەرمووی ئەوە (سدره المنتهى)یە، وە لەوێ چوار ڕوباری لێوە دەڕۆیشت، دوانیان سەرچاوەكانیان دیار بوو، دوانەكانی تر سەرچاوەكانیان دیار نەبوو، منیش گوتم: ئەوانە چین ئەی جوبرائیل؟ ئەویش فەرمووی: هەرچی ئەو ڕوبارانەن كە سەرچاوەكەیان دیار نیە ئەوە دوور وباری بەهەشتن، وە ئەو دوانەی كە سەرچاوەكەشیان دیارە ئەوە ڕوباری نیل و فوراتن، پاشان بەرزکرامەوە بۆ (البیت المعمور)

(لە فەرموودەیەكی تردا پێغەمبەرﷺ دەربارەی (البیت المعمور) دەفەرمووێت: پرسیارم لە جوبرائیل كرد گووتم: ئەوە چیە و كوێیە؟ ئەویش فەرمووی: (هذا البَیتُ المَعمُورُ، یُصَلی فِیهِ کُلَّ یومٍ سبعونَ ألفَ مَلَك، إذا خَرَجوا لم یَعودوا إلیهِ)[1]واتا: ئەوە (البیت المعمور)ە هەموو ڕۆژێك حەفتا هەزار فریشتە سەردانی دەكات و نوێژی تێدا دەكات، جا كاتێك لە نوێژ بونەوە و هاتنە دەر هەرگیز بۆی ناگەڕێنەوە)

پاشان سێ پەرداخم بۆ هات" پەرداخێك مەی و پەرداخێك شیر و پەرداخێكیش هەنگوین، منیش پەرداخە شیرەكەم هەڵبژارد، جوبرائیل فەرمووی: ئەوە ئەو سروشت و خوو ڕەوشتی تۆو ئوممەتەكەی تۆیە.

(لە فەرموودەیەكی تردا پێغەمبەرﷺباسی دوای ئەوەمان بۆ دەكات و دەفەرمووێت: (ثُمَّ عُرِجَ بِيَ حتَّى ظَهَرتُ لِمستوى أسمَعُ فِیهِ صَرِیفَ الأقلام)[2]واتا: پاشان بەرزکرامەوە هەتا گەیشتە جێگایەك كە گوێم لەدەنگی نوسینی قەڵەم بوو- ئەو قەڵەمەی كە بەفەرمانی خودا

١- پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

هەرشتێك ڕوودەدات دەینوسێت و یەکەم دروستکراوی خودایە لە بەرجەستەکان ـ)

پاشان پێغەمبەرﷺ خودای پەروەردگاری بینی و کەوتنە گفتوگۆ و هەر شتێك خودای پەروەردگار ویستی لەسەر بوو باسیان کرد، پاشان خودای پەروەردگار پەنجا نوێژی لەسەر ئوممەتی پێغەمبەرﷺواجب کرد.

پێغەمبەرﷺدەفەرموێت: (ثُمَّ فُرِضَتْ عَلَيَّ الصَّلَوَاتُ خَمْسِينَ صَلَاةً كُلَّ يَوْمٍ)واتا: پاشان پەنجا نوێژی لەسەر من و ئوممەتەکەم واجب کرا، منیش گەڕامــــەوە و بەلای موســـادا علیه السلام تێپەڕیم، فەرمووی: فەرمانی چیت پێکرا؟ منیش گووتم: فەرمانم پێکرا کە لە ڕۆژێکدا پەنجا نوێژ بکەم، پێغەمبەر موسا فەرمووی: ئوممەتەکەت توانای نیە لە ڕۆژێکدا پەنجا نوێژ بکات، چونکە سوێند بەخودا من پێش تۆ ئوممەتانم تاقیکردۆتەوە، وە من زۆر هەوڵم لەگەڵ نەوەکانی ئیسرائل داوەو و بەرگریشم کردووە، بەڵام سەرکەوتو نەبووم، لەبەر ئەوە بگەڕێوە بۆ لای خودا و داوای سوککردنی لێبکە بۆ ئوممەتەکەت، منیش گەڕامەوە بۆ لای خوداو داوای سوککردنم لێکرد، خودای گەورەش دە نوێژی لەسەر سوك کردم، منیش گەڕامەوە و لە ڕێگادا بەلای موسادا تێپەڕیم، دیسان ئەو گفتو گۆیە لە نێوانماندا ڕوویدایەوە، منیش گەڕامەوە خودای گەورەش دە نوێژی تریشی لەسەر لادام، پاشان گەڕامەوە، دیسان هەمان گفتۆ لەگەڵ موسادا ڕوویدایەوە، ئەمە بەردەوام بوو، هەتا خودای پەروەردگار بۆی کردم بە پێنج نوێژ، بەهەمان شێوەی جارەکانی ڕابردوو کاتێك گەڕامەوە بەلای موسادا تێپەڕیم، پرسی بەچی فەرمانت پێکرا؟ منیش گووتم: بە پێنج نوێژ لە شەو و ڕۆژێکدا، فەرمووی: ئوممەتەکەت توانای پێنج نوێژی نیە لە شەو و ڕۆژێکدا، چونکە سوێند بەخودا من پێش تۆ ئوممەتانم تاقیکردۆتەوە وە من زۆر هەوڵم لەگەڵ نەوەکانی ئیسرائیل داوەو و بەرگریشم کردووە، بەڵام سەرکەوتو نەبووم، لەبەر ئەوە بگەڕێوە بۆ لای خودا و داوای سوککردنی لێبکە بۆ ئوممەتەکەت، منیش گووتم: ئەوەندە داوای

سوك کردنم لە خودای پەروەردگار کرد هەتا ئێستا شەرم دەکەم بگەڕێمەوە بۆ لای و داوای سوککردنی زیاتری لێبکەم، هەرچەندە من کاتێك گەڕامەوە ڕازی نەبووم" بەڵام ئێستا من بەو پێنج نوێژانە ڕازیم و ملکەچی فەرمانی خودا دەبم، کاتێك لە موسا تێپەڕیم بانگکارێك بانگی کردو فەرمووی: بڕیاری نوێژە فەڕزەکانم خستە بواری جێبەجێ کردنەوە، وە نوێژەکانیشم سوك کرد لەسەر بەندەکانم.

جا خودای گەورە پلەی پێغەمبەر موسا بەرز بکاتەوە لای خۆی، چونکە بەڕاستی بو بەهۆی خێر بۆ ئێمەی ئوممەتی حەزرەتی محمدﷺ، هەر بۆیە پێغەمبەری خوداﷺ دەربارەی پێغەمبەر موسا دەفەرموێت:( كَانَ مُوسَى أَشَدَّهُمْ عَلَيَّ حِينَ مَرَرْتُ بِهِ وَخَيْرَهُمْ لِي حِينَ رَجَعْتُ إِلَيْهِ)[1] واتا: موسا لەهەمویان توندتر بوو لەسەرم کاتێك بەلایدا تێپەڕیم، وە باشترینیان بوو بۆ من کاتێك بەلایدا گەڕامەوە.

پاشان دوای ئەو گەشتەو بڕینی ئەم ڕێگایە دورە" هەر لەم شەوەدا گەیشتەوە سەر زەوی و جێگاکەی خۆی، کەواتا موعجیزە ئیسڕاو میعڕاج هەروەك چۆن خودی خۆی پڕ لە موعجیزە" بەهەمان شێوە کەمی کاتی سەفەرەکەش موعجیزەیە، مەولەوی شاعیر رحه الله لە شیعرێکدا باسی ئیسڕاو میعڕاج و کەمی کاتەکەمان بۆ دەکات و دەفەرموێت:

ڕێی چەند هەزار ســاڵ    چوو.

طــەی چەند حیجابات    بوو.

زاتی حەق............    دی.

کەلام.................    بیستی.

سؤال.................    کریاوە.

---

١ـ پێشەوایان طبرانی و بەززار گێڕاویانەتەوە.

جەوابات............. دریاوە.

هاتەوە حەلقە هەر دەلەریاوە!![1]

جا لێرەدا مەولەوی شاعیر باسی کەمی کاتی ئەو گەشتەی پێغەمبەرمانﷺ بۆ دەکات و دەفەرموێت: لەگەڵ ئەوەی ڕێگای چەند هەزار ساڵی بڕی، پەردەی چەندین ئاسمانەکانی کون کرد و زاتی خودای بینی و وتوێژیان کرد، بەڵام کەهاتەوە حەلقەی ئەو دەرگایەی لێوەی ڕۆیشتبوو هێشتا لە لەرینەوە نەکەوتبوو!!

# چەند سودێك لە گەشتي ئیسراو میعراج

١- لەم گەشتەدا چەند ڕێزێك لە پێغەمبەری خوداﷺنرا کە دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

أ- گەورەیی هەموو فریشتەکان کە جوبرائیلە وەك نێردراوی خودا نێردرا بۆ لای و بۆ هاوڕێیی سەفەری.

ب - بەر لە دەستپێکردنی گەشتەکە سنگ و دڵی پێغەمبەرﷺ جوان شۆرا بە ئاوی باوەڕ، پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (فَاستَخرَجَ قَلبی، ثُمَّ أُتِیتُ بِطستٍ مِنْ ذَهَبٍ مَملوءةٍ إیماناً، فَغُسِلَ قَلبی ثُم حُشِيَ)[1]واتا: دڵمیان دەرهێنا، پاشان تەشتێکیان هێنا کە لە زێڕ بوو و پڕ بوو لە باوەڕ، دڵیان شۆردم و پاشان دایانپۆشیەوە و پێکیانەوە نایەوە.

ت - پێشکەوتوترین هۆکاری گواستنەوە بەدرێژیی مێژووی مرۆڤایەتی تەرخانکرا بۆ گواستنەوەو گەیاندنی پێغەمبەرﷺکە بوڕاق بوو، پێغەمبەرﷺدەربارەی تیژڕەوی بوڕاق دەفەرموێت: (یَضَعُ حَافِرَهُ عِنْدَ مُنْتَهَی طَرْفِهِ)واتا: هەنگاوەکانی بە ئەندازەی بینایی چاوەکانی

١- عەقیدەی مەرضیة:٤٢٢

٢- پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

خۆی دایدەنا، جا زانایان دەفەرموون: ووشەی بوڕاق لە (برق)ەوە هاتووە، واتا هەورە تریشقە، خێرایی ڕوناکایی هەورە تریشقەش لە ماوەی یەك چرکەدا (٣٠٠)هەزار کیلۆمەتر دەبڕێت. ئینجا بۆ خودای گەورە زۆر ئاسانە کە هەروەك چۆن خێراییەکی سەرسوڕهێنەری داوە بە ڕوناکی" هەمان خێرایش بدات بە ئاژەڵێکی خۆی.

ث ـ کاتێك پێغەمبەرﷺخەریك بوو سەرکەوێتە سەر پشتی بوڕاقەکە،بوڕاقەکە لە خۆشیاندا دەستی کرد بە جوڵەجوڵ، بەشێوەیەك سەرکەوتنی پێغەمبەریﷺ بۆ سەر پشتی گران و ناخۆش کرد، جوبرائیلیش بە بوڕاقەکەی فەرموو: (ما حَمَلَكَ علی هذا؟! فَوَاللهِ ما رَكِبكَ خلقٌ قطٌ أكرَمَ علی اللهِ مِنهُ، فارفَضَّ عَرقًا)[1]واتا: چی وات لێدەکات ئاوا بجولێیت؟! سوێند بەخودا هەرگیز هیچ کەسێك نەهاتۆتە سەر پشتی تۆ چاکترو ڕێزدارتربێ لەو زاتە کە حەزرەتی محمدەﷺ بوڕاقەکەش لە جوڵە کەوت و هەموو لاشەی لەشەرمان ئارەقی کرد.

ج ـ سەردانی مزگەوتی پێغەمبەرانی کرد کە مزگەوتی ئەقصایە، وە لەوێش بوو بە پێشنوێژ و پێشەوای سەرجەم پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بەگشتی.

ح ـ پاشان بەرز کرایەوە بۆ ئاسمان و بۆ چاوپێکەوتنی خودای گەورە، ئەمەش یەکەم پێغەمبەر و یەکەم کەسە کە بۆ سەردان وخودای میهرەبان بەرز بکرێتەوە بۆ ئاسمان، پێشتر دوو پێغەمبەر بەرز کراونەتەوە بۆ ئاسمان کە(ئیدریس و عیسا)ن، بەڵام هیچیان بۆ سەردان و بینینی خودا نەبوون،

خ ـ لەهەموو ئاسمانەکان کاتێك دەرگاوانی ئاسمان دەیزانی کە جوبرائیل پێغەمبەریﷺ لەگەڵدایە بە (نعم المجیء) بەخێر هاتنی دەکرد!!

د ـ لە هەر ئاسمانێك پێغەمبەرێك یان چەند پێغەمبەرێك لە پێشوازی پێغەمبەردا بوون!!

---

١ـ پێشەوا احمد لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتەوە.

ژـ لەم گەشتـــەدا پێغەمبـــەری خوداﷺبەرزکرایەوە بۆ(سدرة المنتهی و البیت المعموری)و هەردوکیانی بینی.

زـ لەم گەشتـــەدا گەورەترین نیعمـــەتی بەهەشتیﷺ پێ بەخشـــرا کە بینینی خودای پەروەردگارە، پێشەوا نەوەوی رحمه الله دەفەرموێت: قسەی ڕاست ئەوەیە کە پێغەمبەری خوداﷺ لە شەوی میعراجدا بە چاوی سەری خودای پەروەردگاری بینی، ئەوەش ڕای إبن عەبباس و زۆرینەی هاوەڵان و زانایانی ئیسلامە.[1]

ئەمەش یەکەم کەسە کە لەدونیادا خودای پەروەردگار ببینێت و ئەم نیعمەتەی پێبدرێت، پێشتر پێغەمبەر موساعلیه السلام داوای بینینی خودای پەروەردگاری کرد، بەڵام خودای پەروەردگار پێی فەرموو: ﴿لَن تَرَانِي﴾[2] واتا: هەرگیز تۆ لە دونیادا من نابینیت.

جا ئەگەر سەیر بکەین دەبینین: حەزرەتی موسا بۆخۆی داوای بینینی خودای پەروەردگاری کرد" بەڵام خودای گەورە خۆی نیشان نەدا، بەڵام پێغەمبەری خۆمانﷺ بێ ئەوەی داوای بکات خودای پەروەردگار بۆخۆی بانگهێشتی کـــرد بۆ بینینی خۆی، دیسان ئـــەوەش نیعمەتی چاوپێکەوتنی خودا بۆ پێغەمبەرﷺ گەورەتر دەکات.

٢ـ کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ گەیشتە (بیت المقدس) بوڕاقەکەی بەستەوە!! لێرەدا پرسیارەکە ئەوەیە: ئایا بوڕاقێك بە فەرمانی خودا و لەگەڵ جوبڕائیلدا نێردرابێت بۆ لای پێغەمبەرﷺ، وە وڵاخی ســـواری پێغەمبەران بێت" پێویستی بە بەستنەوە چییە؟ وەڵامەکەی ئەوەیە:پێغەمبەری خوداﷺلەبەر ئەوە بوڕاقەکەی بەستەوە بۆ ئەوەی ئێمە فێر بکات هۆکارەکان بەدەستەوە بگرین بۆ هەر ئیش و کارێك بۆ ئەوەی تێیدا سەرکەوتو بین، وە بۆ ئەوەی بە ئێمە

١ـ فتاوى الإمام النووى المسماة بالمسائل المنثورة: ٦٤

٢ـ الأعراف: ١٤٣

بڵێت: تەنها پشت بەستن بەخودا (توکل) بەبێ گرتنە دەستی هۆکار کارێکی هەڵەیە، هەر لەبەر ئەوە بو کاتێك پیاوێك لە پێغەمبەریﷺ پرسی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئایا حوشترەکەم ببەستمەوە جا پشت بەخودا ببەستم یان بەرهەڵدای بکەم و پشت بەخودا ببەست؟ پیغەمبەرﷺ فەرمووی: (اِعقِلها وَتَوَكّل)[1] واتا: بیبەستەوە ئینجا پشت بەخودا ببەستە.

٣ـ پێغەمبەری خوداﷺ لە هەر ئاسمانێك پێغەمبەرێك یان چەند پێغەمبەرێکی بینی" وە لە (البیت المقدیس)یش پێشنوێژی بۆ سەرجەم پێغەمبەران کرد، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێغەمبەران نامرن، بەڵکو تەنها لەناو مرۆڤەکان دەچنە دەرەوە، وە کاتێك هاوەڵان لە پێغەمبەری خودایان پرسی: یارسولَ اللهِﷺ كيفَ تُعرَضُ صلاتُنا عَلَيكَ وقد أَرِمتَ؟ واتا: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ صەلاوەتەکانی ئێمە چۆن بەتۆ دەگەن و پیشانت دەدرێن لەکاتێکدا تۆ بوویت بە خاك و خۆڵ؟ پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: (إنَّ اللّٰهَ حَرَّمَ على الأرضِ أجسادَ الأنبياء)[2] واتا: بەڕاستی خودای گەورە حەرامی کردووە لەسەر زەوی ئەگەر لاشەی پێغەمبەران بخوات. کەواتا: ئێستا پێغەمبەران زیندون و لە ژیاندان" بەڵام ژیانێك کە شایستە بێت بەوان، وە تەنها خودای گەورەش چۆنیەتی ژیانی ئەوان دەزانێت.

٤ـ ئوممەتی پێغەمبەرﷺزۆرینەی دانیشتوانی بەهەشت پێکدەهێنن، وە زۆری ئوممەتی پێغەمبەریش لە بەهەشت وەهای کردووە کە پێغەمبەران ئاخ هەڵبکێشن بۆ ئەوەی ئوومەتەکەی ئەوانیش ئاوا ژمارەیان زۆربایـــە لە بەهەشتدا، هەر بۆیە کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ بەلای حەزرەتی موسادا تێپەڕی جەزرەتی موسا دەستی بە گریان و ئاخ هەڵکێشان کرد!! وە پێغەمبەری خوداﷺ لە چەندین فەرموودەدا موژدەی پێداوین کە ئێمەی ئوممەتی ئەو زۆرینـــەی

---

١ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان ابوداود و ابن ماجە گێڕاویانەتەوە.

بەهەشتین، عبداللە ی کوڕی مەسعود رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إني لأرجو أن تكونوا شطرَ أَهْلِ الْجنة)[1] واتا: تکام وایە ئێوەی ئوممەتی من لایەکی ئەهلی بەهەشت بن. وە بورەیدە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (أهلُ الجنةِ عِشرونَ وَمائة صَفٍ، ثمانونَ مِنها مِن هذهِ الأمَة، وَأَربَعونَ مِن سائِرِ الأمَمِ)[2] واتا: خەڵکی بەهەشت سەد و بیست ڕیزن، لەو سەد و بیست ڕیزە هەشتایان لەو ئوممەتەی منە،وە چلەکەی تریش لە هەموو ئوممەتەکانی تر پێك هاتووە.

لەبەر ئەوە پێویستە ئێمە بەردەوام سوپاسی خودای گەورە بکەین کە ئێمە کردووە بە نوومەتی ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارو خۆشەویستە ﷺ.

٥ـ لەم گەشتەدا بۆ میوانداری کردنی پێغەمبەر ﷺ سێ پەرداخی پڕیان بۆ هێنان، پەرداخێك مەی پەرداخێك شیر پەراخێك هەنگوین، پێغەمبەری خوداش ﷺ پەرداخە شیرەکەی هەڵبژارد، جوبرائیلیش فەرمووی: ئەوە ئەو سروشت و خوو ڕەوشتی تۆو ئوممەتەکەی تۆیە.

جا بە شاهیدی گەورەترینی فریشتەکان کەحەزرەتی جوبرائیلە سروشتی ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ پاکی و بێ تاوانیە، چونکە لە فەرموودەیەکی تردا جوبرائیل بە پێغەمبەری ﷺ فەرموو: (أمَا إنَكَ لو أَخَذتَ الخَمْرَ غَوَتْ أمَّتكَ)[3] واتا: ئەگەر هاتباو تۆ مەیەکەت هەڵبژاردبایە" ئەوە ئوممەتەکەت گومڕاو سەر گەردان دەبوو!!

جا ئەو کەسانەی لە ئوممەتی پێغەمبەرن و تاوان دەکەن ئەوانە لە سروشتی ڕاستەقینەی خۆیان لایانداوە، ئەگەرنا" سروشتی ئوممەتی ئەو ﷺ پاکــی و بێ تاوانیە، ئینجـا ئەی برای بـاوەڕداری

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

ئومەتی پێغەمبەرﷺ" تۆ چۆن ڕێگا بەخۆت دەدەیت مەی بخۆیتەوە و بچیتە میوانداریەك کە مەی تێدا دەخورێتەوە، لە کاتێکدا پێغەمبەرەکەتﷺ لە گەورەترین و خۆشترین میوانداریدا مەی ڕەتکردۆتەوە؟!!

٦ـ لەم گەشتەدا لە شەو ورۆژێکدا پێنج نوێژ لەسەر پێغەمبەرﷺو ئومەتەکەی واجب کرا: جا ئەگەر وردبینەوە دەبینین کە تاکە بنچینەیەك لە بنچینەکانی ئیسلام" وە تاکە واجباتێك لە واجباتەکانی ئیسلام کە لە ئاسمان واجب بوبێت نوێژە،بنچینەکانی ترو واجباتەکانی تر هەموویان لەسەر زەوی واجب بوون، ئەوەش ئاماژەیە بۆ گەورەیی و گرنگی نوێژ، هەر لەبەر ئەوەشە لە ڕۆژی قیامەت یەکەم لێپرسینەوە کە لە بەندەکان دەکرێت دەربارەی نوێژە، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: ( إِنَّ أَوَّلَ ما يُحاسَبُ بِهِ الْعَبدُ يَومَ الْقِيامةِ مِنْ عَمَلِهِ صَلاتُهُ فإِنْ صَلُحَتْ فَقَدْ أَفلحَ وَأَنْجحَ وَإِنْ فَسَدَتْ فَقَدْ خابَ وَخَسِرَ)[1]واتا: یەکەم کردەوە لەکردەوەکانی بەندەکان کە لێپرسینەوەی لێدەکرێت دەربارەی نوێژە، ئەگەر نوێژەکانی تەواو بون و بەچاکی ئەنجامی دابوون" ئەوە سەرفرازو سەرکەوتو دەبێت، وە ئەگەر نوێژەکانی تەواو نەبوون و بەخراپی ئەنجامی دابوون یان هەر نەیکردبوون" ئەوە بێ هیواو خەسارەتمەند دەبێت.

لەبەر ئەوە برای موسڵمانم/ ئاگاداری نوێژەکانت بە، ئەو گرنگیەی خودای گەورە بە نوێژی داوە تۆش هەمان گرنگی پێبدە، هەتا بۆت دەکرێت نوێژەکانت بەکۆمەڵ ئەنجام بدە، کە بۆشت نەگونجا نوێژەکەت بە کۆمەڵ ئەنجام بدەیت" هەوڵبدە بە باشترین و جوانترین شێوە مەرج و ڕوکن و واجبات و سوننەتەکانی ئەنجام بدەیت، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە لە قیامەتدا سەربەرز و سەرفراز بیت إن شاءالله.

١ـ پێشەوایان ترمذی نسائی گێڕاویانەتەوە.

٧ـ پێغەمبەری خوداﷺ لەشەوی میعراجدا سەردانی بەهەشت و دۆزەخی کرد، وە لەو سەردانەدا کۆمەڵێك لە نیعمەتەکانی بەهەشت و بەشێکیش لە سزای دۆزەخیەکانی بینی، پێغەمبەرﷺدەربارەی دۆزەخ دەفەرمووێت: (رأيتُ النارَ يَحطِمُ بعضُها بَعضاً)[1]واتا: دۆزەخم بینی بەشێکی بەشەکەی تری تێکدەشکاند،

جا زانایان جیاڕان دەربارەی چۆنیەتی بینینی بەهەشت و دۆزەخ لەلایەن پێغەمبەرەوەﷺ إبن عبدالبر رحمه الله لە (التمهيد)دا دەفەرمووێت: (والآثارُ في رُؤيَتِهِﷺلِلجَنَّةِ وَالنّارِ كَثِيرةٌ، وَقَدْ رَآهُما مِراراً، وَاللهُ أعلَمُ عَلى ما جاءَتْ بِهِ الْأحادِيثُ، وَعِندَ اللهِ عِلْمُ كَيفِيَةِ رُؤيَتِهِ لَهُماﷺفَيُمكِنُ أنْ يُمَثِلا لَهُ فَيَنظُرَ إليهِما بِعَينَي وَجهِهِ كَما مُثِّلَ لَهُ بَيتَ الْمَقدِسِ حِينَ كَذَّبَهُ الْكُفّارُ بِالإسراءِ فَنَظَرَ إلَيهِ وَجَعَلَ يُخبِرُهُم عَنهُ،وَمُمكِنٌ أنْ يَكونَ ذلِكَ بِرُؤيَةِ الْقَلبِ...،ثم قالَ: والظاهِرُ الْأغلَبُ أنَهُ رَآهُما رُؤيَةَ عَينٍ)واتا: فەرمودەکان دەربارەی بینینی پێغەمبەرﷺبۆ بۆ بەهەشت و دۆزەخ زۆرن، وە پێغەمبەری خوداﷺچەند جارێك بینیونی، وە خودای گەورە زاناترە لەو فەرمودانەی دەربارەی هاتوون، وە هەر لای خوداشە زانستی چۆنیەتی بنینیان لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ، دەکرێت خودای گەورە وێنەی هەردوکیانی نیشان دابێت ئەویش بەهەردوك چاوەکانی سەیری کردبن" هەروەك چۆن کاتێك بێباوەڕەکانی مەککە نکۆڵیان کرد لە ئیسراو میعراج و بەدرۆیان خستەوە خودای گەورە وێنەی (بيت المقديس)ی پیشاندا ئەویش هەواڵی پێدەدان دەربارەی هەر پرسیارێك کە لێیان دەکرد، وەدەشکرێت بەچاوی دڵ هەردوکیانی بینیبێت، بەڵام ئەوەی دیار و بەربڵاوە ئەوەیە کە هەردوکیانی بەچاوی سەر بینیوە.

وە زەڕقانی رحمه الله لە شەرحی (موطأ)دا دەفەرمووێت: (أنَّ اللهَ خَلَقَ لِنَبِيهِ إدراكاً خاصّاً أَدرَكَ

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

بِهِ الْجَنَّةَ وَالنَّارَ عَلى حَقِيقَتِهِما)واتا:خودای پەروەردگار هەستیارێکی تایبەتی بۆ پێغەمبەرەکەی ﷺ دروستکرد بۆ ئەوەی لە ڕێیەوە بەهەشت و دۆزەخ وەکو خۆیان ببینێت.

جا بەهەر شێوەیەك ببینین گرنگ ئەوەیە کە پێغەمبەری خودا ﷺ لەشەوی میعراجدا سەردانی بەهەشت و دۆزەخی کردو هەردوکیانی بینی، وە لە چەندین فەرموودەدا باسی بەشێك لە دیمەنەکانی بەهەشت و دۆزەخی بۆ ئێمە کردووە، بۆ ئەوەی لە دیمەنە سامناکەکانی دۆزەخ بترسێین و بەهۆیەوە خۆمان لە تاوان بپارێزین، وە کردەوەی چاکە بکەین و هەوڵ بدەین بۆ بەدەستهێنانی بەهەشت و نیعمەتەکانی .

## ڕودانی ئیسڕاو میعڕاج بە عەقڵ و زانست چاوەڕوان کراوە

ئێمەی باوەڕداری ئوممەتی پێغەمبەر ﷺ بڕوامان بەهەر شتێك هەیە کە لە قوڕئان و سوننەتدا هاتبێت، بەڵکو وەکو ڕاستگۆی ئوممەت رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەڵێین: ئەگەر پێغەمبەری خودا ﷺ لە میعڕاجیش زیاتر بفەرمووێت" ئێمە هەر دەڵێین: (سمعنا وصدقنا وآمنابه وأطعنا)، بەڵام بۆ ئەو کەسانەی کە بێباوەڕن بە شەریعەتی محمد ﷺ،یان باوەڕدارن بەڵام باوەڕێکی لاوازیان هەیە، وەیان بۆ ئەو کەسانەی کە هەر شتێك لەگەڵ عەقڵە کلۆڵەکەیاندا نەگونجێت بڕوای پێناکەن یان لێکدانەوەیەکی ـ تأویل ـ تری بۆ دەکەن، لە چەند خاڵێکدا ڕونی دەکەینەوە کە ڕودانی ئیسڕاو میعڕاج لە ڕوی عەقڵ و زانستەوە چاوەڕوان کراوە:

١ـ کاتێك خودای گەورە هەبوو هیچ شتێك نەبوو(كان اللهُ ولَمْ يَكُنْ مَعَهُ شَيءٌ)[1] پاشان خودای گەورە ئەم هەموو بونەوەرەی کە دەیبینین هەمووی هێنایە بوون، لە ناویاندا فریشتەکان و هەورە بروسکە، ئەم فریشتانەش لە کاتێکی زۆر کەمدا دێنە سەر زەوی و دەگەڕێنەوە بۆئاسمان، بۆ نمونە ئەو فریشتانەی دەنێردێرن بۆ بەرزکردنەوەی ڕوحی بەندە چاکەکان دوای ڕوح کێشانی،

پاشان لەماوەیەکی زۆر کەمدا ئەم ڕوحە بەرز دەکەنەوە بۆ خزمەتی خودا و دەشیهێننەوە سەر زەوی، وە ڕوناکی هەورە بروسکە لە چرکەیەکدا ٣٠٠ ملیۆن کیلۆمەتر دەبڕێت، جا پرسیارەکە ئەمودیە: ئایا خودایەك ئەو هەموو بونەوەرەی دروستکردبێت" خودایەك فریشتەکانی دروستکردبێت لە ڕۆژێکدا چەند جارێك بێنە سەر زەوی بگەڕێنەوە بۆ ئاسمان" خودایەك تریشکی هەورە بروسکە دروستکردبێت لە چرکەیەکدا ٣٠٠ملیۆن کیلۆمەتر بڕێت" ناتوانێت بەندەیەکی خۆی کە لە هەموو فریشتەکان و هەموو بونەوەرەکانی تری ڕێزدار ترە لە تەمەنیدا جارێك بەرزی بکاتەوە بۆ ئاسمان؟! بێگومان بەڵێ و سەد جار بەڵێ.

٢ـ ئەگەر کەسێك بڵێت منداڵێکی یەك ساڵە بۆخۆی سەرکەوت بۆ سەر چیای هیمالایە، مرۆ بڕوای پێناکات، بەڵام ئەگەر کەسێکی تەواو بڵێت منداڵێکم برد بۆ سەر چیای هیمالایە" ئەوە هەموو کەس بڕوای پێدەکات،(لله المثل الأعلى) لێرەشدا خودای گەورە نافەرموێت: پێغەمبەر ﷺ بۆخۆی هات بۆ ئیسراو میعراج" بەڵکو دەفەرموێت: ﴿سُبْحَانَ الَّذِي أَسْرَى بِعَبْدِهِ﴾[1]واتا: پاك و بێگەردی بۆ ئەو خودایەی کە شەوڕەوی کرد بە بەندەکەی خۆی.

جا ئەم ئایەتە ئەوەمان پێدەڵێت کە خودای گەورە بۆخۆی شەوڕەوی بە پێغەمبەرەکەی ﷺ کردوە" نەوکو پێغەمبەر ﷺ بۆ خۆی شەوڕەوی کردبێت، ئەوە کاری پەروەردگارە نەوەکو کاری بەندەکەی کە پێغەمبەرە ﷺ، خودای گەورەش هەر شتێك بیهەوێت پێی دەفەرموێت: ﴿كُنْ فَيَكُونُ﴾[2]واتا: ببە ئەویش دەست بەجێ دەبێت.

٣ـ لەم ڕۆدا زانست گەیشتوە بەوەی کە بەرزترین ڕێژەی خێرایی"خێرایی ڕوناکیە لە بۆشایدا، وە ئەگەر بێت و صاروخێك خێراییەکەی نزیك بێتەوە لە خێرایی ڕوناکی لە بۆشایدا ئەوە دەتوانێت لە ڕۆژێکی ئاسایدا ماوەی پەنجا هەزار ساڵ ڕێ ببڕێت!! ئەمە لەگەڵ ئەوەی بەڵێ زانست لەم ڕۆدا گەیشتوە بەوەی کە بەرزترین ڕێژەی خێرایی خێرایی ڕوناکیە لە بۆشایدا" بەڵام

هەرگیز زانست نکۆڵی لەوە ناکات کە دەگونجێت شتێکی تر هەبێت خێرایی لە خێرایی ڕوناکی لە بۆشایدا زیاتر بێت" با زانست تا ئێستا پێشی نەگەیشتبێت، ئینجا بەپێی توێژینەوەی زانستی دەرکەوتووە ئەگەر خێراییەك هەبێت لە خێرایی ڕوناکی لە هەوادا خێراتر بێت"ئەوە ماوە لە بەردەمیا دەنوشتێتەوەو کات نامێنێت، پاشان ئینشتاین لە(نظرية النسبية الخاصة)دا دەڵێت: ناکرێت باسی کات بکرێت بەبێ جێگایەکەی، بەهەمان شێوە نابێت باسی جێگا بکرێت بەبێ کاتەکەی، چونکە کات و جێگا پەیوەستن بەیەکەوە، مادام هەموو شتێك دەجولێت" دەبێت کاتەکەشی لەگەڵ خۆیدا هەڵبگرێت، وەهەر کاتێك شتێك بەخێرایتر جولایەوە، ئەوە کاتەکەی دەچێتە پاڵ یەك بەنیسبەت شتەکانی تری دەوروبەری، وە شتەکانی دەوروبەری هێواش تر دەبن لە خۆی.[1] بێگومان خێرایی ئیسراوميعراجی پێغەمبەریشﷺخێراترین خێرایی بووە بەدرێژایی مێژوو، وە ئەو جێگایەی کە پێغەمبەری خوداﷺ میعراجی بۆ کردووە زۆر جیاوازتر بووە لەسەر زەوی، لەبەر ئەوە بەپێی توێژینەوە زانستیەکان و بیرۆکەکەی ئەنشتاین ماوە لەبەردەمیدا نوشتاوەتەوە و کات نەماوە، بۆیە ئەو ماوە زۆرەی لە کاتێکی کەمدا بڕیوە.

٤ـ لەم ڕۆژگارەدا ئەو عەقڵەی خودا بە بەندەکانی داوە توانیویەتی چەندین شت دروستبکات کە بەخێراییەکی پێوانەیی دەگەنە جیگای مەبەست، وەك: دەنگی تەلەفۆن، وزەی کارەبا، دەنگ و ڕەنگی کەناڵە ئاسمانیەکان، ئینتەرنێت...هتد، جا ئەگەر مرۆڤ بتوانێت بەهۆی ئەو عەقڵەی کە خودا پێی داوە ئەو کارە سەرسوڕهێنەران بکات" ئایا خودای گەورە ناتوانێت موعجیزەیەکی وەك ئیسراو میعراج بە گەورەترین دروستکراوی خۆی بدات؟!!

١ـ سایتی موسوعة الإعجاز العلمي، معجزة الإسراء والمعراج من منظور العلمي، دكتور كارم السيد غنيم، أمين جمعية الإعجاز العلمي للقرآن والسنة.

٥ـ لە سەردەمی خۆیدا کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ لە ئیسراو میعراج گەڕایەوە و هەواڵی بە بێباوەڕان دا دەربارەی گەشتەکەی، بێباوەڕان زۆر بەتوندی بەدرۆیان خستەوە، وە بەشێکیان گاڵتەیان پێدەکرد و دەیانگووت محمد تێکچووە، هەتا کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵی گەشتەکەی بە ابوجهل دا، أبو جهل گووتی: ئایا ئەوەی هەواڵت بەمن داوە بۆ خەڵکی تریشی باس دەکەی؟ ـ چونکە ابو جهل وایدەزانی پێغەمبەرﷺ پەشیمان دەبێتەوەـ بەڵام پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵێ، ئینجا هەندێکیان بەغاردان ڕایان کرد بۆ لای پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه بۆ ئەوەی ئەو هەواڵەی پێبدەن، بەڵکو پێشەوا ابوبکریش رضي الله عنه لە پێغەمبەرﷺ بکەوێتە گومان و پاشگەز ببێتەوە، بەڵام کاتێك هەواڵەکەیان بە پێشەوا أبوبکر گووت و گووتیان: هۆ ابوبکر هاوڕێکەت دەڵێ ئەمشەو چوومەتە(بیت المقدیس)و هاتوومەتەوە مەککە!! پێشەوا ابوبکر رضي الله عنه فەرمووی: مادام پێغەمبەرﷺ وادەفەرموێت ڕاست دەکات! جا لەو ڕۆژەوە نازناوی ابوبکری پێشەوا بوو بە (صدیق)، پاشان بێباوەڕان لە پێغەمبەرﷺ کۆبونەوە و گووتیان: باشە ئەی محمد تۆ دەڵێی من ئەمشەو چوومەتە (بیت المقدیس) دەی مادام چووی باسێکی (بیت المقدیس)مان بۆ بکە، ـ بێباوەڕان دەیانزانی کە پێشتر هەرگیز پێغەمبەرﷺ نەچۆتە (بیت المقدیس)، وە بەشێك لە بێباوەڕەکان بەهۆی سەفەری بازرگانیەوە (بیت المقدیس)یان بینیبوو، لەبەر ئەوە پرسیاریان لێکرد- خودای پەروەردگاریش (بیت المقدیس)ی هێنایە بەرچاوی پێغەمبەرﷺ،هەر پرسیارێکیان لێدەکرد دەستبەجێ وەڵامی دەدانەوە، ئەوەش بو بەهۆی دەمکوتکردنی بێباوەڕان و زیادبونی باوەڕی باوەڕداران.[1]

وە لە فەرموودەیـــەکی تردا ام هانی بۆمان دەگێڕێتەوە کە لـــە پێغەمبەریانﷺ پرسی(بیت

١ـ پێشەوایان احمد و بەزار بە سەنەدێکی(حسن) گێڕاویانەتەوە. بڕوانە فتح الباری: ٧/٢٥٠

المقدیس) چەند دەرگای تێدابوون؟ پێغەمبەریش دەفەرمووێت: منیش ئەوکات ئەم ژماردبوون! بەڵام خودای پەروەردگار (بیت المقدیس)ی نیشاندام منیش یەك بەیەك دەرگاکانیم دەژماردن!!

وە لەفەرموودەیەکی تردا کە أبویعلی گێڕاویەتەوە بۆمان باس دەکات: پیاوێك لە پێغەمبەری ﷺپرسی: ئایا لە فلاّن شوێنە بەلای حوشترەکانی ئێمەدا تێنەپەڕی؟ پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (نَعم واللهِ، قد وَجَدتُهُم قَد أضلّوا بعيراً لَهُم فَهُم في طَلَبِهِ، وَ مرَرتُ بِإبلِ بَني فُلان إنكَسَرَت لَهم ناقةٌ لَهُم)واتا: بەڵێ سوێند بەخودا، بێگومان بینیمن حوشترێکیان لێ ونبوبوو بەدوایدا دەگەڕان، وە بەلای حوشترەکەی فلاّن بنەماڵەشدا تێپەڕیم بەمەرجێك حوشترێکیشیان دەستی شکابوو!! جا کاتێك خەڵکی مەککە لێکۆڵینەوەیان کرد بۆیان دەرکەوت کە قسەکانی پێغەمبەر ﷺ هەموویان تەواو و ڕاستن لەبەر ئەوە بێدەنگ بوون.

کەواتا: لەسەردەمی خۆشیدا پێغەمبەری خودا ﷺ بەبەڵگەی بەرجەستە ڕاستی ئیسراو میعراجەکەی دڵنیا کردۆتەوە، لەبەر ئەوەش بێباوەڕان دەمکوت و بێدەنگ بوون لە ئاستی ئەو معجیزە گەورەیە و درێژەیان بە نکۆڵی کردنی نەداوە.

جا ئەمەی ڕابرا بەکورتی باسی یەکێك لە گەورەترین موعجیزەکانی پێغەمبەر ﷺو وردەکاریەکانی بوو، بەهیوای ئەوەی ببێتە مایەی بەهێز بون و پتەو بونی باوەڕی هەموو لایەکمان، وە لە خودای گەورە داواکارین بەزوترین کات خاکی پیرۆزی (قدس)و یەکەم قیبلەگای موسڵمانان بگێڕێتەوە بۆ ناو خاکی ئیسلام و بە ئازادکردنی ئەم خاکە پیرۆزە دڵشاد بین، ئامین.



# شەوی قەدری پیرۆز

# (لیلةالقـــــدر)

﴿لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾

## شەوی قەدری پیرۆز

شەوی قەدری پیرۆز ئەو شەوەیە کە خودای پەروەردگار کۆتا پەیامی خۆی بۆ گەورەترین و خۆشەویسترین پێغەمبەری خۆیﷺ تێدا ناردە خوارەوە، جا هەر لە دوای ئەو کاتەوە گشت باوەڕدارانی ئاسمان و بەشێك لە باوەڕدارانی زەوی ساڵانە بە تاسەوە چاوەڕێی هاتنی ئەم شەوە دەکەن و ئەم شەوە بە عیبادەت و خواپەرستی زیندو دەکەنەوە، وە هەر لەو شەوەدا باوەڕدادارانی زەوی ئاسمان بەیەك دەگەن و تۆقەی خۆشەویستی دەکەن، وە هەر لەوشەوەدا گەورەی باوەڕدارانی ئاسمان جبرائیل وەك یادکردنەوەی ئەم شەوە بە فەرمانی خودای گەورە دادەبەزێت بۆ سەر زەوەی و مژدە بەو باوەڕدارانە دەدات کە خەویان لەچاوی خۆیان ڕەواندووە و سەرقاڵی عیبادەتی خودان، وە خودای پەروەردگاریش پەیمانی داوە هەر موسڵمانێك ئەم شەوە زیندوو بکاتەوە" ئەوە خێر و پاداشتی هەزار مانگی بۆ دەنوسێت ـ کە دەکاتە زیاتر لە ٨٣ ساڵ ـ و دەفەرمووێت ﴿لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾[1] واتا: زیندوو کردنەوەی شەوی قەدری بەڕێز خێری زیاترە لە عیبادەتی هەزار مانگ.

## تایبەتمەندیەکانی شەوی قەدر

خودای پەروەردگار شەوی قەدری بەچەندین تایبەتمەندی تایبەت کردووە و ڕێزی لێناوە، ئەوانەی خوارەوە بەشێکن لە تایبەتمەندی و گەورەییەکانی شەوی قەدری پیرۆز:

١ـ خودای پەروەردگار لەشەوی قەدردا قورئانی دابەزاندووە، کە گەورەترین و پیرۆزترین کتێبە و بەرنامەی ژیـــانە، وە هەر کەسێك و هەر دەوڵەتێك دەستی پێوە بگرێت و بیکـــات بەبەرنامەی ژیانی خۆی" ئەوە سەرکەوتو و سەربەرزی دوونیا و قیامەت دەبێت. خودای گـــەورە

١ـ القدر: ٣

دەفەرموێت: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةِ الْقَدْرِ﴾[1] واتا: بەڕاستی ئێمە لەشەوێکی یەکجار گەورە و پیرۆزدا قورئانمان دابەزاندووە کە شەوی قەدرە.

جا زانایان جیاڕان دەربارەی دابەزینی قورئان لەشەوی قەدردا:

أـ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: خودای گەورە لە شەوی قەدردا قورئانی هەموو بەیەك جار لە (لوح المحفوظ)ەوە ناردوێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی دوونیا، ئەوەش ڕای ابن عباسەرضي الله عنه.

ب ـ بەشێکی تریان دەفەرموون: خودای پەروەردگار لە شەوی قەدردا دەستی کردووە بە دابەزاندنی قورئان بۆ سەر پێغەمبەرﷺ، ئەوەش ڕای زانایان شعبی و سعیدی کوڕی جبیرە رحمهما‌الله.[2]

٢ـ خواپەرستی کردن لە شەوی قەدردا خێری زیاترە لە خواپەرستی کردنی هەزار مانگ ئەگەر شەوی قەدری تێدا نەبێت، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾[3] واتا: زیندوو کردنەوەی شەوی قەدری بەڕێز خێری زیاترە لە عیبادەتی هەزار مانگ.

٣ـ هەموو ڕۆژێك خۆر لە نێوانی دوو شاخەکانی شەیتانەوە هەڵدێت" تەنها لە بەرە بەیانی شەوی قەدردا نەبێت، عبدالله کوڕی مسعودرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إنَّ الشَّمسَ تَطلُعُ كُلَّ يَومٍ بَينَ قَرنَي الشَّيطانِ إلا صَبيحَةَ لَيلةِ الْقَدرِ)[4] واتا: بەڕاستی هەموو ڕۆژێك خۆر لە نێوانی هەردوو شاخەکانی شەیتانەوە هەڵدێت" تەنها بەرەبەیانی شەوی قەدر نەبێت. وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (ولا يَحِلُّ

١ـ القدر: ١

٢ـ الجامع الأحكام القران: ٢٠/ ١٢٠

٣ـ القدر: ٣

٤ـ پێشەوا ابن ابی شیبە گێڕاویەتەوە.

لِلشَّيطانِ أَنْ يَخرُجَ معَها يومئذٍ)[1] واتا: شەیتان بۆی نیە لەگەڵ بەرەبەیانی شەوی قەدردا دەرکەوێت.

٤ـ لەو شەوەدا هەرچی جنۆکە خراپەکانی وەکو (مەرەددە و عیفریت)ن کەلەپچە و قۆڵبەست دەکرێن، پێشەوا ضحاك رحمه الله لە ابن عەبباسەوە رضي الله عنهما گێڕاویەتەوە کە فەرموویەتی: (في تِلكَ الليلةِ تُصفَّدُ مَرَدَةَالجِنِّ وتُغَلُّ عِفريتَ الجِنِ) واتا: لەو شەوەدا هەرچی جنۆکە خراپەکانی وەك (مەرەددە و عیفریت)ن کەلەپچە دەکرێن.

٥ـ لەو شەوەدا گەورەی هەموو فریشتەکانی ئاسمان دادەبەزێت کە جوبرائیلە علیه السلام، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿تَنَزَّلُ الْمَلَائِكَةُ وَالرُّوحُ فِيهَا بِإِذْنِ رَبِّهِم مِّن كُلِّ أَمْرٍ﴾[2] واتا: لەو شەوەدا بەفەرمانی خودا فریشتەکانی ئاسمان وە لە ناویاندا جوبرائیل علیه السلام دادەبەزێتە سەر زەوی، ئەو فەرمانانە جێبەجێ دەکەن کە خودای پەروەدگار پێیان دەکات.

وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (إذا كانَ ليلةُ الْقَدرِ نَزَلَ جِبرِيلُ فِي كَبكَبَةٍ مِنَ الْملائِكَةِ، يُصَلُّونَ وَيُسَلِّمُونَ على كُلِّ عَبدٍ قائِمٍ أَو قاعِدٍ يَذكُرُ اللهَ تَعالى)[3] واتا: کاتێك شەوی قەدر دێت جوبرائیل لەناو کۆمەڵێك لە فریشتەکاندا دادەبەزن بۆ سەر زەوی، وە سەلام دەکەن و دووعا دەکەن بۆ هەر کەسێك کە بە پێوە وەستابێت، وەیان دانیشتبێت و یادی خودا بکاتەوە.

٦ـ ئەمشەوە هەتا دەرکەوتنی بەرەبەیان ئارامی و ئاسودەیی و ئاسایش موسڵمانان دەگرێتەوە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿سَلَامٌ هِيَ حَتَّى مَطْلَعِ الْفَجْرِ﴾[4] ئەو شەوە شەوی ئاسودەیی و ئارامی و ئاشتی و ڕەحمەت و میهرەبانیە هەتا بەرەبەیان .

١ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە.

٢ـ القدر: ٤

٣ـ پێشەوا بیهقی لە( الجامع لشعب الإيمان)دا گێڕاویەتەوە.

٤ـ القدر: ٥

٧ـ له‌و شه‌وه‌دا كارو باری دروستكراوه‌كانی خودا ڕێكده‌خرێت، خودا په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموویت: ﴿فِيهَا يُفْرَقُ كُلُّ أَمْرٍ حَكِيمٍ﴾[١] واتا: له‌و شه‌وه‌دا هه‌موو كارو كرده‌وه‌ و به‌رنامه‌یه‌كی پڕ حیكمه‌ت لێك جیاده‌كرێته‌وه‌.

جا زۆرینه‌ی زانایان ده‌فه‌رموون: ئه‌م شه‌وه‌ی كارو كرده‌وه‌كانی تێدا ڕێكده‌خرێت" شه‌وی قه‌دره‌، به‌ڵام له‌به‌رامبه‌ریشدا به‌شێك له‌ زانایان وه‌ك(عیكره‌مه‌) ده‌فه‌رموون: ئه‌م شه‌وه‌ شه‌وی نیوه‌ی مانگی شه‌عبانه‌.[٢]

٨ـ شه‌وی قه‌در جگه‌ له‌وه‌ی شه‌وی ڕێزه‌(قدر)ه‌" شه‌وێكی پیرۆزیشه‌(مبارك). خودای په‌روه‌ردگار ده‌فه‌رموویت: ﴿إِنَّا أَنزَلْنَاهُ فِي لَيْلَةٍ مُّبَارَكَةٍ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ﴾[٣]

٩ـ هه‌ر كه‌سێك به‌ باوه‌ڕه‌وه‌ ئه‌و شه‌وه‌ زیندوو بكاته‌وه‌ به‌ عیباده‌ته‌" خودای گه‌وره‌ له‌ تاوانه‌كانی خۆشده‌بێت و لێی ده‌بورێت، (ومَن قام ليلة القدر إيمانًا واحتسابًا غُفِرَ له ما تقدَّم من ذنبه)[٤] واتا: هه‌ر كه‌سێك به‌ باوه‌ڕه‌وه‌ شه‌وی قه‌در زیندوو بكاته‌وه‌ و چاوه‌ڕێی پاداشت بێت له‌ خودای گه‌وره‌" ئه‌وه‌ خودای گه‌وره‌ له‌ هه‌موو گوناهه‌كانی ڕابردوی خۆشده‌بێت.

## هۆكاری تایبه‌تكردنی (لیله‌ القدر) به‌ ئوممه‌تی محمدﷺ

باوه‌ڕداره‌كانی ئوممه‌تانی پێش ئێمه‌ ته‌مه‌نیان زۆر درێژ بووه‌، له‌به‌ر ئه‌وه‌ خوداپه‌رستیان له‌ ئێمه‌ زیاتر كردووه‌، جا بۆ ئه‌وه‌ی خواپه‌رستی ئێمه‌ش له‌گه‌ڵ هی ئه‌وان یه‌كسان ببێته‌وه‌، وه‌ یاخود له‌ هی ئه‌وان زیاتر بێت" خودای گه‌وره‌ شه‌وی قه‌دری به‌ دیاریدا به‌ ئوممه‌تی پێغه‌مبه‌ری

---

١ـ الدخان: ٤

٢ـ الجامع لأحكام القران: ١١٠/١٦

٣ـ الدخان: ٣

٤ـ پێشه‌وایان بوخاری و مسلم گێڕاویانه‌ته‌وه‌.

كۆتایی زەمان خۆشەویستمان محمدﷺ:

* پێشەوا مالك رحمه الله لە (موطأ)دا دەفەرمووێت: (سَمِعتُ مَنْ أَثِقُ بِهِ يَقُول: إنَّ رَسولَ اللهِ ﷺأَري أعمارَ الْأُمَمِ قَبلَهُ، فَكَأنَّهُ تَقاصَرَ أعمارَ أُمَّتِهِ ألّا يَبْلُغوا مِنَ الْعَمَلِ مِثلَ ما بَلَغَ غَيرُهُم فِي طُولِ الْعُمرِ" فَأعطاهُ اللهُ تَعالى لَيلَةَ الْقَدرِ، وَجَعَلَها خَيراً مِنْ ألفِ شَهرٍ)[1]واتا: گوێم لە كەسانێك بوو كە جێگای متمانەن دەیانگووت: بەڕاستی پێغەمبەری خواﷺ كاتێك سەیری تەمەن ئومەتانی پێش خۆی كرد و بەراوردی كرد لەگەڵ تەمەنی ئومەتەكەیدا بینی كە تەمەنی ئومەتەكەی لەچاو ئوومەتانی پێشوتر زۆر كەمە، بەوەش كارو كردەوە چاكەكانیان بە هی ئومەتانی پێشوتر ناگات، خودای پەروەردگاریش شەوی قەدری بە دیاری بە ئومەتی پێغەمبەر ﷺ بەخشی، كە خێری بە ئەندازەی عیبادەتی هەزار مانگە!!

*عبدالله ی كوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرمووێت:(أنَّ النَبِيَّﷺذَكَرَ رَجُلاً مِنْ بَنِي إسرائِيلَ لَبِسَ السِّلاحَ فِي سَبيلِ اللهِ ألفَ شَهرٍ" فَعَجِبَ الْمُسلِمُونَ مِن ذٰلِكَ)[2]واتا: پێغەمبەری خواﷺ باسی پیاوێكی كرد لە نەوەكانی ئیسرائیل كە هەزار مانگ لە پێناوی خوادا چەكی هەڵگرتووە، موسڵمانەكان سەریان لەوە سوڕما!! خودای پەروەردگاریش ئەو سوڕەتەی ناردە خوارەوە و تێیدا ئاماژەی بەوە كرد هەر كەسێك شەوی قەدر بە عیبادەت زیندوو بكاتەوە خێری لەم پیاوە زیاترە: ﴿لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾

* ابن جرير دەفەرمووێت: (كانَ فِي بَنِي إسرائِيلَ رَجلٌ يَقُومُ الَّليلَ حتَّى يُصبِحَ ثُمَّ يُجاهِدُ الْعَدوَّ بِالنَّهارِ حتَّى يُمسِيَ فَفَعَلَ ذٰلِكَ ألفَ شَهرٍ فَأنْـزَلَ اللهُ هذِهِ الآيَة)[3]واتا: لـــە

---

١ـ پێشەوا مالك لە (موطأ)دا گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا طبری و واحدی گێڕاویانەتەوە، بڕوانە الجامع لأحكام القرآن: ٢٠/ ١٢٢، وە تفسیر ابن كثیر:٨/٢٩٢

٣ـ تفسیر القرآن العظیم لإبن الكثیر: ٨/ ٢

نەوەکانی ئیسرائیل پیاوێك هەبوو شەوانە هەتا بەرەبەیان خواپەرستی دەکرد، کاتێك خۆر دەردەکەوت هەتا ئێوارە دەچو بۆ شەڕی دوژمنانی دین ـ جهادـ، ئەم پیاوە هەزار مانگ لەسەر ئەم کارەی بەردەوام بوو، خودای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی دابەزاند کە دەفەرموێت: ﴿لَيْلَةُ الْقَدْرِ خَيْرٌ مِّنْ أَلْفِ شَهْرٍ﴾

* بەشێکی تر لە زانایان دەفەرموون: لە ئوممەتانی پێش ئێمە هەر کەسێك هەزار مانگ خودا پەرستی نەکردبایە" پێی نەدەگوترا عابد!! جـــا هەر کەسێك شەوی قەدر بەدەستبهێنێت ئەوە پلەی (عابد)ی پێدەدرێت لای خودای پەروەردگار.[1]

* ابوبکری وەڕڕاق رحمه الله دەفەرموێت: (كان مُلكُ سُلَيمانَ خَمسِمائَةِ شَهرٍ، وَمُلكُ ذِي الْقَرنَينِ خَمسِمائَةِ شَهرٍ فَصارَ مُلكُهُما أَلفَ شَهرٍ" فَجَعَلَ اللهُ تَعالى العَمَلَ فِي هذِهِ اللَّيلَةِ لِمَنْ أَدرَكَها خَيراً مِنْ مُلكِهِما)[2]واتا: دەسەڵاتداری سولەیمان علیه السلام پێنج سەد مانگ بوو، وە دەسەڵاتداری و پادشایەتی ژی القرنین)یش پێنج سەد مانگ بوو، بە هەردووکیان دەکاتە هەزار مانگ، جا هەرکەسێك شەوی قەدر بەدەست بهێنێت ئەوە خودای پەروەردگار باشتر لە دەسەڵات و پادشایەتی ئەو دوانەی پێدەدات!!

## شەوی قەدر کام شەوەیە؟

شەوی قەدری پیرۆز دەکەوێتە دە شەوە تاکەکانی کۆتایی مانگی ڕەمەزانەوە، خاتوو عائیشە رضي الله عنها لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (تَحَرَّوا لَيلَةَ الْقَدرِ فِي الْوِترِ مِنَ الْعَشرِ الْأَواخِرِ مِنْ رَمَضانَ)[3]واتا: بە دوای شـەوی قـــەدردا بگەڕێن لە دە شــــەوە

١ـ الجامع لأحكام القرآن: ٢٠/ ١٢٢

٢ـ هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەڕە.

٣ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

تاکەکانی کۆتایی ڕەمەزاندا. وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (وإنِّي أُرِيتُها ليلةَ وِترٍ)[1] واتا: من لە شەوە تاکەکاندا شەوی قەدرم بینی.

ئینجا بزانە: هاوەڵە بەڕێزەکان و زانایان جیاڕان دەربارەی دیاریکردنی ئەو شەوە تاکەی کە شەوی قەدری تێدا دێت، ئەوەی خوارەوەش ڕاو بۆچونەکانیانە:

یەکەم/ شەوی قەدر دەکەوێتە شەوی بیست ویەکی ڕەمەزانەوە، ئەوە ڕای هاوەڵانی بەڕێز علی کوڕی ابی طالب و ابن مسعودە رضي الله عنهما.

دووەم/ شەوی قەدر دەکەوێتە شەوی بیست و سێی مانگی ڕەمەزانەوە، ئەوەش ڕای زۆرینەی هاوەڵە بەڕیزەکانە رضي الله عنهم.

سێهەم/ شەوی قەدر دەکەوێتە شەوی بیست و پێنجی ڕەمەزانەوە. ئەو ڕایەش ابن عربی گێڕاویەتەوە.

چوارەم/ شەوی قەدر دەکەوێتە شەوی بیست و حەوتی ڕەمەزانەوە، ئەوەش ڕای کۆمەڵێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانە رضي الله عنهم.

پێنجەم/ شەوی قەدر دەکەوێتە شەوی بیست و نۆی ڕەمەزانەوە. ئەو ڕایەش ابن عربی گێڕاویەتەوە.[2]

جا ئەوانەی ڕابران ڕاو بۆچونی هاوەڵان و زانایان بوو دەربارەی شەوی قەدر، ئینجا ئەوانەش تەنها ئەو ڕاو بۆچونانە بوون کە باسی شەوە تاککەکانی کۆتایی ڕەمەزانیان دەکرد، ئەگەرنا" ابن حجری عەسقەلانی رحمه الله لە(فتح الباری)دا چل و شەش ڕاو بۆچونی زانایانی هێناوە لەسەر دیاریکردنی ئەم شەوە پیرۆزە.[3]

---

١- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢- المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج: ٧-٨/ ٢٩٨، وە فتح الباری: ٤/ ٣٣٦

٣- فتح الباری: ٤/ ٣٣٣-٣٣٨

ئینجا بزانە: هەر یەکێك لە خاوەنی ئەم ڕایانە بەڵگەی هەیە لەسەر ڕاو بۆچونەکەی، کە دەتوانین بەڵگەی هەمویان لە چوار فەرموودەدا کۆبکەینەوە:

١ـ ابو سعیدی خودری رَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە پێغەمبەر خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (فالتَمِسُوها في الْعَشرِ الأواخِرِ، فِي كُلِّ وِترٍ)[1] واتا: شەوی قەدر بەدەست بهێنن لە شەوە تاکەکانی دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا.

٢ـ ابن عەبباس رَضِيَ اللهُ عَنْهُمَا لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمـــان دەگێڕێتەوە کـــە فەرموویەتی: (الْتَمِسُوهَا فِي الْعَشْرِ الْأَوَاخِرِ مِنْ رَمَضَانَ لَيْلَةَ الْقَدْرِ فِي تَاسِعَةٍ تَبْقَى فِي سَابِعَةٍ تَبْقَى فِي خَامِسَةٍ تَبْقَى)[2] واتا: شەوی قەدر بەدەست بهێنن لە دە شەوی کۆتایی ڕەمەزان، کە ڕەمەزان نۆ شەوی مابوو، یان حەوت شەوی مابوو، وە یان پێنج شەوی مابوو، بەواتای: لە شەوەکانی بیست و یەك و بیست و سێ و بیست وپێنج.

٣ـ هەردووك هاوەڵی بەڕێز ابن عمر و معاویە رضي الله عنهما لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕنەوە کە فەرموویەتی: (ليلةُ الْقَدرِ لَيلَةُ سَبعٍ وَعِشرِينَ)[3] واتا: شەوی قەدری پیرۆز شەوی بیست و حەوتی ڕەمەزانە.

٤ـ ابوسعیدی خودری رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (وإنِّي أُرِيتُها لَيلَةَ وترٍ، وأنِّي أسجُدُ صبيحَتَها في طينٍ وماءٍ، فأصبحَ مِن لَيلةِ إحدى وعشرِينَ لصلاةِ الصُبحِ فمَطَرَتِ السماءُ، فوكَفَ المَسجِدُ، فأَبصَرتُ الطِّينَ والماءَ)[4] لە گێڕانەوەیەکی تـــردا: (فَمُطِرنا

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوایان احمد و ابوداود گێڕاویانەتەوە.

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

لیلةَ ثلاثٍ وعِشرينَ، فصَلّى بنا رَسولُ اللهِ وأثرُ الماءِ والطينِ على جَبهَتِهِ و أنفهِ)[1]واتا: من لەشەوێکی تاکدا شەوی قەدرم نیشاندرا، هەم لە بەیانیەکەیدا لە ناو قوڕو ئاودا سوجدە دەبەم، ئینجا بۆ نوێژی بەیانی باران باری و مزگەوت دڵۆپەی کرد و پێغەمبەری خودا پێشنوێژی کرد و ئاسەواری قوڕ و ئاو بە ناوچاوان و لوتیەوە دیاربوو، ئەو شەوەش شەوی بیست و یەك بوو، لە گێڕانەوەیەکی تردا: شەوی بیست و سێ بوو.

جا ئەو چوار فەرموودە هەموو شەوە تاکەکانی دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزان لە خۆیان دەگرن.

پاشان بزانە: ڕەنگە کەسێك بپرسێت و بڵێت: ئایا ئەو فەرموودانە تێك ناگیرێن و بەرامبەر ناوەستن؟ وە یاخود پێغەمبەری خوداﷺ چۆن نەیزانیوە کەی شەوی قەدرە لە کاتێکدا لەلایـــەن خوداوە سروشی بۆ هاتووە، وە کە زانیویەتی بۆ ئوممەتەکەی لێئاگادار نەکردوتەوە؟!

لەوەڵامدا دەڵێین: قاضی عیاض فەرموویەتی: کۆمەڵێك لە زانایان فەرموویانە: شەوی قەدر لە ساڵێکەوە بۆ ساڵێکی تر کاتەکەی جیاوازە، بەواتای: هەر ساڵەو لە شەوێکدا دێت، ڕەنگە ساڵێکیان لە بیست و سێی ڕەمەزاندا بێت، ساڵی دواتر لە بیست و حەوتی....، بەوەش واتای هەموو فەرموودەکان کۆدەکرێتەوە و هیچ تێکگیرانێك ڕونادات، چونکەپێغەمبەری خوداﷺ بەپێی گۆڕانکاری لە شەوی قەدردا ئەو فەرمودانەی فەرموون، وە ئەمە ڕای چەند زانایەکی تریشە وەك: پێشەوایان: مالك و احمد و ثـــوری و إسحاق و ابی ثور رحمهم الله.[1] وە دەربارەی ئەوەی ئایا پێغەمبەری خوداﷺ بەم شەوەی زانیوە یان نا؟ وە بۆ ئوممەتەکەی لێئاگادار نەکردوتەوە؟ ابو سعیدی خودریرضي الله عنهلە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە

١- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢- المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج: ٧-٨/ ٢٩٨

فەرموویەتی: (وقد رأيتُ هذهِ الليلةَ فأُنسيتُها)[1] واتا: بەڕاستی من ئەم شەوەم بینی و دەمزانی بەڵام لەبیرم چۆوە. جا ابن حجری عەسقەلانی رحمه الله دەفەرمووێت: حیكمەت لەوەی كە پێغەمبەر لەبیری چوتەوە كە شەوی قەدر كام شەوەیە و شەوەكە بەشاراوەی ماوەتەوە ئەوەیە: موسڵمانان زۆر عیبادەت بكەن و هەوڵ بدەن بۆ بەدەستهێنانی، ئەگەر هاتباو تەنها لە یەك شەوی دیاریكراودا بوایە" ئەوە موسڵمانان تەنها ئەو شەوەیان زیندوو دەكردەوە بۆ عیبادەت، بەوەش عیبادەتێكی زۆریان لەدەست دەچوو.[2] جا هەر لەبەر ئەوەی كە شەوی قەدر لە ساڵێكەوە بۆ ساڵێكی تر جیاوازە" وە شەوی قەدر نادیارە" پێویستە لەسەر موسڵمانان كە هەموو شەوە تاكەكانی كۆتایی مانگی ڕەمەزان بە خودا پەرستی زیندو بكەنەوە بۆ ئەوەی ئەم خێر و پاداشتە گەورەیان لەدەست نەچێت.

## زیندووكردنەوەی شەوی قەدر بەچی دێتەجێ؟

زیندو كردنەوەی شەوی قەدر بە تەواوی بەوە دێتەجێ كە موسڵمان تەواوی شەوەكە یان زۆرینەی دانیشێت و خەریكی جۆرەكانی خوداپەرستی بێت،مباركفوری رحمه الله(مرعاه المفاتح)دا دەفەرمووێت: كرمانی رحمه الله فەرموویەتی: (أنه لا يقال قام الليلة إلا إذا قام جميعها أو أكثرها) واتا: ناگوترێت فلان كەس شەوی قەدری زیندووكردوتەوە" تەنها مەگەر هەموو شەوەكە یان زۆرینەی زیندوو كردبێتەوە و خواپەرست تێداكردبێت. بەڵام ڕەمەلی رحمه الله لە (نهاية المحتاج)دا دەفەرمووێت: پێشەوا شافعی رحمه الله فەرموویەتی: هەركەسێك نوێژی عیشا و بەیانی بە جەماعەت بكات ئەوە بەشێكی لە شەوی قەدر بەركەوتـــووە، چونكە پێغەمبەری خــــودا ﷺ

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

٢ـ فتح الباري: ٤/ ٣٢٨

فەرموویەتی: (مَنْ صَلّٰى الْعِشاءَ الآخِرةِ فِي جَماعَةٍ مِنْ رَمَضانَ فَقَد أَدرَكَ لَيلَةَ الْقَدرِ)[1]واتا: هەر کەسێك نوێژی عیشا بە جەماعەت بکات لە ڕەمەزاندا" ئەوە شەوی قەدری بەدەستهێناوە. وە پێشەوا مالك رحمه الله لە سعیدی کوڕی موسەییەبی رحمه الله گێڕاوەتەوە کە فەرموویەتی: (مَنْ شَهِدَ العِشاءَ لیلةَ القَدرِ فَقَد أخذَ بحظِهِ مِنها)[2]واتا: هەرکەسێك نوێژی عیشا بە جەماعەت لە مزگەوتدا بکات لە شەوی قەدردا" ئەوە بەشی خۆی لە شەوی قەدر بەدەستهێناوە.

ئاگاداری: لەگەڵ ئەوەی کە بەشێك لە زانایان دەفەرموون تەنها بە ئەنجامدانی نوێژی عیشا و بەیانی بە جەماعەت بەشێك لە شەوی قەدر بەدەستدەهێنێت" بەڵام پێویستە کە موسڵمانان هەموو شەوەکە زیندوو بکەنەوە، بۆ ئەوەی هەموو خێر و پاداشتەکەیان بەربکەوێت، چونکە بێگومان ئەگەر شەوی قەدر تەنها بە جەماعەتی عیشا و بەیانیش یان شێوان و عیشـاش بێتەجێ" ئەوە خێر و پاداشتی کەسێك کە هەموو شەوەکەی بە خواپەرستی زیندوو کردوتـەوە یەکسان نیە لەگـەڵ ئەو کەسەی کە تەنها نوێژی عیشا و بەیانی بە جەماعەت کردووە، ئینجا ابو زەڕی غەففاری رضي الله عنه دەفەرموێت: (...صلّى بِنا حتَّى كادَ أن يَذهَبَ شطرُ اللَّيلِ، فقُلتُ: يارَسولَ اللهِ لَو نَفَلتَنا بَقِيَّةَ لَيلَتِنا! فقالَ: ( لا، إنَّ الرَّجُلَ إذا صلَّى معَ الإمامِ حتَّى يَنصَرِفَ كُتِبَ لَهُ قِيامُ ليلَةٍ)[1]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ نوێژی پێکردین هەتا نزیکبوو نیوەی شەو بڕوات، منیش گووتم: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ بۆ ئەو بەشەی شەو کەماوە لەویشدا نوێژی سوننەتمان پێناکەیت؟ ئەویشﷺ فەرمووی: نەخێر، بەڕاستی هەرکەسێك لەگـەڵ پێشنوێژخوێندا

---

١ـ پێشەوا ابن خزیمە لە صەحیحەکەیدا گێڕاویەتەوە و بەیهەقیش لە (الجامع لشعب الإيمان)دا باسی کردووە.

٢ـ پێشەوا مالك لە (موطأ) دا گێڕاویەتەوە، وە پێشەوا بەیهەقی لە (الجامع لشعب الإيمان: ٢٨٢/٥)دا باسی کردووە.

١ـ پێشەوایان ابوداود و ترمذی و نسائی و ابن ابی شیبە و ابن خزیمە گێڕاویانەتەوە، پیاوەکانی جێگای متمانەن، بڕوانە: جامع لشعب الإيمان: ٥/ ٢٦٨

ـ إمام ـ دا نوێژ بکات هەتا تەواو دەبێت ئەوە خێری زیندووکردنەوەی شەوەکەی بۆ دەنوسرێت.

جا ئەو فەرموودە بەڵگەیە کە هاوەڵان تەنها نوێژی عیشایان بە جەماعەت نەکردووە بەڵکو لە خزمەت پێغەمبەردا ﷺ ماوەیەکی زۆر لە شەوەکە ماونەتەوە، ئەوەش ئەصلی سوننەتەکەیە، جا بۆ ئەوەی موسڵمان تەواترین خێری شەوی قەدری بەدەستبکەوێت" پێویستە لەگەڵ پێشنوێژخوێندا لەمزگەوت نوێژی عیشا و تەراویحەکان بە کۆمەڵ بکات و پاشانیش چەند توانی شەوەکە بە خواپەرستی زیندوو بکاتەوە.والله أعلم.

# سوننەتەکانی شەوی قەدر

١ـ زیندوکردنەوەی شەوەکە بە جۆرەکانی خواپەرستی: چونکە لە فەرموودەی پێغەمبەردا ﷺ هاتووە کە فریشتەکان تەنها سڵاو لەو کەسانە دەکەن کە سەرقاڵی خواپەرستین: (إذا كانَ ليلةُ الْقَدرِ نَزَلَ جِبرِيلُ فِي كَبكَبَةٍ مِنَ الْملائِكَةِ، يُصَلُّونَ وَيُسَلِّمُونَ على كُلِّ عَبدٍ قائِمٍ أَو قاعِدٍ يَذكُرُ اللهَ تَعالى)[1] واتا: کاتێك شەوی قەدر دێت جوبرائیل لەناو کۆمەڵێك لە فریشتەکاندا دادەبەزێت بۆ سەر زەوی،وە سەلام دەکەن و دووعا دەکەن بۆ هەر کەسێك کە بە پێوە وەستابێت، وەیان دانیشتبێت و یادی خودا بکاتەوە.

٢ـ دوعا کردن و داواکردنی لێخۆشبوون لە خودای پەروەردگار. خاتوو عائیشە رضي الله عنها لە پێغەمبەری خودای ﷺ پرسی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەگەر زانیم کام شەوە شەوی قەدرە چی بڵێم؟ فەرمووی: (قُولي: اللهُمَّ إِنَّكَ عفوٌ كريمٌ تُحِبُّ العَفوَ فاعفُ عَنِّي)[2] واتا: بڵێ خودایە تۆ لێبوردە و بەخشندەی، وە ئەو کەسانەت خۆشدەوێت کە لێبوردەن، دەتۆش خودایە لێم ببورە.

٣ـ لەم شەوەدا زۆر قورئان بخوێنە،چونکە لەم شەوەدا قورئان دابەزیوە بۆ سەر پێغەمبەر ﷺ.

---

١ـ پێشەوا بیهقی لە( الجامع لشعب الإيمان)دا گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوەو دەفەرموێت: (حسن صحيح)

٤ـ ئاگادار کردنەوەی ماڵ و خێزان لەوشەوە پیرۆزە و فەرمان پێکردنیان بە زیندووکردنەوەی، خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: (كانَ إذا دخلَ الْعَشرُ أَحيا اللَّيلَ وَأَيقَظَ أَهلَهُ وَشَدَّ مِئزَرَهُ)[1]واتا: کاتێك دەشەوی کۆتایی ڕەمەزان دەهاتن، پێغەمبەری خوداﷺ شەوەکانی زیندوو دەکردنەوە، وە منداڵ و خێزانەکانی ئاگادار دەکردنەوە، وە پۆشاکەکەی لە خۆی توند دەکرد.

٥ـ لەبەر کردنی پۆشاکی جوان و چاك خۆ توندتوڵ کردن. لە فەرموودەکەی ڕابردودا خاتو عائیشە رضي الله عنها فەرمووی: (وَشَدَّ مِئزَرَهُ)واتا: پێغەمبەری خوداﷺ خۆی توندوتوڵ دەکرد.

٦ـ پارێزگاری کردن لە ئەنجامدانی نوێژە فەرزەکان بە کۆمەڵ، بە تایبەت نوێژەکانی شێوان و عیشاو بەیانی. ابن عەبباسﷺلە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مَن صلَّى الْمغرِبَ وَالعِشاءَ فِي جَماعَةٍ حَتَّى يَنقَضِيَ شَهرُ رَمَضانَ فَقَدْ أَصابَ مِنْ لَيلَةِ الْقَدرِ بِحَظٍ وافِرٍ)[2]واتا: هەر کەسێك نوێژەکانی شێوان و عیشا بە کۆمەڵ بکات هەتا مانگی ڕەمەزان تێدەپەڕێت" ئەوە بەشێکی زۆری لە شەوی قەدر بەدەستهێناوە.

جا ئەوەی ڕابرا بەشێك بوون لە سوننەتەکانی شەوی قەدر، پێویستە ئەو کەسەی کە شەوی قەدر زیندوو دەکاتەوە ئەم سوننەتانە بە باشی جێبەجێ بکات، بۆ ئەوەی تەواوترینی خێر و پاداشت بەدەست بهێنێت.

## نیشانەکانی شەوی قـەدر

پێغەمبەری خوداﷺ چەند نیشانەیەکی باس کردووە بۆ ئەوەی بەهۆیانەوە شەوی قەدر لە شەوەکانی تری ساڵ جیا بکەینەوە، ئەوانەی خوارەوەش ئەو نیشانانەن:

١ـ ئەم شەوە شەوێکی ئارامەو نە ساردەو نە گــەرمە. پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی:

١ـ پێشەوایان بوخاری ومسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە.

(لَيلَةُ الْقَدرِ لَيلَةٌ سَمحَةٌ طَلِقَةٌ لا حارَّةٌ وَلا بارِدةٌ)[1]واتا: شەوی قەدر شەوێکی نارام ڕوٚشنە، نە ساردەو نە گەرمە.

٢ـ بەرەبەیانی شەوی قەدر خوٚر سورە و پڕشنگ و تیشکی نیەو بەری خوٚر سپیە وەك ئەوەی پەردەی بەسەردا بێت، وە شێوەی خوٚر لە تەشتێك دەچێت. ئوبەی کوڕی کەعبﷺ دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵی پێداین دەربارەی شەوی قەدر و فەرمووی: (أنَّها تَطْلُعُ يومَئِذٍ لا شُعاعَ لها)[2]واتا: لە بەرەبەیانی ئەو شەوەدا خوٚر هەڵدێت و هیچ پڕشنگێکی نیە. وە لە گێڕانەوەیەکی تردا ئوبەی کوڕی کەعبﷺ: (أَخْبَرَنَا أَنَّ الشَّمْسَ تَطْلُعُ صُبْحَةَ صَبِيحَتِهَا كَالطَّسْتِ لا شُعَاعَ لَهَا)[3]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ هەواڵێ پێداوین کە لە بەرەبەیانی شەوی قەدردا خوٚر هەڵدێت شێوەی وەکو تەشت وەهایەو هیچ پڕشنگێکی نیە. لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەرﷺفەرموویەتی: (تُصبِحُ الشَّمسُ صَبيحَتَها ضَعِيفَةً حَمراءَ)[4] واتا: بەرەبەیانی شەوی قەدر خوٚر هەڵدێت بەڵام لاوازەو سورە. وە ابی عقرب دەفەرمووێت: بەیانیەکی ڕەمەزان چووم بوٚ لای عبداللە ی کوڕی مەسعود ﷺلەسەربان دانیشتبو گوێم لێبوو دەیگووت: (صَدَقَ اللَّهُ وَبَلَّغَ رَسُولُهُ)واتا: خودا ڕاستی فەرموو و پێغەمبەرەکەشیﷺڕایگەیاند، گووتمان: گوێمان لێبوو دەتگووت خودا ڕاستی فەرموو و پێغەمبەرەکەشی ڕایگەیان!! ئەویش فەرمووی: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (تَطْلُعُ الشَّمْسُ غَدَاتَئِذٍ صَافِيَةً لَيسَ لَهَا شُعَاعٌ ، فَنَظَرْتُ إِلَيْهَا فَوَجَدْتُهَا كَمَا قَالَ رَسُولُ اللَّهِ)[5]واتا: بەرەبەیانی شەوی قــەدر خوٚر هــەڵدێت و

١ـ پێشەوا طیالیسی گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا ابو داود گێڕاویەتەوە.

٤ـ پێشەوا طیالیسی گێڕاویەتەوە.

٥ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە.

پڕشنگی نابێت لەکاتێکدا ئاسمان سامالە،منیش سەیرم کرد بینیم بەم شێوە بوو کە پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی.

٣- لەم شەوەدا ئەستێرەکانی ئاسمان لەجێگای خۆیان ناخزن. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (ولا يُرمى فِيها بِنَجمٍ)[1]واتا: لەو شەوەدا هیچ ئەستێرەیەك ناهاوێژرێت و لەجێگای خۆی ناخزێت.

٤- لە شەوە تاکەکاندایە. نیشانەی چوارەمی شەوی قەدر ئەوەیە کە دەکەوێتە شەوە تاکەکانی کۆتا دەشەوی مانگی ڕەمەزان، هەروەك باسمان کرد پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (فالتَمِسُوها فِي الْعَشرِ الأواخِرِ، فِي كُلِّ وِترٍ)[2]واتا: شەوی قەدر بەدەست بهێنن لە شەوە تاکەکانی دەشەوی کۆتایی مانگی ڕەمەزاندا.

خوێنەری بەڕێز: ئەوەی ڕابرا گەورەیی و سوننەت و ئاداب و نیشانەکانی شەوی قەدر بوو، تۆی بەڕێز هەوڵبدە هەرگیزاو هەرگیز ئەم شەوە گەورەیە لەدەست خۆت نەدەیت، چونکە پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (إنَّ هذَا الشَّهرَ قَدْ حَضَرَكُمْ، وَفِيهِ لَيلَةٌ خَيرٌ مِنْ أَلفِ شَهرٍ، مَن حُرِمَها فقد حُرِمَ الخَير كله، ولا يُحْرَم خَيرها إلا مَحرومٌ)[3]واتا: بەڕاستی ئەوە مانگی ڕەمەزان هات بۆ لاتان، وە لەو مانگەدا شەوێك هەیە چاکترە لە هەزار مانگ، هەر کەسێك لەدەستی بدات" ئەوە هەموو چاکەیەکی لەدەستداوە، وە هیچ کەسێك لەدەستی نادات تەنها کەسێك نەبێت کە لە چاکە بێبەش بووە.

١- پێشەوا طبرانی گێڕاویەتەوە.

٢- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣- پێشەوا ابن ماجه گێڕاویەتەوە.

# جەژنی ڕەمەزانی پیرۆز

# عيد الفطر المبارك

فَقال رَسول اللهﷺ: (إِنَّ الله قَد أَبدلكم بِهما خيراً مِنهما يوم الأضحى و يومَ الفطر)

# جەژنی ڕەمەزان (عیدالفطر)

ڕۆژوی مانگی ڕەمەزان لە ساڵی دووەمی کۆچی یەوە لەسەر موسڵمانان واجب کرا هەر لەم ساڵەشەوە هەموو ساڵێك موسڵمانان دوای تەواوبونی مانگی ڕمەزان جەژن دەگێڕن، ئەوەش وەك خۆشحاڵی دەربڕین بە جێ بەجێ کردنی فەرمانی خودا و ئەنجامدانی خواپەرستی و ڕۆژو گرتن لەو مانگەدا، بەو جەژنەش دەگوترێت جەژنی ڕمەزان ـ عید الفطر ـ وە لەم ڕۆژەدا خودای بەرزو باڵادەست پاداشتی ئەو موسڵمانانە ڕادەگەیەنێت کە مافی مانگی ڕەمەزانی پیرۆزیان داوە، ئەوەش لە ڕێگای فریشتەکانیەوە . دواتر إنشاءالله باسی دەکەین .

وە ئەم جەژنانە بۆئەمە دانراون کە موسڵمانان تێبگەن و بێباوەڕانیش بزانن کە ئیسلام دینێکی داخراو نیەو لەگەڵ سروشتی هەمو جۆرە مرۆڤیکدا یەکانگیرە و دەگونجێت، خاتو عائیشەرضی الله عنها دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ لە ڕۆژی جەژندا فەرمووی: (لِیتعلمَ یهود أنَّ فِي دیننا فسحةً)[1] وە لە گێڕانەوەی پێشەوا حمیدی فەرمووی: (لیعلم الیهودُ والنصاری أنَّ في دیننا فُسحةً)[2]واتا: با جولەکەو گاورەکان بزانن کە ئاینی ئێمە ئاینی کرانەوەو فراوانیە.

# جەژنی ڕەمەزان و قوربان تەنها جەژنی موسڵمانن

گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرموێت: ( قَدِمَ رَسول الله ﷺ المدینة ولهم یومانِ یلعبونَ فِیهما فقال: (ما هذان الیومان ؟) قالوا: کنّا نلعبُ فِیهما في الجاهلیة، فَقال رَسول اللهﷺ: (إنَّ الله قَد أَبدلکم بِهما خیراً مِنهما یوم الأضحی و یومَ الفطر)[3]واتا: کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ هاتە مەدینە بینی خەڵکی مەدینــە دوو ڕۆژیـــان هەن تێیانـدا دڵخۆشی

١ـ پێشەوا أحمد گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوا حمیدی لە موسنەدەکەیدا گێڕاویەتەوە .

٣ـ پێشەوایان أبوداود و النسـائی و احمد و بیهقی گێڕاویانەتەوە .

دەردەبڕن و گاڵتەو گەپ و یاری دەکەن، ئەویش ﷺ پرسی ئەم دوو ڕۆژانە چین ؟ گوتیان ئەم دوو ڕۆژانە ئێمە لە نەفامیدا دیاریمان کردبون بۆ خۆشی و یاری تێدا کردن ئەویش ﷺ فەرموی : بێگومان خودای گەورە جل جلالە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بە دوو ڕۆژی باشتر و چاکتر ئەوانیش ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و جەژنی قوربانن .

پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بە ئەبوبکری ڕاستگۆی فەرموو: (**يا أبابكر إنَّ لكل قومٍ عيدًا، وَهذا عيدُنا**)[1] واتا : هەموو گەل و هۆزێك جەژنی تایبەتی خۆیان هەیە ئەوەش جەژنی ئێمەیە.

وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ڕوودەکاتە موسڵمانان و دەفەرموێت: ( **هذا عيدُنا أهلَ الإسلامِ** )[2] واتا: ئانەوە جەژنی ئێمەیە ئەی موسڵمانان .

کەواتا:ئەم دوو جەژنە هەواڵی پێغەمبەری خودایانﷺلەسەرە کە جەژنی ئێمەی موسڵمانن، ئێمەی موسڵمانیش دەبێت بەو پەڕی سینە فراوانیەوە ڕەزامەندی و خۆشحاڵیەوە تەنها ئەم جەژنانە بە هی خۆمان بزانین و ئەم جەژنانەو جەژنەکانی تری ئیسلام تینوایەتی جەژنمان بشکێنن و بێ پێویستمان بکەن لە هەمو ئەو جەژنانەی کە لە وولاتانی کوفرەوە لە ژێر جۆرەها ناوی ترسوکەدارەوە بۆ ئێمەیان ئەڕازیننەوەوگەنجەکانمانی پێ لە خشتە دەبەن، بۆیە دەبێت گەنجــی موسڵمان و هەمو توێژەکانی تری ئیسلام پشت بکەنە ئەم جۆرە جەژنانە و پڕ بەدەمیان بڵێن: ( **هذا عيدنا**).

## جەژنی ڕەمەزان ڕۆژی سەرفرازی و وەرگرتنی پاداشتە

گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالكرَضِيَ اللهُ عَنْهُ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کــــە

1ـ پێشەوایان بوخاری ومسلم گێراویانەتەوە .

2ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە .

فەرمویەتی: ( إِذَا كَانَ لَيْلَةُ الْقَدْرِ نزل جِبْرِيلُ عَلَيْهِ السَّلامُ، فِي كَبْكَبَةٍ مِنَ الْمَلائِكَةِ يُصَلُّونَ عَلَى كُلِّ عَبْدٍ قَائِمٍ أَوْ قَاعِدٍ يَذْكُرُ اللَّهَ، فَإِذَا كَانَ يَوْمُ عِيدِهِمْ يَعْنِي يَوْمَ فِطْرِهِمْ، بَاهَى بِهِمْ مَلائِكَتَهُ، قَالَ: يَا مَلائِكَتِي مَا جَزَاءُ أَجِيرٍ وَفَّى عَمَلَهُ ؟ قَالُوا: رَبَّنَا جَزَاؤُهُ أَنْ يُوَفَّى أَجْرَهُ ، قَالَ: مَلائِكَتِي عَبِيدِي وَإِمَائِي قَضَوْا فَرِيضَتِي عَلَيْهِمْ، ثُمَّ خَرَجُوا يَعِجُّونَ إِلَيَّ بِالدُّعَاءِ، وَعِزَّتِي وَجَلالِي وَكَرَمِي وَعُلُوِّي وَارْتِفَاعِ مَكَانِي لأُجِيبَنَّهُمْ، فَيَقُولُ: ارْجِعُوا فَقَدْ غَفَرْتُ لَكُمْ، وَبَدَّلْتُ سَيِّئَاتِكُمْ حَسَنَاتٍ، قَالَ: فَيَرْجِعُونَ مَغْفُورًا لَهُم)[1] واتا کاتێك شەوی قەدر دێت جبرائیل علیه السلام لەگەڵ تاقمێك لە فریشتەکانی خودا دادەبەزنە سەرزەوی، نزا دەکەن بۆ هەر بەندەیەك کە لە خزمەت خودادا وەستابێت یان دانیشتبێت و یادی خودا بکاتەوە، وە کاتێك ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دێت خودای باڵادەست شانازی بە بەندە چاکەکانیەوە دەکات بەسەر فریشتەکانیدا و دەفەرموێت: ئەی فریشتەکانم ئایە پاداشتی کرێکارێك چیە ئەگەر بەباشی کارەکەی ئەنجامدابێت؟ ئەوانیش دەڵێن: پەروەردگاری ئێمە پاداشتەکەی ئەوەیە کرێیەکەی بدرێتێ،ئەویش دەفەرموێت: ئەی فریشتەکانم بەندەکان و کەنیزەکانی من ئەوەی لەسەرم واجب کردبوون ئەنجامیاندا، پاشان لە ماڵەکانیان هاتونە دەرو هاواریان بۆلای من بەرز کردۆتەوەو نزا دەکەن، دەسا منیش سوێند بەهێز و شکۆو میهرەبانی و تواناو بەرزی خۆم وەڵامی نزاکانیان دەدەمەوە، ئینجا دەفەرموێت: بگەڕێنەوە، بەڕاستی من لێتان خۆشبوم، وە هەموو خراپەکانتانم گۆڕی بە چاکە، فەرمووی: ئەوانیش دەگەڕێنەوە بە لێخۆشبووی .

*گەورەمان ابن عەبباس رضي الله عنهما دەفەرموێت: گوێم لە پێغەمبەری خودا ﷺ بوو دەیفەرموو: (...وَإِذَا كَانَتْ غَدَاةُ الْفِطْرِ بَعَثَ اللَّهُ الْمَلائِكَةَ فِي كُلِّ بِلادٍ ، فَيَهْبِطُونَ إِلى الأَرْضِ، فَيَقُومُونَ عَلَى أَفْوَاهِ السِّكَكِ فَيُنَادُونَ بِصَوْتٍ يَسْمَعُهُ جَمِيع ما خَلَقَ اللَّهُ تعالى إِلا الْجِنَّ وَالإِنْسَ،

---

١ـ پێشەوا البیهقی لە شعب الإیماندا و پێشەوا سیوطی لە الدر المنثوردا گێڕاویانەتەوە .

فَيَقُولُونَ: يَا أُمَّةَ مُحَمَّدٍ، اخْرُجُوا إِلَى رَبٍّ كَرِيمٍ يُعْطِي الْجَزِيلَ، وَيَغْفِرُ الذَّنْبَ الْعَظِيمَ، فَإِذَا بَرَزُوا إِلَى مُصَلاهُمْ يَقُولُ اللَّهُ جَلَّ جلاله لِلْمَلائِكَةِ: يَا مَلائِكَتِي، مَا جَزَاءُ الأَجِيرِ إِذَا عَمِلَ عَمَلَهُ؟ فَتَقُولُ الْمَلائِكَةُ: إِلَهَنَا وَسَيِّدَنَا جَزَاؤُهُ أَنْ تُوَفِّيَهُ أَجْرَهُ فَيَقُولُ اللَّهُ تعالى: فَإِنِّي أُشْهِدُكُمْ يَا مَلائِكَتِي أَنِّي قَدْ جَعَلْتُ ثَوَابَهُمْ مِنْ صِيَامِهِمْ شهر رَمَضَان وقيامه رِضَائِي وَمَغْفِرَتِي فَيَقُولُ اللَّهُ تعالى: يَا عِبَادِي، سَلُونِي فَوَعِزَّتِي وجلالي لا تَسْأَلُونِي الْيَوْمَ شَيْئًا لِدِينِكُم ودنياكم إلا أَعْطَيْتُكُمْ إياه)[1] واتا: کاتێك بەرەبەیانی ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان دێت، خودای بەرزو بالاّ بۆ هەموو شارو وولاّتێك فریشتەکانی دەنێرێتە سەرزەوی،ئەوانیش لەسەر دەرگای ماڵەکان دەوەستن و بەدەنگێك بانگەواز دەکەن کە هەموو بونەوەر گوێی لێیەتی تەنها جنۆکەو مرۆڤ نەبێت، دەڵێن: ئەی ئوممەتی محمد ﷺ وەرنە دەرەوە بۆلای پەروەردگارێکی میهرەبان، ئەو پەروەردگارەی کە زۆر دەبەخشێت، وە لەتاوانەکان خۆش دەبێت، کاتێك هاتنە دەرەوە بۆلای جێگای نوێژ کردنیان خودای بەرزو شکۆدار بە فریشتەکانی دەفەرموێت: ئەی فریشتەکانم ئایا پاداشتی کرێکارێك چی یە ئەگەر کارەکەی تەواوکرد؟فریشتەکان دەفەرمون:خوداو گەورەمان پاداشتەکەی ئەوەیە کرێ یەکەی وەربگرێت، ئینجا خودای بەرزو بالاّدەست دەفەرموێت: ئەی فریشتەکانم من ئێوە دەکەم بە شاهید کەوا من بێگومان پاداشتی ئەوانە دەدەمەوە کە ڕۆژوی مانگی ڕەمەزانیان گرت و شەونوێژو تەراویحیان تیدا کرد بەوەی کە: لێیان ڕازی بوم و لە تاوانەکانیان خۆشبوم پاشان خودای گەورە جل جلاله دەفەرموێت: ئەی بەندەکانم داوام لێبکەن، سوێند بە هێزو شکۆمەندی خۆم لەمڕۆدا هەر شتێکم داوا لێبکەن دەربارەی دینەکەتان یان دونیاتان پێتان دەدەم.

* وە لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: (وَيُغْفَرُ لهم في آخرِ

---

١ـ پێشەوا البيهقي لە (شعب الإيمان ) دا گێڕاویەتەوە .

لیلةٍ، قِیل: یا رَسول الله أهي لَیلة القدر؟ قَال: لا، وَلکن العامِلَ إنَّما یوفی أجرهُ إذا قضی عَملهُ)[1] واتا: خودای گەورەجل جلاله لە کۆتا شەوی مانگی ڕەمەزاندا لە بەندەکانی خۆشدەبێت، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئایا ئەم شەوە شەوی قەدرە؟ فەرمووی نەخێر، بەڵام کرێکار کاتێك کرێیەکەی وەردەگرێت ئەگەر کارەکەی تەواو کرد. وە لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرموێت: (شهرٌ أوَّلهُ رحمةٌ، وأوسطهُ مَغفرَةٌ، وآخرهُ عتقٌ مِن النّارِ)[2] واتا: مانگی ڕەمەزان سەرەتاکەی سۆزی خودایەو ناوەندەکەی لێخۆشبونی خودایە لە بەندەکانی و کۆتاییەکەشی ڕزگاربونە لە ئاگری دۆزەخ .

(دەك پیرۆز بێت جەژنی لێبوردەی خوداو ڕزگاربون لە ئاگری دۆزەخ)

## ئاداب و سوننەتەکانی جەژن

پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بە کــــرداروو گوفتارەکانی خۆی، ئاداب و سوننەت و شێوازی هەڵسوکەوتەکانی ڕۆژانی جەژنی بۆ موسڵمانان شیکردوەتەوە، ئێمەش لێرەدا دەیانخەینە ڕوو بە شێوەی ڕیز بەندی.

یەکەم / خۆشۆردن و خۆ ڕازاندنەوەو خۆبۆن خۆش کردن و لەبەرکردنی پۆشاکی جــــــــوان: پێشەوا نافع رحمه الله دەفەرموێت: (أنَّ ابن عمر رضي الله عنهما كانَ یَغتسلُ یومَ الفطرِ قبلَ أن یغدو)[3]

واتا ابن عمر لە جەژنی ڕەمەزاندا خۆی دەشۆرد بەر لەوەی بێتە نوێژی جەژن .

وە گەورەمان حەسەنی کوڕی علی رضي الله عنهما دەفەرموێت: ( أمَـرَنا رَسول الله ﷺ أن نَلبسَ

---

١ـ پێشەوا أحمد گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوا ابن الخزیمە بە سەنەدێکی (صحیح) گێڕاویەتەوە .

١ـ پێشەوا مالك بە سەنەدێکی (صحیح) گێڕاویەتەوە.

أجوَدَ ما نجِدُ، وأن نتطيبَ بأجوَدِ ما نجِدُ)[1] واتا پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی پێدەکردین باشترین پۆشاك لەبەربکەین و بۆن خۆشترین بۆتیش لە خۆمان بدەین.

دووەم/ سەرفترە دان. سوننەتە بەرلە ئەنجامدانی نوێژی جەژن سەرفترەی ڕەمەزان بدرێت، وە حەرامە لە ڕۆژی یەکەمی جەژن دوا بخرێت. پێشەوا ابن عمر رضي الله عنه دەفەرموێت: (فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِﷺزَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ)[2]واتا: پێغەمبەری خودا ﷺ زەکاتی سەرفترەی بە پێویست گێڕا"صاعێك ـ ٢٤٢٠گرام ـ لە خورمای قەسپ، یان صاعێك لە جۆ، لەسەر موسڵمانانی کۆیلەو ئازادو نێرو مێ و بچوك و گەورە، وە فەرمانی دا پێش چونە نوێژی جەژن سەرفترە بدرێت.

سێیەم/ چونە مزگەوت بە پێیان،گەورەمان علی کوڕی ئەبی طالب رضي الله عنه دەفەرموێت: (مِنْ السُّنَّةِ أَنْ يَخْرُجَ إِلَى الْعِيدِ مَاشِيًا)[3]واتا: لە سوننەتییە هاتنە دەرەوە بۆ جەژنێ بە پێیان.

چوارەم/ سوننەتە پێش هاتنە دەرەوە شتێك بخورێت. گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرموێت: (مَا خَرَجَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ وَسَلَّمَ يَوْمَ فِطْرٍ حَتَّى يَأْكُلَ تَمَرَاتٍ ثلاثًا أَوْ خَمْسًا أَوْ سَبعاً أَوْ أَقَلَ مِنْ ذلك أَوْ أَكْثَرَ مِنْ ذلك)[4]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان لەماڵ نەدەهاتە دەرەوە هەتا سێ خورما یان پێنج خورمان یان حەوت خورما یان زیاتر یان کەمتری نەخواردبا.

---

١ـ پێشەوا حاکم و گبرانی و بیهقی گێڕاویانەتەوە .

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

٣ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە و دەفەرموێت (حدیث حسن)

٤ـ پێشەوایان بوخاری و أحمد و ابن خزیمە و ابن حبان و ترمذی گێڕاویانەتەوە .

پێنجەم/ سوننەتە یاخود ڕێگاپێدراوە منداڵان و ئافرەتانی تازە پێگەیشتوو ئافرەتانی کامڵ و ئافرەتانی حەیزدار بێنە دەرەوە بۆ ناو موسڵمانان و بەشداری بکەن لە دووعای خێر، خاتو أم عطیة رضی الله عنها دەفەرموێت: (أَمَرَنَا رسولُ اللهِﷺأن نُخرجهُن في الْفِطْرِ والأضحى" العَوَاتِقَ والحُيَّضَ وذواتِ الخُدورِ، فأمَّا الحُيَّضُ فيعتزِلْنَ الصلاةَ ـ وَفِي لَفظ المُصَلَّى، ويشهدنَ الخيرَ ودعوةَ المسلمين. قلتُ: يا رسولَ الله إحْدانَا لا يكونُ لها جِلبابٌ؟ قال: ( لِتُلْبِسْها أختُها مِنْ جلبابِها)[1] واتا: پێغەمبەری خواﷺ فەرمانی پێکردین کە لە ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزان و قوربان دا کچە تازە باڵغەکان و حەیزدارەکان و پێگەیشتوەکان بهێنینە دەرەوە، بەڵام هەرچی ئەو ئافرەتانەن کە لە حەیزدان با نوێژ نەکەن و نەهێنە جێگای نوێژ کردن، بەڵکو الله أکبر بکەن و کاری چاکە ئەنجام بدەن و بەشداری نزاکانی موسڵمانان بکەن. گوتم: ئەی ئەگەر ئافرەتێك حەبای نەبوو بەخۆی دابدات؟ فەرمووی: با بە حەبای یەکێك لە خوشکەکانی خۆی دابپۆشێت.

وە گەورەمان ابن عباسرضي الله عنهما دەفەرموێت:(خَرَجْتُ مَعَ النَّبِيِّﷺ يوم فِطْرٍ أَوْأَضحى..)[2]

واتا: لەگەڵ پێغەمبەری خواﷺ هاتمە دەرەوە بۆ جەژنی ڕەمەزان یان قوربان .

*ئەم فەرمودانە بەڵگەن کە ئافرەتان ومنداڵانیش ڕۆژی جەژن هاتونەتە دەرەوە بۆمزگەوت.

بەڵام پێشەوا شەوکانی رحمه الله دەفەرموێت: زانایان جیاڕان ئایا هاتنە دەرەوەی ئافرەتان سوننەتە یان ڕێگا پێدراو ـ مباح ـ ە .

* پێشەوا شافعی و أبی حامدی حەنبەلی و جرجانی و رحمهم الله دەفەرموون : سوننەتە .

* بەشێکی تری زانایان کە ڕای زۆرینەی شافعیەکانە رحمهم الله دەفەرموون : حوکمی ئافرەتی پیر لەگەڵ ئافرەتی گەنج جیاوازە ـ بۆ ئافرەتی پیر سوننەتە بۆ ئافرەتی گەنج ڕێگا پێدراوە .

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە .

٢ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە .

پێشەوا أحمد رحمه الله دەفەرموێت: هاتنە دەریان ڕێگا پێدراوە و سوننەت نیە .

* پێشەوا قاضی عیاض رحمه الله لە أبوبکر علی و ابن عمرەوە رضی الله عنهم گێڕاویەتەوە کە پێویستە ئافرەتان بێنە دەرەوە. ئینجا بەشێك لە زانایان وەك: پێشەوا ثوری و ابن مبارك امام مالك و أبی یوسف دەفەرموون: هاتنە دەری ئافرەتان ناپەسەندە ـ مكروه ـ [1] ئەوەش ئەگەر بێت و ڕەچاوی ئادابە شەرعیەکان نەکەن ، إنشاء الله دواتر باسی دەکەین .

شەشەم / سوننەتە لە شەو و ڕۆژی جەژندا الله أكبر ـ تكبيرات ـ زۆر بگوترێت، خودای بەرزو بەتوانا دەفەرموویت: ﴿ وَلِتُكْمِلُوا۟ ٱلْعِدَّةَ وَلِتُكَبِّرُوا۟ ٱللَّهَ عَلَىٰ مَا هَدَىٰكُمْ وَلَعَلَّكُمْ تَشْكُرُونَ ﴾[2] واتا:خودا ئاسانکاری بۆکردن بۆ ئەوەی مانگی ڕەمەزان تەواو بگرن وە بۆ ئەوەی الله أکبری جەژن بڵێن و سوپاسگوزاری خودا بکەن. وە خاتو أم عطية رضی الله عنها دەفەرموێت: (كُنَّا نُؤْمَرُ يَوْمَ الْعِيدِ أَنْ نَخْرُجَ حَتَّى نُخْرِجَ الْحُيَّضَ فيكبرن بتكبيرهم، أي الناس)[3] واتا: ئێمە فەرمانمان پێدەکرا لە ڕۆژی جەژن بێینە دەرەوە هەتا ئافرەتانی حەیزداریش لەگەڵ خۆمان بیهێنە دەرەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ پیاوان (لله أکبر) بڵێین " کەواتا: پیاوان و ئافرەتان هەردوکیان بەشدارن لە خۆشیەکانی جەژن و هەردوکیان دروشمی (الله أکبر) دەڵێن، تەنها لەوەدا جیاوازن کە ئافرەتان نابێت لای پیاوی بێگانە دەنگیان بەرز بکەنەوە .

* وە جوانترین دەستەواژەی (الله أکبر)ی جەژنەکان ئەوەیە: ( الله أكبر الله أكبر الله أكبر، لا إله إلا الله، الله أكبر الله أكبر ولله الحمد) وە پێشەوا شافعی و زانایانی مەزهەبەکەمان پێیان جوانە دوای گوتنی (الله أکبر)ە کان ئەوەش زیاد بکرێت: ( اللَّهُ أَكْبَرُ كَبِيرًا، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ كَثِيرًا،

١ـ نيل الأوطار شرح منتقى الأخبار ٣٦٤.

٢ـ البقرة : ١٨٥ .

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

وَسُبْحَانَ اللَّهِ بُكْرَةً وَأَصِيلًا، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِياهُ مُخْلِصِينَ له الدِّيْنَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ ، وَنَصَرَ عَبْدَهُ ، وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ، لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَاَللَّهُ أَكْبَرُ)[1] وە پێشەوا بیهقی رحمه الله لە جابری کوڕی عبدالله رضي الله عنه گێڕاویەتەوە کە پێغەمبەری خوداﷺ بەم شێوە( الله أكبر) ی جەژنی کردووە: (الله أكبر الله أكبر، لا إله إلا الله، والله أكبر الله أكبر ولله الحمد) واتا: دوو جار فەرموویەتی الله أكبر پاشان فەرموویەتی: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ. جا ئەم ( الله أكبر)انە لە ڕۆژ ئاوا بونی شەوی جەژنەوە دەست پێدەکەن هەتا پێش نوێژ ـ إمام ـ نوێژی جەژن دادەبەستێ بەردەوام دەبن.

حەوتەم/ نزا کردن و پاڕانەوە، لە فەرموودەکەی ڕابردووی گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دا هاتبوو کە خودای گەورەجل جلاله بە فریشتەکانی دەفەرموێت: (عَبِيدِي وَإِمَائِي قَضَوْا فَرِيضَتِي عَلَيْهِمْ، ثُمَّ خَرَجُوا يَعِجُّونَ إِلَيَّ بِالدُّعَاءِ ...)[2]واتا: بەندەکانی من لە ژن و پیاوان ئەوەی لە سەرم واجب کردبوون ئەنجامیاندا، پاشان هاواریان بۆ لای من بەرز کردوتەوەو نزا دەکەن و لێم دەپاڕێنەوە...

جا بە بەڵگەی ئەم فەرموودەیە سوننەتە ئەو کەسەی دێتە نوێژی جەژن دوعا زۆر بکات و بپاڕێتەوە، دوعای چی؟ دووعای گیرا بونی مانگی ڕەمەزان، لێخۆشبون، سەرفرازی ...هتد، وەئەگەر دوعاکانی قورئان و فەرمودەبن باشترە :

*جەعفەری کوڕی بەرقان رحمه الله دەفەرموێت: نامەیەکی عمری کوڕی عبدالعزیز رضي الله عنه مان بۆهات تیایدا نوسیبوو: تصدقوا قبل الصلاة: ( قَدۡ أَفۡلَحَ مَن تَزَكَّىٰ * وَذَكَرَ ٱسۡمَ رَبِّهِۦ فَصَلَّىٰ )[3]

---

١ـ الأذكار : ١٤٢ .

٢ـ پێشەوا بیهقی لە شعب الإيمان داو پێشەوا سیوطی لة الدر المنثوردا گێڕاویەتەوە .

٣ـ الأعلى : ١٤ ـ ١٥ .

وقولوا كما قال أبوكم: ( رَبَّنَا ظَلَمْنَآ أَنفُسَنَا وَإِن لَّمْ تَغْفِرْ لَنَا وَتَرْحَمْنَا لَنَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ) [٢]

وقولوا كما قال نوح: ( وَإِلَّا تَغْفِرْ لِي وَتَرْحَمْنِيٓ أَكُن مِّنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ) [٣]

وقولوا كما قال إبراهيم: ( وَٱلَّذِيٓ أَطْمَعُ أَن يَغْفِرَ لِي خَطِيٓـَٔتِي يَوْمَ ٱلدِّينِ ) [٤]

وقولوا كما قال موسى: ( رَبِّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي فَٱغْفِرْ لِي فَغَفَرَ لَهُۥٓۚ إِنَّهُۥ هُوَ ٱلْغَفُورُ ٱلرَّحِيمُ )[٥]

وقولوا كما قال ذوا النون: ( لَّآ إِلَٰهَ إِلَّآ أَنتَ سُبْحَٰنَكَ إِنِّي كُنتُ مِنَ ٱلظَّٰلِمِينَ ) [٦] [٧] واتا:

پێش ئەنجامدانی نوێژی جەژن سەرفترە بدەن، چونکە خودای گەورە دەفەرموێت: بەڕاستی ڕزگاری دەبێت ئەوکەسەی خۆی لە تاوان خاوێن دەکاتەوە و یادی خودا دەکات و نوێژ دەکات. وە بە پاڕانەوەی باوکتان ئادەم علیه السلام بپاڕێنەوە کە فەرمووی: ئەی پەروەردگاری ئێمە، ئێمە ستەمان لە خۆمان کرد بەوەی سەرپێچی فەرمانی تۆمان کرد، ئەگەر تۆ لێمان خۆش نەبیت و ڕەحمان پێنەکەیت ئێمە لە زەرەد مەندان دەبین ، وە بە دووعای نوح علیه السلام بپاڕێنەوە کە فەرمووی: ئەی خودای من خۆ ئەگەر لێم خۆش نەبیت و لێم نەبوریت لە زەرەد مەندان دەبم، وە بە دووعای إبراهیم علیه السلام نزا بکەن کە فەرمووی: خودای من ئەو خودایەیە کە هیوام وایە لە ڕۆژی قیامەتدا لە هەڵەکانم بم بەخشێت. وە بەدووعای موسی علیه السلام بپاڕێنەوە کە فەرمووی: پەروەردگارە بەڕاستی من ستەمم لە دەرونی خۆم کرد بەو هەڵەیەی ئەنجامم دا لێم خۆشببە، خودایش لێی خۆش بوو،بەڕاستی خودا بە بەزەیی و بەخشندەیە.وە بە دووعاکانی یونس علیه السلام

٢ـ الأعراف : ٢٣ .

٣ـ هود : ٤٧ .

٤ـ السعراء : ٨٢ .

٥ـ القصص : ١٦ .

٦ـ الأنبياء : ٨٧ .

٧ـ پێشەوا بیهقی لە سنن و شعب الإیماندا گێڕاویەتەوە .

لە خودا بپاڕێنەوە کە فەرمووی: پەروەردگارە هیچ خودایەك نیە جگە لە تۆ، پاك و بێگەردیت بەڕاستی من بەهۆی ئەم هەڵەیەمەوە چومە ڕیزی ستەمکاران.

هەشتەم/ نوێژی جەژن: نوێژی جەژن سوننەتێکی زۆر خێردارەو (مؤکدة) یە، وە ڕایەکی تر دەفەرمووێت: فەرزی کیفایەیە، وە پێغەمبەری خوداﷺ هەرگیز ئەم نوێژانەی لە دەست نەداوە و بەبەردەوامی و هەموو ساڵێك ئەنجامی داون.

## ئادابەکانی نوێژی جەژن

أـ سوننەتە ئەم نوێژە بە کۆمەڵ ئەنجام بدرێت، وەسوننەتە موسڵمانان زوو بێنە مزگەوت و چاوەڕێی نوێژ بکەن، کەواتا موسڵمانان سوننەتە دوای نوێژی بەیانی نەچنەوەماڵەوە و لەمزگەوت بمێننەوە چاوەڕوانی کاتی نوێژی جەژن بکەن، بەڵام: پێش نوێژ ـ إمام ـ نابێت لە مزگەوت چاوەڕێی نوێژی جەژن بکات بەڵکو سوننەتە لەکاتی نوێژی جەژن بێتە شوێنی نوێژ کردن یەکسەر نوێژ داببەستێ" گەورەمان ئەبو سعیدی خدری رضي الله عنه دەفەرمویت : ( كَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى إِلَى الْمُصَلَّى، فَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلاةُ )[1] واتا: پێغەمبەری خودا ﷺ لە جەژنی ڕەمەزان و قوربانەدا دەهاتە شوێنی نوێژ کردن و یەکسەر دەستی بە نوێژی جەژن دەکرد.

ب ـ سوننەتە لە شوێنێکی کراوە ـ دەرەوەی مزگەوت ـ نوێژی جەژن ئەنجام بدرێت بەڵام ئەگەر ڕێگرێکی شەرعی هەبوو ئەوە لە مزگەوت دا ئەنجام دەدرێت. چونکە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ هەمو نوێژە جەژنەکانی لە دەرەوە کردوون تەنها نوێژێکی جەژنی لە مزگەوت کردووە" ئەویش بە هۆی بارانەوە بو" گەورەمان ئەبو هریرە رضي الله عنه دەفەرمووێت: (أَنَّهُ أَصَابَهُمْ مَطَرٌ

١ ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

فِي يَوْمِ عِيدٍ ، فَصَلَّى بِهِمُ النَّبِيُّ ﷺ الْعِيدَ فِي الْمَسْجِدِ)[1]واتا:لە ڕۆژێکی جەژندا باران دەباری بەم هۆیەوە پێغەمبەری خودا ﷺ نوێژی جەژنی لە مزگەوتدا بە موسڵمانان کرد .

ت ـ نوێژی جەژن بە پێش هەردووك ووتارەکە دەخرێت" واتا: بە پێچەوانەی نوێژی جمعە. گەورەمان ابن عمر رضي الله عنهما دەفەرموێت: (كَانَ النَّبِيُّ ﷺ وَأَبُو بَكْرٍ وَعُمَرُ يُصَلُّونَ الْعِيدَيْنِ قَبْلَ الْخُطْبَةِ)[2]واتا: هەر یەك لە پێغەمبەری خودا ﷺ و ئەبوبکر و عمر رضی الله عنهما نوێژی جەژنیان پێش ووتارەکان ئەنجام دەدا.

ث ـ کاتی نوێژی جەژن لە دوای خۆر هەڵاتن دەست پێدەکات، وە سوننەتە نوێژەکە دوا بخرێت هەتا خۆر بە ئەندازەی ڕمێك بەرز دەبێتەوە، بەڵام بەداخەوە لەم ڕۆژگارەدا زۆر کەم ئەم سوننەتە جێ بەجێ دەکرێت !!

ج ـ ئەم نوێژە بەبێ بانگ و قامەت ئەنجام دەدرێت" گەورەمان جابری کوڕی سەمورە رضي الله عنهما دەفەرموێت: (صَلَّيْتُ مَعَ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ الْعِيدَيْنِ غَيْرَ مَرَّةٍ وَلا مَرَّتَيْنِ بِغَيْرِ أَذَانٍ وَلا إِقَامَةٍ)[3] واتا : زیاتر لە جارێك و دوو جار نوێژی هەردووك جەژنەکانم لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ کرد ، بەبێ بانگ و قامەت ، بەڵام سوننەتە دوو جار بگوترێت : ( الصلاةُ جامعة )[4]

و ـ نوێژی جەژن دوو ڕەکاتە، دوای(الله أكبر)ی نوێژ دابەستن دووعای کردنەوەی نوێژ: (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضَ ، حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنَ الْمُشْرِكِينَ ، إِنَّ صَلاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ ، لاَ شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنَ الْمُسْلِمِينَ)

---

١ـ پێشەوایان أبوداود و بیهقی و ابن ماجه گێڕاویانەتەوە .

٢ـ پێشەوایان بخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

٣ـ پێشەوایان بخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

٤ـ الأذكار : ٣٨

دەخوێنێت پاشان حەوت جار دەڵێت: (الله أکبر) وە لەنێوانی(الله أکبر)ە کاندا دەڵیت: (سُبْحَانَ اللّهِ، وَالْحَمْدُ لِلّهِ، وَلا إِلَهَ إِلا اللّهُ، اللّهُ أَكْبَرُ) وە لە ڕەکاتی دووەمدا پێنج ( الله أکبر) دەڵێت و لە نێوانیاندا ئەم زیکرەی ڕابردوو دەڵێت. خاتو عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێت: (كَانَ النَّبِيّ يُكَبِّرُ فِي الْعِيدَيْنِ فِي الأُولَى سَبْعًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ، وَفِي الآخِرَةِ خَمْسًا قَبْلَ الْقِرَاءَةِ)[1]واتا: پێغەمبەرﷺلە نوێژی جەژنەکاندا لە ڕەکاتی یەکەم پێش خوێندنی سوڕەتی فاتحە حەوت جار(الله أکبر)ی دەگوت و لە ڕەکاتی دووەمیش پێنج جار دەیگوتن.

هـ ـ سوننەتە لە ڕەکاتی یەکەمدا دوای خوێندنی سوڕەتی فاتحە" سورەتی (ق) یان سوڕەتی (الأعلی) بخوێنرێت، وە لە ڕەکاتی دووەم سوڕەتی(الساعة) یان (الغاشیة)[2]بە تەوای بخوێنرێت.

نۆیەم/ دوای تەواو بونی نوێژ ووتار بێژ ڕوو دەکاتە موسڵمانان و ئامۆژگاریان دەکات. گەورەمان ئەبو سعیدی خدری رضي الله عنه دەفەرمووێت: (كَانَ النَّبِيُّﷺ يَخْرُجُ يَوْمَ الْفِطْرِ وَالأَضْحَى إِلَى الْمُصَلَّى، وَأَوَّلُ شَيْءٍ يَبْدَأُ بِهِ الصَّلاةُ، ثُمَّ يَنْصَرِفُ فَيَقُومُ مُقَابِلَ النَّاسِ، وَالنَّاسُ جُلُوسٌ عَلَى صُفُوفِهِمْ، فَيَعِظُهُمْ ،و يُوحِّدُهِمْ وَيَأْمُرُهُمْ ...)[3]واتا: پێغەمبەرﷺلە ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕەمەزان دەهاتە دەرەوە بۆ شوێنی نوێژ لێ کردن ،وە یەکەم شت دەستی دەکرد بە نوێژ کردن ، پاشان ڕووی دەکردە خەڵکەکە و بەرامبەریان ڕادەوەستا و ، خەڵکەکەش لە ڕیزەکانیاندا دانیشتبون، ئامۆژگاری دەکردن و ، ڕای دەسپاردن وە فەرمانی پێدەکردن بە چاکە. ئینجا بزانە: سوننەتە بەشێکی ووتاری جەژنەکان تایبەت بکرێت بە ئامۆژگاری ئافرەتان، وە ئەگەر لە جێگایەك بڵندگۆ ـ مكبر ـ ەی لێ نەبوو سوننەتە ووتار بێژ لەگەڵ یەك دوو پیاوی تردا بچێت

١ـ پێشەوایان أبوداود و ترمذی بە سەنەدێکی (حسن) گێڕاویانەتەوە .

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە ، وە بڕوانە : الأذکار : ١٤٣.

٣ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

ـ مۆژگاری ئافرەتان بکات. گەورەمان جابری کوڕی عبداللە ﷺ دەفەرمووێت:(قَامَ النَّبِيُّ ﷺ يَوْمَ الْفِطْرِ فَصَلَّى ، فَبَدَأَ بِالصَّلَاةِ ، ثُمَّ خَطَبَ،فَلَمَّا فَرَغَ نَزَلَ فَأَتَى النِّسَاءَ فَذَكَّرَهُنَّ، وَهُوَ يَتَوَكَّأُ عَلَى يَدِ بِلَالٍ ...)[1]واتا: لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزاندا پێغەمبەر ﷺ سەرەتا نوێژی کردو پاشان ووتاری خوێندەوە، کاتێك لە ووتارەکەی بویەوە دابەزی و هاتە لای ئافرەتان و ئامۆژگاری کردن ـەو کاتەدا خۆی خستبۆ سەر دەستی بیلال ﷺ ...) .

## ئادابەکانی ووتاری جەژن

١ـ ڕوکنەکانی ووتاری جەژن وەك ڕوکنەکانی ووتاری (جمعە)ن. واتا: دەبێت ووتار بێژ:

أـ سوپاسی خودا ـ الحمدلله ـ بکات.

ب ـ صەڵاوەت بدات لەسەر پێغەمبەری خودا ﷺ.

ج ـ ئامۆژگاری موسڵمانان بکات و ڕایان بسپێرێت بە تەقوای خودا جل جلاله .

د ـ لە ووتارەکاندا ئایەتێکی قورئان و فەرمودەیەك باس بکات.

و ـ دووعا کردن بۆ موسڵمانان لە ووتاری دووەم دا.

٢ـ ووتاری جەژنەکان مەرج نیە بۆ دروست بوونی نوێژەکە واتا: ئەگەر کەسێك تەنها نوێژەکە بکات و بۆ ووتارەکانیش دانەنیشێت بەری دەکەوێت، وە هەردووك ووتارەکە کاتێك سوونەتن ئەگەر نوێژەکە بە جەماعەت بکرێ، بەڵام ئەگەر کەسێك نوێژەکەی بە تەنیا کرد ئەوکاتە ووتارەکان سوننەت نین.

٣ـ سوننەتە ووتاربێژ لە سەرەتای ووتاری یەکەمدا نۆ جار(الله أکبر) بڵێت.

٤ـ سوننەتە ووتار بێژ لە ووتاری جەژندا موسڵمانان فێری چۆنیەتی سەرفترە دان بکات.

---

٢ ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

٥ـ سوننەتە ووتاربێژ ووتاری جەژنەکان لەسەر زەوی بخوێنێتەوەو نەچێتە سەر مینبەر چونکە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ووتاری جەژنەکانی لەسەر زەوی خوێندوٚتەوە و نەچوٚتە سەر مینبەر، وە یەکەم کەس کە مینبەری داهێنا بۆ نوێژی جەژنەکان مەروان بوو[1] .

٦ـ جگە لەم ئادابانەی ڕابردوو هەر شتێك سوننەت بێت بۆ ووتاری (جمعە) ئەوەش سوننەتە بۆ ووتاری جەژنەکان وەك سلام کردنی ووتار بێژو ، کورتی ووتارەکان و .... هتد.

دەیەم/ سوننەتە لە گەڕانەوەیدا لە نوێژی جەژن بۆ ماڵەوە ڕێگاکەی بگۆڕێت و بەو ڕێگایەدا نەگەڕێتەوە بۆماڵەوە کە پیایدا چووە بۆ نوێژی جەژن. گەورەمان جابری کوڕی عبداللهرضي الله عنه دەفەرموێت: (كَانَ النَّبِيُّﷺ إِذَا كَانَ يَوْمُ عِيدٍ خَالَفَ الطَّرِيقَ)[2]واتا: پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی جەژندا ڕێگای چوون و هاتنەوەی دەگۆڕی.

جا ئەم ڕێگا گۆڕینەی پێغەمبەری خۆشەویستﷺ و موسڵمانان چەندان حیکمەتی تێدایە کە زانایان ئاماژەیان پێکردوون لەوانە:

* قاضی عبدالوهابی مالکی رحمه الله دەفەرمووێت: پێغەمبەرﷺ ڕێگای دەگۆڕی بۆ ئەوەی هەردووك ڕێگاکان لە قیامەتدا شاهیدی بۆ بدەن.

* بەشێکی تر لە زانایان دەفەرموون: بۆ ئەوەی دانیشتوانی سەر هەردووك ڕێگاکە لە مرۆڤ و جنۆکە شاهیدی بۆ بدەن ، بەشێکی تر دەفەرموون : بۆ ئەوەی بەهرەوەر بن ـ تبرك وەربگرن ـ بە پێغەمبەری خودا ﷺ .

* وە بەشێکی تر دەفەرموون: بۆ ئەوەی لە هەموو ڕێگاکاندا درووشمەکانی ئیسلام بەرز بکرێتەوە ( الله أكبر ) بگوترێت و زیکری خودایان تیادا بکرێت .

---

٢ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە .

٣ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە .

* وە بەشێکی تری زانایان دەفەرموون: لە ڕۆژانی جەژن فریشتەکانی خودا لەسەر ڕێگاکان دەوەستن، پێغەمبەرﷺ مەبەستی بووە بە گۆڕینی ڕێگاکەی شاهیدی سەرجەم فریشتەکانی سەر ڕێگاکان بەدەست بهێنێت. لەگەڵ چەندین حیکمەتی تردا کە پێشەوا ابن حجر رحمه الله لە(فتح) دا ئاماژەی پێکردوون [1] .

یازدەهەم/ جەژنە پیرۆزە لە یەکتر کردن: سوننەتە موسڵمانان لە ڕۆژی جەژندا بە ڕوویەکی خۆشەوە جەژنە پیرۆزە لە یەکتر بکەن و گەردن ئازادی لە یەکتر بکەن.

## ئادابەکانی جەژنە پیرۆزە

١ـ سوننەتە لە کاتی بە یەکتر گەیشتنی موسڵمانان تەوقە بکەن و صەڵاوەت لە پێغەمبەری خوداﷺ بدەن و سوپاسی خودا بکەن، گەورەمان بەڕاتی کوڕی عازیبرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ دەفەرمووێت: (إِذا التَقى المُسلِمانِ فتَصافَحا وحَمِدا اللهَ عَزَّ وجَلَّ واستَغفَراه غُفِرَ لَهما)[2] واتا: هەرکاتێك دوو موسڵمان بەیەك گەیشتن و سوپاسی خودای بەرزو بەتوانایان کردوو داوای لێخۆشبونیان کرد" ئەوە خودای گەورە لێیان خۆش دەبێت. وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرمووێت: (مَا مِنْ مُسْلِمَيْنِ يَلْتَقِيَانِ فَيَتَصَافَحَانِ وَيُصَلِّيانِ عَلى النَّبِيِّ ﷺ إِلَّا لَمْ يَتَفَرَّقَا حتَّى يُغْفِرَ لَهُمَا ذُنُوبُهُما )[3] واتا: هەردوو موسڵمانێك بگەنە یەکتری و تەوقە بکەنو صەڵاوەت لەسەر پێغەمبەرﷺ بدەن" ئەوە لە یەکتر جیا نابنەوە هەتا خودای گەورە لە تاوانەکانیان خۆشدەبێت .

٢ـ سوننەتە لەکاتی بەیەك گەیشتن جەژنە پیرۆزە لە یەکتری بکەن و بەیەکتری بڵێن: (تقَبَّلَ

١ ـ بڕوانە: فتح الباری : ٢ / ٦٠٩

١ ـ پێشەوا أبوداود بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویەتەوە .

٢ ـ پێشەوایان ابو یعلی وابن حبان گێڕاویانەتەوە .

اللهُ مِنّا وَمِنكُم)واتا: خودا لە ئێمەو ئێوەشی قبوڵ بکات. جوبەیری کوڕی نەفیر دەفەرموویت:
(كَانَ أَصْحاب رَسُولِ اللهِﷺ إذا التقوا يَوْمَ الْعِيدِ يَقُولُ بَعْضُهُم لِبَعْضٍ تقَبّلَ اللهُ مِنّا وَمِنكُم)[1]
واتا: کاتێك هاوەڵانی پێغەمبەرﷺ لە ڕۆژی جەژن پێك دەگەیشتن بە یەکتریان دەگوت : تقَبّلَ اللهُ مِنّا وَمِنكُم .

٣- سوننەتە لە کاتی بەیەك گەیشتنی موسڵمانان،باوەش بەیەکتردا بکەن، خاتو عائیشە رضی الله عنها دەفەرموویت: (قَدِمَ زَيد بن حارثةَ المَدينَةَ فأَتى النَّبِيَّﷺ فَقَرعَ البَابَ فَقَامَ إِلَيهِ النَّبِيُّ ﷺفَاعْتَنَقَهُ وَقَبَّلَهُ)[2]واتا: زەیدی کوڕی حارثە لەسەفەر گەڕایەوە مەدینە و هاتە ماڵی پێغەمبەر ﷺ لە دەرگای دا، پێغەمبەریشﷺ لە بەری هەڵستاو باوەشی پێدا کردو ماچی کرد.

٤- سوننەتە سەردانی پیاوچاکان و زانایانی ئاینی و دایك و باوك و خوشك و براو خزم و دۆستان بکرێت و دەستیان ماچ بکرێت.خاتو عائیشە رضی الله عنها دەفەرموویت:(كَانَ رَسُولُ اللّهِ ﷺ دَخَلَ على فَاطِمةَ رضی الله عنها قَامَتْ إِليهِ فأَخذَت بِيَدِهِ وَقَبَّلَتهُ وَاَجلَستهُ فِي مَجالِسها)[3] واتا: کاتێك پێغەمبەر ﷺ دەچۆ ماڵی فاطمە ی کچی، فاطمە رضی الله عنها لە بەری هەڵدەستاو دەستی دەگرت و ماچی دەکردو لە جێگای خۆی دایدەنیشاند. وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموویت : ( مَنْ عَادَ مَرِيضًا أَوْ زَارَ أَخًا لَهُ نَادَى مُنَادٍ مِنَ السَّمَاءِ أَنْ طِبْتَ وَطَابَ مَمْشَاكَ وَتَبَوَّأْتَ مِنَ الْجَنَّةِ مَنْزِلا)[4] واتا: هەر کەسێك سەردانی نەخۆشێك، یان برایەکی موسڵمان بکات لەبەر خاتری خـــودا، ئەوە لـــەلای خوداوە فریشتەیەك بانگی دەکات: پـاك بویتەوەو

١- پێشەوا زاهری کوڕی طاهر گێڕاویەتەوە ، پێشەوایان ابن حجر لە(فتح )دا:٥٧٥/٢و سیوطی لە ( الحاوی ): ١٠٠ دەفەرموون ( حسن ).

٢- پێشەوا ترمذی بە سەنەدێکی (حسن)گێڕاویەتەوە.

٣- پێشەوایان أبو داود و النسائي و ترمذی بە سەنەدێکی ( حسن )گێڕاویانەتەوە

٤- پێشەوا ترمذی بە سەنەدێکی ( حسن )گێڕاویەتەوە.

هەنگاوەکانیشت پاك و چاکن وە شوێنێکیشت لە بەهەشت بۆخۆت ئامادە کرد.

دوازدەهەم/ سوننەتە لە ڕۆژی جەژندا بەهەر هۆکارێکی شەرعی دڵی خێزان و منداڵەکانت خۆش بکەیت. چونکە پێغەمبەری سەروەرﷺدڵی خاتو عائیشەو خێزانەکانی تری خۆش کردووە، خاتو عائیشە رضی الله عنها دەفەرموویێت: (لَقَدْ رَأَيْتُ رَسُولَ اللَّهِﷺ يَقُومُ عَلَى بَابِ حُجْرَتِي وَالْحَبَشَةُ يَلْعَبُونَ بِحِرَابِهِمْ فِي الْمَسْجِدِ، وَرَسُولُ اللَّهِﷺيَسْتُرُنِي بِرِدَائِهِ لِكَيْ أَنْظُرَ إِلَى لَعِبِهِمْ، ثُمَّ يَقُومُ مِنْ أَجْلِي حَتَّى أَكُونَ أَنَا الَّتِي أَنْصَرِفُ)[1]واتا: پێغەمبەری خودامﷺ بینی لە بەردەرگای ماڵەکەم وەستابوو، لەو کاتە حەبەشیەکان بە نێزەکانیان لە مزگەوتی پێغەمبەرداﷺ یارییان دەکرد، پێغەمبەری خوداﷺ بە عەبایەکەی منی داپۆشی بۆ ئەوەی سەیری یاریەکەیان بکەم، پاشان لەبەر من مایەوە هەتا من تێر ببم لە سەیر کردنیان و ئینجا بڕۆم.

لە گێڕانەوەی پێشەوا النسائي دا پێغەمبەری خوداﷺبەخاتو عائیشەیرضی الله عنها فەرموو: (يَا حُمَيرآء أتحبينَ أنْ تَنظري إلَيهِم؟ فَقُلتُ: نَعَم)واتا: ئەی سورکەڵە[2] حەزدەکەی سەیریان بکەیت؟ منیش گوتم بەڵێ.

جا لێرەدا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ تەنها مەبەستی دڵخۆش کردنی خاتو عائیشە بووە!!

سێزدەهەم/ دروستەو ڕێگا پێدراوە لە ڕۆژی جەژنەکاندا گۆرانی شەرعی بگوترێت و دەفی لەگەڵدا لێبدرێت" پێغەمبەری خۆشەویستﷺ ڕێگای بە خاتو عائیشە رضی الله عنها داوە گوێ بۆ گۆرانی بگرێت لە ڕۆژی جەژنداو نکوڵی ئەبوبکری ڕاستگۆشی کردووە لەوەی ڕێگریان بکات. خاتو عائیشە رضی الله عنها دەفەرموویێت: (دَخَلَ عَلَيَّ رَسُولُ اللَّهِﷺ وَعِنْدِي جَارِيَتَانِ تُغَنِّيَانِ

[1] ـ پێشەوا بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

[2] ـ پێغەمبەرﷺ لەم دەستەواژەی لە خۆشەویستیان بۆ خاتو عائیشە رضی الله عنها بەکار دەهێنا، هەروەك چۆن لە کوردەواریدا لە خۆشەویستیان بە منداڵەکانیان دەڵێن سورە یان ڕەشە.

بِغِـنَاءِ بُعَاثَ، فَاضْطَجَعَ عَلَى الْفِرَاشِ وَحَوَّلَ وَجْهَهُ ، وَدَخَلَ أَبو بَكْرٍ فَانْتَهَرَنِي وَقَالَ مِزْمَارَةُ الشَّيْطَانِ عِنْدَ رسول اللهﷺ ؟ فَأَقْبَلَ عَلَيْهِ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ دَعْهُمَا)[1]وفي رواية أخرى ( يَا أَبَابَكر إِنَّ لِكُلِّ قَوْمٍ عِيداً، وهذا عيدُنا)[2]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ هاتەلام لە ڕۆژی جەژندا، لەوکاتەدا دوو کەنیزەکم لابون گۆرانیەکانی ڕۆژی(بعاث)یان بۆ دەگوتم، ئەویشﷺ لەسەر دۆشەکێك پاڵکەوت و پشتی کردە ئێمە، ئینجا ئەبوبەکرﷺهاتە ژوورەوە تێوەی شراخاندم و فەرمووی: چۆن دەبێت زوڕنای شەیطان لە لای پێغەمبەری خوداﷺلێبدرێت! پێغەمبەری خودا ﷺ ڕووی تێکردو فەرمووی: لێیان گەڕێ . وە لە گێڕانەوەیەکی تردا فەرمووی: ئەی ئەبوبکر هەموو گەلێك جەژنی خۆی هەیە ، ئەوەش جەژنی ئێمەیە !.

چواردەهەم / سوننەتە لە ڕۆژی جەژنەکاندا خواردنی خۆش و خواردنەوەی تایبەت ئامادە بکرێت، گەورەمان عوقبەی کوڕی عامرﷺدەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺفەرموویەتی: (يومُ عرفةَ ويوم نحرٍ وأيامُ التشريقِ عِيدُنا أهلَ الاسلامِ وهي أيامِ أكلٍ وشُربٍ)[3]واتا: ڕۆژی عەرەفە و ڕۆژی نحر - ڕۆژی یەکەمی جەژنی قوربان - و سێ ڕۆژەکەی دواتری جەژنی قوربان"جەژنی ئێمەن ئەی گەلی موسڵمان،وە ئەو ڕۆژانە ڕۆژی خواردن و خواردنەوەن .

## شەوی جەژن

دەربارەی زیندووکردنەوەی شەوی هەردووك جەژنەکان بەخواپەرستی کۆمەڵێك لە فەرموودە هاتوون، کە ئاماژە دەکەن بە سوننەتی زیندوکردنەوەی ئەم شەوانە، هەرچەندە زۆرینەی زانایان

١- پێشەوایان بوخاری و موسلم گێڕاویانەتەوە .

٢- پێشەوایان بوخاری و موسلم گێڕاویانەتەوە .

٣- پێشەوایان أبوداود و نسائی گێڕاویانەتەوە.

فەرموودەکانیان بەلاواز داناون" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرینەی زانایان زیندوکردنەوەی ئەم شەوانە بە سوننەت دەزانن ، چونکە فەرمودەی لاواز لەم جۆرە باسانەدا کاری پێدەکرێت.

پێشەوا نواوی رحمه الله دەفەرموێت: بزانە کە سوننەتە شەوانی جەژنەکان زیندو بکرێتەوە بە زیکری خوداو نوێژکردن و خوا پەرستیەکانی تر لە بەر ئەو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە دەفەرمووێت: (من أحيا ليلتَي العيدينِ لم يَمُتْ قلبُهُ يومَ تموتُ القلوبُ)[1][2] واتا: هەرکەسێك شەوانی دوو جەژنەکە زیندویکاتەوە دڵی نامرێت " لەکاتێکدا دڵەکان دەمرن.

وە گەورەمان ئەبو ئومامەی باهیلی رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ دەفەرمووێت: (مَن قام ليلتَي العيدينِ مُحتَسِباً لِله لم يمتْ قلبُهُ يومَ تموتُ القلوبُ)[3] واتا: هەرکەسێك شەوی دوو جەژنەکان لە پێناوی خودا زیندویکاتەوە و چاوەڕێی پاداشت بێت لە خودای بەرزو توانا " ئەوە دڵی نامرێت" لەکاتێکدا کە دڵەکان دەمرن .

پێشەوا شافعی رحمه الله دەفەرمووێت: پێمان گەیشتووە کە ابن عمر رضي الله عنه شەوی جەژنەکانی زیندو کردوەتەوە[4].وەهەر پێشەوا پێشەوا شافعی رحمه الله دەفەرمووێت: (بَلَّغنا أنَّ الدُّعاءَ يُستجابُ في خمسِ ليالٍ: ليلةِ الجُمعةِ والعيدينِ وأولِ رجبِ ونصفِ الشعبانِ)[5] واتا: پێمان گەیشتووە کە دووعا لە پێنج شەواندا گیرا دەبن: شەوی جومعە و شەوی جەژنەکان و شەوی یەکەمی ڕەجەب وەنیوەی شەعبان.

ئینجا زانایان جیاڕان دەربارەی ئەو ماوەیەی کە زیندو کردنەوەی شەوەکەی پێ دێتــە جێ:

١ـ پێشەوا دارالقطني گێڕاویەتەوە.

٢ـ الأذكار: ١٤١

٣ـ پێشەوایان شافعی و ابن ماجە گێڕاویانەتەوە.

٤ـ جامع لشعب الإيمان: ٥/٢٨٨

٥ـ هەمان سەرچاوە: ٥/٢٨٧

بەشێك لە زانایان دەفەرموون: زیندو کردنەوەی شەوەکە بەماوەیەکی کەمیش ـ کاتژمێرێکیش ـ بێت دێتە جێ. بەشێکی تر لە زانایان کە زانایان و پیاو چاکانی شاری مەدینەی لەگەڵدان دەفەرموون: زیندوکردنەوەی شەوی جەژنەکان بەوە دێتەجێ نوێژی عیشاو بەیانی بەکۆمەڵ ـ جماعە ـ بکەیت[1] پێشەوا نواوی رحمه‌الله دەفەرمووێت: ووتەی دیارترـالأظهرـ ئەوەیە زیندوکردنەوەی شەوەکە بەوە دێتە جێ کە زۆرینەی شەوەکە زیندوبکەیتەوە [2].

## کارو کردەوە حەرام و ناپەسەندەکانی ڕۆژانی جەژن

گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالك رضي الله عنه دەفەرمووێت: (أعيادُ المؤمنِ خمسةٌ: كلُ يومٍ يمرُ على المؤمنِ ولا يُكتبُ عليه ذنبٌ فهوَ عيدٌ، واليومُ الذي يَخرجُ فيه منَ الدُنيا بالإيمانِ والشهادةِ والعِصمَةِ مِن كيدِ الشيطانِ فهوَ عيدٌ ، واليومُ الذي يُجاوزُ فِيهِ الصراطَ ويَأمنٌ فيه من أهوالِ يومِ القيامةِ ويخلصُ من أيدى الخُصومِ والزَّبانيةِ فهوَ عيدٌ، واليومُ الذي يَدخلُ فيه الجنةَ ويأمنُ منَ الجحيمِ فهوَ يومُ عيدٍ، واليوم الذي يَنظرُ فيه إلى ربِّه فهوَ يومُ عيدٍ)[3] واتا: جەژنی بڕواداران پێنجن: یەکەم/ هەرڕۆژێك بەسەر مرۆڤی بڕواداردا تێپەڕێت و هیچ تاوانێکی لەسەر نەنوسرێت ئەو ڕۆژە جەژنە . دووەم/ ئەو ڕۆژەی لە دونیا دەچێتە دەرەوە بە باوەڕێکی تەواو و پارێزراوی لە فێڵەکانی شەیطان ئەوە جەژنە. سێ یەم/ ئەو ڕۆژەی لە پردی صیراط دەپەڕێتەوە و لە ناهەمواریەکانی قیامەت دەربازی دەبێت و لە دەستی بەرامبەرەکانی و فیریشتەکانی دۆزەخ سەرفراز دەبێت ئەوە جەژنە. چوارەم/ ئەو ڕۆژەی دەچێتە بەهەشت و لە دۆزەخ دڵنیاو پارێزراو

---

١ـ روضة الطالبين: ٧٥/٢

٢ـ الأذكار: ١٤٢

دەبێت" ئەو ڕۆژە جەژنە. پێنجەم/ ئەو ڕۆژەی خودای گەورەی تێدا دەبینێت ئەو ڕۆژە جەژنـــە. شاعیر دەڵێت :

لیس العيد لمن لبس الجديـــــــــد إنما العيد لمن طاعته تزيـــــد

لیس العيد لمن تجمّل باللباس والمركوب إنما العيد لمن غفرت له الذنــوب

لیس العيد لمن حاز الدرهم والدينـــار إنما العيد لمن أطاع العزيز الغفـار

لیس العيد لمن لبس الجديـــــــــد إنما العيد لمن أطاع رب العبيـــد

لیس العيد لمن لبس الثياب الفاخـــرة إنما العيد لمن عمل وخاف الآخـــرة

جەژن بۆ ئەو کەسانە نیە کە پۆشاکی جوان لە بەردەکـــــەن

جەژن بۆ ئەو کەسانەیە کە خوا پەرستی زیاد دەکـــــــەن

جەژن تەنها خۆ ڕازاندنەوە نیە بە پۆشاك و وەڵاخی ســـواری

جەژن بۆ ئەو کەسەیە خودا بوریویەتی لە تاوانبـــــــــاری

جەژن بۆ ئەو کەسانە نیە کە بەدەست دێنن درهەم و دینـــــار

جەژن بۆ ئەو کەسانەیە کە گوێڕایەڵن بۆ خودای بەسۆزو غەففار

جەژن بۆ ئەو کەسانە نیە کە پۆشاکی جوان لە بەردەکـــــەن

جەژن بۆ ئەو کەسانەیە کە گوێڕایەڵی خودای بەندەکان زیاددەکەن

جەژن بۆ ئەو کەسانە نیە کە پۆشاکی گران بەها لە بەردەکـــەن

جەژن بۆ ئەو کەسانەیە کە کردەوەی چاك بۆ دواڕۆژ توێشو دەکەن

جا مرۆڤی موسڵمان دەبێت هەوڵبدات لە ڕۆژی جەژندا هیچ کارێك ئەنجام نەدات کە خودای گەورە لە خۆ بڕەنجێنێ بە تایبەت ئەم کارو کردەوانەی خوارەوە :

یەکەم/ نابێت هیچ کەسێك لە ڕۆژی جەژندا چەك هەڵبگرێت، پێشەوا حسن رحمه الله دەفەرموێت: (نُهُو أن يحملوا السلاح يوم عيد إلا أن يخافوا عدوا)[1] واتا: نکوڵی کراوە لە ڕۆژی جەژنەکاندا چەك هەڵبگیردرێت تەنها مەگەر کەسێك لە دوژمن بترسێت، کەواتا: ئەو کەسانەی بۆ خۆ ڕانان لە ڕۆژانی جەژنەکاندا دەمانچە هەڵدەگرن ئەوانە سەرپێچی یاسای شەرعیان کردووە.

دووەم/ بە هیچ شێوەیەك دروست نیە تەوقە لەگەڵ ئافرەتی نامەحرەمدا بکرێت: پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ دەفەرموێت : ( لَأَنْ يطعن في رأسِ أَحدكم بِمِخيَطِ خيرٌ لَه مِن أن يمس إمرأةً لاتحلُّ لَهُ )[2] واتا : ئەگەر بە شوژن لە سەری یەکێك لە ئێوە بدرێت ، هێشتا بۆی باشترە لەوەی دەستی بەر ئافرەتێك بکەوێت کە بۆی حەڵاڵ نیە. خاتو عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: (وَاللهِ ما مست يد رسول اللهﷺ يَد امرأة قط )[3] ـ وفي رواية الترمذی ـ ألا امراة يملكها)[4] واتا: سوێند بە خودا پێغەمبەری خودا ﷺ هەرگیز دەستی لە هیچ ئافرەتێك نەداوە " تەنها ئافرەتێك نەبێت کە حەڵاڵی خۆی بوبێت .

سێ یەم / بە هیچ شێوەیەك دروست نیە ئافرەتان بە پۆشاکی بێ شەرعی بێنە دەرەوە و بۆنی خۆش لە خۆیان بدەن. گەورەمان ئەبو موسای ئەشعەری ر لە پێغەمبەری خوداوە ص دەفەرموێت:(أيما امرأة استعطرت فمرت بقوم ليجدوا ريحها فهي زانية)[4] واتا: هەر ئافرەتێك بۆنی خۆش لە خۆی بدات و بە لای کۆمەڵێك پیاودا بڕوات بۆئەوەی بۆنی بکەن ئەو ئافرەتە زینا

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا طبرانی بە سەنەدێکی (صحیح) گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٤ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوەو دەفەرموێت: (حسن صحیح)

٥ـ پێشەوایان نسائی و احمد و دارمی و بیهقی گێڕاویانەتەوە.

کارە ـ چونکە ئەو خۆ بۆنخۆشکردنەی هەنگاوی یەکەم و ڕێخۆشکەرە بۆ زینا ـ

چوارەم/ حەرامە لە ڕۆژانی جەژندا تەعزیە زیندو بکرێتەوە و ئافرەتان بچنە سەر قەبران" چونکە ڕۆژی جەژن ڕۆژی دڵخۆشی و شادیە، نەوەکو ڕۆژی تەعزیەو سەر قەبران. پێغەمبەری خۆشەویست فەرموویەتی: (هذا عیدنا)واتا: ئەمڕۆ جەژنی ئێمەیە، نەیفەرمووە: ئەمڕۆ ڕۆژی تەعزیەیە!! نەیفەرمووە: ئەمڕۆ ڕۆژی سەرقەبرانە!! وە هەروەکو لە پێشتر ئاماژەمان پێکرد پێغەمبەرﷺ دڵی ماڵ و خێزانی خۆشکردووە و حەبەشیەکانیش جەژن و شادیان گێڕاوە، بۆیە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە بە زیندو کـــردنەوەی تەعزیە دڵی مــــاڵ و خێـــزان و دۆست و خۆشەویستان تەنگ بکرێت" چونکە ئەم کردەوە بیدعەیەکی خراپەو پێچەوانەی ڕەفتارو کرداری پێغەمبەرە ﷺ .

پێنجەم/ حەرامە بەبێ ئیزن وەرگرتن بچیتە هیچ ماڵێکەوە، جا با ئەم ڕۆژە ڕۆژی جەژنیش بێت و خەڵکی زۆرتر لە ڕۆژانی تر سەردانی یەکتر بکەن، هەر دروست نیە بەبێ ئیزن وەرگرتن بچیتە هیچ ماڵێکی خەڵکەوە، چونکە بەجەژن حەرامەکان حەڵاڵ نابن. خودای گەورە دەفەرمووێت: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَدۡخُلُواْ بُيُوتًا غَيۡرَ بُيُوتِكُمۡ حَتَّىٰ تَسۡتَأۡنِسُواْ وَتُسَلِّمُواْ عَلَىٰٓ أَهۡلِهَا)[1] واتا: ئەی ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە مەچۆنە هیچ ماڵێکەوە هەتاکو ئیزن وەرنەگرن و سەلام لە دانیشتوانەکەی نەکەن.

شەشەم/ پێویستە منداڵەکان فێری ئادابەکانی جەژن بکرێن، بۆ ئەوەی لە ڕۆژانی جەژندا نەبنە هۆکاری هەراسانکردن و ئازاردانی موسڵمانان بە کردەوەکانیان، بۆنمونە: وەك سەرکردن بە ماڵاندا بەبێ ئیزن و بەکارهێنانی هەندێك یاری زیان بەخش و ..... هتد، لەبەر ئەوە پێویستە باوکان و کەسە نزیکەکان منداڵان لەگەڵ خۆیاندا بەرن بۆ نوێژی جەژن و سەردانی خزم و دۆستان

---

١ـ النور: ٢٧

و دراوسێکان، بۆ ئەوەی لەگەورەکانەوە فێری ئادابەکانی جەژن بن، چونکە پێغەمبەرﷺإبن عباسی لەگەڵ خۆیدا دەبرد بۆ نوێژی جەژن.[1]

حەوتەم/ بە ڕۆژو بون لە ڕۆژانی جەژندا حەرامە. گەورەمان أبو سعیدی خدریرَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەفەرمووێت: (نهی رسول اللهﷺ عن صوم یوم الفطر والنحر)[2]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ نکوڵی کردووە لە بەڕۆژو بونی ڕۆژانی جەژنی ڕەمەزان و قوربان.

خوێنەری بەڕێز: ئەوەی ڕابرا ئاداب و چۆنیەتی بەڕێکردنی جەژنی ڕەمەزان بوو، تۆی بەڕێزیش هەوڵبدە لە هەموو بوارەکانی ژیانتدا بەگشتی، وە بە تایبەتی ڕۆژەکانی جەژندا هەنگاوەکانت بەپێی شەریعەتی خوداو سوننەتی پێغەمبەرﷺبێت،بۆئەوەی هەموو کارو بارێکی ژیانت ببێتە مایەی خێر و پاداشت. إن شاءالله.



١ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

٢ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

# دە شەو و ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان و ڕۆژی عەرەفە

پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (یوم عرفة و یوم النحر وأيام التشريق عِيدُنا أَهل الإسلام)

## دە شەو و ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان ـ ذوالحجة ـ

دە شەو و ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان شەوان و ڕۆژانی گەورە و ڕێزدارن لای خودای پەروەردگار، وە شەوان و ڕۆژانی تایبەتمەندن بە خودا پەرستی، خودای گەورە لە چەندین جێگادا شاهیدی بۆ گەورەیی ئەم دە شەو و ڕۆژانە داوە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿ٱلْحَجُّ أَشْهُرٌ مَّعْلُومَـٰتٌ﴾[1] مانگەکانی حەج چەند مانگێکی دیاریکراون کە بریتین لە شوال و ذوالقعیدە و ذوالحجة، ئەم دە ڕۆژەش لە مانگی ذوالحجتن،وە خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿مِنْهَآ أَرْبَعَةٌ حُرُمٌ﴾[2] لەمانگەکانی سال چواریان جەنگ تێیاندا حەرامە ئەوانیش:(محرم ورجب و ذوالقعیدە و ذوالحجة)ن وە دەفەرمووێت: ﴿ لِّيَشْهَدُوا۟ مَنَـٰفِعَ لَهُمْ وَيَذْكُرُوا۟ ٱسْمَ ٱللَّهِ فِىٓ أَيَّامٍ مَّعْلُومَـٰتٍ عَلَىٰ مَا رَزَقَهُم مِّنۢ بَهِيمَةِ ٱلْأَنْعَـٰمِ ۖ فَكُلُوا۟ مِنْهَا وَأَطْعِمُوا۟ ٱلْبَآئِسَ ٱلْفَقِيرَ ﴾[3] ابن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێت: (الأيام المعلومات) دە ڕۆژی مانگی قوربانن، وەهەر لەبەر گەورەی ئەم دە ڕۆژانەیە کە خودای گەورە لە قورئانی پیرۆزدا سوێندی پێیان خواردووەو دەفەرمووێت:﴿وَٱلْفَجْرِ * وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾[4] گەورەمان جابر رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی: (العشر:عشر الأضحى)[5] واتا: ئەم دە شەوەی خودا سوێندی پێخواردوون دە شەوی سەرەتای مانگی قوربانن.

وە گەورەمان ابن عباس رضي الله عنهما لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:

---

١ـ البقرة: ١٩٧

٢ـ التوبة: ٣٦

٣ـ الحج : ٢٨

٤ ـ الفجر : ١/٢

٥ ـ پێشەوایان احمد وحاکم ونسائی بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە

(ما مِن أيام فيهنَّ العملُ أحبُّ إلى اللهِ عَزَّوَجَلَّ مِن أيام العشرِ) قيل: يارسول الله ولا الجهاد في سبيل الله؟ قال: (وَلا الجهادُ في سبيلِ الله إلا رجلٌ جَاهد في سبيلِ الله بمالِهِ ونفسه فَلم يرجع مِن ذلِك شيء)[1] واتا: هیچ ڕۆژێك نیە کردەوەی چاك تیایدا خۆشەویستتربێت لەلای خودای گەورە جل جلاله لە دە ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان. گوتیان ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هەتا غەزاکردنیش لە پێناوی خودادا ئەوەندە خێری نیەو خۆشەویست نیـــە؟ فەرمووی: هەتـــا غەزاکردنیش لە پێناوی خودادا ئەوەندە خێری نیەو خۆشەویست نیە، تەنها مەگەر پیاوێك بە خۆیو سامانیەوە لە پێناوی خودادا بجەنگێت و بۆخۆشی شەهید ببێت و سامانەکەشی نەگەڕێتەوە.

پێشەوا ئەوزاعی رحمه الله دەفەرموێت: (بَلغني أَن العملَ في اليومِ مِن أَيَامِ الْعَشرِ كَقَدرِ غَزوةٍ في سَبيلِ اللهِ يُصامُ نهارُها ويُحرَس لَيلُها إلا أنْ يختص امرؤٌ بِشَهادةٍ)[2] واتا: پێم گەیشتووە کە ئەنجامدانی کاری چاکە لە ڕۆژێك لە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی قوربان خێری بە ئەندازەی خێری کەسێکە کە بچێتە غەزاو ڕۆژ بە ڕۆژوو بێت و شەویش پاسەوانی بکات ، تەنها کەسێك نەبێت کە شەهید بێت .

گەورەمان ابن عمر رضي الله عنهما لە پێغەمبەری خوداوەﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (ما مِن أيامٍ أعظم عِندالله وَلا أحبُّ إليهِ العملُ فيهنَّ مِن هذهِ الأيام العشرِ، فَأكثروا فِيهنَّ مِن التحميدِ وَالتكبيرِ وَالتهليلِ)[3] واتا: هیچ ڕۆژێك نیـــە کردەوەی چاك تیایـــدا گەورەترو خۆشەویستتربێت لە دە ڕۆژەکانی سەرەتای مانگی قوربان، ئێوەش زۆر (الحمدُلله و الله أكبر و لا إله إلا الله)ی تێدا بڵێن .

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و ترمذی و ابن ماجەو أحمد گێڕاویانەتەوە .

٢ ـ پێشەوا سیوطی لە الدر المنثور وبیهقی لە شعب الإیماندا باسیان کردووە

٣ـ پێشەوا أحمد بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە

# هەڵە تێگەیشتنێك

بەشێك لە ووتار بێژان و زۆرێکی موسڵمانانیش زۆر دڵنیایی دەدەن و گرینگی دەدەن بە ڕۆژوگرتن لەم نۆ ڕۆژەی سەرەتای مانگی قوربان" بەشێوەیەك لە بەر زۆر گرنگی دان بە باسکردنی ڕۆژوەکان و گرتنی ڕۆژوەکان بوارەکانی تری چاکە و خوا پەرستی تیایدا وونبووە، بەڵێ خێزانەکانی پێغەمبەرﷺ دەفەرموون: (أنَّ النَّبي ﷺ كانَ يَصوم تسع ذالحجة...)[1] واتا: پێغەمبەرﷺ نۆ ڕۆژی سەرەتای قوربان بە ڕۆژو دەبوو. بەڵام نابێت موسڵمانان تەنها لەسەر ڕۆژو هانبدرێن و وابزانن تەنها ڕۆژو گرتن تیایاندا خێرە، چونکە فەرمودەکەی پێغەمبەرﷺ بەرەهایی هەموو کردەوەیەکی چاك دەگرێتەوە:( العملُ فيهنَّ ...) کەواتا: موسڵمانان لەم دە ڕۆژەدا هەر کارێکی چاکەیان بۆ گونجا پێویستە ئەنجامی بدەن جا ئەم کردەوە چاکە نوێژ بێت ڕۆژوبێت یارمەتی موسڵمانان بێت زیکری خوداو دوعا بێت...هەر کارێکی تر بێت. چونکە هەر یەکێك لەو کردەوە چاکانە زۆر خۆشەویستترە لای خودای گەورە لە ڕۆژانی تری تاسایی.

# عەرەفە گەورەی ناو گەورانە

گومان دە شەو و ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان شەوان و ڕۆژانی تایبەتن و کردەوەی چاکە تێیاندا گەورەیەو زۆر خۆشەویستە، لەناو ئەم دە ڕۆژەشدا ڕۆژی عەرەفە تایبەتمەندی خۆی هەیە، وە یەکێکە لەو ڕۆژانەی کە پێغەمبەری خوداﷺ بە جەژن ناوی بردووە، ئەم ڕۆژەش دەکاتە ڕۆژی نۆیەمی مانگی ذالحجة، عوقبەی کوڕی عامرؓ دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: ( يوم عرفة و يوم النحر وأيام التشريق عِيدُنا أهل الإسلام وهي أيـام أكـــــل

١ ـ پێشەوایان ئەبوداود و نسائی و بیهقی گێڕاویانەتەوە .

وشرب)[1] واتا: ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژە سپیەکانی ئەو مانگە- أيام التشريق - جەژنی ئێمەن ئەی گەلی موسڵمان، وە ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن. جا ڕۆژی عەرەفە یەکێکە لەو جەژنانەی کە چەندین موژدەو خۆشی تێدایە بۆ موسڵمانان، بەشێوەیەك هەر یەکێك لەو موژدانە بۆخۆی جەژنێکە، ئەوانەی خوارەوە بەشێکن لەو موژدانە:

١- ڕۆژی عەرەفە جەژنی ڕزگار بونە لە ئاگر،خاتو عائیشە رضي الله عنها دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی:(ما مِن يومٍ أكثَرَ مِن أن يعتقَ الله فيهِ عبداً مِن النارِ مِن يوم عرفة)[2] واتا: هیچ ڕۆژێك نیە خودای گەورە زیاتر بەندەکانی لە ئاگر ڕزگار بکات لە ڕۆژی عەرەفە.

٢- ڕۆژی عەرەفە جەژنی لێخۆشبون و سڕینەوەی تاوانە. گەورەمان ابی قتادە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەفەرموێت: (صِيامُ يَومِ عَرفةَ إني أحتَسبُ عَلى اللهِ أنْ يُكَفِّرَ السَّنةَ التي قَبلَهُ وَالسَّنةَ التي بَعدَهُ)[3] واتا: ڕۆژی عەرەفە وای ئەژمار دەکەم لەسەر خودای گەورە کە بە هۆیەوە لە تاوانی ساڵی ڕابردوو داهاتوو خۆشبێت .

٣- ڕۆژی عەرەفە جەژنی گیرابونی حەجی حاجیانی ماڵی خودایە . گەورەمان عبدالرحمان ی کوڕی یەعمەر رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەر ﷺ فەرمویەت:(الحج عرفة)[4] واتا: وەستان لە عەرەفە یەکسانە بە تەواویەتی حەج .

٤- ڕۆژی عەرەفە جەژنی شانازی خودایە بە بەندەکانیەوە بەسەر فریشتەکانیدا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: (إنَّ اللهَ يُباهي بأهل عرفات أهل السماء)[5] واتـــــا: بەڕاستی

١- پێشەوایان أبو داود و نسائي و گێڕاویانەتەوە .

٢- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە

٣- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە

٤- پێشەوایان ترمذي و نسائي و دارالقطني و بيهقي و گێڕاویانەتەوە .

٥- پێشەوا أحمد بە سەنەدێکی صحيح گێڕاویەتەوە .

خودای گەورە جل جلاله شانازی دەکات بە خەڵکی عەرەفاتەوە بەسەر خەڵکی ئاسمان.

٥- ڕۆژی عەرەفە جەژنی تورە کردن و بچوککردن و بێ ڕێزکردنی شەیطانەعلیه اللعنة. گەورەمان طلعه ی کوڕی عبدالله رضي الله عنه لە پێغەمبەرەوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (ماروئي الشيطان يوماً هو فيه أصغر ولا أدحر ولا أحقر ولا أغيظ منه في يوم عرفة، وما ذاك إلا لما رأى من تنزيل الرحمة وتجاوز الله عن الذنوب العظيم ألا ما أرئي يوم بدرٍ قيل: وما رأى يوم بدرٍ يارسول الله؟ قال: أما إنه قد رأى جبريل يزع الملائكة)[1] واتا: هیچ ڕۆژێك نەبینراوە شەیطان تیایدا بچوکترو کەمتر و ڕیسواترو تورەتر بێت لە ڕۆژی عەرەفە، ئەوەش تەنها لەبەر ئەوەیە کە دەبینێت ڕەحمەتی خودا دادەبەزێت و خودای باڵا لە تاوانی گەورە خۆش دەبێت. تەنها ئەوە نەبێت کە لە ڕۆژی بەدری بینی، گوتیان: چی بینی ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟ فەرمووی: بێگومان لە ڕۆژی بەدر شەیطان جبرائیلی فریشتەکانی هاندەداو دەیجولاندن.

لەم فەرمودەی ڕابردوو بۆمان دەرکەوت کە ڕۆژی عەرفە : هەم جەژنی حاجیانی ماڵی خودایە " وە هەم ڕۆژی خۆشی موسڵمانانە بە گشتی بەوەی هەر کەسێك لەم ڕۆژەدا بە ڕۆژو بێت بەڵێننامەی لێخۆشبونی تاوانی دوو ساڵی پێدەدرێت .

## ئادابەکانی ڕۆژی عەرەفە

ڕۆژی عەرەفە چەند ئادابێکی هەیە پێویستە مرۆڤی موسڵمان ڕەچاویان بکات لەوانە:

ئادابی یەکەم/ ئەم ڕۆژە جەژنی حاجیانی ماڵی خودایە بۆیە پێویستە لەم ڕۆژەدا خۆشحاڵی و شادی و دڵخۆشی دەربڕن و (تکبیرو تلبیه) ألله أكبر ولبيك اللهم لبيك...) بڵێن. پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (يَومُ عَرَفَـــةَ وَيومَ النَّحرِ وَأيامُ مِنَى عِيدُنا أَهلَ الإسلامِ)[2] واتا: ڕۆژی

١- پێشەوا مال لە (موطا)دا گێڕاویەتەوە.

٢- پێشەوایان ابوداود و نسائي و ابن ماجه و ترمذی گێڕاویانەتەوە و ترمذی دەفەرموێت: صحيح.

عەرەفەو ڕۆژی قوربان و ڕۆژەکانی مینا جەژنی ئێمەن ئەی خەڵکی موسڵمان.

ئادابی دووەم/ ڕۆژی زیکرو یادی خودایە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت: (فَأكثِروا فيهنَّ مِن التحميدِ والتكبيرِ والتهليلِ)[1] واتا: لەم دە ڕۆژەدا زۆر (الحمدلله و الله أكبر لا إله إلا الله) بڵێن.

ئادابی سێیەم/ ڕۆژو گرتن بۆ جگە لە حاجیانی ماڵی خودا لەو ڕۆژەدا سوننەتە، ئەبی قتادە رضي الله عنه دەفەرموێت: پرسیار لە پێغەمبەری خودا ﷺ کـــرا دەربارەی ڕۆژوی ڕۆژی عەرەفە؟ فەرمووی: (يُكفِّروا السَّنة الماضية و الباقية)[2] واتا: دەبێتە هۆی سڕینەوەی تاوانی ساڵێکی ڕابردوو ساڵێکی داهاتو. بەڵام بۆ ئەو کەسەی چوتە حەج نا پەسەندە بەڕۆژوبێت چونکە ڕۆژی جەژنە بۆ ئەو، وە پێغەمبەریش ﷺ نکۆڵی کردووە لە بەڕۆژو بونی ئەم ڕۆژە بۆ حاجیان. گەورەمان ابو هریرە رضي الله عنه دەفەرموێت: (أنَّ رَسول اللهِ ﷺ نَهى عَن صومِ يومِ عرفَةَ بِعرفَةَ)[3] واتا: پێغەمبەری خودا ﷺ نکۆڵی کردووە لە بەڕۆژو بونی ڕۆژی عەرەفە لە عەرەفات.

ئادابی چوارەم/ ڕۆژی عەرەفە ڕۆژی سوپاسگوزاریە" پێویستە مرۆڤی موسڵمان لەم ڕۆژەدا سوپاسی خودا بکات لەسەر ئەوەی لەم ڕۆژەدا خودای بەرزو بەتوانا ئاینی ئیسلامی تەواوکردووە. گەورەمان عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه دە فەرموێت: پیاوێکی جولەکە گوتی: يا أَميرَ المؤمنين آيةٌ فِي كِتابِكُم تَقرَؤُنَها، لَوعَلَينا مَعشر الْيَهودِ نَزَلت لَاتَّخَذنا ذلِكَ الْيومِ عِيداً قَالَ: أَي آيةٍ قَال: ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ وَأَتۡمَمۡتُ عَلَيۡكُمۡ نِعۡمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ ٱلۡإِسۡلَٰمَ دِينٗا﴾[4] واتا: ئەی فەرمان ڕەوای بڕواداران ئایەتێك هەیە لە قورئانەکەی ئێوەدا دەیخوێننەوە،ئەگەر ئەو ئایەتە

١ـ پێشەوا احمد بەسەنەدێکی صحیح گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە .

٣ـ پێشەوایان أبوداو و بیهقی گێڕاویانەتەوە.

٤ـ المائدە : ٣

بەسەر ئێمەی جولەکەدا دابەزیبایە ئەو ڕۆژەمان دەکرد بەجەژن. فەرمووی: کام ئایەت؟ گوتی ئەم ئایەتە ﴿ٱلۡيَوۡمَ أَكۡمَلۡتُ لَكُمۡ دِينَكُمۡ ...﴾ قَال عُمر: قَد عَرفنا ذلِكَ اليومِ الذي نَزَلَتْ فِيهِ عَلَى النَّبيِﷺ وَهُو قَائِم بعرفةَ يوم الجمعة)[1] واتا: ئێمە زانیومانە ئەو ڕۆژەی ئەم ئایەتەی تێدا دابەزی ڕۆژی جومعە بوو و پێغەمبەرﷺ لە عەرەفات وەستابوو.

ئادابی پێنجەم/ نزاو پاڕانەوە لەم ڕۆژەدا زۆر خێرەو گیرایە، عەمری کوڕی شعیب لە باوکیەوە ئەویش لە باپیریەوە دەفەرموێت: پێغەمبەرﷺ فەرموویەتی: (خَيْرُ الدُّعاءِ دُعاءُ يَومِ عَرَفَةَ)[2] واتا: باشترین دووعاو پاڕانەوە دووعاو پاڕانەوەی ڕۆژی عەرەفەیە .

ئادابی شەشەم/ ڕاوەستان لـــە عەرەفە بۆ حاجیانی مـــاڵی خودا پێغەمبەری بەڕێزﷺ دەفەرمووێت: (الحجُّ عَرفَةُ)[3] حەج بریتیە لەعەرەفە، کەواتا: هەر کەسێك بە فریای وەستانی عەرەفات نەکەو دەبێت ئیحرام بە حەج بشکێنێت و دەست بکات بە ئەرکەکانی عومرە.

ئادابی حەوتەم/ کۆبونەوە لە مزگەوتەکاندا بۆ زیکرو دووعاو وەرگرتنی پەندو ئامۆژگاری. ئەوەش بۆ جگە لە حاجیان. پێشەوا شعبی لە قتادە ئەویش لە حەسەنی بەصریرحمه الله گێڕاوەتەوە کە گەورەمان ابن عباسرضي الله عنهما لەڕۆژی عەرەفەدا موسڵمانانی لە مزگەوتی بەصرەدا کۆکردۆتەوە.

وە موسای کوڕی أبی عائیشەرضي الله عنها دەفەرمووێت: عمری کوڕی حەریـــم بینیرضي الله عنه لە ڕۆژی عەرەفەدا خەڵکی لە دەوری کۆببونەوە و ووتاری بۆ دەدان [4].

ئەثرەم دەفەرمووێت: پرسیـــارم لە أحمدی کوڕی حنبل کرد دەربـــارەی کۆبونەوەی خەڵکی لە

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە و (حسن)ە.

٣ـ پێشەوایان ترمذی و نسائی گێڕاویانەتەوە.

٤ـ المغني: ١٢٩/٢

مزگەوت لە ڕۆژی عەرەفە؟ فەرمووی: (أَرجو أنْ لا أكونَ بِهِ بَأسٌ قَدْ فَعَلَهُ غَيرٌ واحِدٍ)[1] واتا: پێم وایە هیچ ڕێگریەکی شەرعی نیە چونکە زیاتر لە کەسێك لە پێشینان ـ سلف ـ ئەم کارەیان کردووە .

ئادابی هەشتەم/ پێویستە لەم ڕۆژەدا موسڵمانان هەموو ئەندامەکانی لەشیان لە تاوان بپارێزن. هاوەڵی بەڕێز ابن عباس رضي الله عنهما دە فەرموێت: كانَ فلانٌ رَديفَ رَسولِ اللهِ ﷺ يومَ عَرَفَةَ قال: فَجَعَلَ الْفَتَى يُلاحِظُ النساءَ وَينظُرُ إلَيهِنَّ وَجَعَلَ رَسولُ اللهِ ﷺ يَصرِفُ وَجهَهُ بِيَدِهِ مِنْ خَلفِهِ مِراراً، وَجَعَلَ الْفَتَى يُلاحِظُ إلَيهِنَّ قال: فَقالَ: لَهُ رسولُ اللهِ ﷺ: (ابنَ أَخي إنَّ هذا يَومٌ مَنْ مَلَكَ فِيهِ سَمعُهُ وَبَصَرُهُ وَلِسانَه غُفِرَ لَهُ)[2] واتا: فلان کەس لە پاش پێغەمبەرەوە سەرکەوتبو لە ڕۆژی عەرەفەردا، ئەو گەنجەش سەیری ئافرەتانی دەکرد و لێی دەڕوانین، پێغەمبەری خوداش ﷺ چەند جارێك ڕوی پێدەسوڕاند، بەڵام گەنجەکە هەر بەردەوام بوو لە سەیرکردنیان، پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: ئەی برازای خۆم" بـــەڕاستی ئەمڕۆ ڕۆژێکە هەرکەسێك لەمڕۆدا گوێ و چاو و زمانی لە تاوان بپارێزێت" ئەوە خودای گەورە لە تاوانەکانی دەبورێت.

خوێنەری بەڕێز: ئەوەی ڕابرا گەورەیی وئاداب و سوننەتەکانی دە ڕۆژی سەرەتای مانگی ذی الحجە و ڕۆژی عەرەفەبوو،لە خودای گەورە داواکارین حەجی ماڵی خۆی بەهەمووومان ببەخشێت، وە بێبەشمان نەکات لە خێر و بەخشین و ڕۆژوی ئەم دەڕۆژەوە، وە لەڕۆژی عەرەفەدا لەتاوانەکانمان ببورێت. آمین.

---

١ ـ المغني: ٢/١٢٩

٢ ـ پێشەوا أحمد گێڕاویەتەوە .

# جەژنی قوربانی پیرۆز

# عيد الأضحى المبارك

خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾ وە هەر خودای گەورە دەفەرمووێت:﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾

# جەژنی قوربان (عید الأضحی)

یەکێکی تر لەو جەژنانەی کە فەرموودەی (صحیح) ی پێغەمبەری لەسەرە و موسڵمانان ساڵانە جەژن و خۆشی و شادی تێدا دەگێڕن جەژنی قوربانە، عوقبەی کوڕی عامر رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی:(يَوْمُ عَرَفَةَ وَيَوْمُ النَّحْرِ وَأَيَّامُ التَّشْرِيقِ عِيدُنَا أَهْلَ الْإِسْلَامِ وَهِيَ أَيَّامُ أَكْلٍ وَشُرْبٍ)[1] واتا: ڕۆژی عەرەفەو ڕۆژی قوربان و ڕۆژانی سێی - أيام التشريق - جەژنی ئێمەن ئەی گەلی موسڵمان، وە ئەو ڕۆژانە ڕۆژانی خواردن و خواردنەوەن.

جا ئەم جەژنەش وەك هەر جەژنێکی تر چەندین تایبەتمەندی و ئاداب و سوننەت و ناپەسەندی تایبەت بەخۆی هەیە، بە پشتیوانی خودا تیشکیان دەخەینە سەر.

## گەورەیی و تایبەتمەندیەکانی جەژنی قوربان

١ـ لەبەر گەورەیی ئەم ڕۆژە خودای پەروەردگار سوێندی پێی خواردووە. خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَالْفَجْرِ * وَلَيَالٍ عَشْرٍ﴾[2] واتا: سوێند بە بەرەبەیان، وە سوێند بە دە شەوی سەرەتای مانگی قوربان. گەورەمان جابر رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی: (العشرُ:عَشرُ الأَضحَى)[3] واتا: ئەم دە شەوەی خودا سوێندی پێخواردوون دە شەوی سەرەتای مانگی قوربانن.

٢ـ ئەم ڕۆژە یەکێکە لەو ڕۆژانەی کە تایبەتن بە یادی خوداو ئەنجامدانی جۆرەکانی خواپەرستی. خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَيَذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ فِي أَيَّامٍ مَّعْلُومَاتٍ﴾[4] واتا:

---

١ـ پێشەوایان أبو داود و نسائي و گێڕاویانەتەوە .

٢ـ الفجر: ١-٢

٣ـ پێشەوایان أحمد وحاكم ونسائي بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە

٤ـ الحج: ٢٨

بۆ ئەوەی لەو ڕۆژە دیاریکراوانەدا یادی خودا بکەن و بەردەوام ناوی خودا لەسەر زاریان بێت.

٣ـ ڕۆژەکانی جەژنی قوربان ئەو ڕۆژانەن کە یەکێك لە گەورەترین خواپەرستیەکان و پایەیەك لە پایەکانی ئیسلامی تێدا جێبەجێ دەکرێت کە حەجی ماڵی خودایە، کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەی دەفەرمووێت: (لَيْسَ لِلْحَجَّةِ الْمَبْرُورَةِ ثَوَابٌ إِلَّا الْجَنَّةَ )[1]واتا: حەجی گیرابوو هیچ پاداشتێکی نیە تەنها بەهەشت نەبێت.

٤ـ لە ڕۆژانی جەژندا وەڵامی بانگەوازی خودا و پێغەمبەرەکەی ابراهیم علیه السلام دەدرێتەوە" کە بانگەوازی خەڵکیان کرد بۆ حەج کردن، ﴿وَأَذِّن فِي النَّاسِ بِالْحَجِّ يَأْتُوكَ رِجَالًا وَعَلَى كُلِّ ضَامِرٍ يَأْتِينَ مِن كُلِّ فَجٍّ عَمِيقٍ﴾[2]واتا: ئەی ابراهیم بانگی خەڵکی بکە و جاڕ بدە لە ناویاندا بۆ ئەوەی بێن بۆ حەج، ئەوانیش بە پیادە و بە سورای وشتر و وڵاخیش و لە هەموو ڕێگایەکی دورەوە دێن.

هاوەڵی بەڕێز ابن عباس رضي الله عنهما دەفەرمووێت: کاتێك ابراهیم علیه السلام لە دروستکردنی ماڵی خودا بویەوە، خودای پەروەردگار فەرمانی پێکرد کە بانگەوازی خەڵکی بکات بۆ حەج کردن، پێغەمبەر ابراهیمیش علیه السلام فەرمووی: ئەی پەروەردگاری من ئاخر من دەنگم بەم هەموو خەڵکە ناگات! خودای پەروەردگاریش فەرمووی: (أَذِّنْ وَعَلَيَّ الْإِبلاغ)واتا: تۆ بانگەواز بکە و ڕاگەیاندنیشی لەسەر من، جا إبراهیم چو بۆ سەر کێوی ابوقبس و بانگی خەڵکی کرد بۆ حەج کردن فەرمووی: (ياأَيُّها النّاسُ! إِنَّ اللهَ قَدْ أَمَرَكُم بِحَجِّ هذا الْبَيتِ لِيُثِيبَكُم بِهِ الْجَنَّةَ وَيُجِيرَكُم مِنْ عَذابِ النّارِ، فَحُجُّوا" فَأَجابَهُ مَنْ كانَ فِي أَصلابِ الرِّجالِ وَأَرحامِ النِّساءِ: لَبَّيكَ اللَّهُمَّ لَبَّيكَ! فَمَنْ أَجابَ يَومَئِذٍ حَجَّ عَلى قَدَرِ الْإِجابَةِ" إِنْ أَجابَ مَرَّةً فَمَرَّةً ، وَإِنْ أَجابَ مَرَّتَينِ

---

١ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە.

٢ـ الحج: ٢٧

فَمَرَّتَيْنِ" وَجَرَتِ التَّلْبِيَّةُ عَلى ذلِكَ)[1]واتا: ئەی خەڵکینە بەڕاستی خودای پەروەردگار فەرمانتان پێدەکات حەجی ئەو ماڵەی بکەن، بۆ ئەوەی بەهۆی ئەو حەجەوە بە بەهەشت پاداشتتان بداتەوە و لە دۆزەخ بتانپارێزێت، دەی ئێوەش وەرن و حەج بکەن، جا خەڵکی لە پشتی پیاوان و ناو ڕەحمی ئافرەتانەوە وەڵامیان دایەوە و گووتیان: لە خزمەتت داین ئەی خودای ئێمە ـ لبيك الله لبيك ـ جا هەر کەسێك لەو ڕۆژەدا وەڵامی دابێتەوە ئەوە بە ئەندازەی وەڵامدانەوەکانی حەج دەکات، ئەگەر جارێکی وەڵامدابێتەوە ئەوە حەجێك دەکات، وە ئەگەر دوو جار وەڵامی دابێتەوە ئەوە دوو حەج دەکات، وە گوتنی (لبيك اللهم لبيك)یش لەوەوە سەرچاوەی گرتووە.

٥ـ کردەوەی چاکە لەم ڕۆژەدا زۆر گەورەو خۆشەویستە لای خودای پەروەردگار، چونکە یەکەم ڕۆژی جەژنی قوربان دەکەوێتە دە ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربانەوە، پێغەمبەری خۆشەویستیشﷺ دەربارەیان فەرموویەتی: (ما مِن أيام فيهنَّ العملُ أحبُّ إلى اللهِ عزَّ وَجَلَّ مِن أيام العشرِ) قيل: يارسول الله ولا الجهاد في سبيل الله ؟ قال: (وَلا الجهادُ في سبيلِ الله إلا رجل جَاهد في سبيلِ الله بمالِهِ ونفسه فَلم يرجع مِن ذلِك شيء)[2] واتا: هیچ ڕۆژێك نیە کردەوەی چاك تیایدا خۆشەویستتربێت لەلای خودای گەورە جل جلاله لە دە ڕۆژی سەرەتای مانگی قوربان، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ هەتا غەزاکردنیش لە پێناوی خودادا ئەوەندە خێری نیەو خۆشەویست نیە؟ فەرمووی: هەتا غەزاکردنیش لە پێناوی خودادا ئەوەندە خێری نیەو خۆشەویست نیە، تەنها پیاوێك نەبێت کە بە خۆی و ماڵیەوە لە پێناوی خودادا بجەنگێت و بۆخۆشی شەهید ببێت و ماڵەکەشی نەگەڕێتەوە.

٦ـ لەم ڕۆژەدا حاجیان سەفاو مەڕوا دەکەن، ئەم سەفاو مەڕوایەش یادکردنەوەی

١ـ جامع الأحكام القرآن: ٣٧/١٢

٢ـ پێشەوایان بوخاری و ترمذی و ابن ماجەو أحمد گێڕاویانەتەوە .

بەمتمانەترین ئافرەت بە خودایەکەیەی و گوێڕایەڵترین ئافرەت بۆ هاوسەرەکەی و بەسۆزترین دایکە بۆ ڕۆڵەکەی، کە خاتوو هاجەرەیە!! ئافرەتێکە پڕ لە متمانە بەخودا،کاتێك ابراهیم علیه السلام هاجەرەی لەگەڵ منداڵە جگەر گۆشەکەیدا بەجێهێشت لە چوڵەوانیدا، ئیبراهیم ڕۆیشت و ئاوڕی نەدایەوە، هاجەرە چەند جارێك بانگی کرد و لێی پرسی: هۆ ئیبراهیم بۆ جێمان دەهێڵیت؟ بەڵام ئیبراهیم علیه السلام وەڵامی نەدایەوە، جاری کۆتایی پرسی: ئەی ئیبراهیم ئەو جێهێشتنەمان بە فەرمانی خودایە؟ ئیبراهیمیش فەرمووی: بەڵێ بە فەرمانی خودایە، هاجەرەش فەرمووی: دەی من دڵنیام کە خودا ئێمە لەدەست نادات!! سبحان الله!! لەو متمانە بونە بە خودا!! بەڵی خودای گەورە بە هەدەری نەدان، بەڵکو ناوی بەرز کردنەوە، کردەوەکانی کردن بە یەکێك لە ڕوکنەکانی حەج و ساڵانە ملیۆنەها موسڵمان یادیان دەکاتەوە، چونکە ابن عەبباس رضي الله عنهما دەفەرموێت:کاتێك هاجەرە ئەو ئاوو نانەی لێبڕا کە ئیبراهیم بۆی بەجێهێشتبوون، سەیری منداڵەکەی کرد لە برسان دەتلایەوە،ئەویش حەزی نەکرد بەو شێوەیە سەیری منداڵەکەی بکات، لەبەر ئەوە چو بۆ سەر بەرزایی سەفا کەلێوەی نزیك بوو، بۆ ئەوەی براونێت ئاخۆ کەسی لێوە دیارە، وە یاخود هیچ خواردن و خواردنەوەیەك پەیدا ناکات، بەڵام کەس دیار نەبوو، پاشان چو بۆ سەر کێوی مەروا بۆ هەمان مەبەست، بەڵام هەر هیچ دیار نەبوو، جا ئەم هاتوچۆیەی لە نێوانی سەفا و مەروەدا حەوت جاران دووبارە کردەوە، پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: (فَذلكَ سَعيُ النَّاسِ بينَهُما)[1] واتا:هاتوچۆی خەڵکی لە نێوانی سەفاو مەروەدا لەوەوە سەرچاوەی گرتووە

٧ـ ڕۆژی جەژنی قوربان" ڕۆژی ڕیسواکردنی شەیتانە. چونکە لەو ڕۆژەدا ملیۆنەها موسڵمان سوننەتی پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام و پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ ئەنجامدەدات و ڕەجمی شەیتانەکان دەکەن، ئەو ڕەجمکردنانەش هەمووی سوك و ڕیسواکردنی شەیتانە.

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

٨ـ قوربانی کردن. یەکێکی تر لە تایبەتمەندیەکانی ڕۆژی جەژنی قوربان بریتیە لە قوربانی کردن. جا قوربانی کردن سوننەتێکی زۆر جەخت لەسەر کراوـ مؤکد ـ یە، و یادکردنەوەی قوربانی دانی ابراهیمە علیه السلام بە جگەر گۆشەکەی، خودای گەورە فەرمانی بە پێغەمبەرەکەی کردووە قوربانی بکات و دەفەرمووێت:﴿فَصَلِّ لِرَبِّكَ وَانْحَرْ﴾[1]واتا: ئەی پێغەمبەرﷺ بۆ ڕەزامەندی خودا نوێژ بکەو قوربانی بکە. وە خودای پەروەردگار قوربانی کردنی بە یەکێك لە دروشمەکانی خۆی ناو بردووە و دەفەرمووێت: ﴿وَالْبُدْنَ جَعَلْنَاهَا لَكُم مِّن شَعَائِرِ اللَّهِ لَكُمْ فِيهَا خَيْرٌ فَاذْكُرُوا اسْمَ اللَّهِ عَلَيْهَا صَوَافَّ﴾[2]واتا: سەر بڕینی قوربانیە دابەستەکانمان کردووە بە یەکێك لە دروشمەکانی خودا، کە خێری زۆری تێدایە بۆ ئێوە، دەی ئێوەش ناوی خودا بهێنن لە کاتی سەر بڕینیداو بڵێن: (بسم الله، الله أکبر...) وە پێغەمبەری خوداﷺ زۆر باسی گەورەیی و خێری قوربانی کردووە، عیمرانی کوڕی حصینرضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺبە فاطمەی رضي الله عنها فەرموو:(يا فاطِمةُ قومِي فاشهَدى إلى أضحيَتِكِ، فإنَّهُ يُغفَرُ لكِ بأوَّلِ قطرَةٍ تقطُرُ مِن دَمِها كُلُّ ذنبٍ عملته)[3]واتا: ئەی فاطمة رضي الله عنها هەستە بڕۆ بۆ لای قوربانیەکەت، چونکە لەگەڵ یەکەم دڵۆپە خوێن کەلێی دەتکێت خودای گەورە لە هەموو ئەو تاوانانەت خۆشدەبێت کە ئەنجامت داون. وە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ نکوڵی لەهاتنی ئەو کەسانە کردووە بۆ مزگەوت" کە تواناییان هەیە و قوربانی ناکەن و فەرموویەتی: (مَنْ وَجَدَ السَّعَةَ فَلَم يَذبح" فلا يُقرَبَنَّ مُصلانا)[4]واتا: هەر کەسێك توانای هەیە و قوربانی ناکات" ئەوە با لە جێگای نوێژکرنی جەژنمان نزیك نەکەوێتەوە.

---

١ـ الكوثر: ٢

٢ـ الحج: ٣٦

٣ـ پێشەوا حاکم گێڕاویەتەوە.

٤ـ پێشەوا ابن ماجه و احمد و حاکم گێڕاویانەتەوە و (حسن)

# مەرجەکانی قوربانی

أـ پێویستە ئەو کەوسەی قوربانی دەکات خۆی خاوەنی ماڵاتی قوربانیەکە بێت، وە یان کەسێك بە دیاری بیداتێ" بەواتای ئەوەی نابێت ماڵاتی قوربانیەکە داگیرکراو و دزراو و بەدەستهێنراوبێت بە بیانوی پوچ و لە ڕێگای حەرامدا.

ب ـ پێویستە ئاژەڵی قوربانیەکە لەو جۆرە ئاژەڵانە بێت کە لە شەرعدا دیاریکراون بۆ قوربانی، کە بریتین لە: حوشتر و گاو مانگا و مەڕو بزن.

ت ـ پێویستە ئەو ئاژەڵەی دەکرێتە قوربانی ساڵی شەرعی تەواو کردبێت، بەواتای: حوشتر پێنج ساڵی تەواو کردبێت، وە مانگاو بزن دوو ساڵی تەواو کردبێت، وە مەڕیش ساڵێکی تەواوکردبێت، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (لاَ تَذْبَحُوا إِلاَّ مُسِنَّةً" إِلاَّ أَنْ يَعْسُرَ عَلَيْكُمْ فَتَذْبَحُوا جَذَعَةً مِنَ الضَّأْنِ)[1] واتا: بۆ قوربانی جگە لە ئاژەڵی ساڵ تەواو (مسنة) سەر مەبڕن، مەگەر دەستتان نەکەوێت، ئەوکات مەڕێکی ددان کەوتووی لە ساڵێك بچوکتر سەربڕن.

ث ـ پێویستە ئەو ئاژەڵەی کە دەکرێتە قوربانی سەلامەت بێت لە هەر عەیبێك کە گۆشتی کەم کردبێت، بەڕاڕاتی کوڕی عازبرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( أَرْبَعٌ لا تَجُوزُ فِي الْأَضاحِي ـ وفِي رواية: لا تُجزِئُ ـ: العَوراءُ البَيِّنُ عَوَرُها، وَالْمَرِيضَةُ الْبَيِّنُ مَرَضُها، وَالْعَرجاءُ الْبَيِّنُ ظَلَعُها، وَالْكَسِيرُ الّتِي لا تُنقِي)[2] واتا: چوار جۆر ئاژەڵ بۆ قوربانی ناشێن: ئەو ئاژەڵەی بە ئاشکرا چاوێکی کوێرە، ئەوەی بە ئاشکرایی نەخۆشە، ئەوەی بە ئاشکرایی دەشەلێت، وە ئەوەشی کە مێشکی نەماوە. وە جگە لەمانەش بەهەمان شێوە هەر ئاژەڵێك بەشێکی گوێی یان بەشێکی زمانی یان بەشێکی دونگی یان بەشێکی گوانی، یان

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان ابوداود و ترمذی و ابن ماجە و نسائی بە سەنەدێکی(صحيح) گێڕاویانەتەوە.

بەشێکی کلکی لێکراوەتەوە، وە یان هەر لەزگمانگدا گوێی نەبن ئەوەش هەر دروست نیە بۆ قوربانی.

ج ـ پێویستە کاتی دیاریکراوی سەربڕینی قوربانی هاتبێت" کە دوای بەرزبونەوەی خۆر بە ئەندازەی ڕمێك و ئەنجامدانی نوێژوو ووتاری جەژنە. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (إنَّ أَوَّلَ مَا نَبْدَأُ بِهِ فِي يَوْمِنَا هَذَا أَنْ نُصَلِّيَ، ثُمَّ نَرْجِعَ فَنَنْحَرَ، مَنْ فَعَلَهُ فَقَدْ أَصَابَ سُنَّتَنَا، وَمَنْ ذَبَحَ قَبْلَ فَإِنَّمَا هُوَ لَحْمٌ قَدَّمَهُ لأَهْلِهِ لَيْسَ مِنَ النُّسُكِ فِي شَيْءٍ)[1]واتا: یەکەم شتێك کە ئەمرۆدا ـ ڕۆژی جەژن ـ دا ئەنجامی دەدەین نوێژی جەژنە، پاشان دەچینەوە بۆ ماڵەوەو قوربانیەکانمان سەردەبڕین، جا هەر کەسێك بەم شێوە بکات ئەوە سوننەتی ئێمەی جێبەجێ کردووە، وە هەر کەسێکیش پێش نوێژی جەژن قوربانیەکەی سەربڕیبێت" ئەوە گۆشتێك بووە داویەتی بە ماڵ و خێزانی و بەبەر قوربانی نەکەوتووە.

ح ـ نیەتهێنان. هیچ کردەوەیەکی ئادەمیزاد گیرا نابێت بەبێ نیەتهێنان، پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ فەرموویەتی: (إنَّما الأعمالُ بالنِّيَّاتِ)[2]واتا: بنچینەی گیرا بوونی هەر کارو عیبادەتێك نیەتهێنانە، وە هەر لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوداﷺ لە کاتی قوربانیدا نیەتی هێناوە،گەورەمان ئەبوهریرە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەفەرموێت:(كانَ رسولُ اللهِﷺيَضَحِّي بِكَبْشينِ أقرنينِ مُوصيين فَيبدَأُ بِأَحَدِيهِما فَيَقُولُ:بِسمِ اللهِ واللهُ أكبَرُاللهُمَّ مِنكَ وَلَكَ عَن مُحَمَّدٍ وأُمَّتِهِ مَنْ شَهِدَ لكَ بِالتوحيدِ وشهِدَ لى بالبلاغِ )[3]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ دوو بەرانی بەڵەکی- سپی و ڕەش ـ شاخداری خەسێنراوی کردنە قوربانی، یەکێکیانی هێنا و فەرمووی: بەناوی خـــودا، ئـــەو خودایـــەی کە لەهەموو

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٣ـ پێشەوایان ابن ماجەو احمد گێڕاویانەتەوە.

شتێك گەورەترە، خودایە ئەم بەرانە تۆ پێتداوم و بۆ تۆشی سەردەبڕم لە بری محمد و هەر کەسێك لە ئوممەتەکەی کە شاهیدی بدات تۆ تاك و تەنیای و شاهیدیش بدات کەمن پەیامەکەم گەیاندووە .

جا ئەمانەی ڕابران چەند مەرجێك بوون بۆ دروستبونی قوربانی، بەواتای هەر قوربانیەك یەکێك لەو مەرجانەی تێدا نەیەتەجێ" ئەوە دروست نابێت.[1]

# سوننەتەکانی قوربانی

١ـ سوننەتە ئەو کەسەی قوربانی دەکات لە دە ڕۆژی سەرەتای مانگی قورباندا هیچ موویەك لە خۆی نەکاتەوەو نینۆکی نەکات هەتا قوربانیەکەی سەر دەبڕێت. پێغەمبەری ئازیزﷺ فەرموویەتی: (من كان لَهُ ذبحٌ يَذبَحُهُ فإذا أُهِلَ هلالُ ذی الحجةِ فلا يأخُذَنَّ مِن شَعرِهِ ولا مِنْ أظفارِهِ شيئاً حتى يُضَحِيَ)[2] واتا: هەر کەسێك بە نیازە قوربانی بکات" ئەوە هەر کاتێك مانگی قوربان دەرکەوت با نە هیچ مویەکی لاشەی لاببات و نە نینۆکیشی بکات هەتا قوربانیەکەی سەر دەبڕێت.

٢ـ سوننەتە ئەو کەسەی ئاژەڵەکە سەردەبڕێت ڕوەو قیبلە و لەسەر لای چەپ ڕاییخات و پێی بخاتە سەر لای ڕاستی ئەستۆی ئاژەڵەکە، گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالكرضي الله عنه دەفەرموێت:(ضَحَّى النَّبِيُّﷺبِكَبْشَيْنِ أَمْلَحَيْنِ أَقْرَنَيْنِ ذَبَحَهُمَا بِيَدِهِ وَسَمَّى وَكَبَّرَ وَوَضَعَ رِجْلَهُ عَلَى صِفَاحِهِمَا)[3]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ دوو بەرانی شۆڕی شاخداری کردنە قوربانی، بەدەستی خۆی سەری بڕین و(بسم الله، والله أكبر)ی گوتن و پێی خۆی خستە سەر لای ڕاستی

١ـ بڕوانە بۆ (المجموع شرح المهذب: ٨/٢٨٠و٢٨٦و٢٩٢) ئەم بابەتە بەدرێژی شیکراوەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

ئەستۆی بەرانەکان.

٣ـ سوننەتە ئەو کەسەی قوربانی دەکات بۆ خۆی سەری ببڕێت، چونکە هەروەك لە فەرموودەکەی ڕابردودا باسمان کرد پێغەمبەری خوداﷺ بۆخۆی قوربانیەکەی سەر بڕیوە، وە ئەگەر نەشیتوانی بۆ خۆی سەری ببڕێت" ئەوە سوننەتە لەکاتی سەربڕینی قوربانیەکە ئامادەبێت، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بە خاتوو فاطمەی رضي الله عنها فەرموو:(يا فاطِمةُ قُومِي فَاشهَدِي إلِى أُضحِيَتِكِ...)[1] واتا: ئەی فاطمة بچۆ بۆ لای قوربانیەکەت و لەکاتی سەربڕینی ئامادەبە..

٤ـ سوننەتە ئەو کەسەی قوربانیەکە سەردەبڕێت بەر لەسەربڕینی قوربانیەکە دووعای کردنەوەی نوێژ بخوێنێت: (وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وما أنا من الْمُشْرِكِينَ، إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ له وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وأنا من الْمُسْلِمِينَ)[2] وە ئینجا بڵێت: (بِسمِ اللهِ،والله أكبَر،أللَّهُمَّ مِنكَ ولَكَ، اللهُمَّ تَقَبَّل مِني)[3] پاشان قوربانیەکەی سەر ببڕێت.

٥ـ سوننەتە قوربانیەکەی بکات بە سێ بەشەوە: بەشێکی بۆ خۆی و ماڵ و خێزانی، وە بەشێکی بکات بە خێر، وە بەشێکی تریشی بکات بە دیاری. خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَكُلُوا مِنْهَا وَأَطْعِمُوا الْقَانِعَ وَالْمُعْتَرَّ﴾[4]واتا: کاتێك سەرتان بڕین و پاکتان کردنەوە، ئەوە لێیان بخۆن و لێشی بدەن بە هەژاران و سوالکەران.وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (وَيُطْعِمُ

١ـ پێشەوا حاکم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا ابوداود بەسەنەدێکی صالح گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٤ـ الحج: ٣٦

أَهْلَ بَيْتِهِ الثُلُثَ، وَيُطْعِمُ فُقَرَاءَ جِيرَانِهِ الثُلُثَ، وَيَتَصَدَّقُ عَلَى السُّؤَّالِ بِالثُّلُثِ)[1] واتا: سێ یەکی بۆ ماڵ و خێزانتان بگێڕنەوە، وە سێ یەکی لێبدەن بە هەژارە دراوسێکانتان، وە بەشەکەی تریشی لێبدەن بە سوالکەران و هەژارانی دوور.

٦ـ سوننەتە ئەو کەسەی قوربانی دەکات بۆ خۆی لە قوربانیەکەی بخوات، چونکە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرمانی پێکردووین لە قوربانیەکانمان بخۆین، وە بۆخۆشی لێیخواردووە.

# کارو کردەوە حەرام و ناپەسەندەکانی قوربانی

١ـ حەرامە هەرکەسێك توانای هەبێت و قوربانی نەکات. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (على كلِّ أهلِ بَيتٍ فِي كُلِّ عامٍ أُضحاةٌ)[2] واتا: لەسەر هەر تاکێکی خێزان پێویستە ئەگەر توانای هەبوو هەمو ساڵێك قوربانی بکات. وە لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خوداﷺ نکوڵی کردووە لەو کەسانەی کەتواناپان هەیەو قوربانی ناکەن بێنە جێگای نوێژی جەژن و مزگەوت.[3]

٢ـ ناپەسەندە بۆ ئەو کەسەی قوربانی دەکات لە دە ڕۆژی سەرەتای مانگی قورباندا موەکانی لاشەی ببڕێت و نینۆکەکانی بکات.

٣ـ بەهیچ شێوەیەك نابێت هیچ بەشێك لە قوربانیەکە بفرۆشرێت، یان لە بری کرێی سەربڕین قوربانیەکە بدرێت بە قەصاب، پێشەوا علی کوڕی ابی طالبرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرموێت: (أَمَرَنِي رَسُولُ الله ﷺأَنْ أَقُومَ عَلَى بُدْنِهِ، وَأَنْ أَتَصَدَّقَ بِلَحْمِهَا وَجُلُودِهَا وَأَجِلَّتِهَا، وَأَنْ لاَ أُعْطِيَ الجَزَّارَ مِنْهَا.

---

١ـ پێشەوا ابو موسای أصفهانی گێڕاویەتەوە و دەفەرموێت: (حسن) وە ابن قدامەش لە (مغنی) دا باسیکردووە.

٢ـ پێشەوا النسائی گێڕاویەتەوە، وە ترمذی دەفەرموێت: (حسن غریب)

٣ـ پێشەوا ابن ماجە و احمد و حاکم گێڕاویانەتەوە و (حسن)

قَالَ:نَحْنُ نُعْطِيهِ مِنْ عِنْدِنَا)[1] واتا:پێغەمبەری خوداﷺفەرمانی پێکردم بچم لەسەر قوربانیەکەی ئامادەبم، وە گۆشت و پێست و ئەوەی کە بەسەر پشتیەوەیەتی هەمووی بکەم بەخێر، وە هیچی نێنەدەم بە قەصابەکە، فەرمووی: بەڵکو خۆمان کرێی قەصابەکە دەدەین.

جا ئەمەی ڕابرا مەرج و سوننەت و کارو کردەوە ناپەسەندەکانی قوربانی بوو، تۆی موسڵمان هەوڵبدە بەتەواوی مەرج و سوننەتەکانەوەو خۆپاراستن لە کارو کردەوە حەرام و ناپەسەندەکان قوربانیەکەت ئەنجام بدەی، چونکە قوربانی کردن لە ڕۆژی جەژندا خۆشەویستترین کردەوەیە لای خودای پەروەردگار، تۆش ئەو کردەوە خۆشەویستە بە باشترین شێوە پێشکەشی خودا بکە، پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرموویەتی: (مَا عَمِلَ ابْنُ آدَمَ يَوْمَ النَّحْرِ عَمَلًا أَحَبَّ إِلَى اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ هِرَاقَةِ دَمٍ وَإِنَّهُ لَيَأْتِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ بِقُرُونِهَا وَأَظْلَافِهَا وَأَشْعَارِهَا وَإِنَّ الدَّمَ لَيَقَعُ مِنْ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ بِمَكَانٍ قَبْلَ أَنْ يَقَعَ عَلَى الْأَرْضِ فَطِيبُوا بِهَا نَفْسًا)[2] واتا: ئادەمیزاد لە ڕۆژی جەژنی قورباندا هیچ کردەوەیەك ناکات خۆشەویستتر بێت لای خودای گەورە لە خوێن ڕژاندن ـ قوربانی کردن ـ وە بێگومان ئەو قوربانیە لە ڕۆژی قیامەتدا بە شاخەکانیەوە و بە ئێسقان موەکانیەوە دێت دەبێتە شاهید، وە بەڕاستی خوێنی قوربانیەکە بەر لەوەی بکەوێتە سەر زەوی لەلای خودا جێی خۆی دەگرێت، دەی ئێوەش دەرونی خۆتانی پێ ئارام بکەن.

## ئادابەکانی جەژنی قوربان

لە باسی جەژنی ڕەمەزاندا باسی ئادابەکانی جەژنمان کرد، جا ئادابەکانی جەژنی قوربانیش هەمان ئادابەکانی جەژنی ڕەمەزانن، تەنها لە چەند ئادابێکدا جەژنی قوربان لـــــــە

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوایان ترمذی وابن ماجە گێڕاویانەتەوە.

جەژنی ڕەمەزان جیاوازە كە ئەوانەی خوارەوەن:

١ـ لە ڕۆژی جەژنی قوربانادا سوننەتە ئەو كەسەی دەچێت بۆ نوێژی جەژن، پێش چونی هیچ شتێك نەخوات بە پێچەوانەی جەژنی ڕەمەزانەوە. هاوەڵی ڕێزدار بورەیدە رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەفەرمووێت: (أنَّ النبيَّ ﷺ كانَ لا يَخرُجُ يَومَ الْفِطرِ حَتَّى يَطعَمَ، وَلا يَطعَمُ يَومَ النَّحرِ حَتَّى يَنحَرَ)[1] واتا: بێگومان پێغەمبەر ﷺ لە ڕۆژی جەژنی قوربانادا لە ماڵ نەدەچوو دەرەوە هەتا شتێكی نەخواردبا، وە لە ڕۆژی جەژنی قوربانیشدا هیچی نەدەخوارد هەتا قوربانی نەكردبا.

٢ـ سوننەتە ووتاربێژ لە ووتاری جەژنی قوربانادا موسڵمانان هانبدات لەسەر قوربانی كردن و باسی ئادابەكانی قوربانیان بۆ بكات.

٣ـ گووتنی (الله أكبر) لە جەژنی قوربانادا هەتا ئێوارەی ڕۆژی چوارەمی جەژن بەردەوام دەبن، بەپێچەوانەی جەژنی ڕەمەزان كە تەنها ڕۆژی یەكەم دەگووترێن.

خوێنەری بەڕێز: ئەوەی ڕابرا گەورەیی و تایبەتمەندی و ئادابەكانی جەژنی قوربان بوون، لە خودای گەورەداواكارین هەموو ساڵێك بە خێرو خۆشی و تەندروستیەكی باش و لاشەیەكی پڕ لە عیبادەت ئەم جەژنەمان بۆ بگێڕێتەوە. آمین.

❋ ❋ ❋

١ـ پێشەوایان ترمذی و احمد و ابن ماجە گێڕاویانەتەوە، وە ابن حبان بە(صحیح)ی داناوە.

# ڕۆژی جومعە

گەورەمان ابن عباس رَضِيَ اللهُ عَنهُ لە پێغەمبەری ئازیزەوە ﷺ وە بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إِنَّ هَذَا يَوْمُ عِيدٍ جَعَلَهُ اللّهُ لِلْمُسْلِمِينَ، فَمَنْ جَاءَ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ، وَإِنْ كَانَ طِيبٌ فَلْيَمَسَّ مِنْهُ، وَعَلَيْكُمْ بِالسِّوَاكِ)

# ڕۆژی جومعە جەژنی موسڵمانانە

یەکێکی تر لە جەژنەکانی موسڵمانان کە بە فەرموودەی (صحیح)ی پێغەمبەرﷺ بە جەژن ئەژمار کراوە ڕۆژی جومعەیە، گەورەمان ابن عباس رضي الله عنهما لە پێغەمبەری ئازیزەوەﷺوە بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إِنَّ هَذَا يَوْمُ عِيدٍ جَعَلَهُ اللَّهُ لِلْمُسْلِمِينَ ، فَمَنْ جَاءَ إِلَى الْجُمُعَةِ فَلْيَغْتَسِلْ، وَإِنْ كَانَ طِيبٌ فَلْيَمَسَّ مِنْهُ، وَعَلَيْكُمْ بِالسِّوَاكِ)[1] واتا: بەڕاستی ڕۆژی جومعە ڕۆژێکە خودای پەروەردگار کردوویەتی بە جەژنی موسڵمانان، جا هەر کەسێك هات بۆ جومعە با خۆی بشوات، وە ئەگەر بۆنی خۆشی هەبوو با لە خۆی بدات، وە تیایدا سیواك بەکار بهێنن.

جا ڕۆژی جومعە لە ئیسلامدا ڕۆژێکی گەورەیە و چەندین تایبەتمەندی هەیە، ئێمە لێرەدا تیشك دەخەینە سەر تایبەتمەندی و گەورەیی ڕۆژی جومعە و واجبات و سوننەت و کار و کردەوە ناپەسەندەکانی ئەو ڕۆژە.

## گەورەیی و تایبەتمەندیەکانی ڕۆژی جومعە

خودای پەروەردگار بە چەندین تایبەتمەندی ڕێزی لە ڕۆژی جومعە ناوە، وە پێغەمبەری خۆشەویست لە چەندین فەرموودەدا باسی گەورەییەکانی ڕۆژی جومعەی کردووە، ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لە تایبەتمەندی و گەورەییەکانی ڕۆژی جومعە:

١ـ ڕۆژی جومعە گەورەترین و چاکترین ڕۆژی ساڵە: گەورەمان ابوهریرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (خَيْرُ يَوْمٍ طَلَعَتْ عَلَيْهِ الشَّمْسُ يَوْمُ الْجُمُعَةِ)[2] واتا: باشترین ڕۆژ کە خۆری بەسەردا هەڵدێت ڕۆژی جومعەیە. وە لە فەرموودەیەکی تـــــردا

١ـ پێشەوایان ابن ماجە و ترمذی و احمد گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

پێغەمبەری ڕێزدارﷺفەرموویەتی: (سَيِّدُ الْأَيَّامِ يَوْمُ الْجُمُعَةِ وَأَعْظَمُهَا عِنْدَهُ وَأَعْظَمُ عِنْدَ اللَّهِ عَزَّ وَجَلَّ مِنْ يَوْمِ الْفِطْرِ وَيَوْمِ الْأَضْحَى)[1]واتا: گەورەترین و ڕێزدارترینی هەموو ڕۆژەکان ڕۆژی جومعەیە، وە ڕۆژی جومعە گەورەترە لای خودای گەورە لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان و ڕۆژی جەژنی قوربان.

٢ـ ڕۆژی جومعە یەکێك لە گەورەترین واجباتەکانی تێدایە کە نوێژی جومعەیە، بە شێوەیەك پێغەمبەری خوداﷺ زۆر جەختیکردوتەوە و پێداگری کردووە لەسەر ئەنجامدانی ئەو نوێژە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَنْ تَرَكَ ثَلاثَ جُمُعَاتٍ مِنْ غَيرِ عُذرٍ كُتِبَ مِنَ الْمُنَافِقِينَ)[2]واتا: هەر کەسێك سێ جومعان بەبێ هیچ بیانویەکی شەرعی بفەوتێنێت" ئەوە لە ڕیزی دووڕوان ناوی دەنوسرێت.

٣ـ لە شەو و ڕۆژی جومعەدا کاتێك هەیە دووعای تێدا ڕەتناکرێتەوە: هاوەڵی بەڕێز ابوهریرەرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (فِي الْجُمُعَةِ سَاعَةٌ لَا يُوَافِقُهَا عَبْدٌ مُسْلِمٌ قَائِمٌ يُصَلِّي فَسَأَلَ اللَّهَ خَيْرًا إِلَّا أَعْطَاهُ)[3]واتا: لە جومعەدا کاتێك هەیە" هەر بەندەیەکی موسڵمان لەو کاتەدا دووعای چاکە بکات و لە خودا بپاڕێتەوە" ئەوە خودای پەروەردگار دووعایەکەی وەردەگرێت و داواکاریەکەی بۆ جێبەجێ دەکات.

پێشەواقاضی عیاض رحمه الله دەفەرموێت: مەبەستی پێغەمبەرﷺ لەوەی کە دەفەرموێت: (قَائِمٌ يُصَلِّي) ئەوەیە کە: ئەو بەندەیە لەو کاتەدا دووعا بکات و پێداگری بکات لە دووعایەکەیدا، بەواتای ئەوەی لێرەدا (صلاة) بە واتای دووعایە.

---

١ـ پێشەوایان شافعی و ابن ابی شیبە و احمد لە (مسند)ەکانیاندا و بوخاری لە تأریخ الکبیردا گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا طبرانی گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

جا زانایان جیاوازن دەربارەی دیاریکردنی ئەو کاتە لە جومعەدا،ابن حجری عەسقەلانی رحمەالله لە (فتح الباري)دا چل و دوو ڕاو ووتەی زانایانی هێناوە دەربارەی دیاریکردنی ئەم کاتە لە ڕۆژی جومعەدا،[1] وە پێشەوا نەوەوی لە شەرحی (صحيح المسلم)دا چەند ڕایەکی زانایانی گێڕاوەتەوە کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

أـ دوای نوێژی عەصر تاکو ڕۆژ ئاوا بوون.

ب ـ کۆتا کاتژمێری ڕۆژی جومعە.

ت ـ لە کاتی دەستپێکردنی نوێژی جومعەوە دەستپێدەکات تا کۆتایی نوێژی جومعە.

ث ـ لە کاتی دانیشتنی ئیمام لەسەر مینبەرەوە دەست پێدەکات هەتا کۆتایی هاتنی نوێژ.

ج ـ لە کاتی دەرچونی إمامەوە دەستپێدەکات هەتا تەواو بوونی نوێژی جومعە.[2]

جا ئەگەر بێت و سەیری ئەم ڕایانە بکەین هەموویان لە دەوری دوو کات هەڵدەسوڕێن کە هەردووکیشیان فەرموودەی (صحيح) ی پێغەمبەریان لەسەرە ئەوانیش بریتین لە:

یەکەم/ لە کاتی دانیشتنی إمام لەسەر مینبەرەوە هەتا تەواوبونی نوێژی جومعە، ابن عمر رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (هِيَ مَا بَيْنَ أَنْ يَجْلِسَ الْإِمَامُ إِلَى أَنْ تُقْضَى الصَّلَاةُ)[3] واتا: ئەو کاتە لە نێوانی دانیشتنی إمام لەسەر مینبەرێ هەتا تەواو بونی نوێژێیە.

دووەم/ لە دوای نوێژی عەصر هەتاخۆرئاوابوون: جابری کوڕی عبدالله رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (فَالْتَمِسُوها آخِرَ ساعَةٍ بَعدَ الْعَصرِ)[4] واتـــا:

---

١ـ فتح الباري: ٢/٥٣٤ـ٥٤١

٢ـ المنهاج شرح صحيح مسلم بن الحجاج: ٦/٣٧٩

٣ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٤ـ پێشەوا ابوداود گێڕاویەتەوە.

ئەوکاتە بەدەست بهێنن لە کۆتایی کاتژمێری ڕۆژدا لە دوای نوێژی عەصر.

٤ـ خودای پەروەردگار لەو ڕۆژەدا باوکی مرۆڤایەتی ئادەمی علیه السلام دروستکردووە، وە هەر ئەو ڕۆژەدا بردویەتە بەهەشت، وە هەر لەو ڕۆژەشدا لەبەهەشت کردویەتە دەرەوە، وە هەر لەو ڕۆژەدا دایبەزاندنووە بۆ زەوی و لەو ڕۆژەشدا گیانی لێوەرگتوتەوەو مردووە. ڕێزدار ابوهریرە ﷺ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (...فِيهِ خُلِقَ آدَمُ وَفِيهِ أُدْخِلَ الْجَنَّةَ وَفِيهِ أُخْرِجَ مِنْهَ)[1] واتا: خودای پەروەردگار لەو ڕۆژەدا ئادەمی دروست کرد، وە هەر لەو ڕۆژەدا بردیە ناو بەهەشتەوە، وە هەر لەو ڕۆژەشدا لە بەهەشت کردیە دەرەوە. وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرموێت: (وأَهْبَطَ فيه آدم إلى الأرض، وفيه توفّى اللهُ آدمَ)[2] واتا: وە لە ڕۆژی جومعەدا خودای پەروەردگار ئادەمی دابەزاند بۆ زەوی، وە هەر لەو ڕۆژەشدا ئادەم کۆچی دوایی کردو مرد.

٥ـ بەخشین و چاکە کردن لەم ڕۆژەدا چەند بەرامبەری ڕۆژانی تر پاداشتی زیاترە، گەورەمان کەعبی کوڕی مالكﷺفەرموویەتی: (وَالصَّدَقَةُ فِيهِ أَعظَمُ مِنَ الصَّدَقَةِ فِي سائِرِ الْأَيَامِ)[3] واتا: چاکە و بەخشین لەو ڕۆژەدا خێر و پاداشتی زیاتر و گەورەترە لە چاکە و بەخشین لە ڕۆژەکانی تردا.

٦ـ ڕۆژی جومعە ڕۆژی پاکبونەوەیە لە تاوان، ابوهریرە ﷺ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (الجُمعةُ إلى الجُمُعةِ كفّارةُ مابَينهُما ما لَم تُغشَ الكبائِرُ)[4] واتا: جومعە بۆ جومعەی کەفارەت و هۆکارە بۆ سڕینەوەی تاوانی نێوانیان، بەو مەرجەی ئەو

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان شافعی و ابن ابی شیبە و احمد لە (مسند)ەکانیاندا و بوخاری لە تأريخ الكبيردا گێڕاویانەتەوە.

٣ـ ئەم فەرموودە (موقوف) لەسەر کعب، بەڵام زانایان دەفەرموون حوکمی(مرفوع)هەیە. بڕوانە (زادالمیعاد: ١/ ٣٨٩)

٤ـ پێشەوا ابن ماجە گێڕاویەتەوە.

كه‌سه‌ تاوانی گه‌وره‌ ئه‌نجام نه‌دات.

٧ـ مردن له‌ ڕۆژی جومعه‌دا نیشانه‌ی عاقیبه‌ت خێریه‌، وه‌ هه‌ر كه‌سێك له‌ شه‌و و ڕۆژی جومعه‌دا بمرێت خودای گه‌وره‌ له‌ سزای ناو گۆڕ ده‌یپارێزێت، گه‌وره‌مان عبدالله ی كوڕی عمر رضي الله عنهما له‌ پێغه‌مبه‌ری ئازیزه‌وه‌ﷺ بۆمان ده‌گێڕێته‌وه‌ كه‌ فه‌رموویه‌تی: (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَمُوتُ يَــوْمَ الجُمُعَةِ أَوْ لَيْلَةَ الْجُمُعَةِ إِلَّا وَقَاهُ اللَّهُ فِتْنَةَ الْقَبْرِ)[1]واتا: هه‌ر موسلمانێك له‌ شه‌و و ڕۆژی جومعه‌دا بمرێت" ئه‌وه‌ خودای په‌روه‌ردگار له‌ تاقیكردنه‌وه‌كان و سزای ناو گۆڕ ده‌یپارێزێت.

٨ـ قیامه‌ت له‌ ڕۆژی جومعه‌دا هه‌ڵده‌ستێت: پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رموویه‌تی: (وفيه تقومُ السَّاعَةُ)[2]واتا: وه‌ هه‌ر له‌ ڕۆژی جومعه‌دا قیامه‌ت هه‌ڵده‌ستێت.

٩ـ گشت دروستكراوه‌كانی خودا ترسیان هه‌یه‌ له‌وه‌ی مافی ڕۆژی جومعه‌ نه‌ده‌ن و ده‌ترسن له‌ ڕۆژی جومعه‌: پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رموویه‌تی: (ما مِنْ مَلَكٍ مُقَرَّبٍ، ولا سماءٍ، ولا أرضٍ، وَلا رِيَاحٍ، ولا جِبالٍ، ولا شَجَرٍ إلا وهنّ يُشْفِقن مِنْ يَوْمِ الجمعة)[3]واتا: هیچ فریشته‌یه‌كی نزیك له‌ خودا نیه‌، وه‌ هیچ ئاسمان و زه‌وی و با و چیا و دارو دره‌ختێك نیه‌ مه‌گه‌ر ترسی نه‌بێت له‌ ڕۆژی جومعه‌.

١٠ـ ڕۆژی جومعه‌ له‌ قیامه‌تدا شاهیده‌، ابن عباس رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا له‌ ته‌فسیری ئه‌م ئایه‌ته‌دا: ﴿وَشَاهِدٍ وَمَشْهُودٍ﴾[4]ده‌فه‌رموێت: (الشاهِدُ يَومُ الجُمعَةِ، وَ مَشهُودُ يَومُ عَرَفَةَ)[5]واتا: شاهید ڕۆژی جومعه‌یه‌، وه‌ مشهود ڕۆژی عه‌ره‌فه‌یه‌.

---

١ـ پێشه‌وایان احمد و ترمذی به‌ سه‌نه‌دێكی(صحیح) گێڕاویانه‌ته‌وه‌.

٢ـ پێشه‌وا مسلم گێڕاویه‌ته‌وه‌.

٣ـ پێشه‌وا ابن ماجه گێڕاویه‌ته‌وه‌.

٤ـ البروج: ٣

٥ـ الجامع لشعب الإيمان: ٤/ ٣٨٩

١١ـ ڕۆژی دیاری خودایە بۆ ئوممەتی ئیسلام، وە لەسەر ئەو ڕۆژە ئاینەکانی تر ئیرەییمان پێدەبەن، أبو هریرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (أَضَلَّ اللهُ عَنِ الْجُمُعَةَ مَنْ كَانَ قَبْلَنَا. فَكَانَ لِلْيَهُودِ يَوْمُ السَّبْتِ. وَكَانَ لِلنَّصَارَى يَوْمُ الأَحَدِ. فَجَاءَ اللهُ بِنَا. فَهَدَانَا اللّهُ لِيَوْمِ الْجُمُعَةِ. فَجَعَلَ الْجُمُعَةَ وَالسَّبْتَ وَالأَحَدَ. وَكَذَلِكَ هُمْ تَبَعٌ لَنَا يَوْمَ الْقِيَامَةِ. نَحْنُ الآخِرُونَ مِنْ أَهْلِ الدُّنْيَا. وَالأَوَّلُونَ يَوْمَ الْقِيَامَةِ. الْمَقْضِيُّ لَهُمْ قَبْلَ الْخَلاَئِقِ)[1] واتا: خودای پەروەردگار ڕێی ونکرد لە ئوممەتانی پێش ئێمە بۆ جومعە، جولەکەکان ڕۆژی شەممەیان دیاریکرد بۆ خۆیان، وە گاورەکان ڕۆژی یەك شەممەیان بۆ خۆیان دانا، ئینجا خودای گەورە ئێمەی هێنا و ڕێنمونی کردین بۆ ڕۆژی جومعە، وە ڕۆژەکانی هەفتەی بەم شێوەیە ڕیزبەند کرد: (جومعە، شەممە، یەك شەممە...) بەو شێوەیە ئەوان بونە شوێنکەوتەی ئێمە، وە ئێمە کۆتا ئوممەتین لە دونیا و یەکەم ئوممەتیشین لە قیامەتدا کە زیندو دەکرێینەوە و دادوەریمان لە گەڵدا دەکرێت.

وە لە فەرموودەیەکی تردا خاتوو عائیشە رضي الله عنها بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (فإنَّهُم حَسَدُونا على القِبلةِ التِي هَدَينا لَها،وضَلُّوا عنها، و على الجُمُعَةِ التِي هَدَينا لَها، و ضَلُّوا عنها)[2] واتا: بێگومان ئەوان ـ جولەکە و گاورەکان ـ ئیرەیان پێدەبەن لەسەر ئەو ڕوگەیەی خودای گەورە بە ئێمەی داو ئەوان ڕێیان لێی ونبوو، وە ئیرەیان پێدەبەن لەسەر ئەو جومعەیەی خودا بە ئێمەی داو ئەوان ڕێیان لێی ونبوو.

جا ئەمەی ڕابرا بەشێك بوون لە گەورەیی و تایبەتمەندیەکانی ڕۆژی جومعە، بە پشتیوانی خودا ئینجا دەچینە سەر باسی واجباتەکان وسونئەتەکانی ڕۆژی جومعە.

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان احمد و بیهقی گێڕاویانەتەوە.

# واجباتەکانی ڕۆژی جومعە

هەر کار و کردەوەیەك واجب بێت کە لە ڕۆژانی تری ئاسایدا ئەنجام بدرێت" ئەوە بەهەمان شێوە ئەو کارە ئەنجامدانی لە ڕۆژی جومعەشدا واجبە، تەنها ئەوە نەبێت کە لە ڕۆژی جومعەدا واجبێکی زۆر جەخت لەسەر کراوە ـ مۆکدەـ هەیە کە لە ڕۆژەکانی تردا ئەم واجبە نیە، ئەویش ئامادە بونە لە ووتار و نوێژی جومعە، خودای گەورە و پێغەمبەرەکەی ﷺ زۆر جەختیان کردۆتەوە لەسەر ئامادەبون لە نوێژی جومعە، وە پاداشتێکی یەکجار گەورەشان داناوە بۆ ئەو کەسەی ئامادەی نوێژی جومعە دەبێت:

خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا فەرمانی پێکردووین کاتێك بانگی جومعە بوو، بەپەلە بچین بە دەمیەوەو هەموو کارو کاسبی و مامەڵەیەکی تر ڕابگرین و دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[١] واتا: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك بانگی جومعە بوو بەپەلە بەرەوە مزگەوت بڕۆن و هەموو کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکانتان ڕابگرن، چونکە ئەو کارەتان خێری زیاترە ئەگەر بزانن و تێبگەن.

جا هەر کەسێك وەڵامی ئەم بانگەوازەی خودا بداتەوە و بەشێوەیەکی ڕێك و پێك بەرەو مزگەوت بچێت و سوننەت و ئادابەکانی مزگەوت و جومعە ئەنجام بدات"ئەوە خودای پەروەردگار لە تاوانەکانی خۆشدەبێت، پێغەمبەری ڕێزدار ﷺ فەرموویەتی: (...وَالْجُمُعَةُ إِلَى الْجُمُعَةِ وَرَمَضَانُ إِلَى رَمَضَانَ مُكَفِّرَاتٌ ما بَيْنَهُنَّ إِذَا اجْتُنِبَ الْكَبَائِرُ)[٢] واتا: جومعە بۆ جومعە، وە ڕەمەزان بۆ ڕەمەزان" دەبنە هۆکاری سڕینەوەی تاوانەکانی نێوانیان، بەو مەرجەی لە تاوانی گەورە خۆی بپارێزێت.

بە پێچەوانەوەش هەر کەسێك بە ئەنقەست و بە بێ عوزری شەرعی جومعە بچوێنێت، ئەوە خودای پەروەردگار مۆری دوو ڕویی ـ نیفاق ـ لـــــە دڵی دەدات،پێغەمبەری خـــــودا ﷺ

---

١ـ الجمعة: ٩

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

فەرموویەتی: (مَنْ تَرَكَ ثلاثَ جُمَعٍ طُبِعَ على قَلبِهِ)[1]

## سوننەتەکانی ڕۆژی جومعە

لەشەو و ڕۆژی جومعەدا چەند کارو کردەوەیەك ئەنجامدانیان سوننەتە، کە پێویستە لەسەر موسڵمانان خۆیانی پێبڕازێننێتەوە و بیانکەن بە توێشوی ڕۆژی قیامەتی، ئەوانەی خوارەوەش بەشێکن لە سوننەتەکانی ڕۆژی جومعە:

١ـ سوننەتە پێشنوێژ خوێن لە نوێژی بەیانی جومعەدا هەردوو سوڕەتی ( السجدە، الإنسان) بخوێنێت، چونکە پێغەمبەری خوداﷺ وەهای دەکرد.

٢ـ سوننەتە موسڵمانان لە ڕۆژی جومعەدا زۆر صەلاوەت لە پێغەمبەر بدەن. پێغەمبەری ئازیزﷺ فەرموویەتی: (أكثِروا مِنَ الصلاة عَليَّ يومَ الجُمُعة وَلَيْلَةَ الجُمُعة)[2]واتا: لە شەو و ڕۆژی جومعەدا زۆر صەلاوەت لەسەر من لێبدەن،

جا خۆشی و تایبەتی صەلاوەتدان لە پێغەمبەری خوداﷺ لەشەو و ڕۆژی جومعەدا ئەوەیە: ڕاستەوخۆ صەلاوەتەکان بە پێغەمبەری ئازیزﷺ دەگەن، پێغەمبەری خوداﷺ بە هاوەڵە بەڕێزەکانی فەرموو:(إنَّ مِن أفضَلِ أيَّامِكم يومَ الجمُعةِ، فأكثِروا عليَّ مِنَ الصَّلاةِ فيه فإنَّ صلاتَكم معروضَةٌ عليَّ، فقالُوا: يا رسولَ اللّهِ ، وَكيفَ تُعرَضُ صلاتُنا عليكَ وقد أرِمْتَ ؟ قالَ:يقولونَ بَليتَ. قالَ: إنَّ اللّهَ حرَّمَ على الأرضِ أجسادَ الأنبياءِ)[3]واتا: بێگومان یەکێك لە هەرە ڕۆژە گەورەکان ڕۆژی جومعەیە، لەو ڕۆژەدا زۆر صەلاوەتم لێبدەن، چونکە صەلاوەتەکانتان پیشانی من دەدرێت، هاوەڵە بەڕێزەکان گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ صەلاوەتەکانی ئێمە چۆن پیشانی تۆ دەدرێت لە کاتێکدا تۆ لە ناو قەبرەکەتدا بوویت بە خۆڵ!! فەرمووی: بەڕاستی خودای پەروەردگار لەسەر زەوی قەدەغە کردووە کە لاشەی پێغەمبەران بخوات.

---

١ـ پێشەوا یان ترمذی و ابن ماجە و ابوداود بە سەنەدێکی (صحیح) گێڕاویانەتەوە.

١ـ پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان نسائی و ابن ماجە گێڕاویانەتەوە.

٣ـ ٤ـ ٥ـ خۆ شۆردن و خۆ بۆنخۆشکردن و سەر چەورکردن: سەلمانی فارسی ﷺ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لا يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الجُمعَةِ، وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ، وَيَدَّهِنُ مِن دُهْنِهِ، أَوْ يَمَسُّ مِن طِيبِ بَيته، ثُمَّ يَخرُجُ، فَلاَ يُفَرِّقُ بَيْنَ اثنَيْن، ثُمَّ يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ، ثُمَّ ينْصِتُ إذا تَكَلَّمَ الإمَامُ إلاّ غُفِرَ لَهُ مَا بَينةُ وَبَيْنَ الجُمُعَةِ الأخْرَى)[1] واتا: هەر پیاوێك ڕۆژی جومعە خۆی بشوات و بەپێی توانا خۆی پاك بکاتەوە، وە سەری چەور بکات و بۆنی خۆش لەخۆی بدات، پاشان لە ماڵەوە بێتە دەرەوە بەرەو مزگەوت، وە لە مزگەوتیش هیچ کەسێك نەزیەت نەدات و جیاوازی نەخاتە نێوانی دوو کەسەوە، پاشان ئەو نوێژە سوننەتە بکات کە بۆی دانراوە ، دواتر بێدەنگ بێت کاتێك ووتاربێژ دەستی کرد بە قسە کردن" ئەوە خودای گەورە لە تاوانەکانی نێوانی ئەو جومعە و جومعەی ڕابردوی خۆشدەبێت.

٦ـ سیواك کردن. پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: ( لَوْلَا أَنْ أَشُقَّ عَلَى أُمَّتِي أَوْ عَلَى النَّاسِ لَأَمَرْتُهُمْ بِالسِّوَاكِ مَعَ كُلِّ صَلَاةٍ)[2] واتا: ئەگەر لەسەر ئوممەتەکەم وە یان لەسەر خەڵکی گران نەبوایە" ئەوە فەرمانم پێدەکردن بە سیواك کردن لە گەڵ هەموو نوێژێکدا.

جا پێشەوا بوخاری لە تێگەیشتنی لەم فەرموودەیەوە باسێکی لە صەحیحەکەیدا ناوناوە: (باب السواك يوم الجمعة) وە پێغەمبەری خوداﷺ لەو فەرموودەیەدا کە باسی تادابەکانی هاتنە جومعەی کردووە فەرموویەتی: (...وَاسْتَاكَ..)واتا: سیواك بکات.

٧ـ لەبەر کردنی پۆشاکی جوان. پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَنِ اغْتَسَلَ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَاسْتَاكَ وَمَسَّ مِنْ طِيبٍ إِنْ كَانَ عِنْدَهُ، وَلَبِسَ مِنْ أَحْسَنِ ثِيَابِهِ ثُمَّ خَرَجَ حَتَّى يَأْتِيَ الْمَسْجِدَ فَلَمْ يَتَخَطَّ رِقَابَ النَّاسِ حَتَّى رَكَعَ مَا شَاءَ أَنْ يَرْكَعَ، ثُمَّ أَنْصَتَ إِذَا خَرَجَ الإِمَامُ فَلَمْ يَتَكَلَّمْ حَتَّى يَفْرُغَ مِنْ صَلاَتِهِ، كَانَتْ كَفَّارَةً لِمَا بَيْنَهَا وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الَّتِي قَبْلَهَا)[3] واتا: هەر کەسێك لە

---

1ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا احمد لە مسندەکەیدا گێڕاویەتەوە.

ڕۆژی جومعەدا خۆی بشۆرێت و سیواك بکات و بۆنی خۆش لە خۆی بدات" ئەگەر هەیبوو، وە پۆشاکێکی جوان لەبەر بکات، پاشان بێتە مزگەوت و بەسەرشانی خەڵکیدا هەنگاو نەنێت، وە چەند توانی نوێژی سوننەت بکات، وە کاتێك وتاربێژ چو بۆ سەر مینبەر بێدەنگ بێت و قسە نەکات هەتا لە نوێژ دەبێتەوە" ئەوە ئەم جومعەیەی دەبێتە هۆکاری سڕینەوەی تاوانی نێوان ئەو جومعە و جومعەی ڕابردووی.

٨ـ زوو چون بۆ مزگەوت.گەورەمان ابوهریرەﷺلە پێغەمبەری خوداوەﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مَن رَاحَ فِي السَّاعَةِ الأُولى، فَكَأنما قَرَّبَ بَدَنَةً،ومَنْ رَاحَ فِي السَّاعَةِ الثَّانِيَةِ، َكَأنّما قَرَّبَ بَقَرَةً، ومَنْ رَاحَ فِي السَّاعة الثَّالِثَةِ، فَكأنّما قَرَّبَ كَبْشاً أَقرَنَ)[1] واتا: هەر کەسێك لە کاتژمێری یەکەمدا بچێتە مزگەوت بۆ جومعە" خێری وەك ئەوە وەهایە کە حوشترێك بکاتە قوربانی، وەهەر کەسێك لە کاتژمێری دووەمدا بچێت بۆ مزگەوت" خێری وەك ئەو کەسە وەهایە کە مانگایەك بکات بە قوربانی، وە هەر کەسێك لە کاتژمێری سێهەمدا بچێت بۆ مزگەوت، خێری وەك ئەو کەسە وەهایە کە بەرانێکی شاخداری کردبێتە قوربانی.

٩ـ خوێندنی سوڕەتی (کهف). ابوسعیدی خودریﷺ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مَنْ قَرَأَ سُوَرَةَ الْكَهفِ يَومَ الْجُمُعَةِ أَضاءَ لَهُ مِنَ النُّورِ ما بَينَ الْجُمُعَتَينِ)[2] واتا: هەر کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا سوڕەتی (کهف) بخوێنێت، ئەوە خودای گەورە نورێکی درەوشاوەی پێدەدات لە نێوان ئەو جومعە و جومعەی دواتردا.

١٠ زۆر دوعا کردن و پاڕانەوە لە خودا، وەك پێشتر باسمان کرد لە جومعەدا کاتێك هەیە" لەم کاتەدا هەر دووعایەك بکەیت گیرا دەبێت.

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان نسائی و حاکم گێڕاویانەتەوە.

١١ـ نزیکبونەوە لە ووتارخوێن و هەوڵدان بۆ ڕیزی یەکەم. گەورەمان عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرموویێت: گوێم لە پێغەمبەری خوداﷺ بوو دەیفەرموو: (**إِنَّ النَّاسَ يَجلِسُونَ يَومَ القِيَامَةِ مِنَ اللّهِ عَلَى قَدْرِ رَوَاحِهِمْ إلى الجمُعَةَ، الأول، ثُمَّ الثاني، ثمَّ الثالث، ثُمَّ الرابع**)[1]واتا: بێگومان خەڵکی لە ڕۆژی قیامەت بە گوێرەی زوو هاتنیان بۆ مزگەوت لە ڕۆژی جومعەدا لە خزمەتی خودادا دادەنیشن، ئەوکەسەی یەکەم کەس بێت بۆ جومعە نزیکترین کەسە لە خوداوە، پاشان دووەم پاشان سێهەم، دواتر چوارەم....

وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (**مَنْ غَسَّلَ يَومَ الجُمُعَةِ واغتَسَلَ، وَدَنا مِنَ الإمامِ واقتَرَبَ وَاستَمَعَ وَأَنصَتَ" كانَ لَهُ بِكُلِّ خُطوةٍ يَخطُوها أَجرُ صيامِ سَنَةٍ وقِيامِها**)[2]واتا: هەر کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا خۆی بشۆرێت، وە لە ووتارخوێن نزیك ببێتەوە و بێدەنگ دابنیشێت و گوێبگرێت" ئەوە بە هەر هەنگاوێکی کە هەڵیدەهێنێت بەرەو مزگەوت خێری بە ئەندازەی ڕۆژو و شەونوێژی ساڵێکی بۆ دەنوسرێت.

١٢ـ سوننەتە پێشنوێژخوێن لە نوێژی جومعەدا هەردوو سورەتی:(**الجمعة و المنافقون**) وە یان (**الأعلى و الغاشية**) بخوێنێت، چونکە پێغەمبەری ئازیزﷺ لە نوێژی جومعەدا ئەوانەی خوێندووە.[3]

جا ئەوەی ڕابرا بەشێك بوون لە سوننەتەکانی ڕۆژی جومعە، ئێستاش دێینە سەر باسی کار و کردەوە ناپەسەندەکانی ڕۆژی جومعە.

## کار و کردەوە ناپەسەند و قەدەغەکانی شەو و ڕۆژی جومعە

هەروەك چۆن لە شەو و ڕۆژی جومعە ئەنجامدانی چەند کار و کردەوەیـــــەك سوننەت بـــوو،

١ـ پێشەوا بیهقی لە (الجامع لشعب الإيمان) دا گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

بەهەمان شێوە ئەنجامدانی چەند کارو کردەوەیەکی تریش تێیدا قەدەغەیە، جا ئەم قەدەغەیە یان حەرامە، وە یان ناپەسەندە، ئەمانەی خوارەوەش بەشێکن لە کار و کردەوە ناپەسەندەکانی شەو و ڕۆژی جومعە:

١ـ ئەنجامدانی پێچەوانەی ئەو سوننەتانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن.

٢ـ تایبەتکردنی شەوی جومعە بە هەڵسانەوە بۆ عیبادەت و شەونوێژ. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (لا تَخصوا لَيْلَةَ الجُمُعَةِ بِقِيامٍ مِن بَينِ اللّيالِي)[1]واتا: لەناو شەوەکاندا بەتەنها شەوی جەمعە تایبەت مەکەن بە عیبادەت و شەونوێژ.

٣ـ بە ڕۆژو بوون: پێغەمبەری خواﷺ فەرموویەتی: (يَومُ الْجُمُعَةِ يَومُ عِيدٍ، فَلا تَجْعَلُوا يَومَ عِيدِكُم يَومَ صِيامِكم إِلا أَنْ تَصُومُوا قَبلَهُ أَو بَعْدَهُ)[2]واتا: ڕۆژی جومعە ڕۆژی جەژنە، ئێوەش ڕۆژی جەژنتان مەکەن بە ڕۆژی بەڕۆژو بوون، تەنها مەگەر ڕۆژێکی پێشتر یان دواتر لەگەڵی بەڕۆژو بن.

٤ـ سەفەرکردن لە ڕۆژی جومعەدا. هاوەڵی بەڕێز ابن عمر رضي الله عنهما لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مَنْ سافَرَ مِن دارِ إِقامَةٍ يَومَ الْجُمُعَةِ دَعَتْ عَلَيهِ الْمَلائِكَةُ لا يُصْحَبَ فِي سَفَرِهِ، وَلا يُعانَ عَلى حاجَتِهِ)[3]واتا: هەر کەسێك لە ڕۆژی جومعەدا لەجێگای نیشتەجێ بونیەوە گەشت بکات" ئەوە فریشتەکان دووعای لێدەکەن و دەڵێن: خودایە لەم سەفەرەدا کەس نەکەیت بەهاوڕێی و یارمەتیشی نەدرێت.

جا بە کۆدەنگی هەر چوار مەزهەبەکە گەشتکردن لە ڕۆژی جومعەدا دروست نیە، بەڵام شافعیەکان رحهم الله دەفەرموون: لەچەند بارودۆخێکدا لە ڕۆژی جومعەدا گەشتکردن دروستە بەو مەرجە وابزانێت کە لەڕێگاد ئاوەدانی هەن و جومعەیان لێدەکرێت و جومعەکەی نافەوتێت، وەك:

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا ابن خزیمە گێڕاویەتەوە، وە پێشەوایان مسلم و ترمذی و بیهقی هاوشێوەیان گێڕاوەتەوە.

٣ـ پێشەوا دارالقطنی گێڕاویەتەوە، وە پێشەوا خرائطی لە مساوىء الأخلاقدا باسی کردووە.

* سەفەرەکە واجب بێت، بۆنمونە وەك سەفەری حەج و کاتەکەشی تەنگ بوبێت.

* یان پێویستیەك ـ ضرورة ـ هەبێت، بۆنمونە وەك ئەوەی لەوە بترسێت هاوڕێکانی جێیدەهێڵن و بە بەجێهێشتنیشیان زیانی بەر بکەوێت.[1]

٥ـ لە کاتی جومعەدا هەر شتێك سەرقاڵت بکات لە جومعە ئەنجامدانی حەرامە، وەك: کڕین و فرۆشتن و بەخشین و بەکرێگرتن و ...[2] خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا نُودِيَ لِلصَّلَاةِ مِن يَوْمِ الْجُمُعَةِ فَاسْعَوْا إِلَى ذِكْرِ اللَّهِ وَذَرُوا الْبَيْعَ ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[3] واتا: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە کاتێك بانگی جومعە بوو بەپەلە بەرەوە مزگەوت بڕۆن و هەموو کڕین و فرۆشتن و مامەڵەکانتان ڕابگرن، چونکە ئەو کارەتان خێری زیاترە ئەگەر بزانن و تێبگەن.

٦ـ درەنگ هاتن بۆ مزگەوت. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (إذا كانَ يَومُ الْجُمُعَةِ كانَ عَلى كُلِّ بابٍ مِن أَبوابِ الْمَسجِدِ مَلائِكَةٌ يَكْتُبُونَ الْأَوَّلَ فَالأَوّل فَإذا جَلَسَ الإِمامُ طَوَوْا الصُّحُفَ وَجاءُوا يَستَمِعُونَ الذِّكرَ)[4] کاتێك ڕۆژی جومعە دێت، لەسەر هەر دەرگایەکی مزگەوت فریشتەیەك ڕادەوەستێت بە پێی ڕیزبەندی ناوی ئەو کەسانە دەنوسن کە ئامادەی مزگەوت دەبن، هەتا ووتار بێژ دەست بە ووتار دەکات، جا کاتێك ووتار بێژ دەستی بە ووتار کرد" فریشتەکان تۆماری ناونوسین دادەخەن و گوێ دەگرن بۆ ووتار.

کەواتا: ئەو کەسانەی دوای دەستپێکردنی ووتار دێنە مزگەوت" ئەوا لە وتۆمارەدا ناویان تۆمار ناکرێت کە فریشتەکان دەینوسن.

٧ـ بازدان و هەنگاونان بەسەر موسڵمانانداو هەوڵدان بۆ ڕیزەکانی پێشەوە بەسەر شانی خەڵکدا .ڕێزدار ابی زاهریەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُدەفەرموێت:لە ڕۆژی جومعەدا لە مزگەوت دانیشتبوم، پیاوێك

---

١ـ الفقه على المذاهب الأربعة: ١/ ٣٩٩

٢ـ الجامع لأحكام القرآن: ١٨/ ٩٦

٣ـ الجمعة: ٩

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

هات بەسەر شان و ملی خەڵکیدا هەنگاوی دەنا، پێغەمبەری خوداشﷺ ووتاری دەخوێندەوە، کاتێك ئەوەی بینی فەرمووی: ( اجْلِسْ فَقَدْ آذَيْتَ وَآنَيْتَ)[1]واتا: دانیشە، تۆ بۆجومعە درەنگ هاتوی، ئێستاش خەڵکی ئازار دەدەیت!!

٨ـ قسەکردن لە کاتی ووتاردا. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (من تكلّمَ والإمام يَخطبُ فَقَد لَغا، ومن لَغا فلا جُمُعةَ لَهُ)[2]واتا: هەر کەسێك قسە بکات لە کاتێکدا ووتار خوێن ووتار دەخوێنێـەوە" ئەوە تاوانی کردووە و بەهۆیەوە خێری جومعەی لە دەستداوە.

٩ـ دانیشتن لە ڕیزەکانی دواوە لەگەڵ ئەوەی هێشتا ڕیزەکانی پێشەوە تەوا نەبـــــوون. بەداخەوە زۆر جار لە مزگەوتەکان دەبنیت کە بەر لەوەی ڕیزەکانی پێشەوە تەواو ببێت خەڵکی لە دواوە ڕیز دەبەستن، یان لە داوەوە پشت بە دیوارێك دەدەن، وەیان پشت بە پایەکەوە دەدەن و نایەنە پێشەوە، ئەمەش کارێکی ناپەسەندە، چونکە وەك پێشتر ئاماژەمان پێکرد سوننەتە موسڵمانان هەوڵبدەن لە ووتارخوێن نزیك ببنەوە، بۆ ئەوەی لە قیامەتدا لە خودا نزیك بن.

١٠ـ چونە دەر لە مزگەوت دوای بانگی جومعە، تەنها مەگەر بۆ کارێکی شەرعی بێت. خودای پەروەردگار ڕەخنەی لەو هاوەڵە بەرێزانە گرت کە لەکاتی ووتاردا چونە دەرەوە بۆ لای بازرگانەکان و پێغەمبەریان بەجێهێشت و فەرمووی: ﴿وَإِذَا رَأَوْا تِجَارَةً أَوْ لَهْوًا انفَضُّوا إِلَيْهَا وَتَرَكُوكَ قَائِمًا قُلْ مَا عِندَ اللَّهِ خَيْرٌ مِّنَ اللَّهْوِ وَمِنَ التِّجَارَةِ وَاللَّهُ خَيْرُ الرَّازِقِينَ﴾[3] لەبەر ئەوە ناپەسەندە موسڵمانان دوای بانگی جومعە لە مزگەوت بچنە دەرەوە، بەڵکو دەبێت چاوەڕێی ووتاربێژ بکەن گوێبگرن بۆ ووتاری جومعە.

١١ـ خواپەرستی کردن لە ڕۆژی جومعەدا بە هەندێك کاری حەرام و قەدەغە، بۆ نمونە زۆر کەس هەیە هەموو ڕۆژانی جومعە ڕیشی دەتاشێت، وادەزانێت کە ئەم ڕیش تاشینەی دەچێتە پاڵ خۆ خاوێنکردنەوە و خۆشۆردنەوە و سوننەتە!! نازانێت کە ڕیش تاشین لە هەموو کاتێکـــدا

١ـ پێشەوایان ابن ماجة و احمد و ابن خزيمة گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣ـ الجمعة: ١٠

قەدەغەیە و حەرامە، یان کەسێك تەنها شەوانی جومعە شەو نوێژ بکات و تەنها ڕۆژانی جومعە بەڕۆژو بێت، وابزانێت چونکە ڕۆژی جومعە ڕۆژێکی گەورەیە" ئەوە کارێکی چاکی کردووە، نەخێر، کارێکی خراپەو پێغەمبەری خۆشەویستﷺ نکۆڵی لێکردووە.

جا ئەمانەی ڕابران بەشێك بوون لە واجبات و ئاداب و سوننەت و کارە حەرام و ناپەسەندەکانی ڕۆژی جومعە، لە خودای باڵادەست داواکارین لەو کەسانەمان بگێڕێت کە مافەکانی جومعە دەدەن، وە لە خودای گەورە داواکارین لە کارو کردەوە حەرام و ناپەسەندەکانی بمانپارێزیت، بۆ ئەوەی لەو کەسانە بین کە خودای پەروەردگار بەهۆی جومعەوە لە تاوانەکانیان خۆشدەبێت. ئامین.



# جەژن و یادو بۆنە نیشتیمانیەکان

بەپێی ئەوەی کە مێژوو کورد پڕیەتی لە هەورازو نشێو و بەرزی و نزمی و خۆشی و ناخۆشی،وە بەپێی ئەوەی لەسەدەی تازەداو دوای بە عەلمانی بونی ناوچەکە و دەوروبەری" ڕژێمە عەلمانیەکانی دەوروبەر بەردەوام لە دژایەتی کردنی گەلی کورددا بوون، لەبەرامبەریشدا گەلی کورد بەردەوام لە شۆڕشدا بوون بۆ ڕوبەڕوبونەوە و بەرپەرچدانەوەی هێرشە ستەمکاریەکانی دوژمنان، بەو هۆیەشەوە چەندین ڕوداوو پێشهات هاتوونەتە پێش کە بوون بەڕۆژێکی مێژوویی بۆ گەلی کورد، جا ئەو مێژووە خۆش بوویێت یان ناخۆش، ئەوە لە بیرو هۆشی تاکی کورددا ڕیشەی داکوتاوە بۆتە جەژنێك یان بۆنەیەك، لەبەر ئەوە جەژن و یادو بۆنەکانی تایبەت بە کورد و نیشتیمانەکەی زۆرن، وە زۆرێك لە ڕۆژەکانی ساڵ تایبەتکراون بە یادی ئەو بۆنانە، وەك: ٣/٥ یادی ڕاپەڕینی کوردستان دژی ڕژێمی ستەمکاری ئەوکاتی بەغدا، وە ٣/١٦ڕۆژی شەهید و کیمیابارانی هەڵەبجەو ٣/٢١ جەژنی سەری ساڵی کوردی، وە ٣/٣٠ یادی لە سێدارەدانی یەکەم سەرۆك کۆماری کورد قاضی محمد و ٣/٣١ یادی کۆڕەوە مەزنەکەی گەلی کوردو، ٤/١٤ڕۆژی ئەنفال و ٤/٢٤ڕۆژی شەهیدی زانکۆو کارەسات و ڕاپەڕینی خەڵکی پشدەر، وە جگە لەمانەش ڕۆژی جلی کوردی و ڕۆژی ڕۆژنامەگەری و...هتد.بەڵام ئەم یادانە زۆربەیان یادێکی ناوچەیین نەوەك یادێکی نیشتیمانی، وەهەر لەبەر ئەوە زۆرێکیان ناکرێن بە پشوی ڕەسمی، وە ئەویادانەی زیاتر مۆرکی نیشتیمانیان وەرگرتووە بریتین لە جەژنی نەورۆز(سەری ساڵی کوردی و یادی ڕاپەڕینە مەزنەکەی گەلی کورد لە دژی ڕژێمی ستەمکاری ئەوکاتی بەغدا) وەهەر لەبەر ئەوە ئێمە لێرەدا تەنها باسی ئەو دوو جەژن و بۆنەیە دەکەین. وە تۆی خوێنەر دەتوانیت حوکمی یادکردنەوەی جەژن و بۆنە نیشتیمانیەکانی تریش بکەیت بۆ سەر ئەو دوو جەژن و بۆنەیە.

# ٣/٢١

# جەژنی نەورۆز

## سەری ساڵی کوردی

# جەژنی سەری ساڵی کوردی نەورۆز لە ٣/٢١

نەورۆز ووشەیەکی کوردی لێکدراوە لە(نەو) بەواتای نوێ (رۆز) بەواتای ڕۆژ، وە هەردووکیان بە یەکەوە بەواتای ڕۆژێکی نوێ دێن، جا ساڵانەو لە ٣/٢١دا گەلە ئاری نەژادەکان کە بریتین لە کورد و فارس ... یادی نەورۆز دەکەنەوە و تێیدا پۆشاکی جوان دەکەنە بەریان و خۆیان دەڕازێننەوەو لە شار دەچنە دەرەوەو ئاهەنگ دەگێڕن، وە چەندین مەڕاسیم و میهرەجان و ئاهەنگی تایبەتی تێدا سازدەکەن، وە لە ئێوارەی بیستی مارسدا کوردان ئاگر دەکەنەوە کە ڕەمزە بۆ سەرکەوتنی کاوەی ئاسنگەر و کوردان بەسەر جەور و ستەمدا، وە لەناو کورددا ڕۆژی نەورۆز وەکو جەژنی نیشتیمانی و سەری ساڵ سەیری دەکرێت.

# مێژووی سەرهەڵدانی نەورۆز

مێژوو نوسان جیاڕان دەربارەی سەرەتای سەرهەڵدانی نەورۆز، بەشێکیان دەڵێن: مێژووی سەرهەڵدانی نەورۆز دەگەڕێتەوە بۆ چوار هەزار ساڵ پێش زاین و سەردەمی میدیەکان،[1] بەشێکی تریان دەڵێن: نەورۆز دەگەڕێتەوە بۆ پێش هاتنی باوکی پێغەمبەران إبراهیم علیه السلام بەبەڵگەی ئەوەی کە لەسەردەمی هاتنی ئیبراهیمی پێغەمبەردا علیه السلام خەڵکی یاد نەورۆزیان دەکردەوە و بە شاو گەداوە لە ڕۆژی نەورۆزدا دەچونە دەرەوەو هەتا ئێوارە بەخۆشی و شادی دەیانبردە سەر و پێشوازیان دەکرد لە هاتنی بەهار، وە هەر لەڕۆژی نەورۆزدا کاتێك خەڵکی لە شار چونە دەرەوە ئیبراهیم علیه السلام بتی کافرەکانی شکاندن.[2] وە بەڕای بەشێکی تر لە مێژوو نوسان نەورۆز لە سەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیمدا علیه السلام پەیدا بووە، بەڕای منیش ئەوەیان

١ـ جریدە الإتحاد، حقائق حول عید النورز. د مولودإبراهیم.

٢ـ کاوەو نەورۆز لە نێوان ئەفسانەو ئاییندا،حسن محمود حمە کریم: ١٢

زیاتر لە پێكانەوە نزیكە چونكە:

یەكەم/ ضوحاك لە سەردەمی پێغەمبە ئیبراهیمداعلیه السلام بووە، ابن كثیر لە (البدایة والنهایة)دا دەفەرمووێت: بەشێك لە مێژوو نوسان دەڵێن: ئەو پادشا ستەمكارەی میصر كە بەرابەركێی لەگەڵ ئیبراهیمدا كرد برای ضوحاكی ستەمكار بووە،[1]

دووەم/ بەهەمان شێوە كاوەی ئاسنگەریش هەر لەسەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیمدا علیه السلام بووە: ئالوسی لە تەفسیرەكەیدا دەفەرمووێت: كاوە سەر لەشكری سوپای(ذوالقرنین)بووە، إبن كثیریش لە تەفسیرەكەیدا دەفەرمووێت: ئەزرەقی و جگە لەویش چەند زانایەك فەرموویانە دوای ئەوەی هەردووك پێغەمبەر ئیبراهیم و ئیسماعیل علیهما السلام ماڵی خودایان دروستكرد (ذوالقرنین) سەردانی كردوون و لەگەڵ ئیبراهیمدا علیه السلام طـــوافی بەیتی كردووە و بڕوای پێهێناوە و شوێنی كەوتووە.[2]

جا مادام هەردووك كارەكتەری سەرەكی نەورۆز لە سەردەمی پێغەمبەر ئیبراهیمدا علیه السلام بوبن دیارە نەورۆزیش هەر لەسەردەمی ئەودا بووە. والله أعلم

جا نەورۆز لە وكاتەوە لە زۆربەی سەردەمەكاندا ساڵانە یادیكراوەتەوە، بەتایبەت لەسەردەمی ساسانیەكاندا نەورۆز گوڕو تینێكی زیاتری بەخۆیەوە بینی، وە هەندێك گۆڕانكاریش لە داب و نەریت و شێوزای یادكردنەوەكەیدا بەدی دەكرا، وە هەندێك كاری سیاسی و ستەكماری تێكەڵ كرا، وەك وەرگرتنی باجی تایبەت لە وەرزێر و جوتیاران، ..... پاشانیش لە دوای هاتنی ئیسلام یادكردنەوەی نەورۆز چەندین بەرزی و نزمی بەخۆیەوە بینی، سەرەتاو دوای ڕوخاندنی ئیمپڕاتۆریەتی ساسانی لە سەردەمی عمری كوڕی خطابدا رضي الله عنه بە فەرمی ڕێگری كرا

١ـ البدایة والنهایة: ١/ ١٧٠

٢ـ تفسیر القرآن العظیم: ٥/ ١١٤

لە یادکردنەوەی نەورۆز، چونکە ئەو کات وەك دروشمێکی ئاگر پەرستی سەیری دەکرا، پاشان لە دوای هاتنی سەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا علی کوڕی ابی طالبرضي الله عنه ڕێگا درا بە یادکردنەوەی نەورۆز، وە پێشەوا علی رضي الله عنه خودی خۆی ڕێگای دا بەوەی کە یادی نەورۆز بکرێتەوە، وەڕێگای دا پیرۆزبایی لە یەکتری بکەن و شیرینی دابەش بکەن، بەڵام ڕێگای نەدا بە ناهەنگ گێڕان،[1] پاشان لە سەردەمی ئەمەویەکاندا بە فەرمی ڕێگا درا بە یادکردنەوەی نەورۆز هەتا سەردەمی جێنشینایەتی جێنشینی دادپەروەر عمری کوڕی عبد العزیز، کاتێك عمری کوڕی عبدالعزیز رحمه الله بو بە جێنشینی بڕواداران فەرمووی: مادام جێنشنە ڕاشیدەکان ڕێگایان بەم یادە نەداوە منیش ڕێگای پێنادەم، لەبەر ئەوە لەسەردەمی ئەودا قەدەغە کرا،[2] پاشان دوای هاتنی سەردەمی عەبباسیەکان" خەلیفەکانی عەبباسی زۆر گرنگیان بەو یادە دەدا، وە شاعیر و ئەدیبەکانیش کەوتنە نوسین لەسەر مێژوو و ڕووداوەکانی نەورۆز، وە پاشان دوای هاتنی سەردەمی جێنشینایەتی عوسمانیەکانیش یادکردنەوەی نەورۆز هەر بەردەوام بوو، پیرەمێردی شاعیر دەڵێت: بۆ یەکەم جار لە ژیانمدا لە ئەستەمبوڵ جەژنی نەورۆزم دی، ئەم ڕۆژە لێرە بەجەژنێکی پیرۆز دادەنرا، هەموو ساڵێك لە نۆی مارسدا کاربەدەستان تێکڕا دەستە دەستە پۆل پۆل دەهاتنە سەراو کۆشك بۆ پیروزبایی کردن لە سوڵتان شەربەتیان دەخواردەوە و لە گشت منارەکانی مزگەوتیش مۆم و قوتیلەنیا دادەگیرساند.[3]

## ئایا کاوە باوەڕدار بووە یان بێباوەڕ؟ وە ئایا ئاگر نیشانەی ئاگرپەرستیە؟

زۆر جار عەلمانیەکانی کوردستان بەڵگە دێننەوە لەسەر بێبـــاوەڕی و ئاگـــرپەرستی کاوەی

---

١ـ کاوەو نەورۆز لە نێوان ئەفسانەو ئاییندا: ٥٤

٢ـ هەمان سەرچاوە: ٥٥

٣ـ هەمان سەرچاوە:٥٦

ئاسنگەر بەوەی کە دوای سەرکەوتنی بەسەر ضوحاکدا ئاگری کردۆتەوە، بەڵام ئەوە بۆچونێکی هەڵەیە و تەوا پێچەوانەی مێژوو گەورەیی و بەربڵاوی یادی نەورۆزە، پێشەوا ئالوسی لە تەفسیری ئایەتی ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَن ذِي الْقَرْنَيْنِ﴾[1]دا دەفەرموێت: (أجْمَعَ أهلُ التأريخِ على أنّهُ لم يُسافِر لا شَرقاً ولا غَرباً وإنَّما دوَّخَ لَهُ البِلادَ كاوة الأصفهانيُّ الحَدّادُ الذي مَزَّقَ اللهُ على يَدِهِ مُلْكَ الضُّحاكَ و بقِيَ رئيسَ عساكِرِهِ إلى أن ماتَ)واتا: مێژونوسان کۆدەنگن لەسەر ئەوەی کە (ذوالقرنين) بۆخۆی بەسەفەر نەچۆتە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوای دوونیا، بەڵکو کاوەی ئەسفەهانی ئاسنگەر ئەو وولاتانەی بۆ ملکەچ کردوون و خستونیە ژێر دەستی ئەو- ئینجا ئەو چووە- ئەو کاوەی کە لەسەر دەستی ئەو خودای گەورە دەسەڵاتی ضوحاکی لەناو برد، وە کاوە هەر بەسەر لەشکری سەربازەکانی (ذوالقرنين) مایەوە هەتا کۆچی دوایی کرد.

وە (ذوالقرنين) یەکێك بووە لەو پادشا موسڵمانانەی کە وەکو سولەیمانی پێغەمبەرعلیه السلام حوکمی هەموو دونیای کردووە، وەخودای گەورە دەربارەی دەفەرموێت:﴿إِنَّا مَكَّنَّا لَهُ فِي الْأَرْضِ وَآتَيْنَاهُ مِن كُلِّ شَيْءٍ سَبَبًا﴾[1]واتا: ئێمە تواناو دەسەڵاتمان لە زەویدا پێبەخشیبوو، بۆ هەر شتێکی پێویستی ئەو سەردەمە هۆکارەکەیان بۆ ڕەخساندبوو، وە پێشەوا علی کوڕی ابی طالب رضي الله عنه دەربارەی دەفەرموێت: (كانَ عَبْداً صالِحاً دَعا قَومَهُ إلَى اللهِ تَعَالَى)[2]واتا: ذوالقرنين بەندەیەکی چاکی خودا بوو خەڵکی بانگ دەکرد بۆ لای خودای گەورە.

جا لە عەقڵ و لۆژێکەوە دورە ئەگەر ذوالقرنين لەناو ئەم هەموو باوەڕدارانەدا کاوەیەکی ئاگر پەرست بکات بە سەرلەشکی سوپاکەی و هەتا مردنیش هەر بەسەر لەشکری بیهێڵێتەوە!! بەڵکو ڕاستیەکەی ئەوەیە کە کاوەی ئاسنگەر کەسێکی باوەڕدار بووە و شوێنکەوتەی ذوالقرنين بووە، وەك پێشتریش باسمان کرد ذوالقرنینیش شوێنکەوتەی پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام بووە و لەسەر ئاینی ئەو بووە، کەواتا دەکرێت بڵێین: کە کاوەی ئاسنگەریش هەر لەسەر ئاینی

پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام بووە.وە هەرچی ئاگرکردنەوەکەشی بووە لەناو کۆشکی ضوحاکدا" ئەوە ئاماژە نیە بۆ ئاگرپەرستی و ڕەهەندێکی دینی نیە، بەڵکو ئاگر کردنەوەکەی نیشانەی سەرکەوتن بووەو ئاگادار کردنەوەی دەوربەر بووە لەو سەرکەوتنەو ڕەهەندێکی سیاسی هەبووە، لەسەر ئەمەش بێگانەکانیش شاهیدیمان بۆ دەدەن، بۆنمونە: دکتۆر کۆنتەر وشنەر لە کتێبی (أحفاد الصلاح الدين)دا دەڵێت: (عملية إشعالُ النِّيران عِندَ الْكُوردِ،هِيَ عَمَلِيَّةُ السِّياسِيةُ بَحتة، فَهِيَ إِشارةٌ واضحةٌ على رَغبةِ الكُوردِ فِي إعلانِ كَونِهم شعباً مستقِلا بذاتِهِ..، ولذلكَ المَغزى السياسي تتم مُراقبة عَمَلِيةِ إشعالِ النيرانِ ومَنعِها ومطاردةِ القائمينَ بِها مِن قِبَلِ الشرطةِ والأمنِ فِي البلادِ المعينة)[1]واتا: ئاگر کردنەوە لەلای کوردان لە جەژنی نەورۆزدا ڕەهەندێکی سیاسی هەیە و بەس، وە ئاماژەیەکی ڕون و ئاشکرایە بۆ حـــەزی کـــورد بۆ ڕاگەیاندنی خۆیان وەك گەلێکی سەربەخۆ، وە هەر لەبەر ئەو ڕەهەندە سیاسیەیە کە لە چەند وولاتێکی دیاریکراوە لەلایەن پۆلیس و ئاسایشەوە چاودێریەکی وردی ئاگر کردنەوە دەکرێت، وە هەرکەسێك بەو کارە هەستێت شوێنی دەکەون و دەستگیری دەکەن.

وە دەشکرێت بڵێین: جگە لەو ڕەهەندە سیاسیە ئاگر کردنەوەکەی کاوە دەربڕینی ڕق و کینەی خۆی و گەلە ستەمدیدەکەی بوو بێت، ئەو ڕق و کینەشی بە سوتاندنی کۆشکی ضوحاکی ستەمکار دامرکاندبێتەوە، ئەگەر نا" جەژنی نەورۆز زۆر لە جەژنێکی ئاگر پەرستان گەورە ترە، وە بەشێك لە مێژوو نوسان دەڵێن: نەورۆز زۆر لە ئاگر پەرستی کۆنترە، وە زۆر پێدەچێت کە نەورۆز پەیوەندی بە ڕوداوێکی ئاینی یەکێك لە پێغەمبەرانەوە هەبووبێت، کە ئەو کاتە هەموو گەلی ئاری یەك دەوڵەتیان هەبووەو جەژنەکە هەرهەموویان پێی هەستاون، وە جەژنی نەورۆز ئەوەندە گەورە وبەربڵاو بووە ئەوەك تەنها ئاری نەژادەکان بەڵکو سامیەکانیش هێناوەتە جولـــە،

---

١ـ نەورۆز لە مێژووی ئیسلامی و ئیسلامی و لە دیدی زانایانی ئاینی ناوداری کوردستانەوە، عبدالرحمن صدیق: ٨

ئەوانیش لە بەهاردا ئاهەنگ دەگێڕن.[1] ئینجا بەڵگەیەکی تریش ئەوەیە کە نەورۆز جەژنێکی ئاگرپەستان نەبووە: گەلەکەی پێغەمبەر ئیبراهیمیش علیه السلام یادی نەورۆزیان کردۆتەوە، وەك گووتمان پێغەمبەر ئیبراهیم علیه السلام لە نەورۆزدا کاتێك گەلەکەی بۆ نەورۆز چوبونە دەر بتەکانی شکاندن، گەلی ئیبراهیمیش ئاگر پەرست نەبوون هەتا بۆ ئاگر پەرستی لە نەورۆزدا بچنە دەر، بەڵکو بت پەرستبوون، کەواتا: ئێستا بۆمان ڕون بۆوە کە جەژنی نەورۆز هیچ تایبەت نیە بە ئاگر پەرستانەوە، بەڵکو جەژنێکی نەتەوەیی ئاری نەژادەکانە، لەسەر دەستی کاوەی بڕوادار سەریهەڵداوە، پاشانیش گەلە تاری نەژادەکان بە باوەڕدار و بت پەرست وئاگر پەرستەوە یادیان کردۆتەوە. پاشان ئاگری نەورۆز چەند جیاوازیەکی هەیە لەگەڵ ئاگری ئاگر پەرستاندا، کە دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ ئاگری ئاگر پەرستان چوار وەرزەی ساڵ داگیرساوەو دەئایسێت و بۆ دەقیقەیەکیش ناکوژێتەوە، چونکە ئەوان ئاگرەکە بەخودا دەزانن" خوداش نابێت نەمێنێت!! بەڵام ئاگری نەورۆز چوار وەرزە نائایسێت، بەڵکو ساڵانە تەنها لە ئێوارەی نەورۆزدا دەکرێتەوە و دواتر دەکوژێنرێتەوە.

٢ـ ئاگری ئاگر پەرستان خزمەتکاری تایبەتی هەبووە و خزمەتی ئاگرەکەی کردووە و نەیهێشتوە بکوژێتەوە، بەو خزمەتکارانەش گوتراوە(الهرابذة)، بەڵام ئاگری نەورۆز هیچ کەسێکی دیاریکراوی نیەو نەبووە بۆ خزمەتکردنی.

٣ـ ئاگری ئاگرپەرستەکان لەناو پەرستگاو خانوی تایبەتدا کراوەتەوە، ئەوخانوو پەرستگایانەش پێیان گووتراوە( بیوت النیران) وە بە فارسی پێیان گووتراوە(آتشگدە)، بەڵام ئاگری نەورۆز لەناو خانو و پەرستگادا ناکرێتەوە، بەڵکو زیاتر لەسەر بەرزاییەکان دەکرێتەوە.

---

١ـ کاوە لە نێوان ئەفسانەو ئاییندا: ١٤

٤ـ ئاگرپەرستەکان ڕێزیان لە ئاگرەکە دەگرت و سوجدە و ڕکوعیان بۆ دەبرد و پەرستشیان بۆی دەکرد، بەڵام کورد هیچ کاتێك ڕێزی لە خودی ئاگرەکە نەگرتووەو سوجدەو ڕکوعی بۆی نەبردووە وَ هیچ پەرستشێکی بۆی ئەنجام نەداوە.[1]

کەواتا: ئێستا بۆمان دەرکەوت کە نەورۆز و ئاگری نەورۆز نەدورو نە نزیك پەیوەندی بە ئاگر پەرستیەوە نیە، وە ئاگری نەورۆز بەڵگەش نیە لەسەر ئاگرپەرستیەتی گەلی کورد، بەڵکو ئاگر کردنەوە لە نەورۆزدا دروشی سەرکەوتنە بەسەر ستەمکاریدا.

# حوكمی شەرعی یادكردنەوەی نەورۆز

بەشێك لە مێژوو نوسان نەورۆز و ڕوداوەکانی وەك ئەفسانە دەبینن و وای بۆ دەچن کە نەورۆزو ئەژدیهاو خواردنی مۆخی گەنجی کورد و..هتد ئەوانە هەمووی هەر ئەفسانەن و دورن لە ڕاستیەوە، بەڵام پێویستە ئەوە بزانین کە نەورۆز و ڕوداوەکانی ڕاستی بن یان ئەفسانە و هەڵبەستراوبن" ئەوە یادکردنەوەی نەورۆز هەر ڕاستیە و لەبەر دەستدایە، وە لە کۆنەوە شاعیران و ئەدیبان خۆیان لەگەڵی خەریك کردووە و شیعر و شانامەیان بۆی نوسیوە، وە دوو گەلی گەورەی وەکو کورد و فارس زۆر بە بەربڵاوی یادیان کردۆتەوە و دەکەنەوە، جا مادام نەورۆز ڕاستیەك بێت و لەبەر دەست بێت پێویستە ئێمە فتواو ڕای زانایان بزانین دەربارەی یادکردنەوەی نەورۆز.

سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە زانایان جیاڕان دەربارەی یادکردنەوەی نەورۆز، بەشێکیان بەشێوەیەکی یەکجاری یادکردنەوەی نەورۆز بە کارێکی قەدەغە ـ حرام ـ دەزانن، بەشێکی تریان بە کارێکی ڕەواو دروستی دەزانن، ئەوەی خوارەوەش ڕاو بۆچونی زانایانە لەسەر نەورۆز:

ڕای یەکـــەم/ یاد کردنەوەی نەورۆز قەدەغەیە و حەڕامە: ئەوەش ڕای هاوەڵانی بەڕێز(عمری

١ـ جەژن و یادو بۆنەکان و هەڵسەنگاندنێك، علی باپیر، بەدەستکاریەوە: ١٧٦

کوڕی خــه ططاب و عبدالله ی کوڕی عەمرٍ و علی کوڕی ابی طالب رضي الله عنهم اجمعین)ە:

* وەك گووتمان لە سەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا عمری کوڕی خطابدا ﷺ بە فەرمی یادی نەورۆز قەدەغەکرا، ئەوەش ئاماژەیە بۆ ئەوەی کە پێشەوا عمر بە یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز ڕازی نەبووە.

* وە هەرچی پێشەوا عەلی کوڕی ابی طالبــە ﷺ ڕێگای بە یادکردنەوەی نەورۆز داوە بە جەژنە پیرۆزە لە یەکتر کردن و شیرینی بەشینەوە، بەڵام ڕێگای بە ئاهەنگ گێڕان نەداوە، محمدی کوڕی سیرین رحمه الله دەفەرمووێت: شیرینی نەورۆزیان بۆ پێشەوا علی ﷺ هێنا، ئەویش فەرمووی: ئەوە بەبۆنەی چیەوەیە؟ گووتیان: ئەمڕۆ نەورۆزە، پێشەوا علی ﷺ فەرمووی: (فاصنعوا كلَّ يومٍ فيروزاً)[1] واتا: هەموو ڕۆژێك فەیرۆز ساز بکەن.

جا ئوسامە دەفەرمووێت: پێشەوا عەلی ﷺ لەبەر ئەوە فەرمووی:(فاصنعوا كلَّ يومٍ فيروزاً) نەیفەرموو: (فاصنعوا كلَّ يومٍ نيروزاً) چونکە پێی خۆش نەبوو هەر ناوی نەورۆزیش بهێنێت.[2]

* وە عبدالله ی کوڕی عەمرٍ ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ بنَى ببلادهِم و صَنَعَ نيروزَهُم و ميهرجانَهُم، وتَشَبَّهَ بِهِم حتى يَمُوتَ حُشِرَ معَهُم يَومَ القِيامةِ)[3] واتا: هەر کەسێکی لە ناو بێباوەڕاندا نیشتەجێ بێت، وە یادی نەورۆز بکاتەوە و بەشداری میهرەجانەکانیان بکات، وە خۆیان پێبچوێنێت هەتا دەمرێت" ئەوە لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت لە ڕۆژی قیامەتدا.

وە ئەمە ڕای بەشێك لە زانایانیشە لەناویشیاندا بەشێك لــە زانایانی کورد، وەك مامۆستــا

---

١ـ پێشەوا البیهقی لە سنن الکبرادا گێڕاویەتەوە.

٢ـ إقتضاء الصراط المستقیم: ١٧٣

٣ـ هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەڕە.

عبداللە هەرتەلی خودابیارێزێت: خۆم پرسیارم لە مامۆستای هەرتەلی کرد دەربارەی یاد کردنەوەی نەورۆز، گووتم: ئایا ئەو نەرۆزەی کورد هەمان ئەو نەورۆوەیە کە بەشێك لە هاوەڵان نکۆڵیان لێکردووە، وە ئایا یادکردنەوەی دروستە یان نا؟ لەوەڵامدا فەرمووی: بەڵێ ئەم نەورۆزەی ئێستا هەمان ئەو نەورۆزەیە کە بەشێك لە هاوەڵان نکۆڵیان لێکردووە، وە یادکردنەوەشی دروست نیە.[1]

ڕای دووەم/ یاد کردنەوەی نـــەورۆز کارێکی ڕەواو دروستـــە. ئەوەش ڕای بەشێك لە مامۆستایانی ئاینی و زانایانی کوردە، وەك: شێخ محمدی خاڵ و شێخ محمد قەرەداغی و، مامۆستا مەلا عبداللە ی چروستانی،... لە ناویشیاندا فتوای لیژنەی باڵای فتوای کوردستان زانایان)

لیژنەی باڵای فتوای کوردستان لە ڕۆژی ١٩/٣/ ٢٠١٣دا بە پشت بەستن بە چەند بەڵگەیەك فتوای دروستی و ڕەوایی یادکردنەوەی نەورۆزیاندا، ئەوانەی خوارەوەش دیارترین بەڵگەکانیانن:

١ـ نەورۆز جەژنێکی نەتەوەی گەلی کوردە ودروشمی سەرکەوتنە و هیچ پەیوەندیەکی بە ئاینەوە نیە، وە یاسایەکی فیقیهمان هەیە دەفەرمووێت: (الأصلُ فِي الأشياءِ الإِباحَةُ)واتا: بنەڕەتی هەموو شتێك ڕێپێدان و دروستبونە، مادام دەقێکی وەها نەبێت قەدەغەی بکات.

٢ـ پێغەمبەرﷺفەرموویەتی:(لِكُلِ قومٍ عيدٌ، وهذا عيدُنا)[2]واتا: هەموو گەلێك جەژنێکی تایبەت بەخۆی هەیە، ئەوەش جەژنی ئێمەیە، کە مەبەستی پێی جەژنی قوربان بووە، وە لەڕوانگەی شەرحەکانی( فتح الباري وعمده القاري و إرشاد الساري) بۆمان دەردەکەوێت کە مەبەستی پێغەمبەرﷺجەژنە ئاینیەکان بووە نەوەك جەژنەکانی تـــر، چونکـــە پێغەمبـــەرﷺ

١ـ لەدانیشتنێکدا لەشەرویت لە خزمەتیدا بووم و ئەو پرسیارەم لێکرد.

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

فەرمووی: (لِكُلِ قومٍ عيدٌ)واتا: هەموو گەلێك جەژنێكی هەیە، جەژنی ئیسلامیش ڕەمەزان و قوربانە، وە هیچ دژایەتیەك نیە لە نێوانی جەژنەكان وەك جەژنی ئاینی كە عیبادەت بێت كە هەر ئەم دوانەن، وە ئەوانی تر عادەت و نەریتە.

٣ـ هیچ دەقێك نیە لە قورئان و سوننەت ڕێگری بكات لەوەی بە بۆنەكان بگوترێت جەژن، وە ئاساییە ئێمەی موسڵمان لە پاڵ جەژنە ئیسلامیەكاندا جەژنی نەتەوەیشمان هەبێت، وەهیچ دەقێكیشمان نیە ڕێگری لێبكات.

٤ـ خەڵكی ئەو جەژنە بە عیبادەت نازانن، وە وەها سەیری ناكەن كە خودای گەورە ڕۆژی نەورۆزی وەك جەژن بۆ دانابن. كەواتا دەچێتە باسی نەریتەكانەوە و بنچینەی نەریتەكانیش ڕەوایەتیە.

٥ـ ئەمەش كە پیاو و ژنی نامەحرەم بەشێوەیەكی ناشەرعی تێكەڵ دەبن، ئەمە ڕاستە ڕێگا پێدراو نیە و حەرامە، بەڵام ئەم حەرامە(لذاته) نیە، بەڵكو حەرامێكی پەیدابوو(عارضی)یە، لەبەر ئەوە لەسەرمان پێویستە ئامۆژگاری گەنجەكانمان بكەین و ئاگاداریان بكەینەوە لەسەر حەرامی تێكەڵ بوونی كوڕو كچ.

٦ـ لە ساڵی ١٩٧٠دا زانایانی كورد وەك: (شێخ محمدی خاڵ و مامۆستا مصطفى نجیب قەرەداغی و، عبدالحمید ئەتروشی و، شێخ محمد قەرەداغی و، مامۆستا سەید حسن لە كەركوك و، مامۆستا مەلا عبدالله ی چروستانی و، مەلاعبدالله ی پەرخی و مامۆستا مەلا عبدالسلام) فتوایان داوە كە نەورۆز جەژنی نەتەوەی كوردە، وە ئاگری نەورۆزیش ئاماژەی سەركەوتنی شۆڕشی نەتەوەیەكە بەسەر زوڵم و ستەمدا، نەورۆزیش سەری ساڵی كوردیەو خۆی لە خۆیدا بۆنەیەكی ڕەوایە، وە ئەگەر خوانەخواستە شتی نائاسایی و ناشەرعی لەهەر بۆنەیەك ڕو بدات نابێت بەهۆیەوە بۆنەو جەژنێكی نەتەوەیان لەكەدار بكەین.

جا ئەوەی ڕابرا ڕاو بەڵگەی زانایانی هەردووك ڕایەکە بوو، بەڵام ئەوەی پێویستە ئاماژەی پێبکەم ئەوەیە: ئەگەر بێت و ڕێگا بە یادرکردنەوەی نەورۆزیش بدرێت" ئەوە دەبێت بەهەموو توانایەکمانەوە ڕێگری بکەین لەو بێشەرعیانەی کە تێکەڵ بەنەورۆز بوون، لە سازکردنی ئاهەنگی بێشەرعی و دابینکردنی بودجەی خەیاڵی لە قوتی خەڵك بۆ ئەو یادەو هێنانی گورانیبێژو سەماکاری بیانی دیسان ئەویشیان بە پارەیەکی خەیاڵی لەسەر حیسابی قوتی خەڵك و بۆ تێکدانی ڕەوشت و کلتور و نەریتی کوردایەتی، وە تێکەڵاوبونی کوڕ و کچی نامەحرەم و....هتد. خۆ ئەگەر بێت و بۆمان بگونجێت وەکو پێشەوا علی رضي الله عنه تەنها ڕێگا بەجەژنە پیرۆزەو دابەشکردنی شیرینی بدرێت و ڕێگری بکرێت لە ئاهەنگ گێڕان ئەوە باشترینیانە.



# یادی ڕاپەڕینی گەلی کورد لە ٣/٥ دا

لە ڕۆژی٣/٥دا گەلی کورد لە کوردستانی باشور دژی دام و دەزگا داپڵۆسێنەر و تاوانبارەکانی ڕژێمی بەعس، ڕاپەڕی و لـــە مـــاوەیەکی پێوانەییدا زۆرینـــەی خاکـــی باشوری کوردستان بە کەرکوکیشەوە لە دەستی ئەم ڕژێمە ستەمکارە سەندرایەوەو خانەخوێ گەڕایەوە بۆ ماڵی خۆی، جا هەرچەندە پشدەریەکان وای دادەنێن کە یەکەم جار ئەوان لە ٣/٤دا لە خەبات ڕاپەڕینیان دژی ڕژێم بەرپا کردووە و یەکەم شەهیدیش شەهید بەختیار بووە، بەڵام تا ئێستاش هەر ٣/٥ وەکو دەستپێکی ڕاپەڕین و ڕۆژی ڕزگاری گەلی کورد دیاری کراوە، لەبەر ئەوە ساڵانە گەلی کورد لە کوردستانی باشور یادی ئەم ڕاپەڕینە مەزنە دەکاتەوە و تیایدا چەندین کارو چالاکی ڕێکدەخەن و بەو بۆنەیەوە ئاهەنگ سازدەکەن و خۆشی خۆیان دەردەبڕن، وە هاوڵاتیان کورد لە کوردستانی باشور ئەم ڕۆژە وەك ڕۆژی نەتەوەیی و ڕۆژی ڕزگاری گەلی کورد ئەژمار دەکەن.

## ڕاپەڕین بۆچی و لە پای چی؟

بەدرێژایی مێژووی تازە هیچ ستەمکار و ڕژێم دیکتاتۆرێك نەبووە ئەوەندەی دیکتاتۆرە بەعسیەکەی عێراق دڕندە بێت و هەوڵی لە ناو بردنی گەلەکەی و نەیارەکانی بدات، وە لەناو گەلی عێراقیشدا ڕژێمی بەعس بەتایبەت هەڵمەتەکانی لەناوبردنی گەلی کوردی چڕ کردبۆوە، وە لەچەندین هەڵمەتی دڕندانەدا بەشێکی زۆری خاك و نیشتمانی کوردستانی وێرانکرد، وە سەدان هەزار هاوڵاتی کوردی بەژن و منداڵەوە بە دڕندانە ترین شێوە لەناو برد، ئەوە جگە لەوەی کە دەیان وسەدان هەزار کەسی تریش بەبێ دادگایکردن لە بەندیخانەکاندا لە ژێر جۆرەها ئەشکەنجەو ئازاردا ژیانی بەسەر دەبرد، یان سەری دەنایەوە، وە ئەو کەسەی لە دەرەوەی بەندیخانەکانیش دەژیا وەك مرۆڤی پلە دوو سەیری دەکرا، وە هیچ کاتێك دەرون و بیرو هزری ئاسودە نەبوو، ئێمە لێرەدا بەخێرایی چاوێك دەخشێنین بە دیارترین ئەو کارەسات و نەهامەتیانەی کە ڕژێمی بەعس

بەسەر گەلی کوردیدا هێناون کە لە ساڵی ۱۹۷۱وە دەست پێدەکات و بە ساڵی ۱۹۸۸ز کۆتایی پێدێت، بۆ ئەوەی بزانین ئاخۆ خەڵکی کوردستان بۆچی دژی ڕژێمی بەعس ڕاپەڕی:

یەکەم/ لە نێوانی ساڵەکانی (۱۹۷۱ بۆ ساڵی ۱۹۷۹ز)دا ڕژێمی بەعس دە هەزار کوردی فەیلی لە عێراق دەرکرد و بەرەو وولاتی ئێران ئاوارەی کردن، ئەمە جگە لەوەی کە چەند هەزار گەنجێکی کوردە فەیلیەکانی هەر بێ سەر و شوێن کرد.

دووەم/ بۆمباباران کردنی شاری قەلادزێ لە (۲٤/٤/۱۹۷٤ز)دا بە بۆمبی قەدەغەکراوی نێو دەوڵەتی، کە لە ئەنجامدا بوو بەهۆی شەهید کردنی ۱٦۳کەس لە ژن و پیرو منداڵ و بریندار بوونی ٤۰۰هاولاتی،وە وێرانکردنی زیاتر لە بیست و سێ ماڵ و سی و شەش دووکان و نۆ بینای حکومی، وە پاشانیش لە ۲٤/٤/۱۹۸۲دا و لە یادی بۆمباباران کردنی شارەکەدا خەڵکی نەبەزی قەلادزێ لە دژی دام و دەزگا داپڵۆسێنەرەکانی ڕژێمی بەعس ڕاپەڕین، بەلام جارێکیتر دارودەستەی ڕژێم زۆر نامەردانە ڕوبەڕوی خۆپیشاندەران بوونەوەو دەستیانکرد بەتەقەکردن لە خۆپیشاندەران، لە ئاکامدا دوو ئافرەت شەهید بوون و دوو کەسی تریش بریندار بوون و حەفتاو دوو کەسیش دەستگیر کران، وە پاشان و لە ساڵی ۱۹۸۹دا ڕژێمی بەعس خەڵکی قەلادزێی ڕاگواست و سەرجەم خانوو و ماڵەکانی کە پێنج هەزار خانوو بوون تەخت کردن و یەکسانی کردن لەگەڵ زەویدا، وە هەر لەو هەڵمەتە دڕندانەیەدا ۱۳ مزگەوت و خانەقایەکی نەقشبەندی ڕوخاند و ۱۳ قوتابخانەی سەرەتایی و ٤قوتابخانەی ناوەندی و ۱ قوتابخانەی ئامادەیی و باخچەی ساوایان و نەخۆشخانەو سەرجەم بینا حکومیەکانی تری ڕوخاند،وە خەڵکەکەشی پەرتەوازە کرد بۆ کۆمەڵگا و ئۆردوگا زۆرەملێیەکانی تۆبزاواو خەبات و جەدیدە ودارەتوو و کەوەرگۆسك و کەڵەکی یاسین ئاغا لە هەولێر و کۆمەڵگاکانی پیرەمەگرون و حاجی ئاواو باینجانە و هەردوو بازیانی یەك و دوو لە سلێمانی.[1] ئەم ڕاگواستنەش بۆ زۆرێك لە هاولاتیانی ناوچەکە جار دووەم بوو، چونکە لە ســـاڵی

۱ـ کۆستی شارێك: ۸۹وە ۲۰۹وە ۲۱۸ـ ۲۱۹

١٩٧٦ وەك هەنگاوی یەکەم خەڵکی زۆرینەی گوندەکانی دەوروبەری قەڵادزێ و سەر بە پشدەری بە ناحیەی هێرۆشەوە کە ژمارەیان نزیکەی ٢٩٤گوند بوو ڕاگواستبون و لە ئۆردوگای قەڵادزێ و تووەسوران نیشتەجێی کردبوون.

سێهەم/ هەڵمەتی ڕاگواستنی گوند و ناحیەکان و خاپور کردن و یەکسان کردنیان لەگەڵ زەوی: کاتێك سەیری مێژووی ڕەشی ڕژێمی بەعس دەکەی بەرامبەر بەکورد زۆر بە ئاسانی بۆت دەردەکەوێت کە مەبەستی سەرەکی ئەو ڕژێمە لەناو بردنی کوردو تێکدانی خاك و ژینگەکەی بووە، ویستویەتی لەم باکوری عێراقەدا گەلێك نەبێت بەناوی کورد، خاکێك نەبێت بەناوی کوردستان، وە هەر لەبەر ئەو مەبەستە لە ساڵی ١٩٧٥وە دەستی کرد بە ڕاگواستن و دەربەدەر کردنی گووند و ناحیەکان لە سەرجەم ناوچەکانی کوردستان، لە نێوانی ساڵەکانی ١٩٧٦بۆ ١٩٧٩دا زیاتر لە ١٢٢٢گوندی لە سەرجەم ناوچەکانی کوردستان ڕاگواست، وە هەتا ساڵی ١٩٨٨ ڕێژەی گوندە ڕاگوێزراوەکان بوون بە ٣٨٣٩ گوند، وە ئەو ماڵانەی لەو ماوەیەدا ڕاگوێزران٢١٩٨٢٨گوند بوون، وە ژمارەی ئەو کەسانەی ڕاگوێزران بریتی بوو لە ١١٦٨٤١٦کەس[١]، جا ئێمە لێرەدا تەنها بەشێك لە ئامارەکانی سەر بە شاری کەرکوك وەردەگرین بۆ ئەوەی گەورەیی ئەم تاوانە بزانین:

* لە ناوچەکانی سەر بە شاری کەرکوك ئامارەکان بەو شێوە بوون:

١ـ ٧٨١ گوند سوتێنران و وێرانکران و لەگەڵ زەویدا یەکسان کران،

٢ـ شەش مەرکەزی ناحیە وێران کران.

٣ـ ٣٩١٧٨خانوو وێران کران بە هەندێگ گەڕەکی کەرکوکیشەوە.

٤ـ ٤٥٧٧٢ ئاوارەو بێ سەر و شوێن بوون.

---

١ـ قسوە لدی صدام حسین: saddamscruelty.blogspot.com

٥ـ ١٥٧ تەکیە و خانەقا و مەزارگەو شوێنەواری ئاینی وێران کران.

٦ـ ١٤٣٢ ڕەزو باغ وێران کران.

٧ـ ٤٧٢٧٧هەزار سەر مەڕ و بزن و ١٥٠٠٠ سەر ڕەشە وڵاخ بە تاڵان بران و فەوتێنران.

٨ـ ٥٧٠٠٠٠ طن گەنم و جۆو دانەوێڵەی تر فەوتێنران یان سوتێنران.

چوارەم/ شاڵاوی جینۆساید کردنی گەلی کورد کە بە (ئەنفال) ناسراوە، ڕژێمی بەعس لە نێوانی ١٧ـ٢/١٨/ ١٩٨٨ هەتا ١٩٨٨/٨/٢٥ شاڵاوێکی زۆر دڕندانەی کردە سەر بەشێکی زۆر لە خاکی کوردستان و بەچەند قۆناغێك زۆرێك لە شارۆچکە و گوندەکانی هەرێمی کوردستانی ڕوخاند و خەڵکەکەشی یان ڕاگواستن بۆ ئۆردوگا زۆرە ملێکان، وە یان بە زیندوویی خستیاننە ژێر گڵەوە و زیندە بەچاڵیان کردن، ئەوەی خوارەوەش قۆناغەکانی جینۆسایدی گەلی کورد بوو:

قۆناغی یەکەم/ ڕژێمی بەعس لە بەرواری ١٧ـ٢/١٨/ ١٩٨٨یەکەمین هێرشی ئەنفالی دەستپێکرد لە سنوری قەزاو نەحیەکانی (دوکان، بنگرد، چوارتا، قەلاچوالان، سەرچنار، سورداش) کە سەر بە پارێزگای سلێمانین، وە لە ٣/١٩و بە گرتنی سەرگەڵو و بەرگەڵو کۆتایی پێهات.

قۆناغی دووەم/ لەبەرواری ١٩٨٨/٣/٢٢بۆ سەر ناوچەکانی:(بازیان و قەرەداغ و دەربەندیخان) کە ئەوانیش هەر سەر بە سلێمانی بوون دەستپێکرد، وە لە ٣/٢٩هەمان ساڵ کۆتاییان پێهات.

قۆناغی سێهەم/ ئەم قۆناغەیان بەر فراوانترین قۆناغی جینۆسایدەکە بوو، کە بەئەنفالی گەرمیان ناسراوە، ئەم قۆناغە لە ١٩٨٨/٤/٧دەستی پێکرد بۆسەر ناوچەکانی: (چەمچەماڵ، سەنگاو، قادر کەرەم، دوز، کفری، کەلار، پیباز، تیلەکۆ) وە لە ٤/١٨/ کۆتایی پێهات، جێگای ئاماژەیە وەك گوتمان ئەم قۆناغەیان بەرفراوانترین قۆناغی جینۆسایدەکە بوو، کە تەنها لە (قادر کەرەم و سەنگاو و پیباز و تیلەکۆ) زیاتر لە بیست هەزار ژن و منداڵ کۆکراونەتەوە و دواتر بە ئیفای سەربازی براون و دواتر بێ سەرو شوێن کراون.

قۆناغی چوارەم/ لە بەرواری٢٠/ ٤/ ١٩٨٨ لە ناوچەکانی (ئاغجەلەر، چەمی ڕەزان، ناوشوان، دەشتی کۆیە، تەق تەق) دەستی پێکرد، وە پاشان دوای کیمیا باران کردنی گوندی (گۆپتەپە) کە زیاتر لە ٢٠٠کەسی تێدا کوژرا کۆتایی هات.

قۆناغەکانی پێنجەم و شەشەم/ لەم قۆناغەدا ڕژێم هێرشی کردە سەر (دۆڵی بالیسان و شێخ وەسانان و دۆڵی سماقولی و گوندی کۆلکە ڕەش و ئاشقولکە و سورەدێ و قرناقەو پشتاشان وبۆڵی ) وە هەر لەم قۆناغەدا هێرشی کردە سە ر بادینان، وە ئەم قۆناغە لە ٢٥/٨/ ١٩٨٨کۆتایی پێهات، جێگای ئاماژەیە لەسەرجەم ئەم قۆناغانەدا ١٨٢٠٠٠ مرۆڤی کوردی نێتاوان بونە قوربانی و بێسەر و شوێن کران، ئەمە جگە لەم هەموو زەرەد و زیانە ژینگەیی و دارایی و دەرونیەی کە لەدوای خۆی بەجێی هێشت.[1]

## ڕژێمی بەعس بۆ ناوی لە جینۆسایدی کورد نا (ئەنفال)؟

لە ئیسلامدا بەو ماڵ و سەروەت و سامانە دەگوترێت ئەنفال کە لە جەنگی بێباوەڕاندا دەبێتە دەستکەوتی جەنگاوەرە موسڵمانەکان، بەڵام ڕژێمی بەعسی عەلمانی هاتو هەڵمەتی جینۆساید کردنی کوردی ناونا ئەنفال، جا بابزانین ڕژێمی بەعس بۆ ئەم ناوە پیرۆزەی هەڵبژارد بۆ جینۆساید کردنی کورد:

١ـ هیچ گومانێك نیە کە ڕژێمی بەعس هەتا ساڵی ١٩٩٠یش پەیوەندیەکی زۆر توندو تۆڵی هەبوو لەگەڵ ئەمریکاو ئەوروپادا، وە ئەمریکاو ئەوروپا چاویان نوقاند بوو لە ئاست ئەو هەموو تاوان و جینۆسایدەی ڕژێمی بەعس بەرامبەر بە کورد و کوردستان، وە ئەوەك هەر چاو نوقاندن بەڵکو ئەو چەك و تەقەمەنیە ڕژێم بەرامبەر بەکورد بەکاری دەهێنا زۆربەی لە ئەمریکاو بەشێك

---

١ـ بروانە بۆ کتێبی: هەڵەبجەو ئەنفال: لەوێدا بەبەڵگەنامەوە و بە شێوەیەکی فراوان باسی ئەنفالی کردووە.

لە وولاتانی ئەوروپا بەر دەستی دەکەوت، جا هەروەك چۆن لەبواری سەربازیدا عێراق سودمەند بوو لە چەك و تەقەمەنی و بێدەنگی ئەمریکاو ئەوروپا" بەهەمان شێوە لە هەڵبژاردنی ناوی ئەنفالیش صەددام حسێن و ڕژێمی بەعس سودمەند بوون لە مێژوی ئەمریکا و ئینگلیز، چونکە ناونای جینۆسایدی کورد بە ئەنفال دووبارەکردنەوەی هەمان ئەو سیاسەتە بوو کە ئینگلیزەکان دوای دۆزینەوەی ئەمریکا لە بەرامبەر جینۆساید کردنی هیندە سورەکان بەکاری هێنا، چونکە دوای ئەوەی کە ئەمریکا دۆزرایەوە ئینگلیزەکان ٨٠ملیۆن هیندی سوریان جینۆساید کرد وە هەریەك لە شارستانیەتەکانی (ئانیکا و مایا و ئازتیك) یان لە ناو برد، وە هەموو هەفتەیەك کەشتیەکیان دەنار بۆ تالآنکردنی زێڕو زیوی ئەو ناوچەیە، ئەوەش هەمووی بەناوی کەنیسەوە، وە ملیۆنەها کەسی ئەفریقیان جینۆساید کرد، هەمووشی بەناوی دینەوە، هەتا ئەو کەشتیانەی کە دەیانناردن بۆ دزینی سەروەت و سامانیان و بە کۆیلە گرتنیان، هەموویان ناوی پیرۆزی ئاینی مەسیحیان لێنابوون، بۆنموونە: کەشتیەکیان ناو نابوو (کەشتی سلیمان) یەکێکی تریان ناونابوو: (کەشتی یسوع) یەکێکی تریان ناو نابوو (کەشتی یوحنا المعمدان).[1] بەهەمان شێوە صەددام حوسەینیش هەموو تاوانکار و کاولکاری و جەنگەکانی لە ژێر ناوە پیرۆزە ئاینیەکانەوە ئەنجام دەدا، بۆنمونە: ئەو موشەکانەی کە لە جەنگی هەشتا ساڵەی لەگەڵ ئێراندا دەیگرتنە ئێران ناوی لێنابوون موشەکی(حوسەینی و عەبباسی) بەناوی هەردووك هاوەڵی بەڕێز(حسینی کوڕی عەلی و عەبباسی کوڕی عبدالمطلب رضي الله عنهما) وە ناوی قەزای دیانانی کرد بە (قضاء الصدیق) بەناوی هاوەڵی بەڕێز ابوبکری صدیقەوەﷺ وە ئەو ڕێکخراوەی سخوڕی بەسەر کوردەوە دەکرد ناوی لێنا (منظمة الفاروق) بەناوی عمری کوڕی خطابەوەﷺ، وە ئەو سەربازگەی کە کوردی تێدا بەند دەکرد ناوی نا(خالد بن ولید)[2] بەهەمان شێوە هەڵمەتی جینۆسایدی کوردیشی کرد بە

١ـ اطلس إنتشار الإسلام: ١٨وة ٨٠

٢ـ ئەنفال لە ڕوانگەی ئیسلامەوە: ١٨

ناوی پیرۆزی ئەنفالەوە، بۆ ئەوەی ڕەوایەتیەکی ئاینی لە سەر ئاستی وولآتانی ئیسلامی بە تاوانەکەی بدات.

٢ـ بۆ ئەوەی ئیسلام لەبەر چاوی کورد ناشیرین بکات. هۆکاری دووەم لە ناونانی هەڵمەتی جینۆسایدی کورد بە ئەنفال ناشیرین کردنی ئیسلام بوو لەلای گەلی کورد، بۆ ئەوەی بەکورد بڵێت: ئەوە ئیسلامە ڕێگای داوە ئێوە جینۆساید بکرێن، بەداخەوە زۆرێك لە عەلمانیەکانی کوردستان بە زۆر زانی یان بەنەزانی ئێستاش جینۆسایدی کورد لەسەر ئیسلام ئەژمار دەکەن، بەو هۆیەشەوە زۆر گەنج هەیە ڕەنگە بکەوێتە هەڵەوە و بڕوا بە عەلمانیەکان بکات، نازانێت کە حیزبی بەعس بۆخۆی حیزبێکی ئیسلامی نەبوو بەڵکوو حیزبێکی بێ دینی عەلمانی بوو، حیزبی عەلمانیش کەی گوێی بە دەقەکانی ئیسلام داوە و پشتی پێبەستوون هەتا لێرەدا پشتی پێبەستێت؟! وە حیزبی عەلمانی هەموو کاتێك کار دەکات لەسەر لاوازکردنی ڕۆڵی ئاین لەهەر کۆمەڵگایەکدا بێت، حیزبی بەعسیش هەر لەبەر ئەوە ئەو کارەی ناونا ئەنفال بۆ ئەوەی بەهۆیەوە ئیسلام لەکەدار بکات، ئەگەر نا ئیسلام لەگەڵ کوشتنی چۆلەکەیەکدا نیە بەبێ هۆ!! لە ئیسلامدا هەر کەسێك تەنها کەسێك بکوژێت وەك ئەوە وایە هەموو مرۆڤایەتی لەناو بردبێت، نەوەکو بێیت و ١٨٢٠٠٠کەسی بێتاوان بکوژیت، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿مَن قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الْأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا﴾[1]

پێنجەم/ کیمیاباران کردنی هەڵەبجەو ناوچەکانی تری کوردستان: لە ١٩٨٨/٣/١٦داو لە ڕۆژەکانی کۆتایی جەنگی عێراق ئێراندا ڕژێمی بەعس هێرشێکی زۆر نامەردانەی کردە سەر شارۆچکەی هەڵـەبجە و بە چـەکی کۆکوژی کیمیاوی ـ کە لەسەر ئاستی جیهان چەکێکی قەدەغەکراوە ـ هێرشی کردە سەر ئەو شارۆچکەیە، لە ئەنجامدا ٥٥٠٠هاوڵاتی لە ژن و منداڵ و

١ـ المائدة: ٣٢

پیرو پەککەوتەو خەڵکی بێوەی گیانیان لەدەستدا لەو ڕێژەیەش ۳۰۰۰بۆ ۵۰۰۰ دەست بەجێ گیانیان لەدەستدا، وە زیاتر لە حەوت هەزاریش بریندار بوون، کە دواتر ڕێژەیەکیان لە ژێر کاریگەری ئەو برینانەدا گیانیان لەدەستدا، وە هەتا ئێستاش کاریگەری بەکارهێنانی ئەو چەکە بەسەر ژینگەو خەڵکی ئەو شارەوە ماوە، وە تائێستاش زۆرێك لە دایك و باوكـــان چاوەڕێی گـــەڕانەوەی منداڵەکانیانن کە دوای ئەوەی بەبرینداری گوێزراونەتەوە بۆ وولاتی ئێران لێك دابڕاون، وە ئەوەی جێگای ئاماژەشە ئەوەیە ئەو وولاتانەی کە ئێستا فرمێسکی تیمساحی بۆ خەڵکی کوردستان بەگشتی و هەڵەبجە بەتایبەتی هەڵدەڕێژن، وە بەتایبەت ئەمریکا کە کورد وەك هاوپەیان و دۆستی خۆی سەیری دەکات" ئەوکات دۆستی گیانی بەگیانی ڕژێمی بەعس بوو، وە بەردەوام دڵسۆزی و پشتیوانیان بۆ صەدام دەردەبڕی،[1] وە ئەو کات هیچ هەڵوێستێکی وای بەرامبەر بە ڕژێمی بەعس نەنواند، بەڵکو ڕەنگە هەوڵی شاردنەوەی کارەساتەکەشی دابێت، وە تائێستاش زۆرینەی ئەو وولاتانەی بانگەشەی مافەکانی مرۆڤ دەکەن ئەم کارەساتەو کارەساتەکانی تری کوردستانیان وەك جینۆساید نەناساندووە!!

خوێنەری بەڕێز: ئەوانەی ڕابڕان بەشێك بوون لەو تاوانانەی کەڕژێمی بەعس بەرامبەری کورد ئەنجامی داون، وە ئەو تاوانانە و حەزی سەربەخۆیی و ئازادی هۆکاری سەرەکی بوون بۆ گەڕان بەدوای ڕزگاریدا، وە ئەو تاوانانە ڕۆژ بەڕۆژ حەزی تۆڵە و ئاواتی ئازادی لای هاوولاتی کورد زیاد دەکرد، بەشێوەیەك چەندە ڕژێمی بەعس دڕندەتر دەبوو" ئەوەندە تاکی کورد زیاتر ڕق ئەستور دەبوو، وە هاوولاتیانی کوردستان لە دەرفەتێك دەگەڕان بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆیان لەو ڕژێمە فاشستە بستێننەوە و ئازادی بەدەستبهێنن، هەتا خودای پەروەردگار دوای جەنگی ئێران و کوەیت ڕژێمی بەعسی خستە نێو تەنگژەیەکی هەرێمی و نێودەوڵەتی، ئەوەش دەرفەتێك بـــوو

---

[1] ١- بڕوانە کتێبی هەڵەبجەو ئەنفال لەوێدا چەند بەڵگەنامەیەکی خستۆتە ڕوو کە هەتا ساڵی ١٩٩٠یش ئەمریکا هەر بەڵێنی دۆستایەتی لەگەڵ ڕژێمی بەعس دووپات کردۆتەوە.

بۆ ئەوەی هاوولاتیانی کوردستان لە دژی ئەو رژێمە راپەڕن، ئەوەبوو لە ٣/٥ خەلکی رانیە لەدژی رژێمی بەعس راپەڕی و پاشانیش ئاگری ئەم راپەرینە سەرجەم کوردستانی باشوری گرتەوە و کورد توانی رزگاری بێت لەم هەموو ستەمکاریەی رژێمی بەعس و تا رادەیەك سەربەخۆیی بەدەستبهێنێت.

## حوکمی یادکردنەوەی راپەڕین یان رۆژی نیشتمانی

ابوهریرە رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ بەلای کۆمەلێك جولەکەدا تێپەری بینی بەرۆژون، لێی پرسین بەهۆی چیەوە بەرۆژون؟ گوتیان: (...وهذا يومٌ استَوَتْ فِيهِ السَّفِينَةُ عَلَى الْجُودي فَصامَهُ نُوحٌ وَمُوسَى شُكراً لِلّهِ تَعَالَى فَقالَ النَّبِيُّﷺ: أَنَا أَحَقُّ بِمُوسَى وَأَحَقُّ بِصَومِ هذَا الْيومِ فَأَمَرَ أَصْحابَهُ بِالصَّومِ)[1] واتا: لەم رۆژەدا کەشتیەکەی نوح علیه السلام لەسەر چیای جودی لەنگەری گرت، لەبەر ئەوەهەردووك پێغەمبەران نوح و موساعلیها السلام وەك سوپاسگوزاری بۆ خودا تێیدا بەرۆژوبوون، پێغەمبەریشﷺفەرمووی: ئێمە لەپێشترین بە موسا، وە لەپێشترین بۆ ئەوەی بەرۆژو بین، لەبەر ئەوە فەرمانی بە هاوەلە بەرێزەکان کرد لەو رۆژەدا بەرۆژو بن.

جا ئەم فەرموودەیە بەلگەیە کە دروستە مرۆڤی باوەڕدار یادی رزگار بونی لەدەستی ستەمکاران بکاتەوە، بەلام بەخواپەرستی و سوپاسگوزاری خودا" نەوەك بە کاروباری بێشەرعی و رەنجاندنی خودا، چونکە هەریەکێك لە پێغەمبەران نوح و موساو محمد علیهم الصلاه والسلام یادی رزگاربونەکەیان بە رۆژو کردەوە، نەوەك ئاهەنگ و کاروباری بێشەرعی.

وەکۆمەلێك لەزانایان لەناویاندا بەشێك لە زانایانی سعودیەش ـ لە کاتێکدا ئەوان زۆر توندن لە رێگادان بەم جۆرە بۆنانەـ رێگایان داوە بە یادکردنەوەی رۆژی نیشتیمانی،بۆنمونەی عبدالعزیز فەوزان دەفەرمووێت: (وَمَعَ تَرجِيحِي لِجَوازِ تَخصِيصِ يَومٍ لِلْوَطَنِ لِلتَّذكِيرِ بِأَهَمِّيَتِهِ، وَالتَّواصِي

١ـ پێشەوا احمد لە مسندەکەیدا گێراویەتەوە.

بحفظِ مَصالِحِ الْوَطَنِ، وَصِيانَةِ مُكْتَسَباتِهِ، إلا أنّي أكرَهُ كَراهَةً شَدِيدةً إقامَةَ الْاحتِفالاتِ وَالْمِهرَجاناتِ الْعامَّةِ بِمُناسَبَةِ الْيَومِ الْوَطَنِي وذلك لأمرين: الأول : ما قَدْ يَحْصِلُ فِي هذِهِ الْمِهرَجاناتِ مِنْ مُنكَراتٍ وَمُخالَفاتٍ شَرعِيَةٍ،... الثاني: الْخَشيَةُ مِنَ الْمُبالَغَةِ فِي الْاحتِفالاتِ الَّتِي تُقامُ بِهذِهِ الْمُناسَبَةِ حَتَّى تَطْغَى عَلَى الاحتِفالِ بِالأعيادِ الشَّرعِيةِ، الَتِي يَشرَعُ الاجتِماعُ لَها، وَإِظهارُ الْفَرَحِ وَالسُّرُورِ بِها، وَتَبادُلِ التَّهانِي وَالتَبرِيكاتِ...)[٢] واتا: هەرچەندە من لەگەڵ ئەو ڕایەدام کە دروستەڕۆژێك دیاری بکرێت بۆ نیشتمان و یادکردنەوەی گرنگیەکانی، وە بۆ ئامۆژگاری ڕۆڵەکانمان بۆ پاراستنی بەرژەوەندیەکانی و پـاریزگاریکردن لـە ئـامانجە بەدەستهاتوەکانی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆر بەکارێکی ناپەسەندی دەزانم کە ئاهەنگ و مەڕاسیمی تایبەت بەو یادە ئامادە بکرێت، ئەوەش لەبەر دوو هۆکار: یەکەم/ زۆربەی جار ئەو ئاهەنگ و مەڕاسیمانە کاری ناپەسەندو بێ شەرعیان تێدەکەوێت،.. دووەم/لەترسی ئەوەی زیادەڕەوی بکرێت لە یادکردنەوەی ئەم یادانەدا، بەشێوەیەك خەڵکی زیاتر لە جەژنە شەرعیەکان گرنگی پێبدەن لەکاتێکدا لەواندا سوننەتە کۆبونەوە و دەربڕینی دڵخۆشی و پیرۆزبایی لەیەکتر کردن و....

کەواتا: باشترین فتوا بۆ یادی سەربەخۆیی و ڕۆژی نیشتیمانی ئەوەیـە: کـــە ئەم یادە بە سوپاسگوزاری خودا و بەبێ ئاهەنگ و بێ شەرعی ئەنجام بدرێت، بۆ ئەوەی ئەو نیعمەتی سەربەخۆیی و ڕزگار بوونە لەدەستی ستەماکاران کە خودا پێیداوین هەر بەردەوام بێت، خودای گەورە دەفەرموێت:﴿لَئِن شَكَرْتُمْ لَأَزِيدَنَّكُمْ﴾[٢]واتا:ئەگەر سوپاسی من بکەن لەسەر نیعمەتەکان" ئەوە نیعمەتەکانتان بۆ بەردەوام و زیاد دەکەم.

---

١ـ سایتی صید الفوائد.

٢ـ إبراهيم: ٧

# جەژن و یاد و بۆنە جیهانیەکان

جەژن و یاد و بۆنە جیهانیەکان: بە هەموو ئەو ڕۆژانەی ساڵ دەگووترێت کە لە لایەن نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، یان ڕێکخراوێکی جیهانیەوە ، یان وولاتانی مەسیحی و جولەکە بۆ بابەتێك یان چینێکی تایبەتی کۆمەڵگا دیاریکراون و وەك چاولێکەری و لە ژێر ناوی عەولەمەوە وولاتانی دونیاو لە ناویشیاندا وولاتانی ئیسلامی گرتۆتەوە. جا لە ڕوی حوکمی شەرعیەوە ئەم جەژن و یادانە دەکرێن بە دوو بەشەوە:

یەکەم/ ئەو جەژن و یادو بۆنانەی کە تایبەتن بە ئاینی مەسیحیەت و جولەکە و دینە باطلەکانی ترەوە، وە یان خەڵکی هان دەدەن بۆ کارێکی قەدەغەی شەرعی ، وەك جەژنی سەری ساڵی زاینی و ڤالانتاین و درۆی نیسان ... هتد ، ئەم جەژن و یاد و بۆنانە بە کۆدەنگی زانایانی ئیسلام یادکردنەوەیان قەدەغەیە ـ حەرامە ـ وەنابێت پیرۆزبایش لە کافران بکرێت بەم بۆنەیەوە، ئەمەی خوارەوەش ڕاو بەڵگەی زانایانە لەسەر حەرامی ئەو جەژنانە:

١ـ خودای گەورە(جل جلاله) دەربارەی صیفەتی بەندە چاکەکانی خۆی دەفەرموێت :﴿والذين لايشهدون الزور﴾[1] زانایان: أبوعاليه وإبن سيرين و ضَحاك و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس(رحمهم الله) دەفەرمون: واتا ئەوکەسانەی بەشداری جەژنی کافر و هاوبەش دانەرەکان ناکەن[2].

٢ـ خودای پەروەردگار دەفەرموێت:﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾[3] واتا: یارمەتی وکۆمەکی یەکتری بکەن لەسەر خێر و چاکە، وە نەکەن کۆمەکی و یارمەتی یەکتری بکەن لەسەر تاوان و خراپە. جا ئەگـــەر کۆمەکی موسوڵمانان لەسەر خراپــەو

---

١ـ الفرقان : ٧٢

٢ـ تفسير القرآن العظيم ، ابن كثير: ٦/٢٥

٣ـ المائدة : ٢

تاوان حەرام بێت "دەبێت کۆمەکی مرۆڤی کافر چۆن بێت؟! بێگومان بەشداریکردنیش لە جەژنی بێباوەڕان کۆمەك کردنیانە لەسەر تاوان و خراپە.

٣ـ خودای پەروەردگار دوای ئەوەی باسی شەریعەت و پەیامی پێغەمبەرەکانی بەنی نیسرائیل دەکات، بە پێغەمبەرﷺ دەفەرموێت ﴿ ثُمَّ جَعَلْنَاكَ عَلَى شَرِيعَةٍ مِّنَ الْأَمْرِ فَاتَّبِعْهَا وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَ الَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾[1]واتا: ئەی پێغەمبەرﷺ ئێمە تۆمان خستوتە سەر بەرنامەو پەیامێکی ڕاست و ڕەوان، تۆش لەسەر ئەم پەیامە برۆ و نەچی شوێن هەواو ئارەزوی کافرو هاوبەشدانەرە نەزانەکان بکەوی. ئەمەش فەرمانێکی گشتی پەروەردگارە بۆ هەموو ئوممەتی محمدﷺ کە نابێت شوێن هەواو ئارەزوی بێباوەڕان بکەون لە هیچ بابەتێکدا" چونکە بۆخۆمان شەریعەتێکی تێرو تەواومان هەیە. وەپەروەردگار لە ئایەتێکی تردا بە پێغەمبەرەکەیﷺ دەفەرموێت: ﴿وَلَئِنِ اتَّبَعْتَ أَهْوَاءَهُم مِّن بَعْدِ مَا جَاءَكَ مِنَ الْعِلْمِ إِنَّكَ إِذًا لَّمِنَ الظَّالِمِينَ﴾[2]واتا: سوێند بەخودا ئەگەر تۆ دوای هەواو ئارەزوی ئەوان بکەویت دوای ئەوەی زانیاری تەواوت پێڕاگەیەنرا" ئەوە بێگومان تۆ دەچیتە ڕیزی ستەمکارانەوە .

٤ـ ئەنەسی کوڕی مالك(رضي الله عنه)دەفەرموێت: **قدم رسول اللهﷺ المدينة ولهم يومان يلعبون فيهما،فقال: (ماهذان اليومان؟) قالوا: كنا نلعب فيهما في الجاهلية.فقال رسول اللهﷺ: (إنَّ اللهَ قَدْ أَبدَلَكُم بِهِما خَيراً مِنهُما يَومَ الْأَضحى، وَيومَ الْفِطرِ)**[3]واتا: پێغەمبەری خوداﷺ هاتە مەدینە بینی خەلکی مەدینە دوو ڕۆژیان هەن تێیاندا یاری و گالتەو گەپ دەکەن ، پرسی ئەم دوو ڕۆژە چین؟ گووتیان: ئەوە دوو ڕۆژن ئێمە لەسەردەمی نەفامیدا یاری و گالتەو گەپمان تێــدا

---

١ـ الجاثية : ١٨

٢ـ البقرة : ١٤٥

٣ـ پێشەوایان أبو داود و النسائي و أحمد بە سەنەدێکی صحيح گێڕاویانەتەوە.

دەکردن، ئەویش فەرمووی: بێگومان خودای گەورە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بە دوو ڕۆژی باشتر ئەوانیش ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانن .

جا گۆڕان ـ تبدیل ـ کاتێك دێتەجێ کە گۆڕدراو ـ مبدل ـ وازی لێبهێنرێت. بۆنموونە پێغەمبەرﷺ دەربارەی مردوی تاوانبار کە بەر ڕەحمەتی خودا دەکەوێت: دەفەرموێت: (فَيُقالُ لَهُ اُنظُرْ إلى مَقعَدِكَ مِنَ النّارِ أَبدَلَكَ اللهُ بِهِ خَيراً مِنهُ مَقعَداً فِي الْجَنَّة)[1]واتا: پێی دەگوترێت: بڕوانە بۆ ئەم جێگایە ناخۆشەت لە دۆزەخ، بەڵام خودای پەروەردگار بۆی گۆڕی بە جێگایەکی باشتر لە بەهەشت. بەواتای: تۆ لە جیاتی بچیتە دۆزەخ دەچیتە بەهەشت. ئەوە گۆڕانکاریەی کەپێغەمبەریشﷺ فەرموی: (إنَّ اللهَ قَدْ أَبدَلَكُم بِهِما خَيراً مِنهُما)واتا: بێگومان خودای گەورە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بە دوو ڕۆژی باشتر" بەواتای: واز لەم دوو ڕۆژە بهێنن و لە جێگایان یادی جەژنە ئیسلامیەکان بکەنەوە کە جەژنی قوربان و ڕەمەزانن. بۆیە دەبێت ئێمەی موسوڵمان ڕو بکەینە جەژنە ئیسلامیەکان و پشت بکەینە جەژنی کافران.

٥ـ ثابیتی کوڕی ضحاكرضي الله عنهدەفەرموێت:(نَذَرَ رَجُلٌ عَلى عَهدِ رسولِ اللهِﷺأنْ يَنحرَ إبلاً بِبَوانةَ فَقالَ الرَّجلُ لِلنَّبِيِّﷺ إنِّي نَذَرْتُ أنْ أَنحَرَ إبلاً بِبَوانةَ، فَقالَ النَّبيﷺ: هَل كانَ فِيها وَثَنٌ مِن أَوثانِ الجاهِلِيَّةِ يُعبَد؟ قالوا: لا، قال: هَلْ كانَ فِيها عِيدٌ مِنْ أَعيادِهِم؟ قالوا:لا، قال: رسول اللهِﷺ أَوفِ بِنَذرِكَ، فَإنَّهُ لاوَفاءَ لِنَذرٍ فِي مَعصيَّةِ اللهِ)[2]واتا: پیاوێك لەسەردەمی پێغەمبەرداﷺلەسەرخۆی بە پێویست گێڕابوو کە حوشترێك سەرببڕێت لە بەوانە، پیاوەکە بەپێغەمبەری ﷺگووت: من لەسەر خۆم نەزر کردووە حوشترێك سەرببڕم لە بەووانە جەنابت چی دەفــەرمووی؟ پێغەمبەرﷺفەرمووی: ئایـا لەم جێگایە هیچ بتێکی لێیە بپەرسترێت؟ گوتیان:

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوایان أبوداود و البیهقی بەسەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە.

نەخێر، فەرمووی: ئایا هیچ جەژنێك لە جەژنەکانیان لەو جێگایە بەڕێوەچووە؟ گوتیان: نەخێر، فەرمووی: بەپێویست گێڕانەکەت جێ بەجێ بکە، چونکە هیچ بەپێویست گێڕانێك جێ بەجێ ناکرێت ئەگەر تاوانی تێدابێت.

جا پرسیارەکانی پێغەمبەرﷺ سودی ئەوە دەگەیەنن: ئەگەر یەکێك لەم دوو کردەوانەی تێدابوبایە ـ بت یان جەژنی کافران ـ ئەوە ڕێگای پێنەدەدا نەزرەکەی جێبەجێ بکات چونکە ئەوکات دەبو بە تاوان بە بەڵگەی (فَإِنَّهُ لاوَفاءَ لِنَذرٍ في مَعصِيةِ اللهِ) .

جا زانایان دەفەرموون: ئەگەر سەر بڕینی مەڕ ومالاّت لەجێگای جەژنەکانیان لە شەرعدا نکوڵی لێکرابێت" دەبێت حوکمی کەسێك چۆن بێت کە بەژداری خودی جەژنەکەیان دەکات بە ئەنجامدانی هەندێك لە کردەوەکانیان.[1]

٦ـ گەورەمان عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺفەرمویەتی: (مَن كَثَّرَ سَوادَ قَومٍ فَهُوَ مِنهُم، وَمَن رَضِيَ عَمَلَ قَومٍ كانَ شريكُ مَن عَمِلَ بِهِ)[1] واتا: هەرکەسێك ڕەشایی و ژمارەی گەلێك زیاد بکات ئەوە لەوانە، وەهەر کەسێك ڕازی بێت بە کردەوەی هەر گەلێك ئەوە هاوبەشی کردەوەکانیانە.

جا بێگومان هەرکەسێکیش ئاهەنگ لە سەری ساڵ و باقی جەژنەکانی تری کافراندا بگێڕێت ئەوە ژمارەی ئاهەنگ گێڕانی کافرانی زیاد کردووە و بە جەژنەکەشیان ڕازی بووە، بۆیە لای پەروەردگار لە ڕیزی ئەواندا ئەژمار دەکرێت و هاوبەشی کردەوەکانیشیانە!!

٧ـ گەورەمان إبن عباس رضي الله عنهما دەفەرموێت: لە غەزای بەدردا کۆمەڵێك لەموسوڵمانان ـ کە باوەڕیان شاردبۆوە ـ لـــە ڕیزی کافراندابون و ژمـــارەی کافرانیان زیادکردبو ـ یکثرون سواد المشركين ـ لەم شەڕەدا ژمارەیەکیـــان کوژران خودای پەروەردگار ئـــەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿إِنَّ

١ـ پێشەوایان أبو يعلى و دیلمی گێڕاویانەتەوە و شاهیدیشی هەیە . بڕوانە فتح الباري : ١٣/ ٤٨

﴿الَّذِينَ تَوَفَّاهُمُ الْمَلَائِكَةُ ظَالِمِي أَنفُسِهِمْ قَالُوا فِيمَ كُنتُمْ قَالُوا كُنَّا مُسْتَضْعَفِينَ فِي الْأَرْضِ قَالُوا أَلَمْ تَكُنْ أَرْضُ اللَّهِ وَاسِعَةً فَتُهَاجِرُوا فِيهَا فَأُولَٰئِكَ مَأْوَاهُمْ جَهَنَّمُ وَسَاءَتْ مَصِيرًا﴾[1][2] واتا: بەڕاستی ئەوانەی فریشتەکان لەسەرە مەرگدا گیانیان دەکێشێت لە کاتێکدا ئەوانە ستەمیان لە خۆیان کردووە بەوەی ئیمان و باوەڕیان لە مەترسی دابو کەچی کۆچیان نەدەکرد بۆ ناو موسوڵمانان هەتا لە ڕیزی کافراندا کوژران ، فریشتەکان بە توندی پێیاندا هەڵدەشاخێن و پێیان دەڵێن : ئێوە چیتان دەکرد و لە کوێ دەژیان ؟ لەوەڵامدا دەڵێن : ئێمە بێ دەسەڵات بوین و لاواز بوین بۆیە لە ناو کافران مابوینەوە ، ئەوانیش پێیان دەڵێن : باشە نیشتمانی خودا فراوان نەبو هەتا کۆچ بکەن بۆ ناو موسوڵمانان و لە وڵاتی کافراندا نەبن ؟ ئائەوانە جێگایان دۆزەخە کە خراپترین سەرئەنجامە .

* جا ئەگەر موسوڵمانێکی لاواز کە لەترسان چۆتە ڕیزی کافران و ژمارەی کافرانی زیاد کردووە سەرئەنجامی دۆزەخ بێت" دەبێت حاڵی موسوڵمانێك چۆن بێت کە بەحەزو ئارەزوی خۆی و بۆ بەسەربردنی کاتێکی خۆش بەشداری ئاهەنگی کافران دەکات و ژمارەیان زیاد دەکات؟!

٨ـ گەورەمان إبن عمر رضي الله عنهما دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمویەتی: (مَنْ تَشَبَّهَ بِقَوْمٍ فَهُوَ مِنهُم)[3] واتا: هەرکەسێك خۆی بچوێنی بە هەر گەلێك" ئەوە لەوان ئەژمار دەکرێت. کەواتا: ئەو موسوڵمانانەی بەژداری جەژنی کافران دەکەن و لە جەژنەکانیاندا شوێنیان دەکەون و خۆیان پێدەچوێنن" ئەوە لای پەروەردگار لەگەڵ کافران ئەژمار دەکرێن.

٩ـ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ لەچەندین فەرمودەدا فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە کـــە

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ النساء : ٩٧

٣ـ پێشەوایان أبوداود و احمد گێڕاویانەتەوە و فەرمودەیەکی صەحیحە

پێچەوانەی کافـــران بجولێنەوەو موخالەفەیان بکەن لـــە جەژنەکانیـــان و داب و نەریت و هەڵسوکەوتیان، وە بۆخۆشی پێچەوانەی ئەوانی کردووە لەوانە:

أـ ئوم سلمة رضی الله عنها دەفەرموێت: كانَ رَسُولُ اللهِﷺيَصومُ يَومَ السَّبتِ وَيومَ أَحدِ أَكثَرَ مما يَصومُ مِنَ الأيامِ وَيَقولُ: (إِنَّهُما يَوما عِيدِ الْمُشرِكِينَ فَأَنا أُحِبُّ أَنْ أُخالِفَهُم)[1]واتا: پێغەمبەری خواﷺ لەڕۆژانی شەممە و یەك شەممەدا زیـــاتر لـــە ڕۆژەکانی تر بەرۆژو دەبو و دەیفەرموو ئەم دوو ڕۆژە ڕۆژانی جەژنی کافرانن،منیش حەزدەکەم بەپێچەوانەی ئەوان بجولێمەوە.

جا ئەی گەنجی موسوڵمان پێغەمبەرە خۆشەویستەکەتﷺ حـــەزی کردووە پێچەوانەی کافران هەڵسوکەوت بکات لە ڕۆژانی جەژنی کافراندا و بەرۆژو بووە" تۆ چۆن ڕێگا بەخۆت دەدەیت لە ڕۆژی جەژنی کافراندا هاوبەشی کافران و پێچەوانەی پێغەمبەرەکەتﷺ بکەیت و بەژداری جەژنەکەیان بکەیت ؟!!

ب ـ پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرمانی بە موسوڵمانان کردووە بە نەعل وخوفەوە نوێژبکەین، ئەمەش بۆ جولانەوە بەپێچەوانەی جولەکەکان: (خالِفُوا الْيَهُودَفَإِنَّهُم لا يُصلُّونَ فِي نِعالِهِم وَلاخِفافِهِم)[2]واتا: بەپێچەوانەی جولەکەکانەوە بجولێنەوە و بە نەعل و خوفەوە نوێژ بکەن، چونکە ئەوان بە نەعل و خوفەوە نوێژ ناکەن.

ت ـ سوننەتە مرۆڤی موسوڵمان ڕیشی بهێڵێتەوە و سمێڵی کورت بکات ئەمەش بۆ پێچەوانەی هاوبەش دانەران، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ دەفەرموێت:(خالِفوا الْمشرِكِينَ:أَحفُوا الشَّوارِبَ، وَأَعفُوا اللّحى)[3]واتا: بە پێچەوانەی هـــاوبەش دانـــەران بجولێنەوە: سمێڵتان کورت

---

١ـ پێشەوایان احمد البیهقی گێڕاویانەتەوە .

١ـ أبوداود گێڕاویەتەوە و فەرمودەکەش صحیحە

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

بکەن و ڕیشتان درێژ بکەن و بیهێڵنەوە.

ث ـ سوننەتە گۆڕی موسڵمان بە لاچاڵ ـ اللحد ـ هەڵبکەنرێت بۆ ئەوەی جیاواز بێت لە گۆڕی ئەهلی کیتاب، چونکە قەبری ئەهلی کتاب ناوقەدچاڵ ـ شق ـ ە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ دەفەرموێت:(اَللحدُ لَنا، وَالشَّقُ لِغَيرِنا)[1] لە گێڕانەوەیەکی تردا: (والشَّقُ لِأَهلِ الْكِتابِ)[2]

ج ـ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرمانمان پێدەکات وەك پێچەوانەی ئەهلی کتاب ڕۆژێك پێش عاشوڕا یان دوای عاشوڕا بەڕۆژوبین: (صُومُوا يَومَ عاشُوراء، وَخالِفُوا فِيهِ الْيَهُودَ، صُومُوا يَوماً قَبْلَه أوبَعدَهُ)[3] واتا: ڕۆژی عاشوڕا بەڕۆژو بن، بەلاَم بۆ پێچەوانەی جولەکەکان ڕۆژێك پێشتر یان ڕۆژێك دواتر بەڕۆژو بن.

ح ـ پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ نکوڵی کردووە لە موسوڵمانان کە وەکو جولەکە و مەسیحیەکان سلاو بکەن و دەفەرموێت: (لَيسَ مِنا مَنْ تَشَبَهَ بِغَيرِنا، لا تَشَبَهُوا بِاليَهودِ وَلابِالنَّصارَى، فَإِنَّ تَسلِيمَ اليَهودَ الإشارةَ بِالأَصابِعِ، وَتَسلِيمَ النَّصارى الإشارةُ بِالأَكفِ)[4] واتا: لە ئوممەتی من نیە هەرکەسێك خۆی بچوێنێت بە جگە لە ئێمە، خۆتان بە جولەکەو مەسیحیەکان مەچوێنن، چونکە بێگومان سلاوی جولەکەکان بە جولاندنی قامکانەو سلاوی مەسیحیەکانیش بە بەرەدەستە.

جا چەندین فەرمودەی تریش هەیە لە ترسی درێژبونەوە نەم نوسیون کەتێیاندا پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ نکوڵی دەکات لە موسوڵمانان کە لەهەڵسو کەوت و کاروباری ڕۆژانەیاندا خۆیان بچوێنن بە جولەکەو مەسیحی و کافرەکانی تر، بێگومان بەشداریکردنیش لە جەژنی کافراندا

١ـ پێشەوایان أبوداود و ترمذی و نسائی و إبن ماجە بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە .

٢ـ پێشەوا احمد بەسەنەدێکی حسن گێڕاویەتەوە .

٣ـ پێشەوایان : احمد و البیهقی گێڕاویانەتەوە .

٤ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە و (حسن)ە

خۆچواندن و ڕازیبون و موافەقەی کافرانە، بۆیە پێویستە مرۆڤی موسوڵمان خۆیان لێ بپارێزێت.

جا بەپشتیوانی ئەم فەرمودانەی ڕابردوو بە کۆدەنگی هاوەڵان و زانایانی ئومەت حەرامەو قەدەغەیە مرۆڤی موسوڵمان بەشداری جەژنی کافران بکات.(١)

## ووتەی هاوەڵە بەڕێزەکان (رضی الله عنهم)

وەك پێشتر گووتمان هەموو هاوەڵان(رضی الله عنهم) یەکدەنگ بوون لەسەر حەرامی بەشداری کردن لە جەژنی کافران و بەهیچ شێوەیەك ڕێگایان نەداوە کە بێباوەڕان جەژنەکانیان لەناو موسوڵمانانندا ئاشکرابکەن، ئەمەش لەو مەرجە دەردەکەوێت کە فەرمانڕەوای باوەڕداران عمری کوڕی خطابﷺلەسەر ئەهلی زیمەی دانابو و هاوەڵانیش پێی ڕازی بون کە: بەهیچ شێوەیەك بۆیان نیە کە لەناو شار و وولاتی موسوڵمانانندا جەژنەکانیان ئاشکرا بکەن. وە ئەوەی خوارەوەش ووتەی بەشێك لە هاوەڵە بەڕێزەکانە دەربارەی بەشداریکردن لە جەژنی بێباوەڕو کافراندا:

* پێشەوا عمری کوڕی خطابﷺفەرمویەتی: (إجتَنِبوا أَعْداءَاللهِ الْيَهُودَ وَالنَّصارى فِي عِيدِهِم يَومَ جَمْعِهِم، فَإِنَّ السُّخطَ يَنزِلُ عَلَيهِم فَأَخشى أَن يُصِيبَكُم وَلا تَعْلَمُوا رَطانَتَهُم فَتَخَلَّقُوا بِأَخلاقِهِم)(٢)واتا: خۆتان بپارێزن لە دوژمنانی خودا جولەکەو گاورەکان و بەشداری مەکەن لە ڕۆژانی کۆبونەوەیان بۆ جەژنەکانیان، چونکە بێگومان تورەی و غەزەبی خودایان بەسەردا دەبارێت، منیش دەترسم ئەم غەزەب و تورەییەی خودا بەر ئێوەش بکەوێت، وە بەشێوازی ئەوان قسە مەکەن چونکە بەم هۆیەوە ئەخلاقی ئەوان هەڵدەگرن.

وەهەر پێشەوا عمری کوڕی خطابﷺفەرموویەتی: (... لا تَدخُلُوا عَلَى الْمُشرِكِينَ فِي

---

١ـ إقتضاء الصراط المستقيم : ١١٣

٢ـ پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە .

كَنائِسِهِم يَومَ عِيدِهِم فَإنَّ السخطةَ تَنزِلُ عَلَيهِم)[1] واتا: مەچۆنە کەنیسەی هاوبەشدانەرە گاورەکان لە ڕۆژانی جەژنەکانیاندا، چونکە بێگومان تورەیی و غەزەبی خودایان بەسەردا دەبارێت.

* محمدی ابن سیرین رحمەالله دەفەرموێت: خواردنێکی تایبەتیان بۆ پێشەوا علی کوڕی أبی طالب رضي الله عنه هێنا، ئەویش فەرموی: ماهذا؟ ئەمە بە بۆنەی چیەوەیە؟ گوتیان: ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران ئەمڕۆ نەورۆزە، ئەویش فەرمووی: (فاصنعوا كل يوم فيروزا)[2] واتا: هەموو ڕۆژێك فەیروز سازبکەن !! لێرەدا پێشەوا علی رضي الله عنه لەجیاتی بڵێت: نەورۆز گوتی: فەیرۆز! ئوسامە دەفەرموێت: بۆیە پێشەوا علی رضي الله عنه فەرمووی: فەیرۆز" چونکە پێی ناخوش بو بڵێت نەورۆز[3].

بەواتای پێشەوا علی بەم جەژنەیان ڕازی نەبوو.

* پێشەوا عبدالله ی کوڕی عمر رضي الله عنه فەرموویەتی: (مَنْ بَنى بِبِلادِ الأعاجِمِ وَصَنَعَ نِيرُوزَهِم وَمِيهرَجانَهُم وَتَشَبَّهَ بِهِم حَتَّى يَمُوتَ وَهوَكَذلِكَ حُشِرَ مَعَهُم يَومَ القِيامَةِ)[4] واتا: هەرکەسێك لە وولاتی کافراندا نیشتەجێ ببێت و بەشداری نەورۆز و میهرەجانەکانیان بکات، وە خۆیان پێبچوێنیت و هەتا دەمریت لەسەر ئەم حاڵە بێت ـ تەوبە نەکات ـ ئەوە لەڕۆژی قیامەتدا لەگەڵ ئەواندا حەشر دەکرێت .

## ووتە و ڕای زانایان

وەك پێشتر باسمان کرد کۆدەنگی زانایان(رحمهم الله)لەسەر ئەوەیە: حەڕامەو قەدەغەیە مرۆڤی

١ـ پێشەوا بیهقی لە سنن الكبرادا گێراویەتەوە .

٢ـ پێشەوا بیهقی لە سنن الكبرادا گێراویەتەوە .

٣ـ إقتضاء الصراط المستقيم : ١٧٣

٤ـ پێشەوا بیهقی لە سنن الكبرادا بە سەنەدێکی جید گێراویەتەوە.

موسوڵمان بەشداری بکات لە جەژنی کافراندا، بەڵام بۆ زیاتر ڕونکردنەوەی ئەم بابەتە ووتەو ڕای بەشێك لە زانایان دەخەینە ڕوو:

* پێشەوا أبوالحفص الكبير رحمه الله لە حەنەفیەکان دەفەرموێت: (لَو أَنَّ رَجُلاً عَبَدَ اللهَ تَعالى خَمْسِينَ سَنَةٍ ثُمَّ جاءَ يَومُ النَّيروزِ وَأَهدى إِلى بَعضِ الْمشرِكِينَ بِيضَةً يُرِيدُ تَعظِيمَ ذلكَ الْيَومِ فَقَدْ كَفَرَ وَحَبِطَ عَمَلُهُ)[1] واتا: ئەگەر پیاوێك پەنجا ساڵ خودای بپەرستی پاشان ڕۆژی نەورۆز بێت و بەشداری جەژنەکەیان بکات بەوەی یەك هێلکە بۆ هاوبەش دانەرێك بەرێت بەنیەتی بە گەورە ڕاگرتنی ئەم ڕۆژە" ئەوە کافر دەبێت و هەمو کردەوە چاکەکانیشی هەڵدەوەشێنەوە.

* پێشەوا دمیری و عەللامەی شربینی رحمها الله لە شافیعیەکان دەفەرمون: (يُعزَّرُ مَنْ وافَقَ الْكُفَارَ فِي أَعيادِهِمْ)[2][3] واتا: پێویستە لەسەر کاربەدەستی موسوڵمانان هەر کەسێك بەژداری جەژنی کافران بکات سەرزەنشتی بکات و تەمبێی بکات.

* پێشەوا ابن الحجری هەیتەمی رحمه الله دەفەرموێت: زانایانی پاشینەی مەزهەبی شافعی فەرمویانە: (وَمِنْ أَقبَحِ الْبِدَعِ مُوافَقَةُ الْمسلِمِينَ النَّصارى فِي أَعيادِهِم)[4] واتا: لەناشیرینترین بیدعەکان ئەوەیە موسوڵمانان بەشداری جەژنی کافران بکەن.

* لای زانایانی مەزهەبی پێشەوا مالك ناپەسەندە کە مرۆڤی موسوڵمان لە کەشتیەك یان سەیارەیەکیش سەربکەوێت کە گاوری تێدابن و پێی بچن بۆ جەژنەکانیان،لە ترسی ئەوەی نەوەك غەزەبی خودای بەسەر ئەوانیشدا داببارێت. وە پێشەوا ابن الحاج دەفەرموێت: (لا يَحِلُّ لِمسلِمٍ

١ـ البحر الرائق شرح كنز الدقائق للعلامة ابن نجيم ٨ /٥٥٥

٢ـ النجم الوهاج في شرح المنهاج للعلامة الدُّميري ٢٤٤/٩

٣ـ مغني المحتاج إلى معرفة معاني ألفاظ المنهاج ١٩١/٤

٤ـ الفتاوى الفقهية الكبرى لللعلامة ابن حجر الهيتمي ٢٣٨/٤-٢٣٩

أَن يَبِيعَ نَصرانِياً شَيئاً مِن مَصْلَحَةِ عِيدِهِ لا لَحماً وَلا أَدماً وَلا ثَوباً وَلا يُعارُونَ شَيئاً وَلَو دابَّةً إِذْ هُوَ مَعاوَنَةٌ لَهُم عَلى كُفرِهِم وَعَلى وُلاةِ الأَمرِ مَنعُ الْمسلِمينَ مِن ذلِكَ)[1]واتا: دروست نیە و نارەوایە موسوڵمان هیچ شتێك بە كافران بفرۆشێت كەسودی لێوەربگرن بۆ جەژنەكانیان وەك: گۆشت و پێخۆرو پۆشاك، وە نابێت هیچ شتێكیان بە خواستن پێبدرێت هەتا ئەگەر وڵاخی سواریش بێت، چونكە ئەمە یارمەتی دانیانە لەسەر كوفر، وەلەسەر كاربەدەستی موسوڵمانان پێویستە رێگری موسوڵمانان بكات لەم كارە.

* پێشەوا أبو الحسن آمدی رحمه‌الله دەفەرموێت: (لايَجُوزُ شُهُودَ أَعيادِ النَّصارى وَاليهودِ نَصَّ عَلَيهِ أَحمَد)[2]واتا:دروست نیە ئامادەبون لە جەژنی گاورو جولەكەكاندا،ئەمەش دەقی فەرمودەی پێشەوا أحمدی لەسەرە.

* لیژنەی بەردەوامی فتوای سعودی لە فتوای ژمارە(٢٥٤٠)دەفەرموێت:(لا يجوز لِلمسلِمِ أنْ يُشارِكَ الكُفارَ في أَعيادِهِم، ويَظهَرَ الفَرَحَ والسُرورَ بِهذهِ الْمُناسبَةِ ويُعَطِّلَ الأَعمالَ سواء كانَتْ دينيٌّ أو دنيويَّةٌ، لأنَّ هذا مِنْ مُشابَهةِ أعداءِ اللهِ الْمُحرَّمةِ وَمِن التَّعاونِ مَعَهُم على الباطلِ، وقَد ثَبتَ عَنْ رسولِ اللهِ أنَّهُ قال: مَنْ تَشبَّهَ بِقَومٍ فَهُوَ مِنهُم) واتا:دروست نیە مرۆڤی موسوڵمان بەشداری جەژنی كافران بكات و دڵخۆشی و خۆشحاڵی دەربرێت بەو بۆنەیەوە، وە دروست نیە رۆژی جەژنەكانیان بكرێتە پشو و كار وكاسبی تێدا رابگردرێت، جا یەكسانە جەژنەكانیان دینی بن یان دنیایی، چونكە ئەم كارە خۆ چواندنە بە دوژمنانی خودا و یارمەتی دانیانە لەسەر كاری پوچ ـباطل ـ پێغەمبەریشﷺفەرموویەتی: هەركەسێك خۆی بچوێنێت بەهەر گەل و قەومێك لەوان ئەژماردەكرێت .

---

١ـ المدخل للعلامة ابن الحاج المالكي ٢/٤٦-٤٨

٢ـ إقتضاء الصراط المستقيم : ١٧٤

جا ئەمەی ڕابرا بەڵگەکانی قورئان و سوننەت وکۆدەنگی هاوەڵان و زانایان بوو دەربارەی حەرامی و قەدەغەیی بەشداری کردن لە جەژنی کافراندا، ئێستاش بابزانین حوکمی جەژنە پیرۆزە کردن و بەخشینی دیاری جەژنانە بەکافران و فرۆشتنی کەل و پەلی تایبەت بە جەژنی کافران چیە؟

## حوکمی شەرعی جەژنە پیرۆزەو بەخشینی دیاری و فرۆشتنی کەل وپەلی تایبەت بەجەژنی کافران

بەداخەوە لەم ڕۆژگارەداموسوڵمانان ڕۆژانە دەکەونە چەندین تاوانەوە کەهەندێکیان تاوانی گەورەشن بەڵام بەهۆی ناڕۆشنبیری دینی و کەم زانیاری شەرعیەوە هەستیشی پێناکەن، یەکێك لەم تاوانە گەورانە بریتیە لە جەژنە پیرۆزەکردن لە کافران و پێدانی دیاری پێیان، وە فرۆشتنی کەل و پەلی تایبەت بەم جەژنانە لەناو بازاڕی موسڵماناندا، جا ئێمە بە پشتیوانی خودا ئێمە فتوای زانایان دەربارەی ئەم بابەتە وەردەگرین، بەڵکو موسڵمانان هەست بەم تاوانە گەورانە بکەن و چیتر موسڵمانان پیرۆزبایی لە کافران نەکەن بە بۆنەی جەژنەکانیانەوەو، دوکانەکانیان پڕ نەکەن لە کەل و پەلی تایبەت بە جەژنی کافران لە کاتی جەژنەکانیاندا.

## جەژنەپیرۆزە لەکافران

ابن القیم جوزی رحمه‌الله دەفەرموێت:(وَأَمَّا التَّهنئَةُ بِشَعائِرِ الْكُفرِ الْمُختَصَّةِ بِهِ فَحَرامٌ بِالإتِّفاقِ، مِثل أَنْ يُهَنِّئَهُم بِأَعيادِهِمْ وَصَومِهِمْ فَيَقُولُ: عِيدٌ مُباركٌ عَلَيكَ أَو تَهنأ بِهذَا الْعِيدِ ونَحوِهِ، فَهذا إنْ سَلِمَ قائِلُهُ مِنَ الْكُفرِ فَهُوَ مِنَ الْمُحرَّماتِ وَهُوَ بِمَنزِلَةِ أَنْ يُهَنِّئَهُ بِسُجُودِهِ لِلصَّلِيبِ بَلْ ذلِكَ أَعظَمُ إِثماً عِندَ اللهِ وَأَشَدُّ مَقتاً مِنَ التَّهنِئَةِ بِشُربِ الْخَمرِ وَقَتلِ النَّفسِ وَارتِكابِ الْفَرجِ الْحـرامِ

وَنَحوِهِ)[1]واتا: هەرچی پیرۆزبایی کردنە بە بۆنەی دروشمە تایبەتەکانی کافرانەوە" ئەوە بە کۆدەنگی زانایان قەدەغەیە ـ حرام ـ ە، وەك ئەوەی کە پیرۆزباییان لێبکەی بە بۆنەی جەژنێکیان یان رۆژوێکیان و پێیان بڵێیت: جەژنت پیرۆز بێت یان پیرۆزە" ئەوە ئەگەر پیرۆزبایکارەکە کافریش نەبێت و لە میللەتی ئیسلامیش نەچێتە دەرەوە" ئەوە کارێکی حەرامی ئەنجام داوە، وەك ئەوە وایە پیرۆزبایی لە مەسیحیەك بکەی بەبۆنەی سوجدە بردنی بۆ صەلیب، بەڵکو ئەمە تاوانی گەورەترە لەوەی پیرۆزبایی و دەست خۆشی بکەی لە کەسێکی عارەق خۆر یان پیاوکوژ یان زیناکار و هاوشێوەکانی بەبۆنەی تاوانەکانیانەوە و هاوشێوەی ئەوانەش.

* پرسیار لە عزالدینی کوڕی عبدالسلام کرا: ئایا دروستە موسوڵمانێك بە کەسێکی گاور یان جولەکە بڵێت: جەژنت پیرۆز بێت؟ لە وەڵامدا فەرموی: (إنْ قالَهُ الْمُسلِمُ لِلذِمِّي عَلى وَجهِ قَصدِ تَعظِيمِ دِينِهِمْ وَعِيدِهم فَإنَّهُ يَكفُرُ، وَإنْ لَمْ يَقصِدْ ذلِكَ وَإنَّما جَرى عَلى لِسانِهِ فَلا يَكفُرُ بِما قالَهُ مِنْ غَيرِ قَصدٍ) واتا: ئەگەر موسوڵمانێك بەنیەت و مەبەستی بەگەورە زانینی دین و جەژنەکەیان بە گاورێك یان جولەکەیەك بڵێت جەژنت پیرۆز بێت" ئەوە بێگومان کافر دەبێت، بەڵام ئەگەر بەو نیەتە پێیان نەڵێت، بەڵکو تەنها هەر بەسەر زاری دابێت ئەوە کافر نابێت.

وەك پێشتر گووتمان پێشەوا ابن حاج فەرموویەتی: دروست نیە و ناڕەوایە موسوڵمان هیچ شتێك بە کافران بفرۆشێت کەسودی لێوەربگرن بۆ جەژنەکانیان وەك: گۆشت و پێخۆرو پۆشاك، وە نابێت هیچ شتێکیان بە خواستن پێبدرێت هەتا ئەگەر وەڵاخی سواریش بێت، چونکە ئەمە یارمەتی دانیانە لەسەر کوفر، وەلەسەر کاربەدەستی موسوڵمانان پێویستە رێگری موسوڵمانان بکات لەم کارە.

---

١ـ أحكام أهل الذمة : ١/ ٤٤١ ـ ٤٤٢

٢ـ البحر الرائق شرح كنز الدقائق للعلامة ابن نجيم ٨ /٥٥٥

## دیاری پێدانیان

پێشەوا أبوالحفص الکبیر رحمه‌الله لە حەنەفیەکان دەفەرموێت: (لَو أَنَّ رَجُلاً عَبَدَ اللهَ تَعالی خَمْسِینَ سَنةٍ ثُمَّ جاءَ یَومُ النَّیروزِ وَأَهدی إِلی بَعضِ الْمُشرِکِینَ بِیضَةً یُرِیدُ تَعظِیمَ ذلكَ الْیَومِ فَقَدْ کَفَرَ وَحَبِطَ عَمَلُهُ)[1] واتا: ئەگەر پیاوێك پەنجا ساڵ خودای بپەرستی پاشان ڕۆژی نەورۆز بێت و بەشداری جەژنەکەیان بکات بەوەی یەك هێلکە بۆ هاوبەش دانەرێك بەرێت بەنیەتی گەورە ڕاگرتنی ئەم ڕۆژە، ئەوە کافر دەبێت و هەمو کردەوە چاکەکانیشی هەڵدەوەشێنەوە.

بەهەمان شێوە بە هیچ شێوەیەك دروست نیە موسوڵمانان هیچ دیاریەك و کارت و نامەیەکی جەژنە پیرۆزە بدەن بە گاورێك یان بە جولەکەیەك یان هەر کافرێکی تر لە ڕۆژی جەژنەکانیاندا، بەتایبەت ئەگەر ئەو کافرانە کافری جەنگی بن یان کار بکەن لەسەر لاواز کردنی پێگەی ئیسلام و موسڵمانان و بانگەشەی بڵاوکردنەوەی ئاینەکەیان بکەن.

دووەم/ ئەو جەژن و یادو بۆنانەی لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتووەکانەوە، وە یان لە لایەن ڕێکخراوێکی جیهانیەوە کراونەتە ڕۆژێکی جیهانی، وەك: (جەژنی دایك و ڕۆژی منداڵ و ڕۆژی ئایدز و... هتد. زانایان دەربارەی بەشداری کردن و یادکردنەوەی ئەم جەژنانە دەبن بە دوو بەشەوە:

یەکەم/ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: یادکردنەوەی ئەم جەژن و یادو بۆنانەش وەکو جەژن و یاد و بۆنەکانی تری تایبەت بە کافران قەدەغەیە و حەرامە، چونکە ئەمانەش لە بنچینەدا هەر لە کافرانەوە سەرچاوەیان گرتووە، بۆیە پێویستە وەك(السد الذریعة)یادیان نەکرێتەوە، بۆ ئەوەی

١ـ البحر الرائق شرح کنز الدقائق للعلامة ابن نجیم ٨ /٥٥٥

کە ئەو چینانەی ئەم ڕۆژانەیان بۆ دیاری کراوە بەتایبەتی و موسڵمانان بە گشتی وا تێنەگات کە هەر وولاتانی ئەمریکاو ئەورووپاو کوفر خەخۆریانن و خۆشەویستیان بۆ وولاتانی کوفر پەیدا نەبێت. ئەوەش ڕای زۆرینەی زانایانی سەردەمە. بۆنمونە دەربارەی جەژنی دایك محمد متولی الشعراوی رحمەالله دەفەرمووێت: (عيد الأمِ اخترعَهُ الغربُ، فَقَلَّدناهُم تقليداً أعمى ولم نفكُر في الأسبابِ التي جَعلتِ الغربُ يَبتَكِرُ عيدَ الأم ... إذن لَيسَ هُناكَ ضَرورةٌ لِهذا الْعِيدِ عِنْدَنا)[1] واتا: جەژنی دایك داهێنراوی وولاتانی ڕۆژئاوایە ، ئێمەش بە کوێرانە دوایان کەوتووین و یادی دەکەینەوە، بێ ئەوەی بزانین ئەو هۆکارانە چین کە وولاتانی ڕۆژئاوای هانداوە بۆ دانانی ئەم جەژنە ... وە ئێمە هیچ پێویستیمان بە وەها ڕۆژێك نیە بۆ دایك .

وە زین العابدین الآمدی دەفەرمووێت: ( فالألماس غالٍ لأنهُ قليلٌ، و لو صارَ كلُ حجرٍ في الأرضِ ألماساً لصارَ الألماسُ حجراً، و لو صارتِ الأيامُ كلها أعياداً لرجعَ العيدُ يوماً عادياً كسائرِ الأيامِ)[2] واتا: ئەڵماس گران قیمەتە" چونکە کەمە، ئەگەر هاتباو هەموو بەردێك ئەڵماس بوایە" ئەوکات ئەڵماس دەبو بە بەردو ئەو قیمەتەی نەدەما، بەهەمان شێوە ئەگەر بێت و هەموو ڕۆژێك جەژن بوایە ئەوکات جەژن دەبو بە ڕۆژێکی ئاسایی وەك هەر ڕۆژێکی تری ئاسایی و ئەم گرنگیەی نەدەما. (و كثرةُ الأعيادِ تذهبُ بَهجتَها ، و تهدر قِيمَتَها)[3] واتا: زۆری جەژنەکان قیمەت و تایبەتمەندی جەژن ناهێڵن.

دووەم/ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: یادکردنەوەی ئەم جەژن و یادو بۆنانە دروستە، چونکە دەچنە باسی نەریتەکانـەوە، وە بنچینەی نەریتەکانیش ڕەواییـــە: (الأصلُ في الأشياءِ الإباحةُ)

١- الفتاوی : ٣٢١- ٣٢٢

٢- فتاوی الآمدیة : ٢/ ١٧٦.

٣- هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە.

جا یەکێك لەو زانایانەی کە یادکردنەوەی ئەو جەژن و یادو بۆنانە بەدروست و ڕێگا پێدراو دەزانێت دکتۆر یوسف القرضاویە. دکتۆر قرضاوی دەفەرمووێت: (أما الأعيادُ الوطنيةِ، مثل عيدُ الإستقلالِ أو الوحدةِ، أو الأعياد الإجتماعيةِ مثلُ: أعياد الأمُومةِ والطُفولةِ وَالعُمّالِ وَالشَّبابِ وَ نحوِها، فلا حرجَ على المسلمِ من أن يهنيءَ بها أو يشاركَ فيها بإعتبارهِ مواطناً أو مقيماً في هذه الديار،على أن يحرصَ على تَجنُّبِ المحرَّماتِ التي قد تقعُ في تلكَ المناسبات)[٣] واتا: هەرچی جەژن و بۆنە نیشتمانیەکانی وەك: جەژنی سەربەخۆی و یەکگرتنی وولاتن، وە یان جەژن و بۆنە کۆمەڵایەتیەکانی وەك: جەژنی دایك و منداڵ و کرێکاران و گەنجان و هاوشێوەکانیانن" ئەوە هیچ ڕێگریەك نیە و دروستە بۆ ئەو موسڵمانەی هاونیشتیمانی بێباوەڕانە وە یان دانیشتوی وولاتێکی بێباوەڕانە جەژنە پیرۆزە لە بێباوەڕانی ئەهلی ئاشتی بکات و بەشداری جەژنەکەیان بکات، بەڵام دەبێت ئەو کەسە زۆر ئاگاداربێت و خۆی بپارێزێت لەو کارە حەرام و ناپەسەندانەی لەم جەژنانە دەکەون.

جا ئەوەی ڕابرا هەردووك ڕای زانایان بوو دەربارەی جەژن و یادو بۆنە نەریتیەکان، بەڵام لەم دوو ڕایەی ڕابردوو ڕای یەکەم پەسەند ترە ـ راجح ـ والله أعلم، چونکە موسڵمانان پێویستیان بەم جەژنانە نیە بۆ ئەوەی ڕێزی دایك و خێزانی بگرێت و مافی منداڵەکانی و کرێکارەکانی بدات و خۆی بپارێزێت لە ماددە هۆشبەرەکان و هۆکارەکانی توشبون بە ئایدز و ... هتد، بەڵکو ئاینی پیرۆزی ئیسلام پێش ١٤٠٠ ئەم بابەتانی یەکلایی کردوەتەوە، ئینجا یادکردنەوەی ئەم جەژن و یاد و بۆنانە لە دوو ڕووەوە زیان بە موسڵمانان دەگەیەنن:

یەکەم/ یادکردنەوەی ئەم جەژنانە خۆچواندنە بە بێباوەڕان و شوێنکەوتنیانە، ئەم دووەشیان هەروەك باسمان کرد هەردووکیان لە ئیسلامدا قەدەغەن .

---

٣- فتاوى معاصرة ، الدكتور يوسف القرضاوي: ٦٩١/٣

دووەم/ یادکردنەوەی ئەم جەژن و بۆنانە ڕێگایەکە بۆ خۆشەویست کردنی بێباوەڕان لە دڵی ئەو چینەی کە ئەم جەژن و بۆنەیەی بۆ دانراوە، بۆ نمونە تۆ کاتێك یادی جەژنی کرێکاران دەکەیتەوە" کرێکارێکی کەم زانستی ئاینی وا تێدەگات کە ئەوە تەنها وولاتانی ڕۆژئاوان کە مافی کرێکاریان داوە، وە کاتێك یادی ڕۆژی ئافرەتان دەکەیتەوە، ئافرەتێکی کەم زانستی ئاینی هەمان تێڕوانینی کرێکارەکەی دەبێت ... هتد. لەبەر ئەوە پێویستە موسڵمانان خۆیان لە یادکردنەوەی ئەم جۆرە جەژن و بۆنانەش بپارێزێت، چونکە ئێمەی موسڵمان هیچ پێویستیەکمان پێیان نیە و ئاینە پیرۆزەکەمان ئەوەندەی پێداوین کە بەسمان بێت. والله أعلم.

تێبینی/ ئەم حوکمە شەرعیانەی ڕابران دەربارەی جەژن و یاد و بۆنە جیهانیەکان، ئەوە بە کورتی بوون، وە بە پشتیوانی خودا هەر جەژن و بۆنەیەکی کە لەم پەرتوکەدا باسی دەکەین لە جێگای خۆی ئەگەر پێویست بکات وە یان فتواو ڕای زانایان لەسەر حوکمەکەی هەبێت باسی دەکەین، وە ئەگەر جەژن و یاد و بۆنەیەك لە جێگای خۆی باسی حوکمەکەمان نەکرد و فتوای زانایانمان بۆ نەهێنا" ئەوە تۆی خوێنەری بەڕێز دەتوانیت قیاسی بکەیت بۆ سەر حوکمی ئەو جەژن و یاد و بۆنانەی کە باسمان کردن.



# جەژنی سەری ساڵی زاینی

ساڵانە وولاتە مەسیحیەکان لە سەرتاسەری جیهان لە شەوی سەری ساڵ و ڕۆژانی دواتردا ئاهەنگ و چالاکی تایبەت بەسەری ساڵ ڕێکدەخەن و خۆشی و شادی تێدا دەردەبڕن و چەندین دروشمی تایبەت بەم جەژن و یادە بەکاردەهێنن وەك: پاپا نوئێل و درەختی کریسمس. وە بەهەمان شێوە لەناو وولاتانی موسوڵمانانیش وەك چاولێکەری وولاتانی کوفر و لاسایی کردنەوەی ئەوروپا ساڵانە ئەم جەژنە زیندو دەکرێدەوە و موسوڵمانانی ساویلکە و بێ ئاگاش لە دەقە شەرعیەکان بە شداری ئەم بەناو جەژنە دەکەن و پۆشاکی پاپا نوئێل لەبەردەکەن و درەختی کریسمس لە ماڵ و دوکانەکانیاندا دادەنێن، بێ ئەوەی مەرترسی و گەورەیی ئەو تاوانە بزانن ئێمە لێرەدا مێژوی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی ئەم جەژنەو دروشمەکانی کریسمس و پاپانوئێل و پەیوەندیان بەم جەژنەوەو، حوکمی شەرعی دەربارەی بەشداری کردن لەم جەژنەدا دەخەینە ڕوو:

## مێژوی ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی سەری ساڵ

سەرەتا: هیچ پێوەرێك نیە بۆ ئەوەی ڕۆژی لە دایك بونی حەزرەتی عیسا(علیه السلام) بە ڕۆژی ١/١دیاری بکات و بیسەلمێنێ، چونکە ئەوسەردەم تۆمار و نوسین بەم شێوەیە نەبووە، بەڵکو دیاریکردنی بەروار لەهەر شوێنێك بەپێی ڕوداوێکی گەورە بوو، هەروەك ئەم دواییەش لە کوردستان بە پێی ساڵی گرانی،ساڵی بەفرە ئەستورەکە، ساڵی گەنمە سورەکە..)مێژو دەخەملێنرا لەبەر ئەوە زۆر دەگمەن بو مێژووی لەدایکبونی کەسێکی ئاسایی دیاری بکرێت و بمێنێت،[1]

وە هەر لەبەر ئەوە مەسیحیەکان خۆشیان ڕای جیاوازیان هەیە دەربارەی مێژووی ڕاستەقینەی لەدایکبونی حەزرەتی عیسا علیه السلام:

* مەسیحیەکانی کاسۆلیك و پرۆستانت و بەشێکی ئەرسەدۆسك و ئەرمـــەن پێیـــان وایە

---

١ـ گۆڤاری چرای ڕوناکی ژمارە ١٧لاپەڕ٩ پەیوەندی کورد بە جەژنی سەری ساڵ ، مسعود عبدالخالق.

کە٦/١ ڕۆژی لەدایکبونی حەزرەتی عیسایە علیه السلام.

* ئەوروپای ڕۆژهەڵات و قیبتیەکانی میسرو یۆنان پێیان وایە کە ١/٧ ڕۆژی جەژنی لە دایکبونی مەسیحە علیه السلام.

* بەشێکی تری مەسیحیەکان ١/٢٥ دەکەنە ڕۆژی جەژنی لەدایکبونی مەسیح علیه السلام.

* وەبەشێکی تری مەسیحیەکان پێیان وایە کە مێژووی لەدایکبونی مەسیح چوار ساڵ لە پێشترە واتا :کەئێستا ٢٠١٤ یە لای ئەوان ٢٠١٠یە.

جا بەپێی جیاوازی بۆچونەکان دەربارەی لەدایکبونی مەسیح علیه السلام مێژوی سەرهەڵدانی ئەم جەژنەش بۆچونی جیاوازی تێدەکەوێت، بەڵام بەپێی سەرچاوەکان مێژووی سەرهەڵدانی ئەم جەژنە بەم شێوەیە:

یەکەم جار ئەم جەژنە لەم شوێنەی ئێستای ئەڵمانیا سەری هەڵداوە، کاتێك ئەوان ساڵانە جەژنێکی تریان هەبو یادی خودای مانگیان تێدا دەکردەوە، ئەمەش (٢٢یان٢٧ز) بووە، واتا: ٢٧ساڵ دوای لەدایکبونی عیساعلیه السلام، دواتر پاپا (پۆنیفاسیۆس) نێردراوی نارد بۆلایان و ڕێککەوتن کە ئەو ئاهەنگە تێکەڵ بە یادی لەدایکبونی مەسیح بکەن، بەم شێوەیەو لەو مێژوە بە دواوە ئەم جەژن و یادە لەناو مەسیحیەکاندا بڵاوبویەوە[1].

# کریسمس

درەختی کریسمس یەکێکە لە دروشمەکانی تایبەت بەم جەژنەو ساڵانە لە سەرو بەندی هاتنی سەری ساڵدا ئەم دارە بە چرا و گڵۆپ دەڕازێنرێتەوە و، لە کوچەو کۆڵانەکانی وڵاتانی ئەوروپاو مەسیحیەت و بەشێك لە وڵاتانی موسوڵمانیشی وەك چاولێکەری و لاسایی کردنەوە دادەنرێت،

١ـ الموسوعه الحره (سایتی ویکیبدیا)

هەتا لە ساڵی ٢٠١١ دا گەورەترین درەختی کریسمس لە ئیماراتی عەرەبی دانرا کە دانیشتوانەکانی موسوڵمانن، لە کاتێکدا ئەم درەختی کریسمسە نەکەم نە زۆر پەیوەندی بەم جەژنەوە نیە، بەڵکو یەکەم جار ئەتەوە کۆنەکانی وەك ڕۆمانی و یۆنانیەکان ئەم دارەیان بەکارهێناوە، دانیشتوانی ڕۆما لە حەفتەی کۆتایی ساڵداماڵەکانیان و کوچەو کۆڵانەکانی شاریان بەم دارە دەڕازاندەوە، وە لە ئەسینای پایتەختی یۆنان لەناوەڕاستی شاردا لەدەوری دارێکدا ئاهەنگیان دەگێڕا، وە لە سەرەتادا کەنیسە دژی دانانی ئەم دارەبو لە سەری ساڵدا و مەسیحیەکانی هاندەدا ئەم دارە بەکار نەهێنن لە ئاهەنگەکاندا.[1] بەڵام دواتر وەك ئەمری واقع ئەم دارە لە یۆنانیەکانەوە گوازرایەوە بۆ ناو مەسیحیەکان، دواتریش وەك چاولێکەری و لاسایی کردنەوە هێنرایە ناو وولاتی موسوڵمانان!!

## ناو و مێژووی ئەم دارە

ووشەی کریسمس لە دوو بڕگەپێك هاتووە(کریس واتا: دڵسۆز) و (ماس واتا: لەدایکبون) بەواتای درەختی دڵسۆزی بۆ لەدایکبون. وە ئەم درەختە لە یۆنان بە (شجرةالعالم) داری جیهانی و لەلای فەرەنسیەکان بە (شجرة الحیاة) داری ژیان بە ناوبانگ بو. بۆچونەکان لەسەر مێژوی ئەم دارە جیاوازن: هەندێك سەرچاوە دەڵێن: مێژوی ئەم دارە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی پێنجەمی زایینی و لە سەدەی پێنجەم ئەم دارە لە فەرەنسا بەکار هاتووە. هەندێکی تر دەڵێن: مێژوی ئەم دارە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی دەیەم لە ئینگلترا، وە ڕایەکی تر دەڵێت: ئەم دارە سەرەتا ئەڵمانیەکان بەکاریان هێناوە، دوای ئەوەی پاپا(یونیڤاس) نێردراوێکی تبشیری نارد بۆ ئەڵمانیاو ئەوانیش بون بە مەسیحی، لەبەر ڕازی کردنی دڵی ئەڵمانیەکان ڕێگری نەکرد لە بەکارهێنانی ئەم دارە لە جەژنەکانی سەری ساڵدا و پاشان لەسەرجەم وولاتان بو بە ڕەمزێکی سەری ساڵ، وەیەکەم داری

١ـ گۆڤاری چرای ڕوناکی ژمارە: ١٧

گەورە کە بەم شێوەی ئێستا ڕازێنرایەوە لە کۆشکی پاشایی بو لە ئینگلتەڕا ساڵی ١٨٤٠ز لەسەردەمی پاشا ڤیکتۆریا.[1]

## بابا نوئێل

دوای ئەوەی کەمێك زانیاریمان وەرگرت دەربارەی کریسمس و بۆمان دەرکەوت کە ئەم دارە نەکەم و نە زۆر پەیوەندی بە جەژنی سەری ساڵەوە نیە، ئێستاش دەچینە سەر باسی دروشمی دووەمی جەژنی سەری ساڵ ئەویش (بابا نوئێل )ە، ساڵانە لە سەرجەم وڵاتانی مەسیحی و بەشێکیش لە وڵاتانی موسڵمانی دەسەڵات عەلمانی وەك چاولێکەری چەند کەسێك پۆشاکی سور و سپی لەبەر دەکەن و کوڵاوێکی زلی سوری لەسەر دەنێن و پێڵاوێکی ڕەشی بریقەدار لەپێ دەکەن و ڕیشێکی سپی بە خۆیانەوە دەخەن و دیاری بەسەر منداڵاندا دابەش دەکەن" ئەوەش وەك بەرجەستە کردن و نمایش کردنی کەسایەتی بابانوئێل، جابا بزانین ئەم بابا نوئێلە کێیەو چ کەسەو چ پەیوەندیەکی بە جەژنی سەری ساڵەوە هەیە:

سەرەتا: دەبێت ئەوە بزانین کە خودی ناو هێنانی (بابا نوئێل) کوفرە، واتا کەسێك بیزانێت وبەکاریشی بهێنێت ـ پەنا بە خودا- کافر دەبێت[1]، چونکە بابانوئێل لە دوو وشە پێك هاتووە (بابانو) واتا: باوکمان، (ئیل) واتا: خودا، بەواتای: خودا باوکمانە یان باوکمان خودایە[2]، پەنا بەخودا ئەمەش عەقیدەی جولەکە و مەسیحیە لادەرەکانە لە دینی ڕاستی کە دەڵێن: ﴿نَحنُ أَبناءُ اللهِ﴾[3]، بەڵام ئێمەی موسوڵمان دەڵێین: ﴿لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ﴾[4] واتا: خودای ئێمە لەکەس

١- ویکیبدیا

٢- تێبینی:لێمە لێرەدا بۆشیکردنەوەی بابەتەکە ناوی بابانوئێل دووبارە دەکەینەوە بەواتای نەقڵی کوفربۆزانیاری کوفر نیە.

٣- کریسمس (سەری ساڵی زاین) لە نێوانی خور خوادا : ٤٤ د عبدالواحدمحمد

٤- المائدة : ١٨

٥- الإخلاص : ٣

نەبووە و کەسیشی لێ نەبووە، کەواتا ئەو کەسەی ئەم ووشە بەکاردێنێت هەست بەخۆشی ناکات کە چۆتە سەر عەقیدەی جولەکەو مەسیحیەکان، وە دەبێت ئەوەش بزانین کە کەسایەتی بابا نوئێل یەکدەنگی نە دەربارەی ناوەکەی و نە دەربارەی ژیان و بەسەرهات و جێگای لەدایکبونی نیە، بەڵکو ڕایەکان ئەوەندە لێك جیاوازن کە وادەکات بڵێین بابا نوئێل لە ئەفسانەوە نزیکترە وەك لە ڕاستی، بەڵام بەگشتی دەربارەی ناوو مێژوی ژیانی بابانوئێل سێ ڕای جیاواز لە سەرچاوە مەسیحیەکاندا هەیە:

یەکەم/ بابانوئێل ناوی (سانت نیقولاسە) و باوکی ناوی (ئەبی فانیۆس) و دایکی ناوی (تونە) بووە، ئەم سانت نیقۆلاسە لە شاری میرای تورکیا لەدایکبووە و لە بنەڕەتدا یۆتانیەولە سەدەی چوارەم و لەناو خێزانێکی دەوڵەمەندا ژیاوە، بابانوئێل منداڵانی زۆر خۆش ویستووە و یارمەتی داون، وە نزیکەی هەشتاساڵ ژیاوە و چل ساڵ قەشە بووە.

دووەم/ بەشێکی تر دەڵێن بابانوئێل ناوی (سانتا نیکۆلاس)ە و لە سەدەی یازدە لە سوید ژیاوە و منداڵانی زۆر خۆشویستووە و دیاری و شیرینی بەسەردا دابەش کردوون بەتایبەت لەسەری ساڵدا.

سێ یەم/ ئەم ڕایە دەڵێت: بابا نوئێل لە گوندی (لاپلاند) لە فنلەندا ژیاوە، ئێستاش ساڵانە ڕێژەیەکی زۆر منداڵ سەردانی ئەم گوندە دەکەن وەك یادکردنەوەی ئەم کەسایەتیەو شارەزایی لەسەر ژیانی.[1]

## وێنەو شێوەی بابا نوئێل

ئەم وێنەی ئێستای بابا نوئێل کە کراسێکی سوری لەبەردایەو پێڵاوێکی ڕەشی لە پێدایەو ڕیشێکی سپی بەفرینی هەیە وێنەیەکی خەیاڵیەو هیچ ئەسڵێکی نیە، بەڵکو بۆیەکەم جار

١ـ گۆڤاری چرای ڕوناکی ژمارە: ١٧

وێنەکێشی ئەمریکی (تۆماس نیست) لەساڵی ١٨٨١ وەهەندێکی تر دەڵێن: ساڵی ١٨٦٠ ئەم وێنەی کێشاوە. وەهەندێك دەڵێن: دەگەڕێتەوە بۆساڵی ١٨٢٣لەسەردەستی شاعیری ئەمریکی (کلارك مۆریس)[1] جا کە بەپێی ڕای یەکەم بێت کە دەڵێت بابا نوئێل لەسەدەی چواردا ژیاوە، ئەوە چواردە سەدە دوای ژیانی ئەم وێنە کێشراوە، وەئەگەر بەپێی ڕای دووەم بێت حەوت سەدە دوای ژیانی خۆی ئەم وێنەی بۆ کێشراوە، ئنجا یەکەم کەس کە بە بەرگی بابانوئێل کەوتە گەڕان بۆ بانگەشە کردن بو بۆ کۆمپانیای کۆکاکۆلا[2].

کەواتا ئەم کەسایەتیەش نەکەم نەزۆر پەیوەندی بەسەری ساڵەوە نیە!!

## پەیوەندی ئەم جەژنە بە کوردەوە

لە کۆنەوە کورد سێ جەژنی هەبووە دوانیان ئاینی و یەکێکیان نەتەوەیی بووە، ئەوانیش جەژنەکانی ڕەمەزان و قوربان و جەژنی نەورۆز بوون، بەڵام هەرچی جەژنی سەری ساڵە نەکەم نەزۆر پەیوەندی بەکوردەوە نیە بەڵکو جەژنێکی هاوردەیە لەسایەی چاولێکەری کوردو دەسەڵاتی عەلمانیەوە، ئەگەرنا:

١ـ ئەم جەژنە جەژنێکی مەسیحیەتەو زۆرینەی کوردستانیش بە ڕێژەی لە ٪٩٤موسوڵمانە[3]

٢ـ ئەم جەژنە لە ئەوروپا سەری هەڵداوەو پەیوەندی بە نەتەوەی کوردەوە نیە.

٣ـ ئەو دروشمانەی لەم جەژنەدا بەکاردێن هیچیان دروشمی کوردی نین بۆنمونە کەی لەکوردستان ئێمە درەختی کریسمس و بابا نوئێلمان هەبووە، بەڵام ئەم جەژنە بە دوو هۆکاری سەرەکی

١ـ الموسوعە الحرە (ویکیبدیا)

٢ـ کریسمس (سەری ساڵی زاین) لەنێوان خور و خوادا : ٤٨

٣ـ ئەم ڕێژەیە لە جوگرافیای کۆنی پۆلی دووەمی ناوەندی باسکراوە .

گوازراوەتەوە ناو کورد و کوردستان:

یەکەم/ حەزی لاسایی کردنەوەو چاولێکەری لای گەلی کورد. ئێمەی کورد سروشتمان وایە هەمو شتێکی دەرەکی بەگشتی وئەوروپا بەتایبەتی بە چاك و جوان و پێشکەوتن دەزانین و حەزمان لێیەتی لاسایی بکەینەوە، وادەزانین بەوە پێشدەکەوین و ڕۆشنبیر دەبین. مامۆستا مسعود عبدالخالق دەڵێت: بەڵگەنامەیەکی دەگمەنی بەریتانیم دۆزیەوە کە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵانی (١٩٣٤)و باسی هەندێك ڕۆشنبیردەکات لە کوردستان و لەسەردەمی هاتنی ئینگلیزەکان و دەڵێت: ئینگلیزەکان دەیانگوت: کاتێك هەندێك کورد چاویان بەئێمە دەکەوت یەکسەر باسی مەشروب و کیتابەکانی ڤۆلتێر و جەژنی سەری ساڵیان دەکرد و جارجاریش هەڵدەستان دانسیان دەکرد و پەیڕەوی ئەو فەرهەنگەی ئێمەیان دەکرد، دواتر بۆمان دەرکەوت ئەو کوردانە بۆیە وادەکەن بۆ ئەوەی کە ئێمە پێیان بڵێین ئەوانە ڕۆشنبیر و کراوەن!![1]

دووەم/ بەپیلانی عەلمانیەت و تەبشیری مەسیحیەت، یەکەمیان بۆ دورخستنەوەی موسوڵمانان لە بنەماکانی ئاینی پیرۆزی ئیسلام، چونکە تاچەند مرۆڤی موسوڵمان لە بنەماکانی دینەکەی دور بێت ئەوەندە لە عەلمانیەت نزیك دەبێتەوە. وە دووەمیان بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحیەت و کردنە مەسیحی موسوڵمانان. بۆیە دەبینین ساڵانە لەلایەن حکومەتی عەلمانی هەرێمی کوردستانەوە گرنگیەکی زۆر بەم جەژنە دەدرێت و بودجەی تایبەت بۆ ڕازاندنەوەی شارەکان و ئاهەنگەکان تەرخان دەکرێت، لەبەرامبەریشدا هیچ گرنگیەك بە یادی سەری ساڵی موسوڵمانان ـ کۆچی ـ نادرێت !!

## حکمی شەرعی ئەم جەژنە

هیچ گومانێك نیە کە بەژداری کردن لەم جەژنەو پیرۆزبایی کردن بەبۆنەی ئەم جەژنەوە حەرامەو

١ـ گۆڤاری چرای ڕوناکی ژمارە :١٧لاپەڕە: ١٢ پەیوەندی کورد بە جەژنی سەری ساڵ، مسعود عبدالخالق.

قەدەغەیە، ئەمەی خوارەوەش بەڵگەکان و فتواو ڕای زانایانە:

## بەڵگەکان

ئێمە لە باسی حوکمی شەرعی جەژنەکاندا باسمان کرد کە هەر جەژنێك تایبەت بێت بە کافرانەوە ئەوە قەدەغەیە و حەرامە ئەگەر موسڵمانان یادیان بکەنەوە و دروشمەکانی بەرز بکەنەوە، وە هەر لەوێدا بەڵگەکانمان باسکردن، بەڵام لێرەدا بۆ دڵنیا کردنەوەی ئەم باسە چەند بەڵگەیەك باس دەکەین و ووتە و فتوای چەند زانایەکیش دەخەینە ڕوو:

١ـ خودای گەورە(جل جلاله) دەربارەی صیفەتی بەندە چاکەکانی خۆی دەفەرموێت: ﴿والذين لايشهدون الزور﴾[1] زانایان: أبوعاليه وإبن سيرين و ضحاك و ڕەبیعی کوڕی ئەنەس رحمهم الله دەفەرمون: واتا: ئەوکەسانەی بەشداری جەژنی کافر و هاوبەش دانەرەکان ناکەن.[2]

بێگومان جەژنی سەری ساڵیش جەژنێکی تایبەتی کافرانەو هیچ پەیوەندیەکی بە موسڵمانانەوە نیە، کەواتا بە پشتیوانی ئەم ئایەتە بەندە چاکەکانی خودا ئەوانەن کە بەشداری جەژنی سەری ساڵ ناکەن.

٢ـ گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالك(رضي الله عنه)دەفەرموێت: قَدَّمَ رَسُولُ اللهِ ﷺ المَدِينَةَ وَلَهُم يَومانِ يَلْعَبُونَ فِيهِما، فَقَال: (ماهذانِ الْيَومانِ؟) قالوا: كُنَّا نَلْعَبُ فِيهما فِي الجْاهِلِيةِ. فَقالَ رَسُولُ اللهِ ﷺ: (إنَّ اللهَ قَد أَبْدَلَكُم بِهِما خَيراً مِنهُما يَومَ الأَضحَى، وَيَومَ الفِطرِ)[3]واتا: پێغەمبەری خوداﷺهاتە مەدینە بینی خەڵکی مەدینە دوو ڕۆژیان هەن تێیاندا یاری و گاڵتەو گەپ دەکەن، پرسی ئەم دوو ڕۆژە چین؟ گوتیان: ئەوە دوو ڕۆژن ئێمە لـــــە سەردەمی نەفامیدا

١ـ الفرقان: ٧٢

٢ـ تفسير القرآن العظيم ، ابن كثير: ٢٥/٦

٣ـ پێشەوایان أبو داود و النسائي و أحمد بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە.

یاری و گاڵتەو گەپیان تێدا دەکردن، ئەویش فەرمووی: بێگومان خودای گەورە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بە دوو ڕۆژی باشتر ئەوانیش ڕۆژی جەژنی قوربان و ڕۆژی جەژنی ڕەمەزانن.

جا وەك باسمان کرد گۆڕان ـ تبدیل ـ کاتێك دێتەجێ کە گۆڕدراو ـ مبدل ـ وازی لێبهێنرێت. کە پێغەمبەریش ﷺ دەفەرمووێ: (إنَّ اللهَ قَدْ أَبْدَلَكُم بِهِما خَيراً مِنْهُما) واتا: بێگومان خودای گەورە ئەم دوو ڕۆژەی بۆ گۆڕیون بە دوو ڕۆژی باشتر" بەواتای: واز لەم دوو ڕۆژە هاوشێوەکانی ئەم دوو ڕۆژە بهێنن و لە جێگایان یادی جەژنە ئیسلامیەکان بکەنەوە کە جەژنی قوربان و ڕەمەزانن. بۆیە دەبێت ئێمەی موسوڵمان ڕو بکەینە جەژنە ئیسلامیەکان و پشت بکەینە جەژنی کافران.

٣ـ پێشەوا عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه فەرمویەتی: (إجتَنِبوا أَعْداءَاللهِ الْيَهُودَ وَالنَّصارى فِي عِيدِهِم يَومَ جَمْعِهِم، فَإِنَّ السُّخطَ يَنزِلُ عَلَيهِم فَأَخشى أَن يُصِيبَكُم وَلا تَعْلَمُوا رَطانَتَهُم فَتَخَلَّقُوا بِأَخلاقِهِم)[١] واتا: خۆتان بپارێزن لە دوژمنانی خودا جولەکەو گاورەکان و بەشداری مەکەن لە ڕۆژانی کۆبونەوەیان بۆ جەژنەکانیان، چونکە بێگومان تورەی و غەزەبی خودایان بەسەردا دەبارێت، منیش دەترسم ئەم غەزەب و تورەییەی خودا بەر ئێوەش بکەوێت، وە بەشێوازی ئەوان قسە مەکەن چونکە بەم هۆیەوە ئەخلاقی ئەوان هەڵدەگرن.

جا بە پشتیوانی ئەم بەڵگانە وەك باسمان کرد ابن قیم یەکدەنگی زانایانی باس کردووە لەسەر حەرامی و قەدەغەیی یادکردنەوەی ئەم جەژنەو هاوشێوەکانی، چونکە ئەم جەژنە جەژنێکی تایبەتە بە ئاینی مەسیحیەت و هیچ پەیوەندی بەموسڵمانانەوە نیە، پێغەمبەری خوداش لە چەندین فەرمودەدا نکۆڵی کردووە لەوەی موسڵمانان شوێ، داب و نەریت و هەڵسوکەوتی بێباوەڕان بەگشتی و ئەهلی کتاب بەتایبەتی بکەون.

---

١ـ پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە.

# جەژنی خۆشەویستی (ڤالانتاین)

سالآنەو لەرِۆژی٢/١٤دا عاشقان و ئەویندارا ئاهەنگ دەگێرِن بەبۆنەی جەژنی خۆشەویستی جیهانیەوەو، لەم رِۆژەدا ئەویندارا گوڵی سور و کارتی خۆشەویستی دەگۆرِنەوە و پۆشاکی سور دەکەنە بەریان و بۆینباغی سور دەبەستن، وەبە چەندین ووشەی سۆزداری خۆشەویستی بۆ یەکتر دەردەبرِن، جا ئەم جەژنەش لە بنەرِەتدا جەژنێکی رِۆمانیەو چۆتە ناو ئاینی دەستکاری کراوی مەسیحیەتەوە و پاشان وەکو باقی جەژنە پوچەکانی تر وەك چاولێکەری و لاسایی کردنەوە و ساویلکەیی گوازراوەتەوە ناو موسوڵمانان و لە ناویشیاندا کوردستان، جا بە پشتیوانی خودا ئێمە لێرەدا تیشکێك دەخەینە سەر مێژووی سەرهەڵدان و چیرۆکە ئەفسانەییەکانی ئەم جەژنەو، حوکمی بەشداری کردنی موسوڵمانان تیایدا و خۆشەویستی لەرِوی شەرعەوە:

## مێژوو و چیرۆکە ئەفسانەییەکانی ئەم جەژنە

مێژووی سەرهەڵدانی ئەم جەژنە دەگەرِێتەوە بۆ حەڤدە سەدە پێش ئێستا و یەکێکە لە جەژنەکانی رِۆمانیەکان، رِۆمانیەکانیش بت پەرست بوون و ئەم جەژنەیان وەك دەربرِینی خۆشەویستی خودایی بۆ بتەکانیان داهێناوە، وەدەربارەی ئەم جەژنە بت پەرستیە چەند ئەفسانەیەك باسکراوە لەوانە:

١ـ رِۆمانیەکان باوەرِیان وابو کە(رِۆملیۆس) دامەزرێنەری شاری رِۆما رِۆژێك گورگێك شیری پێداوە، ئەمەش هێز و قوڵی بیرکردنەوەی پێبەخشیوە، جا رِۆمانیەکان بە بۆنەی ئەم رِوداوەوە لە نیوەی مانگی دووی هەموو ساڵێکدا ئاهەنگی گەورەیان گێرِاوە،وە یەکێك لە رِێورِەسمەکانی ئەوە بوو کە سەگێك و بزنێکیان سەردەبرِی و دوو لاویان ئەهێنا کە باڵیان بەیەکەوە بادرابو، بەخوێنی ئەم سەگ و بزنەیان چەوریان دەکردن،پاش ئەوە چەوریەکەیان بەشیر ئەشۆردەوە،پاشان خەڵکێکی زۆر بەرِێ ئەکەوتن و ئەم دوو لاوەش لە پێشیانەوە ئەرِۆیشتن و بە کوچەو کۆڵانەکانی ئەم شارەدا

ئەسوڕانەوە، وە ئەم دوو لاوە دووپارچە پێستەیان پێبو، هەرکەسێکیان توش ببوایە ئەیانهێنا بە لاشەیدا، وە ئافرەتانی ڕۆمانی ئەم بەرکەوتنەیان بە خۆشیەوە وەردەگرت، چونکە باوەڕیان وابوو کە ئەم بەرکەوتنە نەزۆکی ناهێڵێت و چارەسەری ئەدات [1].

کەواتا: ئەم جەژنە لە بنچینەدا جەژنێکی بت پەرستی ڕۆمانیە، دوای ئەوەی ڕۆمانیەکان بوون بەگاور ئەم جەژنەیان لەگەڵ خۆیاندا گواستەوە بۆ ناو گاورەکان، بەڵام بەرگێکی ئاینیان بەبەرداکرد و قەدیس ڤالانتاینیان کرد بەڕەمزی ئەم جەژنە!

٢ـ لەسەدەی سێ یەمی زاینی دا ئیمپڕاتۆر(الکودیوسی دووەم) فەرمانداری ڕۆمانیەکانی دەکرد، ڕۆمانیەکانیش چوبونە سەر ئاینی گاورەکان، لەو ماوەیـــەدا ئیمپڕاتۆر هاوسەرگیری قەدەغەکردبو لەسەر سەربازەکانی بە بیانوی ئەوەی هاوسەرگیری سەرقاڵیان دەکات لەو جەنگانەی هەڵ ئەگیرسان و کار دەکات لەسەر هێزی دەرونی و جەستەیی سەربازەکان. لەبەرامبەردا (قەشە ڤالانتاین) دژی ئەم بڕیارەی ئیمپڕاتۆر وەستایەوەو دەنگی لێ بەرز بۆوە و بڕیاریدا بە نهێنی گرێبەستی هاوسەرگیری بۆ سەربازەکان ئەنجام بدات، کاتێ ئیمپڕاتۆر بەمەی زانی قەشە(ڤالانتاین)ی دەستگیرکرد و پاشان فەرمانی لە سێدارەدانی بۆ دەرکرد، لە زینداندا کەوتە داوی خۆشەویستی کچی دەرگاوانی زیندانەوە" ئەمەشیان هەر بەنهێنی چونکە لە ئاینی گاوریدا پێکهێنانی ژیانی هاوسەری و پەیوەندی سۆزداری لەسەر قەشەکان قەدەغەیە ـ حرام ـ، پاشان ئیمپڕاتۆر بڕیاریدا لێی خۆش ببێت و بیکات بە یەکێك لە کەسە نزیکەکانی خۆی و بیکاتە زاوای خۆی، بەو مەرجەی قەشە ڤالانتا واز لە ئاینی خۆی بهێنێت و بچێتە سەر ئاینی بت پەرستی ڕۆمانیەکان، بەڵام قەشە ڤالانایین ئەم داوایەی ڕەت کردەوە، بۆیە ئیمپڕاتۆر لەڕۆژی ٢٧٠/٢/١٤ز دا بڕیاری لە سێدارەدانەکەی بەســـەردا جێ بەجێ کرد.پاشان لـــە شەوی ١٥ی

---

١ـ قوربانیەکانی خۆشەویستی : ٢٧ـ٢٨

فبرایری جەژنی (لوبەرکلیا)وە قەشە ڤالانتاین نازناوی قەدیسی پێدرا، داواتر کەنیسە ساڵنامەیەکی دانا، وەهەر ڕۆژێکی دانا بۆ قەدیسێك، لە بەریتانیا جەژنی قەدیس ڤالانتاین لە کۆتایی وەرزی زستاندا دانرا، لەو ڕۆژەدا کوڕە گەنج و لاوەکان گوڵ لەبەردەمی پەنجەرەی ئەو کچانە دادەنێن کە خۆشیان دەوێن، وە لە لایەن پاپاوە ڕۆژی مردنی قەشە ڤالانتاین ١٤/٢/٢٧٠ز کرا بەڕۆژی جەژنی خۆشەویستی.(١)

## قەشە ڤالانتاین کێ یە؟

لە ناو کتێبەکانی گاورەکاندا ناوی سێ قەدیس ڤالانتاین ی بەناوبانگ هەیە کە بۆخۆشیان باش نازانن تاخۆ جەژنی ڤالانتاین دەگەڕێتەوە بۆ کام قەدیس ڤالانتاینە ئەمەی خوارەوە ئەم سێ قەدیس ڤالانتاینەی گاورەکانە:

یەکەم/ قەدیس ڤالانتاینی ڕۆمی: ئەم قەدیس ڤالانتاینە لە شاری ڕۆما ژیاوە و لەوێش قەدیس بووە، لە ساڵی ٢٦٩ز کوژراوە و لە نزیك ڕێگای (فیافلامینا) و لە کەنیسەی (سانت براکسید) نێژراوە .

دووەم/ قەدیس ڤالانتاینی تۆرنی: ئەم قەدیس ڤالانتاینە لە شاری تۆرنی ژیــاوە و لــە دەوروبەری ساڵی ١٩٧ز بۆتە ئەسقەفی شاری (ئینترامنا)، لەو ماوەی مەسیحیەکان توشی چەوسانەوە بوونەوە لە سەردەمی دەسەڵاتی ئیمپراتۆر (ئۆرلیان) کوژراوە، ئەم قەدیس ڤالانتاینەش بەهەمان شێوەی ڤالانتاینی ڕابردو لە نزیك ڕێگای (فیا فلامینا) نێژراوە"بەڵام لە جێگایەکی تری جیا لە جێگای ڤالانتاینی یەکەم.

سێ یەم/ لە مەوسوعەی (کاثولیك إنسایکلۆپیدیا)دا ئاماژەی بە ناوی قەشە ڤالانتاینێکی تریش کراوە کەناوی لە لستی شەهیدان و قەدیسەکانی کەنیسەی کاسۆلیکی دا هاتووە.

جێگای ئاماژەیە ئەم دوو قەدیسەی ڕابردو لە بنەڕەتدا هیچ پەیوەندیەکیان بە خۆشەویستیەوە نیە، بەڵام لە دوای سەدەی چواردەوە لەلایەن گاورەکانەوە کران بە ڕەمزی خۆشەویستی [1]

## بەشێك لە خورافیاتەکانی ئەم جەژنە

خودی ئەم جەژنە بۆخۆی لە ئەفسانەوە نزیکە، لەگەڵ ئەوەشدا گاورەکان چەندین خورافیاتیان تێکەڵ کردووە کە زیاتر لەگرنگی ئەم جەژنە کەم دەکاتەوە، ئەمەی خوارەوە بەشێك لەم خورافیاتانەن:

* دەڵێن ئەگەر لە جەژنی ڤالانتاین دا کچێك باڵندەیەکی دی، ئەوە هاوسەری داهاتوی بۆ مسۆگەر دەبێت، بەڵام صیفەتی پیاوەکە پەیوەستە بە جۆری باڵندەکەوە، بۆنمونە چۆلەکە: پیاوێکی هەژارە، باڵندەی شین: پیاوێکی دڵخۆشە، باڵندەی ڕەش: قەشە یان پیاوی ئاینی یە... وە ئەگەر کوندە پەپوی بینی ئەوە ئەو کچە بە قەیرەیی دەمێنێتەوە.

*ئەگەر کەسێك سێوێك بکات بە دوو کەرتەوە"ئەوە ژمارەی دەنکەکانی گوزارشت لە ژمارەی منداڵەکانی دەکات.

* هەڵستان لە خەو بەماچ لە ڕۆژی ڤالانتاین دا بەختی باش بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

* ئەو کچەی لە ڕۆژی ڤالانتاین دا بۆ یەکەمجار ناوی پیاوی لە ڕۆژنامەدا خوێندەوە، یان لە ڕادیۆ و تەلەفزیۆندا گوێی لێبیبوو" ئەوا ئەمە ناوی ئەو پیاوەیە کە شوی پێدەکات.

* ئەگەر ئافرەتێك لە ڕۆژی ڤالانتاین دا سمۆرەیەك ببینێ، ئەوە شو بەپیاوێکی ڕەزیل دەکات کە هەموو پارەکەی بۆ خۆی دەبات .

* ئەگەر کچێك لە ڕۆژی ڤالانتاین دا باڵندەی (حەوت ڕەنگینە) ببینێ ئەوە شو بە ملیۆنلێرێك دەکات.

---

١- ویکیبیدیا .

* هەر کچێك لە ڕۆژی ڤالانتاین دا چەند کۆترێك ببینێ ئەوە ئاهەنگێکی بوك گواستنەوەی پڕ لە خێرو خۆشی بە نسیب دەبێت.

* ئەو کچەی لە ڕۆژی ڤالانتاین باڵندەی بوکە سورە یان سنگ زەردە ببینێت ئەوە شوو بە پیاوێکی تاوانکار و شەڕانی دەکات.[1]

جا ئەمانەی ڕابران بەشێك بون لەو خوڕافیات و شتە پوچانەی تێکەڵ بە جەژنی ڤالانتاین بوون و تا ڕاددەیەك گاورەکان بڕوایان پێیەتی، کە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە مرۆڤی موسڵمان بڕوای پێیان هەبێت، چونکە ئەمانە لە ئیسلامدا پێیان دەگوترێت ڕەشبینیکردن وباڵندە هەڵفڕاندن بۆ پێشبینیکردن (تطیر)، ڕەشبینیکردن و هەڵفڕاندنی باڵندەش یەکێکە لە نەریتەکانی سەردەمی نەفامی و پاش هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام حەرام کرا، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (الطیرة شرك ، الطیرة شرك ثلاثا)[2]واتا: هەڵفڕاندنی باڵندە بۆ پێشبینی کارەکان هاوبەشی دانانە بۆ خودا و ئەم فەرموودەی سێ جار دووبارە کردەوە.

## دروشمەکانی تایبەت بەم جەژنە

دروشمەکانی تایبەت بەم جەژنە زۆرن، بەڵام گرینگترینیان بریتین لە گۆڕینەوەی گوڵی سور لە نێوان عاشقان و، بەخشینەوەی کارتی خۆشەویستی و، دەربڕینی دڵخۆشی تایبەت هەروەك چۆن لە باقی جەژنەکانی تردا بونی هەیەو،گۆڕینەوەی ووشەی خۆشەویستی لە نێوانی عاشقاندا و... هتد جا بابزانین بەشێك لەم دروشمانە لە چیەوە هاتوون و واتایان چیە:

١ـ گوڵی سوور: بت پەرستەکان وەك دەربڕینی خۆشەویستی خودایی گوڵی سوریان پێشکەش بەیەکتری دەکرد، واتا : گوڵی سور دروشمە بۆ گۆڕینەوەی خۆشەویستی خودایی.

---

١ـ گۆڤاری هەفتانە ، ژمارە: ٨٤

٢ـ پێشەوایان: ابوداود و ترمذی نسائی گێڕاویانەتەوە و پێشەوا ترمزیش بە صحیحی داناوە.

٢ـ کارتی پیرۆزبایی: لە زۆرێك لە کارتەکانی پیرۆزباییدا وێنەی (کیوبید)ی لە سەرە کە منداڵێکەو دوو باڵی هەیە و کەوانێك و نەشابێکی هەڵگرتووە، ئەو منداڵەش خوای خۆشەویستی بووە لای بت پەرستە ڕۆمانیەکان.

جا ئەی گەنجی موسوڵمان: ئایا خودای تۆ کێ یە؟ ئایا تۆی موسڵمان جگە لە (الله) هیچ خودایەکی ترت هەیە هەتاکو بیکەیت بە خودای خۆشەویستی (پەنا بەخودا)، ئایا تۆ ڕازیت خۆشەویستی کچێك بچوێنی بە خۆشەویستی خودایەکەت؟ ئایا تۆ ڕازیت گوڵێك بکەیت بە ڕەمزی خۆشەویستی خودا کە خودای پەروەرگار خۆی پێی ڕازی نیە؟ بێگومانم نەخێر نەخێر تۆی بەڕێز پێی ڕازی نیت، کەواتا: ئاگاداری باوەڕو ئیمانەکەت بەو نەکەی لە ڕۆژی ٢/١٤دا ئەم گوڵە بدەیت بەهیچ کەسێك و لە هیچ کەسێکیشی وەربگری، نەکەیت کارتی تایبەت بە جەژنی ڤالانتاین بگۆڕیتەوە، نەکەیت هیچ تایبەتمەندیەك بدەیت بە ڕۆژی ٢/١٤ چونکە هەرکەسێك تایبەتمەندی بدات بەم ڕۆژە " بێگومان تاوانبارە و سەرپێچی یاسای پەروەردگاری کردووە.

## حوکمی شەرعی جەژنی ڤالانتاین[1]

جەژنی ڤالانتاین جەژنێکی بت پەرستی گاوریە و هیچ پەیوەندیەکی بە ئیسلام و موسڵمانانەوە نیە، بۆیە حوکمی ئەم جەژنەش وەکو حوکمی جەژنی سەری ساڵی زاینیەو بە هیچ شێوەیەك دروست نیە موسوڵمانان بەشداری ئەم جەژنە بکەن و، بەشداری کردن تێیدا حەرامەو قەدەغەیە .لیژنە بەردەوامی توێژینەوە و فتوای سعودی لەفتوایەکی تایبەت بە جەژنی ڤالانتاین دا دەفەرموێت: (واجتنابه إستجابة لِله وَرَسولِهِ وبعدا عن أسباب سخط الله وعقوبته،كما يحرم على المسلم الإعانة على هذا العيد أوغيره من الأعياد المحرمة، بأى شيء من أكـــــل أو

١ـ بڕوانە حوکمی ئەو جەژنانەی تایبەتن بە بێباوەڕان لە لاپەڕە:٢٤٦ی ئەم پەرتوکەی بەردەستت. لەوێدا بەڵگەکان باسکراوە ، لەترسی دوبارە بونەوە و درێژبونەوە لێرەدا نەمان نوسیون .

شرب أو بيع أو شراء أوصناعة أو هدية أو مراسلة أو إعلان أو غير ذالك، لأن ذلك كله من التعاون على الإثم والعدوان ومعصية الله الرسول والله جل وعلا يقول: ﴿ وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ شَدِيدُ الْعِقَابِ﴾[1] ويجب على المسلم الإعتصام بالكتاب والسنة في جميع أحواله لا سيما في أوقات الفتن وكثرة الفساد)واتا: خۆ پاراستن لە جەژنی ڤالانتاین جێبەجێ کردنی فەرمانی خوداو پێغەمبەرەکەیەتی ﷺ، وە دور کەوتنەوەیە لە هۆکارەکانی کەوتنە ژێر تورەیی و سزای خوداوە، وە قەدەغەیە ـ حرام ـ ە موسوڵمانان یارمەتی کافران بدەن لەسەر ئەم جەژنەو باقی جەژنە حەرامەکانی تر، نابێت بەهیچ پێویستیەکی جەژن وەك: خواردن و خواردنەوە و کڕین و فرۆشتن و دروست کردنی پێداویستیەکانی جەژن وەك دیاری و پەیامی پیرۆزبایی و بانگەوازو جگە لەوانەش یارمەتیان بدرێت، چونکە هەمو ئەمانە یارمەتی کافرانە لە سەر تاوان وسەرپێچی و دوژمنایەتی خودا و پێغەمبەرەکەیﷺ. خودای بەرز و بەتوانا دەفەرمووێت: یارمەتی یەکتر بدەن لەسەر چاکەو خواپەرستی، بەڵام یارمەتی یەکتر مەدەن لەسەر تاوان و سەرپێچی و دوژمنایەتی.بۆیە پێویستە لەسەر موسڵمانان دەست بگرن بە قورئان و سوننەتەوە لە هەموو کات و ساتێکدا بەتایبەت لە کاتی ئاشوب و زۆری خراپەکاری.

دکتۆر محمود میصری لە(من روائع الفتاوى المعاصر)دا دەفەرمووێت: ئاهەنگ گێڕان بەبۆنەی جەژنی خۆشەویستیەوە لەچەند ڕویەکەوە دروست نیە:

یەکەم/ ئەم جەژنە جەژنێکی داهێنراو و هیچ بنچینەیەکی نیە لە شەرعدا.

دووەم/ ئەم جەژنە خەڵکی هاندەدات لەسەر عەشق و خۆشەویستی حەرام.

سێهەم/ ئەم جەژنە هۆکارێکە بۆ مەشغوڵ کردنی دڵ بەم جۆرە شتە بێ نرخ و پوچانەوە و

---

١ـ المائدة : ٢

دوریان دەخاتەوە لەو ڕێڕەوە جوان و چاكەی كە پێشینە چاكەكانی ئوممەت لەسەری بون، لە یادی خودا و مەشغوڵ بون بەخوا پەرستی و...هتد لەبەر ئەوە دروست نیە ئەو ڕۆژە تایبەت بكرێت بە هیچ یەكێك لە دروشمەكانی جەژن وەك ئامادەكردنی خواردن و خواردنەوەی تایبەت و لەبەركردنی پۆشاكی تایبەت و دیاری و پیرۆزبایی و جگە لەوانەش، وە پێویستە موسڵمانان شانازی بكەن بە ئاینەكەیانەوە و بەدوای هەموو هاوارێك نەكەون.[1]

## ئیسلام وخۆشەویستی

ئێمە كاتێك دەڵێین دروست نیە موسوڵمان بەشداری بكات لە جەژنی خۆشەویستیدا، ئەوە واتای ئەوە ناگەیەنێت كە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی ڕق و كینە و داخران بێت! نەخێر، بەڵكو خۆشەویستی یەكێكە لە پلەكانی باوەڕ لە ئیسلامداو تەواوكەری باوەڕە، پێغەمبەری ڕێزدارﷺ فەرموویەتی: (لاتَدخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤمِنوا، وَلاتُؤمِنوا حَتَّى تَحابُّوا...)[1]وە لە گێڕانەوەی پێشەوایان أبوداود و ترمذیدا فەرموویەتیﷺ: (وَالَّذى نَفسِى بِيَدِهِ لاتَدخُلُوا الْجَنَّةَ حَتَّى تُؤمِنوا، وَلا تُؤمِنُوا حَتَّى تَحابُّوا...)واتا: سوێند بەوكەسەی گیانی منی بەدەستە ـ كە زاتی الله ـ یە هیچ كامێكتان ناچێتە بەهەشتەوە هەتا باوەڕ نەهێنن، وە باوەڕیشتان تەواو نابێت هەتا یەكترتان خۆش نەوێت. كەواتا: سەراپای ئیسلام خۆشەویستی یە، بەڵام بۆ ئەم خۆشەویستی یە یاسای هەیە بۆ ئەوەی خەڵكانێكی ئارەزوباز ئەم خۆشەویستی یە نەقۆزنەوەو لە ڕێگا ڕاستەكەی لاینەدەن، بۆیە زانایانی ئیسلام خۆشەویستی دابەش دەكەن بۆ دوو بەشی سەرەكی:

یەكەم/ خۆشەویستی ڕێگا پێدراو ـ حەڵاڵ ـ

دووەم/ خۆشەویستی قەدەغە ـ حرام ـ

---

١ـ من روائع الفتاوى المعاصرة: ٢٢٧ـ٢٢٨

یه‌كه‌م/ خۆشه‌ویستی ڕێگا پێدراو ـ حه‌لاڵ ـ: ئه‌م خۆشه‌ویستیه‌ش دابه‌ش ده‌بێت بۆ سێ به‌ش: واجب، سوننه‌ت، مباح:

أـ خۆشه‌ویستی واجب: بریتیه‌ له‌ خۆشه‌ویستی خودا وپێغه‌مبه‌رﷺ، پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رموویه‌تی: (ثَلاثٌ مَن كنَّ فِيهِ وَجَدَ حَلاوةَ الإيمانِ: أَنْ يَكُونَ اللهُ وَرَسولُه أَحبَ إِلَيهِ مِما سواهُما، وَأنْ يُحِبَّ الْمَرءَ لا يُحِبُّهُ إلا للهِ، وَأنْ يَكرَهَ أَن يَرجِعَ إِلى الْكُفرِ بَعدَ أَنْ أَنقَذَهُ اللهُ مِنهُ كَما يَكرَهُ أَنْ يُلقِيَ فِي النّارِ)[1]واتا:هه‌ركه‌سێك ئه‌م سێ شته‌ی تێدا بێت ئه‌وه‌ شیرینی باوه‌ڕی چه‌شتووه‌: یه‌كه‌م/ خوداو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یﷺله‌ هه‌موو شتێك جگه‌ له‌وان خۆشتر بوێت، دووه‌م/ موسوڵمانێكی خۆشبوێت ته‌نها له‌ به‌ر خودا، سێ یه‌م/ پێی ناخۆش بێت و ڕقی ببێته‌وه‌ له‌وه‌ی بگه‌ڕێته‌وه‌ بۆ بێباوه‌ڕی دوای ئه‌وه‌ی خودا هیدایه‌تی داوه‌ بۆ باوه‌ڕ هه‌روه‌ك چۆن پێی ناخۆشه‌ بیخه‌نه‌ ناو ئاگره‌وه‌. جا هه‌ركه‌سێك خوداو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یﷺ خۆش ویست ئه‌وكات سه‌رفرازی ڕۆژی قیامه‌ت به‌ده‌ست ده‌هێنێت و له‌گه‌ڵ پێغه‌مبه‌رداﷺده‌بێت له‌ به‌هه‌شتدا، گه‌وره‌مان ئه‌نه‌سی كوڕی مالكرضي الله عنهده‌فه‌رموێت: پیاوێك هات بۆلای پێغه‌مبه‌رﷺگووتی: (يا رسولَ اللهِ مَتى السَّاعَةُ؟)واتا: ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوداﷺكه‌ی قیامه‌ت دێت؟ پێغه‌مبه‌ریشﷺفه‌رمووی: (وَما أَعْدَدْتَ لِلسّاعةِ؟)واتا: چیت ئاماده‌ كردووه‌ بۆ قیامه‌ت؟ ئه‌ویش گووتی: (حُبَّ اللهِ وَرَسُولِهِ)واتا: خۆشه‌ویستی خوداو پێغه‌مبه‌ره‌كه‌یﷺ، پێغه‌مبه‌ریشﷺفه‌رمووی: (فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحبَبتَ)[1]واتا: تۆ له‌گه‌ڵ ئه‌وكه‌سه‌دا ده‌بیت له‌ قیامه‌تدا كه‌خۆشت ده‌وێت، به‌واتای تۆ له‌گه‌ڵ مندا ده‌بیت له‌به‌هه‌شتدا، ئه‌نه‌سرضي الله عنهده‌فه‌رموێت: له‌دوای موسوڵمان بوونمان هیچ شتێك به‌ ئه‌ندازه‌ی ئه‌م فه‌رمووده‌ی پێغه‌مبه‌رﷺدڵخۆشی نه‌كردین كه‌فه‌رمووی: ( فَإِنَّكَ مَعَ مَنْ أَحبَبتَ)

---

١ـ پێشه‌وایان بوخاری و مسلم گێڕاویانه‌ته‌وه‌.

جا ئەنەس رضي الله عنه دەیفەرموو: ( فَأَنَا أُحِبُّ اللهَ وَرَسُولَهُ وَأَبَا بَكرٍ وَعُمَرَ وَأَرجُو أَنْ أَكونَ مَعَهُم وَإِنْ لَم أَعمَل بِأَعمالِهِمْ)[1] واتا: من خوداو پێغەمبەر ﷺ و أبوبکر و عمرم خۆشدەوێت و تکام وایە لەگەڵ ئەوان بم لە ڕۆژی قیامەت، هەرچەندە کردەوە باشەکانیشم وەك هی ئەوان نابێت!!

ئێمەش هاوشێوەی ئەنەس رضي الله عنه دەڵێین: ئەی خودای پەروەدگار ئێمەش تۆ و پێغەمبەرەکەت ﷺ و أبوبکر و عمر و عثمان و علی و سەرجەم هاوەڵان رضی الله عنهم و گشت دۆستانی تۆ و پیاو چاکانمان خۆشدەوێت و تکامان وایە لەگەڵ ئەواندا بین لە قیامەتدا، هەرچەندە کردەوەکانیشمان وەکو کردەوەی ئەوان نابێت، وەك شافعی ئاسا دەڵێین:

أحِبُّ الصالحين ولست منهم لعلي أن أنالَ بهم شفاعـةْ

وأكرهُ مَن تجارتُه المعـــاصي ولو كنا سواءً في البضاعةْ

واتا: پیاوچاکانم خۆشدەوێت گەرچی لەوان نیـــمە من

بەڵکو دووعایەك لەوان سودێك ببەخشێت بەمن

زۆر ڕقیشم لەوکەسانەیە مامەڵەی تاوانەکـــەن

گەرچی هەردوو لێکەچن ماڵی ئەوی و ماڵی من[2]

جا خۆشەویستی خوداو پێغەمبەر ﷺ تەنها بە قسە پێك نایەت،بەڵکو موسڵمان دەبێت بە کردەوە بیسەلمێنی کە ئەوانی خۆشدەوێت، خودای گەورە دەفەرموێت:﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ اللَّهَ فَاتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ اللَّهُ وَيَغْفِرْ لَكُمْ ذُنُوبَكُمْ وَاللَّهُ غَفُورٌ رَّحِيمٌ﴾[1] واتا: ئەی پێغەمبەر ﷺ بـــە باوەڕداران بڵێ: ئەگـــەر ئێوە بەڕاستی خوداتان خۆشدەوێت" ئەوە شوێنی من بکـــەون و لە فـــەرمانی من دەرمەچن، ئەوکات خودای گەورە ئێوەی خۆشدەوێت و لـــە تاوانەکانیشتان خۆشدەبێت خوداش

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ دیوانی ئیمامی شافعی ، وەرگێڕانی مەلا محمد سوێری :٤٤

لێخۆشبو و میهرەبانە. بەواتای: خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرەکەی یەکسانە بە فەرمانبەرداری کردنیان، بۆیە ئەو کەسەی دەڵێت: خوداو پێغەمبەرم ﷺ خۆشدەوێت" بەڵام نوێژناکات یان ڕۆژ ناگرێت یان زەکات نادات...هتد، وەیان کەسێکی درۆزنە یان زیناکارە یان بەد ڕەوشتە ...هتد، ئەوە ڕاستگۆ نیە لەبانگەشەی خۆشەویستیەکەی داو درۆی کردووە لەگەڵ خۆیدا، لەبەر ئەوە پێویستە ئەو کەسە پێداچونەوە بکاتەوە بە خۆشەویستیەکەیدا لەگەڵ خوداو پێغەمبەر ﷺ.

ب ـ خۆشەویستی سوننەت: بریتیە لە خۆشویستنی موسوڵمانان بەگشتی و پیاوچاکان بەتایبەتی لەبەر خودا،بەڕڕاتی کوڕی حازب رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمـــان دەگێڕێتەوە کـــە فەرموویەتی:(أوثقُ عُرَى الإيمانِ أَن تُحِبَّ فِي اللهِ وتُبغِضَ فِي اللهِ)[٢]واتا: توندترین گرێی باوەڕ بریتیە لە خۆشویستنی موسڵمانان لەبەر خودا و ڕق لێبونەوەی کافران لەبەر خودا. وە لەفەرموودەکەی ڕابردوی گەورەمان ئەنەسدا رضي الله عنه پێغەمبەری خودا ﷺ بە پیاوەکەی فەرموو: (فإنَّكَ مَعَ مَنْ أَحبَبتَ)واتا: تۆ لەگەڵ ئەوکەسەدا دەبیت لە قیامەتدا کەخۆشت دەوێت. پێشەوا نـــەوەوی رحمه الله دەفـــەرموێت: (فيه فضل حب الله ورسوله ﷺ والصالحين وأهل الخير الأحياء والأموات)[٣]واتا:ئەم فەرمودەیە بەڵگەیە کەخۆشویستنی خوداو پێغەمبەرەکەی ﷺ و پیاوچاکان و ئەهلی چاکەی زیندو و مردو کارێکی گەورەو خێردارە .

جا هەرکەسێك موسوڵمانێکی تەنها لەبەر خودا خۆشبوێت و هیچ مەبەستێکی دنیایی پێوە نەبێت" ئەمە بەهۆیەوە لێخۆشبونی خودا بەدەست دێنێت و لە ڕۆژی قیامەتدا لەلای خـــودای پەروەردگار لە جێگایەکی ڕێزدار دادەنرێت، گـەورەمان عمری کوڕی خطاب رضي الله عنه دەفەرموێت:

---

١ـ آل عمران :٣١

٢ـ پێشەوا احمد بەسەنەدێکی (حسن)گێراویەتەوە.

١ـ منهاج شرح صحيح مسلم بن حجاج : ١٥ـ٤٠٢/١٦

پێغەمبەری خوداﷺفەرموویەتی: (إنَّ مِنْ عِبادِ اللهِ أُناساً ماهُم بِأنبياءَ وَلا شُهداءَ يَغبُطُهُمُ الأَنبياءُ وَالشُّهَداءُ بِمَكانِهِم مِنَ اللهِ تَعالى)، قالُوا: يارَسُولَ اللهِ مَنْ هُم؟ قال: (هُمْ قَومٌ تَحابُّوا بِروحِ اللهِ -أي القرآن- على غَيرِ أَرحامٍ بينهم ولا أَموالٍ يَتَعاطُونَها، فَوَاللهِ إنَّ وُجوهَهُم لَنُورٌ، وَإنَّهُم لَعَلى مَنابِرَ مِن نورٍ، وَلا يَخافُونَ إذا خافَ النّاسُ، ولا يَحزَنونَ إذا حَزَنَ الناسُ" ثم تلا هذه الآية: ﴿أَلا إِنَّ أَوْلِيَاء اللّهِ لاَ خَوْفٌ عَلَيْهِمْ وَلاَ هُمْ يَحْزَنُونَ﴾[1][2]واتا: لە ناو بەندەکانی خودادا خەڵکانێك هەن، نە پێغەمبەرن نە شەهید، بەڵام پێغەمبەران و شەهیدان ئاوات بۆ جێگاکەیان دەخوازن لە بەر نزیکیان لە پەروەردگار، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەوانە کێن؟ فەرمووی: ئەوانە کەسانێکن لە دونیادا لەبەر خاتری خودا یەکتریان خۆشویستووە، بێ ئەوەی خزمایەتیان هەبێت و هیچ مەبەستکی سامان و داراییان بەیەکترەوە هەبێت، جا ئەوانە دەم چاویان لە نور و ڕوناکیە، وەلەسەر مینبەرێکی نور دانراون، ئەوانە ترسیان لەسەر نیە کاتێك خەڵکی دەترسن، وەخەمی هیچ شتێکیان نیە کاتێك خەڵکی خەمیان هەیە، پاشان ئەم ئایەتەی خوێندەوە: ئاگاداربن و بزانن کە دۆستان و خۆشەویستانی خودا نەترسیان لەسەرە لەسەرەمەرگدا و نەپەشیمان و خەمباریشن لە کارەکانی دوونیایان.

وەگەورەمان أبوهریرەرضي الله عنهلەپێغەمبەری خۆشەویستەوەﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: (إنَّ رَجُلا زَارَ أَخًا لَهُ فِي قَرْيَةٍ أُخرَى فَأَرْصَدَ اللّهُ تَعَالَى عَلَى مُدْرَجَتِهِ مَلَكًا، فَلَمَّا أَتَى الْمَلَكُ قَالَ لَهُ: أَيْنَ تُرِيدُ ؟ قَالَ: أَزُورُ أَخًا لِي فِي هَذِهِ الْقَرْيَةِ. قَالَ: هَلْ لَهُ عَلَيْكَ مِنْ نِعْمَةٍ ؟ قَالَ: لا، إلا أَنّي أَحْبَبْتُهُ فِي اللّهِ. قَالَ: فَإِنّي رَسُولُ اللّهِ إِلَيْكَ، إِنَّ اللّهَ عَزَّ وَجَلَّ أَحَبَّكَ كَمَا أَحْبَبْتَهُ)[3]

١- پێشەوا أبوداواد بە سەنەدێکی (صحيح) گێڕاویەتەوە.

٢- یونس: ٦٢

٣- پێشەوایان مسلم و ترمذي و احمد گێڕاویانەتەوە .

واتا: پیاوێك سەردانی برایەكی موسڵمانی دەكات لە گوندێكی تر،خودای پەروەردگار فریشتەیەك دەنێرێتە سەر ڕێگاكەی، كاتێك پیاوەكە دەگاتە فریشتەكە، فریشتەكە پرسیاری لێدەكات: بۆ كوێ دەچیت؟ پیاوەكە دەڵێت: دەچم سەردانی برایەكم دەكەم لەم گوندە، فریشتەكە دەڵێت: ئایا ئەم برایەت هیچ چاكەیەكی بەسەر تۆوە هەیە؟ ئەویش دەڵێت: نەخێر، بەڵام من لەبەر خاتری خودا خۆشم دەوێت! فریشتەكەش دەڵێت: بەڕاستی من فریشتەی خودام بۆ لای تۆ هاتووم، مژدەت لێبێت خودا تۆی خۆشدەوێت هەروەك چۆن تۆ ئەم پیاوەت لەبەر ئەو خۆشدەوێت!

وەبە پێچەوانەشەوە هەركەسێك ڕق و كینەی بەرامبەر موسوڵمانان بەگشتی و پیاوچـــاك و دۆستانی خودا بەتایبەتی هەبێت ئەوە بێ فەرمانی خوداو پێغەمبەریﷺكردووە و جەنگی بەرامبەر خودا ڕاگەیاندووە!! هاوەڵی بەڕێز أبوهريرە رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ ـ تعالى ـ قال: مَنْ عادَى لِي وَلياً فَقَد آذَنْتُهُ بِالحَرْبِ)[1]واتا: خودای گەورە فەرموویەتی: هەركەسێك دوژمنایەتی دۆستێكی من بكات، ئەوە جەنگی لەگەڵ ڕادەگەیەنم. پەنا بەخودا كێ دەتوانێت جەنگ لەگەڵ خودادا بكات؟!

ج ـ خۆشەویستی ڕێگا پێدراو ـ مباح ـ: ئەم جۆرەیان بریتیە لە خۆشەویستی باوك و دایك و منداڵ و خزم و كەس و كار و خۆشەویستی گەل و نیشتیمان...هتد، پێغەمبەری ڕێزدارﷺ خێزانەكانی و منداڵەكان و نەوەكانی خۆشویستووە، وە كاتێك كۆچی كرد بۆ شاری مەدینەی نورانی، لای كردەوە بەلای شاری مەككەداو فەرمووی: (أنتِ أَحَبّ بِلادِ اللهِ إلى اللهِ، وَأنتِ أَحَبّ الْبِلادِ إلَيَّ، فَلَو أَنَّ الْمُشرِكينَ لَم يخرجُونى، لَمْ أَخرُجْ عَنكِ)[2]واتا: ئەی مەككە تۆ خۆشەویسترین خاكی خودای بەلای خوداوە، وە خۆشەویسترین جێگاشی بەلای منەوە، ئەگەر

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوا طبری گێڕاویەتەوە ، وەپێشەوایان ترمذی و احمد بە ووشەی جیا و بە سەنەدێكی حسن گێڕاویانەتەوە.

هاوبەشدانەرەکان منیان دەرنەکردبا، هەرگیز جێم نەدەهێشتی.

جا ئەم جۆرەی خۆشەویستی رێگا پێدراوە، بەو مەرجەی لە سنوری شەرعی دەرنەچێت، بەڵام ئەگەر هاتو لە سنوری شەرع دەرچو ئەوکات دەچێتە بواری حەرامەوە و قەدەغەیە، بۆ نمونە هەروەك چۆن دڵداری شاعیر لە شیعری (ئەی رەقیب) کە لەلایەن عەلمانیەکانەوە بە تۆبزی و بەبێ گەرانەوە بۆ پەرلەمان و هاوڵاتیان کراوە بە مارشی نیشتیمانی دەڵێت:

ئەی رەقیب هەر ماوە قەومی کورد زمان

نایشکێنێ دانەری تۆپی زەمـــــــــــان

وە لە کۆپلەیەکی ترد دەڵێت:

دینمان ئاینمان هەر نیشتیمـــــــــــان

ئەمانە هەمووی دەرچونە لە سنوری شەرع و بەکار هێنانیان کوفرەو حەرامە.

دووەم/ خۆشەویستی قەدەغە - حرام -: بریتی یە لە خۆشویستنی بێباوەران و هەموو رەگەزێکی حەرام، وەك: عارەق و قومار و مامەڵەی حەرام ....هتد و خۆشویستنی هەر شتێك کە بگاتە ئەندازەی خۆشەویستی خودا و پێغەمبەرﷺ.

وەئەوەی زۆر پرسیاری دەربارە دەکرێت لە بواری خۆشەویستی بریتی یە لە خۆشەویستی رەگەزی بەرامبەر، ئایا دروستە پیاو ئافرەتی خۆش بوێت و بە پێچەوانەشەوە؟

وەڵام / خۆشەویستی رەگەزی بەرامبەر دوو جۆرە:

١- خۆشەویستی دوای گرێبەستی هاوسەر گیری: ئەمە دروستەو لە ئیسلامدا رێگا پێدراوە، عەمری کوری عاص رضي الله عنه پرسیاری لە پێغەمبەرخوداﷺکردوو فەرمووی: (أي الناسِ أحبُّ إليكَ؟) واتا: کێ خۆشەویسترین کەسە بەلای تۆوە ؟ قال: (عائشة)[1] فەرمووی: عائیشە.

١- پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

٢ـ خۆشەویستی بەر لە گرێبەستی هاوسەرگیری: ئەمەیان لە ئیسلامدا قەدەغەیە، چونکە سەر دەکێشێت بۆ چەندین تاوان، کە گەورەترینیان بریتی یە لە زینا، وە خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری دەگاتە ئاستی خۆشەویستی خوداو پێغەمبەرﷺ، چونکە عاشقان ئامادەن لەبەر دڵی خۆشەویستەکەیان سەرپێچی فەرمانی خوداو پێغەمبەرﷺبکەن، پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ومِنَ النَّاسِ مَن يَتَّخِذُ مِن دُونِ اللَّهِ أَندَادًا يُحِبُّونَهُمْ كَحُبِّ اللَّهِ وَالَّذِينَ آمَنُوا أَشَدُّ حُبًّا لِّلَّهِ﴾[٢] واتا: خەڵکانێك هەن لە مرۆڤەکان، جگە لەخودا خەڵکانێك دەپەرستن و بە ئەندازەی خودا خۆشیان دەوێن، بەڵام بڕواداره ڕاستەقینەکان خودایان لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێت.

ئینجا ئاینی پیرۆزی ئیسلام بۆ سود و مەصلەحەتی بەندەکان دابەزیوە، لە چەندین توێژینەوەشدا دەرکەوتووە کە زۆرینەی ئەو هاوسەرگیریانەی لەسەر خۆشەویستی پێش وەختە بنیاتنراون سەرکەوتنیان بەدەست نەهێناوە و بە لێکجیابونەوە کۆتاییان پێهاتووە، بەواتای خۆشەویستی پێش هاوسەر گیری سود و مەصلەحەتی بەندەکانی تێدا نیە، لە توێژینەوەیەکدا زانکۆی قاهیرە کە زانکۆیەکی بێلایەنە ـ واتا ئیسلامی نیە ـ دەریخستووە لە ٨٨٪ ی ئەو هاوسەرگیریانەی لە سەر خۆشەویستی پێش وەختە ئەنجام دەدرێن بە لێك جیابونەوەو کێشە کۆتاییان پێدێت، واتا تەنها١٢٪ سەرکەتن بەدەست دێنێت،لەبەرامبەردا هاوسەرگیری ئاسایی لە٧٠٪سەرکەتن بەدەست دەهێنێت [٣]

## چارەسەری عاشقان

پێشتر باسمان کرد کە خۆشەویستی پێش هاوسەرگیری قەدەغەیە ـ حرا ـ ە ، بەڵام ئـــــەریٚ

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ البقرة : ١٦٥

٣ـ منتديات صوت القران الحيكم

ئەگەر کەسێك کەوتە ئەم تاوان و هەڵەیەوە چی بکات؟ بێگومان ئیسلام چارەسەری بۆ داناوە، ئەویش هاوسەرگیریە، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی:(لم نَرَ لِلمُتحابَّين مِثلَ النِّكاح)[1] واتا: نابینم چارەسەرێك بۆ خۆشەویستان باشتر بێت لە هاوسەرگیری. بۆیە پێویستە ئەو کەسانەی کەوتونەتە ئەم هەڵەیەوە بەزوترین کات کۆتایی بە هەڵەکەیان بهێنن بە هاوسەرگیری و لەگەڵیشیدا تەوبەیەکی ڕاستەقینە بکەن، بۆ ئەوەی بەڵکو خودای پەروەردگار لە تاوانەکەیان خۆش ببێت، وە بە هیوای ئەوەی بەهۆی ئەم تەوبەوە ژیانێکی خۆش بەرنە سەرو لەو خۆشەویستانە نەبن کە هاوسەرگیریەکەیان بە لێك جیابونەوە کۆتایی پێدێت، خودای پەروەردگار دەربارەی ئەو تاوانبارانەی تەوبە دەکەن دەفەرموێت:﴿ إِلَّا مَن تَابَ وَآمَنَ وَعَمِلَ عَمَلًا صَالِحًا فَأُولَٰئِكَ يُبَدِّلُ اللَّهُ سَيِّئَاتِهِمْ حَسَنَاتٍ وَكَانَ اللَّهُ غَفُورًا رَّحِيمًا﴾[2] مەگەر کەسێك تەوبە بکات و بڕوا بهێنێت و کردەوەی چاکە بکات، ئائەوانە خودای گەورە کردەوە خراپەکانیشیان بۆ دەگۆڕێت بەچاکە، وە خودای پەورەردگار هەمیشە لێخۆشبو و میهرەبانە.

## چۆن هاوسەر دەستنیشان بکەین؟

لە ئیسلامدا قەدەغەیە پیاو سەیری ئافرەتی بێگانە بکات ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ڕێگا دراوە پیاو بەمەبەستی هاوسەرگیری سەیری ڕەگەزی بەرامبەر بکات و بەپێچەوانەوەش دروستە ئافرەت سەیری داواکارەکەی بکات[1] مغیرەی کوڕی شعبة رضي الله عنه دەفەرموێت: داوای ئافرەتێکم کردبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی:(انظر إليها،فإنه أحرى أن يؤدم بينكما)[2] واتا: بچۆ سەیری بکە

١- پێشەوا إبن ماجه بە سەندێکی(صحيح) گێڕاویەتەوە.

٢- الفرقان : ٧٠

٣- الفقه الإسلامي وأدلته: ٧/٣٥- ٣٦

٤- پێشەوایان احمد و ترمذی و أبوداود نسائی گێڕاویانەتەوە .

چونکە ئەوە هۆکارێکە بۆ بەردەوامی ژیانی هاوسەریتان. وە جابری کوڕی عبداللە‌رضي الله عنهما دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺفەرمووی:(إذا خَطَبَ أحدُكُم الْمَرأَةَ، فَإن استَطاعَ أنْ يَنظُرَ مِنها إلى ما يَدعوُهُ إلى نِكاحِها، فَلْيَفعَلْ)[1]واتا: ئەگەر یەکێکتان داوای ئافرەتێکی کرد، ئەگەر توانی سەیری بکات بەئەندازەی ئەوەی سەرنجی ڕادەکێشێت بۆ هاوسەرگیری" با سەیری بکات، جابر‌رضي الله عنه دەفەرمووێت: من بە نیازی ئافرەتێك بوم خۆم لێی مات دەدا، هەتا بۆم هەلکەوت و بینیم و سەرنجی ڕاکێشام، پاشان خواستم.

جا لە تێگەیشتنی ئەم فەرمودانە زانایان جیاڕان دەربارەی ئەوەی: ئایا تا چەند دروستە پیاو سەیری ئافرەت بکات بۆ مەبەستی هاوسەرگیری:

* زۆرینەی زانایان دەفەرمون:دروستە پیاو تەنها سەیری دەموچاو و دەستەکانی دڵخوازەکەی بکات، چونکە بە دەمو چاو جوانی دەردەکەوێت و بە دەستەکانیش سەلامەتی لاشە لە نەخۆشی دەردەکەوێت .

* أبو حنیفە رحمه الله دەفەرمووێت: دروستە پیاو سەیری قاچەکانیشی بکات .

* حەنبەلیەکان دەفەموون: دروستە سەیری هەموو ئەو ئەندامانە بکات کە لەگەڵ ئیش و کار دەردەکەون، ئەوانیش شەش ئەندامن : دەموچاو،گەردن و، دەست و، قاچەکان و، سەرو، پێیەکان.

* ئەورزاعی رحمه الله دەفەرمووێت: سەیری ئەو جێگایانە دەکات کە گۆشتیان دەردەکەوێت[1] .

جا گەنجی بەڕێز: بزانە کە ئیسلام تەواوترین پەیام و بەرنامەیە، بۆ هەموو سەردەمێکەو لەگەڵ سروشتی هەموو کەسێك دەگونجێت، بۆیە تۆ خۆشەویستی گیانت و هاوسەری ژیانت

١ـ پێشەوایان احمد و ابوداود گێراویانەتەوە و حاکمی شبە(صحیح)ی داناوە.

٢ـ الفقه الإسلامي وأدلته : ٣٧/٧

لەسەر ڕێڕەوی ئیسلام دەستنیشان بکە، بۆئەوەی خۆشەویستی ڕاستەقینەتان دوای هاوسەر گیری دەست پێبکات، کە پەروەردگار دەربارەی دەفەرمویێت: ﴿وجَعَلَ بَيْنَكُم مَّوَدَّةً وَرَحْمَةً﴾[1]واتا: خۆشەویستی و سۆزو میهرم خستوتە نێوان هاوسەرەکانەوە،ئینجا بزانە و دڵنیابە خۆشەویستیەك کـــە خودای گەورەو دروستکارت بۆی بڕیـــار دابێت زۆر باشتر و چاکتر و پڕ بەرەکـــەت ترە لە خۆشەویستیەکی حەرام کە خۆت هەڵی دەبژێری.

## قسەکردن بە تەلەفۆن لەگەڵ داواکرودا

لەم سەردەمەدا جگە لەم ڕێگا شەرعیانەی باسمان کرد بۆ دیاری کردنی هاوسەر، چەند هۆکارێکی تری سەردەمیش هاتونەتە پێشەوە بۆ لە یەکتر گەیشتن و قسەکردن لەسەر بابەتە پەیوەستەکانی ژیانی هاوسەری و هاوسەر گیری، ئەویش بریتین لە ئامێرەکانی پەیوەندی وەك: تەلەفۆن و مۆبایل و ئینتەرنێت، جا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە: ئایا دروستە کەسێك بە تەلەفۆن یان ئینتەرنێت قسە لەگەڵ دڵخواز و داواکراوەکەی بکات بۆ مەبەستی هاوسەرگیری یان نا ؟

وەڵام/ بەڵێ زانایانی سەردەم ڕێگایان داوە ئەگەر کوڕێك بەتەلەفۆن یان ئینتەرنێت قسە لەگەڵ ئەو کچەدا بکات کە بە دڵنیاییەوە بە نیازە هاوسەرگیری لەگەڵدا بکات، بەڵام بەو مەرجەی لە سنوری شەرع نەچێتە دەرەوە، بەواتای: کوڕ بۆی هەیە ئەوەندە قسە لەگەڵ دڵخوازە داواکراوەکەی بکات هەتا لە داواکاریەکانی دەگات و زمان پاراوی هۆشمەندی کچەکەی بۆ دەردەکەوێت، دوای ئەوەی مەبەستی قسەکانی هاتەجێ " ئەوە لەسەری حەرامە کە درێژە بە قسەکانی بدات[2]، ئینجا پێویستە لە کاتی قسەکردنیش بە ئینتەرنێت تەنها بە دەنگ بێت،

١ـ الروم: ٢١

٢ـ بڕوانە: الفتاوى الآمدية: ١٨٤/٢، وە مع الناس: ١٣٥/٢

نەوەكو دەنگ و ڕەنگ، چونكە ئەمەیان سەردەكێشێت بۆ فیتنە و كاری حەرام.

لە كۆتاییدا: ئەی برای موسڵمانم خوشكی ئیماندارم بائێمە هەموو هەنگاوێكی ژیانمان بە پێی ئیسلام بێت، بە تایبەت لەم بابەتە هەستیارەدا، كە باەتی دیاریكردنی هاوبەشی ژیانە، بائێمە لەبەر خودا واز لە خۆشەویستی حەرام بێنین و چاوەڕێ بین خودای بالآدەست باشترمان بۆ بێنێتە پێش، چونكە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّكَ لَنْ تَدَعْ شيئاً لِلهِ عَزَّوَجَلَّ، إلا أبْدَلَكَ اللهُ بهِ ما هوَ خيرٌ لكَ مِنهُ)[1] واتا: تۆ هەر شتێك لە بەر خاتری خودا وازلێبهێنیت، ئەوە خودای گەورە بە هۆیەوە باشتر و چاكترت پێدەدات.

پاشان ئەی لاوی موسڵمان: بزانە كە ئاینەكەی تۆ ئاینی خۆشەویستی و سۆزو میهرە، وە هەموو ڕۆژێك لە ئاینەكەی تۆدا ڕۆژی خۆشەویستیە و هیچ پێویستت بەوە نیە بێباوەڕان ڕۆژێكت بۆ دیاری بكەن بۆ خۆشەویستی، لەبەر ئەوە بە هەموو توانایەكتەوە ئەم جۆرە جەژنانە ڕەتبكەوە و بڵێ: من موسڵمانم، من شوێنكەوتەی پێغەمبـــەری ڕێزدارمﷺ، دینەكەم دینی خۆشەویستیەو هیچ پێویستیم بە جەژنە پوچەكانی ئێوە نیە.



١ـ پێشەوایان: احمد و بیهقی گێڕاویانەتەوە.

# جەژنی جیهانی ئافرەتان (٨)ی مارس

لە هەشتی مارسی ساڵی ١٨٥٦دا هەزاران ئافرەت لە شاری نیوێرکی ئەمریکا ڕژانە سەر شەقامەکان، بۆ دەربڕینی ناڕەزایی دژی ئەو یاسا ستەمکارانەی کە لە ژێریدا ناچار کرابون بە کارکردن، کە ئەوکات ئافرەتان و منداڵەکان کاتێکی زیاتر لە پیاوان کاریان دەکرد و کرێشیان کەمتر لە پیاوان پێدەدرا، لە بەرامبەردا پۆلیسی شاری نیوێرك بە شێوەیەکی زۆر نامرۆڤانە ڕوبەڕوی خۆ پیشاندەرە ئافرەتەکان بویەوە، هەرچەندە پۆلیس ڕێگریەکی زۆری کرد لەم خۆپیشاندانە، بەڵام ئەم خۆپیشاندانە دەورێکی زۆری بینی لە گەیاندنی ناڕەزایی ئافرەتان بە کاربەدەستان. پاشان و دوای نزیکەی پەنجا ساڵ و لە ٨ی مارسی ساڵی ١٩٠٨جارێکی تر نزیکەی ١٥هەزار ئافرەت لە نیوێرك ڕژانەوە سەر شەقامەکان و داوای کەمکردنەوەی ماوەی کار و زیادکردنی موچەیان دەکرد، وەداوای ڕاگرتنی کارکردنیان دەکرد بە منداڵان، وە لەم خۆپیشاندانەدا ئافرەتان تیکە نانێکی ڕەق و گوڵیان بەرز کردبۆوە وەك دروشمی خۆپیشاندانەکەیان" جا تیکە نان وەك دروشمی برسیەتی و زیادکردنی موچە، وە گوڵەکەش وەك دروشمی خۆپیشاندانی ئاشتیانە. وە هەر لەو ساڵەدا هاوپەیمانێتی ڕێکخراوە ئافرەتیەکان بڕیاریدا: یەکشەممەی کۆتایی مانگی شوباتی هەمو ساڵێك دیاری بکات بۆ ڕۆژی ئاهەنگ گێڕانی ئافرەتان.

وە دواتر لە ساڵی ١٩٠٩دا نزیکەی ٢٠هەزار بۆ ٣٠ی هەزار ئافرەت لە کارگەی چنین، هەتا سیانزە هەفتە مانگرتنیان ڕاگەیاندو، داوای بەرزکردنەوەی کرێ و باشکردنی گوزەرانی کاریان دەکرد، وە لە ساڵی ١٩١٣ بە دواوە لە ڕۆژی ٨ی مارس وەك ڕۆژی ئافرەتان ئاهەنگی تیادادەگێڕدرا[1] وەلە ساڵی ١٩٤٥و دوای کۆنگرەی یەکێتی ئافرەتانی دیموکراتی جیهانی کە لە پاریس بەڕیوە چو بڕیاردرا ڕۆژی ٨ی مارس بکرێتە ڕۆژی ئافرەتانی جیهان. وە جێگای ئاماژەیە

---

١ـ الحوار المتمدن ، موقع الرسمی لمؤسسة حوار المتمدن اليسارية علمانية،ديموقراطية.

یەکیەتی ئافرەتانی دیموکراتی جیهان ـ ڕێکخراوێکی پاشکۆی حیزبە شۆعیەکانە ـ وە لە ساڵی ١٩٧٧ دا ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکان داوای لە وولاَتانی دونیا کرد ڕۆژێك دیاری بکەن بۆ ڕۆژی ئافرەتان، زۆربەی ولاَتەکان ٨ی مارسیان دەست نیشان کرد، دواتر لە لایەن نەتەوە یەکگرتوەکانەوە ٨ی مارس وەك ڕۆژی جیهانی ئافرەتان دەست نیشان کرا.[١]

## حوکمی یاد کردنەوەی ئەم ڕۆژە

یادکردنەوەی ئەم ڕۆژەش وەکو ڕۆژەکانی تری تایبەت بە بێباوەڕان قەدەغەیە ـ حەرامە ـ چونکە:

یەکەم/ ئەم ڕۆژە ڕۆژێکە لەلایەن ئافرەتانی ئەمریکاوە سەری هەڵداوە، پاشان لەلایەن ئافرەتانی پاشکۆی شیۆعیەت کراوە بەڕۆژی جیهانی ئافرەتان،ئەم دوانەشیان هەردووکیان کافرن، وە یادکرنەوەی ئەم ڕۆژەش چاولێکەری و شوێنکەوتن وخۆچواندنە بەوان،پێغەمبەری خوداش ﷺلە چەندین جێگادا فەرمانی بەموسڵمانان کردووە پێچەوانەی کافران بجولێنەوەو شوێنیان نەکەون و خۆیان پێنەچوێنن و فەرموویەتی: (فخالفوهم)[٢]وە فەرموویەتی:(مَنْ تَشَبَّهَ بِقَومٍ فَهُوَ مِنهُم )[٣]واتا: هەر کەسێك خۆی بچوێنێت بە هەر گەل و نەتەوەیەك، ئەوە لەگەڵ ئەواندا ئەژمار دەکرێت.

دووەم/ لەم یادەدا چەندین دروشمی باق و بریق و داواکاری بەرز دەکرێنەوە، کە زۆربەیان لەگەڵ ئەوەی چەند ووشەیەکی جوانی مەبەست پوچن (كلمة الحق أريد به الباطل)، بەهەمان شێوە زۆربەشیان پێچەوانەی شەرعی خودان، لەوانە: یەکسانی نێوان ژن و پیاو و جێندەر و، ژن سالاری و، ئازادی ڕەها بۆ ئافرەتان و ...هتد. وە ناشبێت بەهیچ شێوەیەك موسڵمانان دروشمێك بەرزبکەنەوە کە پێچەوانەی ئاینەکەیان بێت.

سێهەم/ یادکردنەوەی ئەم ڕۆژە وولاتانی شیوعیەت و ڕێکخراوە جیهانیە بێباوەڕەکان لە دڵی ئافرەتاندا خۆشەویست دەکات و بەشێك لە ئافرەتانی ساویلکە واهەستدەکەن" کەوا هەر شیوعی و ڕێکخراوە ئافرەتیەکانن کە بەرگری لە مافەکانیان دەکەن، نازانن کە ئەو دروشم و داواکاریانە تەنها مەرەکەبی سەر کاغەزن و لە ڕاستیدا هیچ بونێکیان نیە.

جا لەبەر ئەو هۆکارانەی سەرەوە بەهیچ شێوەیەك دروست نیە یادی ڕۆژی جیهانی ئافرەتان بکرێتەوە.

## مێژووی ڕێکخراوە ئافرەتیەکان

بزوتنەوەی فێمێنیزم(FEMINISM) بەو ڕێکخراوە جیهانی و ناوخۆییانە دەگووترێت کە داوای مافەکانی ئافرەتان دەکەن و داکۆکیان لێدەکەن. وە سەرەتای بزوتنەوەی فێمێنیزم دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدە، بە دیاریکراوی بۆ دوای شۆڕشی گەورەی فەرەنسا، جا لەو ماوەیەوە هەتا ئێستا، ئەم بزوتنەوەیە بە سێ قۆناغدا تێپەڕیوە، ئەوەی خوارەوە قۆناغەکانی فێمێنیزمە:

یەکەم/ فێمێنیزمی لیبڕاڵ: بزوتنەوەی فێمێنیزمی لە سەدەی نۆزدە بە باڵی لیبراڵ دەستی پێکرد، ئامانجیان باشکردنی ژیان و گوزەران و چاکسازی بو لە بارو دۆخی ژیان و کارو هەلی کارو کرێی کاری ئافرەتاندا، جا هەر ڕێکخراوێکی ئافرەتی کار لە سەر باشکردنی بار و دۆخ و ژیانی ئافرەتان بکات پێی دەگوترێت : ڕێکخراوێکی ئافرەتی لیبڕاڵ.

دووەم/ فێمێنیزمی ڕادیکاڵی: بزوتنەوەیەکی فکری سیاسی کۆمەڵایەتیە کاردەکات لەسەر گۆڕینی باری کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری لە سەر بنچینەی گۆڕانکاری پەیوەندیەکانی هەردووك ڕەگەز، هەتا بەداواکاری یەکسانی ڕەها لە نێوانی هەردووك ڕەگەزدا کۆتایی پێدێت، جا ئەم قۆناغەی فێمێنیزم لە شەستەکانی سەدەی بیستەم سەری هەڵدا و تا کۆتایی حەفتاکان بەردەوام

بو، لەم قۆناغەی فێمێنیزمدا پیاو بە هۆكاری سەرەكی چەوساندنەوەی ئافرەت دادەنرا! بەمەش ئافرەتانی هاندەدات لەدژی پیاوان ڕاست ببنەوە، لێرەوەش پەیوەندی هەردوو ڕەگەز لە پەیوەندیەكی خۆشەویستی سۆزداریەوە دەبێت بە پەیوەندیەكی دژیەكی و ململانێ![1] وە ئەم قۆناغەی فێمێنیزم كاری دەكرد لەسەر سڕینەوەی هەندێك دەستەواژە لە بیر مرۆڤایەتیدا، وەك دەستەواژەی: خۆشەویستی ، هاوسەریەتی، پەیوەندی جنسی ژن و پیاو منداڵبون، دایكایەتی .... هتد وە ڕادیكاڵیەكان دەیانگوت دەبێت هەندێك چەمك ڕیشە كێش بكرێن، وەك چەمكی (نێرینە و مێینە)[2]. بەواتای: ڕادیكاڵیەكان بە جددی ئیشیان دەكرد لەسەر هەڵوەشاندنەوەی خێزان و نەهێشتنی خۆشەویستی و پەیوەندیە كۆمەڵایەتیەكان.

سێ یەم/ فێمێنیزمی جێندەری: ووشەیَ جێندەر(GENDAR)ووشەیەكی ئینگلیزیە بەواتای (جۆری كۆمەڵایەتی) دێت، ئەم ووشەیەش وەك جێگرەوەی هەر دوو ووشەی نێرو مێ بەكار هاتووە، بۆ ئەوەی چیتر ووشەی (نێرومێ) بەكار نەیەت، چونكە بەڕای جێندەریەكان لەم دوو ووشەوە نەهامەتیەكانی ئافرەتان دەست پێدەكات، جا ئەگـەر بێت و ئـەم خەونەی جێندەریەكان بێتە جێ ئەوە ڕێڕەوی ژیان بەگشتی تێك دەچێت، چونكە لای ئەوان ناكرێت هەتا هەتایە هەر ئافرەت دایك بێت و شوو بكات" بەڵكو ئاساییە كە پیاویش ببێت بە دایك ومنداڵی ببێت و شووش بكات،[3] جا بۆ یەكەم جار ئەم ووشەیە لە ساڵی ١٩٩٤ لە كۆنگرەی دانیشتوانی میصر بەكارهاتووە، پاشان لە ساڵی ١٩٩٥دا لە كۆنگرەی تایبەت بە ئافرەتان لە پەكین بەكارهاتووە و واتایەكەشی بە مەبەست ڕوون نەكراوەتەوە، جا فێمێنیزمی جێندەری كار دەكات لەسەر یەكسان كردنی ژن و پیاو لە هەموو بوارەكاندا، بەشێوەیەك بڕوای بە جیاوازیە بایەلۆجیەكانی ژن و پیاویش نیە، پێی وایە زۆر ئاساییە ژن ناسنامەی خۆی بگۆڕێت بو پیاو و بە پێچەوانەشەو، وە پێی وایە ئافرەت دەتوانێت هەمو كاروبارێكی پیاو بكات و

١ـ سایتی : اللجنة الإسلامية العالمية للمرأة والطفل .

٢ـ ڕاستیەكی ونبوو ، فەرمان خەرابەیی : ١٠

ـ هەمان سەرچاوە : ١٢ـ ١٥

بەپێچەوانەشەوە، وە پێشی وایە هۆکاری جیاوازیە بایەلۆجیەکانی ژن و پیاو تەنها کۆمەڵگایە، ئەوە کۆمەڵگایە هەر لە منداڵیەوە بە ڕەگەزی مێینە دەڵێت: تۆ مێی و توانات لە پیاو کەمترە و دەبێت شو بکەی و ژێر دەستەی پیاو بیت و تۆ لە پیاو بیهێزتری و ....هتد، وە هەر کۆمەڵگایە بە ڕەگەزی نێر دەڵێت: تۆ پیاوی و بە توانایی و دەبێت ژن بهێنیت و ببیتە گەورەی ماڵ و ...هتد، ئەمە لە کاتێکدایە کە بە زانست جێگیر بووە کە لەڕوی بایەلۆجیەوە ژن و پیاو لە پێکهاتەو توانا و بیرکردنەوەو ...هتد جیاوازن، بەواتای ئەم بانگەشەی ئەوان، بانگەشەیە لە سەر خەیاڵ و هیچ بنچینەیەکی زانستی نیە! دکتۆر(ئان مۆیر[1] و دیفید جیسیل[2]) لە کتێبەکەیاندا(کتاب جنس الدماغ)دا توێژینەوەیەکی وردیان کردووە لەسەر جیاوازیەکانی بایەلۆجی و بنیادی ژن و پیاو و بۆیان دەرکەوتووە کە ژن و پیاو تەنها لە ئەندامە بینراوەکانی ڕوی دەرەوەی مرۆڤدا لێك چونیان هەیە، وە ئەگەرنا لە زۆربەی پێکهاتەکانی تردا جیاوازن، وە لە دەستپێکی کتێبەکەیاندا دەڵێن: پیاو جیاوازە لە ژن، وە ئەو دووانە یەکسان نین تەنها لە ئەندامە سەرەکیەکانی مرۆڤ بوندا نەبێت، لەبەر ئەوە ئەو پڕو پاگەندانەی کە دەڵێن: ژن و پیاو لە ڕوی تواناو بەهرە و هەڵسوکەوتەوە یەکسانن" ئەوە واتای ئەوە دەگەیەنن کە دەبێت ئێمە کۆمەڵگا بنیات بنێین لەسەر درۆیەکی بایەلۆژی و زانستی! وە هەر لەم کتێبەیاندا دوای توێژینەوە دەریان خستووە کە ژن و پیاو ـ ڕەگەزی نێرو مێ ـ لە چەندین ڕووەوە لێك جیاوازن لە وانە:

* ڕەگەزی مێ حەزی لە زۆرێك لەو کردەوانە نیە کە ڕەگەزی نێر ئەنجامیان دەدات .

* منداڵێکی ڕەگەز مێ لە تەمەنی یەك کاتژمێریدا هەڵسو کەوت و جوڵانەکانی جیاوازە لە منداڵێکی ڕەگەز نێری هەمان تەمەن !

* منداڵێکی ڕەگەز مێ نەوەك نێر لەتەمەنی یەك هەفتەییدا دەتوانێت جیاوازی بکات لە نێوان دەنگی هاوار کردن و دەنگی ژاوەژاوی ئاساییدا.

---

١ـ ئان مۆیەر: بڕوانامەی دکتۆرای هەیە لە زانستی (الوراپە)داو دەرهێنەری بەرنامەکانی ڕاگەیاندنی بەریتانی بو .

٢ـ دیفیدجیسیل : نوسەر و پێشکەشکاری بەرنامەکانی تەلەفزیوتی بو لە تەلەفزیونی بەریتانی .

* ڕەگەزی مێ هەستەکانی بیستن و تام کردن و بۆن کردن و دەست لێدانی بەهێزترە لە هی ڕەگەزی نێر، وە ئافرەتان بەهرەی زمانەوانیان بە هێزترە و زوتر شتەکان لەبەردەکەن، وەئافرەتان زوتر لە پیاوان کەسەکان دەناسن و دەتوانن زووتر لەپیاوان شیکاری بۆ زانیاریە هەستیەکان و زارەکیەکان بکەن.

* لە ڕوی لاشەییەوە ڕەگەزی نێر و مێ چەندین جیاوازیان هەیە وەك:(قەبارەی لاشەو، پەیکەری ئێسقانەکان و، ددانەکان و ، سالی بالغ بون و ئیش و کارەکانی مێشك و...هتد)

* ئەو ئافرەتانەی توشی هۆرموناتی نێرینەی ناو ڕەحم دەبن جیاوازن لە ئافرەتێکی تری ئاسایی لە هەڵسو کەوتدا، بۆنمونە: ئەم جۆرەی مێینە لە منداڵیدا زیاتر حەز دەکەن وەکو ڕەگەزی نێرینە خۆیان بسەپێنن، وە حەز دەکەن هاوڕێیەتی منداڵێکی ڕەگەز نێر بکەن لە جیاتی منداڵێکی ڕەگەز مێ، وە زیاتر حەز دەکەن بەشداری کارو باری دەرەوەی ماڵ بکەن، وە لەکۆتایشدا زۆر گرنگی بەکارو باری دایکایەتی نادەن، وە بە پێچەوانەشەوە ئەو پیاوانەی توشی هۆرموناتی مێینە بوون، زیاتر هەڵسوکەوتەکانیان بەلای هەڵسو کەوتی مێینەدا دەشکێتەوە .. وە چەندین و چەندین جیاوازی تریش.

پاشان زانایانی مۆرفۆلۆجی دەڵێن: ڕەگەزی نێرو مێ هەروەك جۆن لە ڕوی بایۆلۆجی لێك جیاوازن، بەهەمان شێوە لەڕوی مۆرفۆلۆجیشەوە لێك جیاوازن ئەمەش لە کتێبەکانی ئیعجازی قورئان و سوننەت دا باسکراوە بۆ نمونە:

* زاناکان بۆیان دەرکەوتووە کە لای ڕاستی مێشکی پیاوان چالاکترە لە لای چەپ، بەلام بەپێچەوانەوە ئافرەت لای چەپی چالاکترە.

* پیاوان لە ئافرەتان درێژترن، وە قەدو بالای ئافرەتان هەتا تەمەنی ١٩ساڵی زیاد دەکات، بەڵام لەش و بالای پیاوان هەتا تەمەنی ٢٠ساڵی زیاد دەکات .

* خوێن: ڕێژەی(هیموگلۆبین)لە خوێنی ئافرەتاندا بری(١٢ـ١٤)گرامە بۆ هەر(١٠٠) میللترێك، بەڵام ڕێژەی (هیمو گلۆبین) لە خوێنی پیاواندا بە بری (١٤ـ١٦) گرامە بۆ هەمو (١٠٠) میللترێك .

* جیاوازی سیەکان: سی ئافرەت (٢و٤) سانتیمەتر سێ جایە، بەڵام هی پیاو(٢و٣) سانتیمەتر سێ جایە [١].

ئەم جیاوازیانەش هاتنە دی موعجیزەکانی قورئانی پیرۆزن کە هەزارو چوار سەد ساڵ زیاتر پێش ئێستا خودای پەروەردگار بەبێ پێچ و پەناو لە قورئانی پیرۆزدا فەرموویەتی: ﴿وَلَيْسَ الذَّكَرُ كَالْأُنثَى﴾[٢] واتا: ژن و پیاو ـ نێر ومێ ـ وەکو یەکتر نین و وێك ناچن.

# دروشم و قسەی بێ کردار

ئەوەی ڕێکخراوە ئافرەتیەکان باسی دەکەن و بانگەشەی بۆ دەکەن تەنها مەرەکەبی سەر کاغەز و قسەی ڕازاوەی ناو هۆڵەکانە و بنیاتنانی ژیانە لەسەر خەیاڵ، ئەگەرنا لە هیچ شوێنێکی دونیا ئەم دروشمانە نەچونەتە بواری جێبەجێ کردنەوە و ئافرەتانی پێ خۆشگوزەران نەبووە بۆ نمونە: لە ڕێککەوتننامەی(جنیف)ی ساڵی ١٩٧٧دا چەند خاڵێك نوسراون دەربارەی مافی ئافرەت، ئەگەر بەشێوەیەکی کردەیی ئەو خاڵانە جێبەجێ بکرێن ئەوە ئافرەت هەر لەدونیایە دەچێتە بەهەشت، بەڵام هەرچی ئەم مافانەن بە شێوەی کردەیی لە هیچ کوێیەکی دونیادا بونیان نیە، بەڵکو پێچەوانەکەیان لەبەر دەستە لەو خاڵانە:

١ـ پێویستە ئافرەت ڕێزی تایبەتی لێبنرێت. بەڵێ بەڕاستی خاڵێکی جوانە بەڵام لە ڕوی کردەییەوە پێچەوانەکەی لەبەردەستە: ئەگەر سەیری ئافرەت بکەین لە ئەوروپاو ئەمریکا دەبینین کە ئافرەت لەوێ لەکالآیەکی بازرگانی کە بۆ بانگەشەی کۆمپانیەکان و تێرکردنی پیاوان بەکاردێت زیاتر هیچی تر نیە.

٢ـ پێویستە ئافرەت پاسەوانی تایبەتی لێبکرێت، بەتایبەت لە ڕوی دەستدرێژی سێکسی و هەر کردەوەیەکی تر کە ببێتە هۆکاری لەکەدار کردنی ڕێز و کەسایەتی ئافرەت، کەچی سەرچاوەیەکی نەتەوە یەکگرتووەکانی تایبەت بە ئافرەتان ڕایگەیاند کە: لە هەر پێنج ئافرەتێك لە ئەمەریکا یەکێکیان لە ژیانیدا توشی دەستدرێژی سێکسی دەبێتەوە![٣]

١ـ ئاشکرابوونی موعجیزە زانستیەکانی قورئان و سوننەت لە سەردەمی تازەدا : ١٢٥ـ١٢٦
٢ـ آل عمران :٣٦
١ـ سایتی: said. net

٣ـ ئافرەت نابێت ئازاری جەستەیی و دەروونی بدرێت. بەڵێ بەڕاستی ووتەیەکی جوانە بەڵام کوا کردار؟ : لە ئەمریکا لە هەر ٩چرکەیەکدا ئافرەتێك لە ماڵەکەیدا لە لایەن هاوبەشەکەیەوە توشی لێدان و ئازاری جەستەیی دەبێتەوە. وە لە یابان لە ٥٩%ئافرەتان توشی لێدان دەبن لە ماڵەوە.[1]

جا ئەمانەی سەرەوە بەشێکن لەو مافانەی کە لە رێککەوتننامەیەکی نێودەوڵەتیدا بڕیاریان لەسەر دراوە و بۆ ئافرەتان دیاریکراون، بەڵام ئایا چوونەتە بواری جێبەجێ کردنەوە؟ بێگومان نەخێر، بەڵکو وەك باسمان کرد هەموویان دروشمی بێ کردارن. وە بەهەمان شێوە لە کوردستانیش هەرچی رێکخراوی ئافرەتیە نەیتوانیوە کێشەی ژن چارەسەر بکات، بەڵکو تەنها دروشمی بێ کرداریان پێبووە، بەڵکو زۆر جار بۆ خۆیان دروشمەکانی خۆیانیان بەدرۆ خستوتەوە، بۆنمونە: رێکخراوە ئافرەتیەکانی کوردستان زۆر بەتوندی دژی فرەژنی کار دەکەن، کەچی سایتی خەندان لە بەرواری ٢٠١٣/١٢/٤دا بڵاوی کردەوە کە هەشت چالاکەوانی بواری ژنان تەنها لە ڕانیە سەر بە هەوێ شویان کردووە!! وە مامۆستا فەرمان خەڕابەیی لە نامیلکەیەکی دا بەناوی(ڕاستیەکی ونبوو) چەندین تاوانی قێزەونی رێکخراوە ئافرەتیەکان و سەنتەر و شێڵتەرەکانی بڵاو کردوتەوە، بەشێوەیەك شێڵتەری وەها هەبووە ئافرەت پەنای بۆ بردووە، بەڵام ئەوان لەجیاتی کێشەکەی بۆ چارەسەر بکەن" کچەکەیان بە کەس و کاری فرۆشتۆتەوە و کەسوکارەکەشی کوشتوویانە!![1] جا ئەمە لە کوردەواریدا پێی دەگوترێت بانێك و دوو هەوا، وە ئێمەش پێیان دەڵێین : **لعنة الله علی الکاذبین.**

## ئافرەت پێش ئیسلام و دوای ئیسلام

بەر لە هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئەوەی بەهای نەبوو ئافرەت بوو، ئەوەی مافی نەبوو ئافرەت بوو، بەڵکو ئافرەت ڕەگەزێکی بێ زراوو پیس و خزمەتکارو کۆیلە بو، نەوەك تەنها لای عەرەب،بەڵکو لای سەرجەم شارستانیەت ونەتەوەکانی تریش هیچ بەهایەك بۆ ئافرەت دانەدەنرا،

---

١ـ ڕاستیەکی ونبوو: ٦٣

ئەمانەی خوارەوەش بەشێکن لە تێڕوانینی شارستانیەت و نەتەوە و ئاینەکانی پێش ئیسلام بۆ ئافرەت، بۆ ئەوەی لە ڕێیەوە گرنگی هاتنی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بزانین:

* لای إغریقەکان: ئافرەت دارێکی ژەهراویەو پیسە، کردەوەکانی کردەوەی شەیتانن!

* لای ڕۆمانیەکان: ئافرەت ڕوحی نیە، وە جۆرێك لە جۆرەکانی سزای ئافرەت لای ڕۆمانیەکان ئەوەبو: زەیتی سورکراوەیان بەسەردا دەکرد، یان لە ئەسپێکیان دەخست هەتا دەمرد ڕایدەکێشا!

* لای صینیەکان: ئافرەت ئاوێکی ئازاردەرەو خۆشیەکان دەشواتەوە، وە پیاوی صینی مافی ئەوەی هەبو ژنەکەی بە زیندویی بنێژێت !

* لای هیندیەکان: نە مردن و نە جەهەننەم و نە ژەهر و نە ئەژدیها و نە ئاگر هیچیان لە ژن خراپتر نین! بەڵکو لای هیندیەکان ژن دوای مێردەکەی مافی ژیانی نەبو" بەشێوەیەك لەگەڵ مێردەکەیدا دەیان سوتاند! وە زۆر جار پیاو ژنەکەی خۆی لە قومار دەدۆڕاند[1]

* لای فارسەکان: ڕێگادرابو بە هاوسەر گیری لەگەڵ ئافرەتی مەحرەم بەبێ جیاوازی"وە پیاو بۆی هەبوو حوکمی مردن بدات بەسەر ژنەکەیدا، هەتا (یەزگوردی دووەم)کچەکەی خۆی مارە کرد و گواستیەوەو پاشانیش کوشتی[2]! وە لە فرەژنیشدا (کیسرا ئەپەروێز) دوانزە هەزار ژنی هەبوو![3]

* لای دینی جولەکە: ئافرەت نەفرەتە" چونکە ئەو هۆکاری ئاشوبەکانە، وە ئافرەت لەکاتی حەیزدا گول و پیسە، وە باوك بۆی هەیە بیفرۆشێت!

* لای گاورەکان: لەساڵی ٥٨٦ز دا فەرەنسیەکان کۆنگرەیەکیان بەست لەسەر ئافرەت، ئاخۆ ئافرەت: مرۆڤە یان نا؟ ڕوحی هەیە یان بێ ڕوحە؟ وە ئەگەر ڕوحی هەیە ڕوحی ئینسانە یان حەیوان؟ وە ئەگەر ڕوحی مرۆڤە" ئایا لە ئاستی ڕوحی پیاودایە یان نا؟ دواتر کۆنگرە

١ـ بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی بەر کەوت ؟!! : ٨٩

٢ـ هەمان سەرچاوە : ٧٣ـ ٧٤

٣ـ هەمان سەرچاوە : ١١٣

بڕیاریدا کە ژنیش مرۆڤە بەڵام بۆ خزمەتی پیاو دروست کراوە!! وە پەرلەمانی ئینگلیزی لە سەردەمی(هێنری هەشتەم) بڕیارێکی دەرکرد، کە قەدەغەیە ئافرەت (العهدالجدید)ی ئینجیلی دەستکاری کراو بخوێنێتەوە، چونکە ئافرەت پیسە!!!

جا ئەمەی ڕابرا مشتێك بو لە خەرواری تێڕوانینی شارستانیەت و گەل و ئاینەکان بۆئافرەت، ئێستاش باسی کەسایەتی و بونی ئافرەت دەکەین لەو ناوچەیەی کە پەیامی ئیسلامی تێدا دابەزی :

دەکرێت بڵێین کە ئافرەت لەسەردەمی نەفامیدا و پێش هاتنی ئیسلام لە بچوکترین مافیش بێبەش بووە کە مافی ژیانە"جا ئەگەر ئافرەت مافی ژیانی نەبوبێت دەبێت مافەکانی تری چۆن بوبن؟! ئەمانە خوارەوەش بەشێکن لە بەراوردی ئافرەتی پێش ئیسلام و دوای ئیسلام:

١ـ ئافرەت شەرم بوو: لە ناو عەرەبەکانداو لە سەردەمی نەفامیدا ئافرەت وەك هۆکاری شەرم و ئابڕو چون سەیر دەکرا، وە پێیان ئابڕو چون بو کە کچەکانیان بە شوو بدەن لەبەر ئەوە هەر کاتێك منداڵ لە دایك دەبو کە کچ بوایە زیندە بەچاڵیان دەکرد، هەتا صەعصەعەی کوڕی ناجیە دەڵێت: بەر لەوەی ئیسلام بێت سێسەد کچی زیندە بەچاڵم بە پارە ڕزگار کردبوو[1]! وە قەیسی کوڕی عاصمرضي الله عنهدوای موسڵمان بونی هاتە لای پێغەمبەری خوداﷺگوتی:(إني وأدت ثماني بنات كن لي في الجاهلية)واتا: ئەی پێغەمبەری خوداﷺلە سەردەمی نەفامیدا هەشت کچم هەبون، هەر هەشتیانم زیندە بەچاڵ کرد، ئایا چی بکەم بۆ ئەوەی لەم تاوانە ڕزگارم بێت؟ پێغەمبەریشﷺفەرمووی: (فأعتِق عَنْ كلِ واحدةٍ مِنهُنَّ رَقَبَةً)[2]واتا: لەبری هەر کچێکت کۆیلەیەك ئازاد بکە! ـ بە واتای تۆ ژیانی کچەکانت لە ناو بردووە لە بری ئەوان ژیانێکی ئازاد بدە بە کۆیلەیەك ـ وە گەورەمان إبن عباسرضي الله عنهدەفەرموێت: لە سەردەمی نەفامیدا ئافرەت کاتێك سکی دەبو چاڵێکی هەڵدەکەند، کاتێك ژانی منداڵ بونی دەهاتێ دەچوە سەر چاڵەکە، ئەگەر کچی ببوایە، یەکسەر دەیخستە ناو چاڵەکەوە و گڵی بەسەردا دەدا، بەڵام ئەگەر کوڕ بوایە

١ـ بە داڕوخانی موسڵمانان جیهان چ زیانێکی لێکەوت ؟ ٩٩

٢ـ پێشەوایان بەزار و طبرانی گێڕاویانەتەوە ، وە طبرانی دەفەرموێت پیاوەکانی (صحیح)ن

لە باوەشی دەکرد و دەیهێنایەوە بۆ ماڵەوە[1] وە قتادە رحمه‌الله دەفەرموێت: لە سەردەمی نەفامیدا پیاو هەبو کچەکەی دەکوشت و گۆشتەکەی دەدا بە سەگەکانی![2]

بەڵام کاتێك ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات زۆر بە توندی دژی ئەم داب و نەریتە خراپە وەستایەوەو مافی ژیانێکی سەر بەرزانەی گێڕایەوە بۆ ئافرەت، وەخودای گەورە ئایەتی قورئانی پیرۆزی دەربارەی ئەم کارە قێزەونەی نەفامەکانی سەردەمی نەفامی دابەزاندو فەرمووی: ﴿وَإِذَا الْمَوْءُودَةُ سُئِلَتْ * بِأَيِّ ذَنبٍ قُتِلَتْ﴾[3] واتا: لە ڕۆژی قیامەتدا کیژۆڵە زیندە بەچاڵکراو و کوژراوەکان دەڵێن: ئەی خودای پەروەردگار بپرسە لە دایك و باوکانمان ئاخۆ بۆ ئێمەیان کوشت؟ تاوانمان چی بو؟ جا بە هۆی ئەم هەڕەشەوە وردە وردە ئەم تاوانە لە ناو عەرەبدا بەیەکجاری کۆتایی پێهات و بونی نەما.

٢ـ ئەگەر کەسێك هەواڵی لەدایکبونی کچیان پێدابایە ئەوە لە خەفەتا ڕەنگی ڕەش دادەگیرا" ئەگەر زیندەبەچاڵیشی نەکردبایە!. خودای پەروەردگار حاڵی ئەو نەفامانەمان بۆ وێنە دەکات و دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَى ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ * يَتَوَارَى مِنَ الْقَوْمِ مِن سُوءِ مَا بُشِّرَ بِهِ أَيُمْسِكُهُ عَلَى هُونٍ أَمْ يَدُسُّهُ فِي التُّرَابِ أَلَا سَاءَ مَا يَحْكُمُونَ﴾[4] واتا: ئەو نەفامانە کاتێك یەکێکیان هەواڵی پێدەدرا کە کچی بووە دەم و چاوی ڕەش دادەگیرا و سینەی پڕ دەبو لە خەم و پەژارە، جا لە داخ و خەفەتی ئەم هەواڵە ناخۆشە خۆی لە خەڵکی دەشاردەوە و بەتەنیا بیری دەکردەوە ئایا ئەم عەیب و عارە بە سوك و بێ نرخی بهێڵێتەوە یان زیندە بە چاڵی بکات، ئاگاداربن کە ئای چەند کردەوەیەکی خراپە کە کچەکانیان زیندە بە چاڵ دەکەن!

---

١ـ الجامع الأحكام القرآن تفسير القرطبي:٢٠٢/١٩.

٢ـ هەمان سەرچاوە و هەمان لاپەرە .

٣ـ التكوير : ٨

٤ـ النحل : ٥٨ـ٥٩

٣ـ ئافرەت لــە پێش ئیسلامدا مافی سەروەت و ساماندارى نەبــوو بەڵكو بە خۆی و سامانەکەشیەوە هی مێردەکەی بوو، وە ئافرەت مافی وەرگرتنی میراتی دایك و باوك و خزمە نزیکەکانیشی نەبوو کاتێك دەمردن، سعیدی کوڕی جبیر و قتادەرحمهماالله دەفەرموون: کافرەکان پێش هاتنی ئیسلام میراتیان تەنها دەدا بە نێرینەی گەورە، ژن و منداڵەکانیان لێی بێبەش دەکردن.[1] بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات و مافی ساماندارى و میراتی گێڕایەوە بۆ ئافرەتان و پەروەردگار فەرمووی: ﴿لِّلرِّجَالِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ وَلِلنِّسَاءِ نَصِيبٌ مِّمَّا تَرَكَ الْوَالِدَانِ وَالْأَقْرَبُونَ مِمَّا قَلَّ مِنْهُ أَوْ كَثُرَ نَصِيبًا مَّفْرُوضًا﴾[2]واتا: پیاوان بەشیان هەیە لەو ماڵ و سامان و شتانەی دایك و باوك و خزمە نزیکەکان لە دوای خۆیان بە میرات بە جێی دەهێڵن،وەئافرەتانیش بەشیان هەیە لەو ماڵ و سامان و شتانەی دایك و باوك و خزمە نزیکەکان لە دوای خۆیان بە میرات بە جێی دەهێڵن، جا ئەو ماڵ و سامانە کەم بێت یان زۆر بەشی هەریەکێکیان دیاری کراوەو دەبێت بیدرێتێ.

جا کاتێك ئەم ئایەتە دابەزی کافر و بێباوەڕەکان لایان سەیر و نەخوازراو بو کە ئیسلام میراتی بۆ ئافرەت داناوە، لەبەر ئەوە دەیان گووت: سەرتان ناسوڕمێ لە کارو کردەوەکانی محمد، ئەوەتا دەڵێت: دەبێت ئافرەت میراتی بدرێتێ!

٤ـ ئافرەت مافی ڕا دەربڕینی نەبو: لە پێش هاتنی ئیسلام تەنها بەتوانا و دەسەڵاتدارەکان مافی ڕادەربڕین و بەشداریکردنیان هەبو لە کارو باری فەرمی و کۆمەڵایەتیەکاندا، هەرچی بیهێزەکان بون، وەك: ژن و کۆیلە و منداڵ و هەتیوەکان، ئەمانە مافی ڕا دەربڕینیان بەشداریکردنیان نەنەبوو لەکاو بارە فەرمی و کۆمەڵایەتیەکاندا، بەڵام کاتێك ئیسلام هات ئەم مافەیان بۆ گەڕایەوە، قسەی ئافرەت ڕێزی لێدەگیراو بەهای هەبو، ئافرەت پرسی پێدەکرا، ئافرەت ڕەخنەی دەگرت و بەهەند وەر دەگیرا، لەسەر قسەی ئافرەتێك حوکمێك جێگیر دەکرا ...

١ـ تفسير القرآن العظيم : ١٣٢/٢

٢ـ النساء : ٧

ئەوە بەسە بۆ گەورەیی ئافرەت کە خودای پەروەردگار بە خودی خۆی گوێی بۆ بگرێت و حوکمێکی بۆ جێگیر بکات و مافی بۆ بگێڕێتەوە هەروەك لە باسی ظهاردا ڕویدا، دواتر إن شاالله باسی دەکەین، وە پێغەمبەری خوداﷺبە خودی خۆی ڕاوێژی بە ئافرەت کردووە، ئەمەش لە صولحی حدیبیە بەشێوەیەکی کردەیی ڕویدا کاتێك پێغەمبەری خۆشەویستﷺ بە ڕاوێژی أم سلمة ئیحرامی شکاند و کارەکەشی سەرکەوتو بو. وە دوای هاتنی ئیسلام چاو کراوەی و مافی ئافرەت گەیشتبۆ ئاستێك کە ئافرەتێك دەیتوانی ڕەخنە لە گەورەترین دەسەلات بگرێت و حەقیشی پێدەدرا، پێشەوا عمری کوڕی خطابرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ هەوڵیدا مارەیی ئافرەت کەم بکاتەوە بۆ ئەوەی هاوسەرگیری بۆ گەنجان ئاسان ببێت، لەسەر مینبەر فەرمووی: (**لا تغالوا في مهور النساء**)واتا: زیادەڕەوی مەکەن لە مارەیی ئافرەتداو مارەیی زۆریان پێمەدەن، ئافرەتێك هەستایە سەر پێ و گووتی: ئەی عمر تۆ ناتوانی مارەیی ئێمە کەم بکەیتەوە چونکە خودای گەورە ئەو مافەی پێداوین، پێشەوا عمررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ فەرمووی: لە کوێ ئەو مافەی پێداون؟ ئافرەتەکە گووتی: خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَآتَيْتُمْ إِحْدَاهُنَّ قِنطَارًا ﴾[1]پێشەوا عمررَضِيَ اللَّهُ عَنْهُفەرمووی:(**إن امرأة خاصمت عمر فخصمته**)[2]واتا: ئافرەتێك کێبەرکێی عمری کردو لێشی بردەوە .

٥ـ ئافرەتان مافی هەڵبژاردنی هاوسەریان نەبوو: لەسەردەمی نەفامیدا زۆرینەی ئافرەتان مافی ئەوەیان نەبو بە حەزی خۆیان هاوسەر دەست نیشان بکەن،بەڵکو زۆریەی هاوسەر گیریەکان بۆ سودی ڕەگەزی نێر بو و ڕەگەزی مێ تێیدا دەبۆ قوربانی، ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەو هاوسەرگیریانەی کە لە سەردەمی نەفامیدا ئەنجام دەدران و قوربانیەکەیان ئافرەت بوو:

* نکاح السبي: ئەم هاوسەرگیریە بریتی بو لەوەی ئەو ئافرەتانەی لە جەنگدا دەگیران، سەربازەکان بەبێ مارەیی لە خۆیان مارە دەکردن .

* نکاح المتعة: ئەم هاوسەرگیریە بریتی بو لەوەی پیاوێك بۆ ماوەیەکی دیاریکراو و لەسەر بڕێکی دیاریکراو ئافرەتێکی مارەدەکرد، کاتێك ماوەکە تەواو دەبو وهاوسەر گیریەکەیان

---

١ـ النساء : ٢٠

٢ـ پێشەوا عبدالرزاق گێڕاویەتەوە.

هەڵدەوەشایەوە، ئەمەش زیانێکی گەورەی لە کەسایەتی ئافرەت دەدا و تیایدا وەك کاڵایەك سەیر دەکرا، بۆیە کاتێك ئیسلام هات بەشێوەیەکی کۆتایی قەدەغەی کرد.

* نکاح البدل ـ ژن گۆڕینەوە: لەم هاوسەر گیریەدا دوو پیاو ڕێك دەکەوتن کە ژنەکانیان بگۆڕنەوە. ئەمەش هەم لەڕوی داراییەوە، وەهەم لە ڕوی کەسایەتیەوە زیانی بە ئافرەت دەگەیاند بۆیە لە ئیسلامدا قەدەغە کرا.

* نکاح الشغار: لەم جۆرە هاوسەرگیریەدا دوو پیاو ڕێك دەکەوتن کە کچەکانیان بدەن بەیەکتر بەبێ مارەیی، ئەمەشیان لە ڕوی داراییەوە زیانی ئافرەتی تێدا بو، جگە لەوەی هیچ بەهایەك بۆ ڕازی بون یان ڕازی نەبونی کچەکە دانەدەنرا.

* نکاح الإستبضاع: بریتی بو لەوەی کاتێك ژنێك لە حەیز پاك دەبۆوە مێردەکەی نەدەچۆ لای، بەڵکو دەینارد بۆ لای پیاوێکی نەجیب زادە یان پاڵەوان بۆ ئەوەی لە گەڵ ئەودا جوت ببێت و لەم جوت بونە ژنەکەی منداڵێکی نەجیب زادە یان پاڵەوانی ببێت!! ئەمەش لەکەداکردنی کەسایەتی ئافرەت و داڕوخاندنی ڕەوشت و کەسایەتی پیاو بو، بۆیە ئیسلام زۆر بەتوندی ئەم کارە قێزەونەی ڕەتکردەوە و بڕیاریدا هەر ئافرەت و پیاوێك دوای هاوسەرگیری زینا بکەن، دەبێت ڕەجم بکرێن.

* نکاح الرهط: ئەم جۆرەیان قێزەونترین جۆری هاوسەرگیری سەردەمی نەفامی بو و تیایدا کەسایەتی ئافرەت قوربانی یەکەم بو، بریتی بو لەوەی کۆمەڵێك پیاوی کەمتر لە دە نەفەر دەچونە لای ئافرەتێك، هەموویان سەرجێیان لەگەڵ دەکرد، کاتێك منداڵی دەبوو، بانگی هەموویانی دەکرد پاشان بەحەزی خۆی ئەم ئافرەتە یەکێك لەم پیاوانەی هەڵدەبژاردو دەیگوت ئەم منداڵە لە تۆیە[1]!!

بەڵام ئیسلام هات و مافی هەڵبژاردنی هاوسەری بۆ ئافرەت گێڕایەوەو پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (لا تنكح الأيم حتى تستأمر، ولا تنكح البكر حتى تستأذن)[2] واتا: نابێت بێوەژن مارە بکرێت هەتا فەرمان نەکات بە مارە بڕینەکەی، وەنابێت کچیش مارە بکرێت هەتا پرسی

١ـ پێشەوا بوخاری لە خاتو عائیشەوە گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

پێنەکرێت و بۆخۆی ڕێگا نەدات بە مارە بڕینی. ئینجا لە ڕوی فرەژنیشەوە هیچ پێوەرێك و سنورێك نەبوو بۆ فرەژنی، بەڵکو پیاوان بێ سنور ژنیان دەهێنا، بەڵام ئیسلام فرەژنی سنوردارکرد و مەرجیشی بۆ دانا، سنورداری کرد بەوەی هیچ پیاوێك نابێت لە چوار ژن زیاتر بهێنێت، مەرجیشی بۆ پیاوان دانا دەبێت دادپەروەر بن، ئەگەر داد پەروەر نەبن ئەوە دەبێت تەنها یەك ژن بهێنن، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿فَانكِحُوا مَا طَابَ لَكُم مِّنَ النِّسَاءِ مَثْنَى وَثُلَاثَ وَرُبَاعَ فَإِنْ خِفْتُمْ أَلَّا تَعْدِلُوا فَوَاحِدَةً﴾[1] واتا: بخوازن لەو ئافرەتانەی کە بۆتان حەڵاڵن دوو دووان، سێ سێیان، چوار چواران،بەڵام ئەگەر ترسان لەوەی دادپەروەر نابن لەنێوان خێزانەکانتاندا ئەوە تەنها یەکێك مارە بکەن.

جا کاتێك سەیری ئەم جۆرە هاوسەرگیریانەی سەردەمی نەفامی دەکەیت، بۆت دەردەکەوێت کە ئەو ژینگەیەی پەیامی ئیسلامی تێدا هات خەڵکێکی چەندە نەفام و پیس و بێ ڕەوشتی تێدابووە و ئافرەت تێیدا چەندە بەش خوراو ماف خوراوبووە، بۆیە دەبێت ئافرەتی موسڵمان سوپاسی خودا بکات کە خودای گەورە ئەم پەیامە جوانەی نارده خوار و ئافرەتی لەم هەموو کوێتانە ڕزگارکرد .

٦ـ ئافرەت بە ناوی (ظهار)ەوە لە ماڵی مێردەکەی بەند دەکرا: جۆرێك لە جۆرەکانی سزادانی ئافرەت بریتی بو لە بەند کردن و ڕاگرتنی ئافرەت لە ماڵی مێرد بە ناوی (ظهار)ەوە، ئەگەر پیاوێك لە خێزانەکەی توڕە بوبایە پێی دەگووت: تۆ وەکو پشتی دایکم وای ـ أنت علی کظهر أمي ـ بەم ووتەیە ئەم ئافرەتە لە پیاوەکەی حەرام دەبوو، نەبۆی هەبوو شو بکاتەوە نە پیاوەکەشی بەلایدا دەچوو، بەمەش وەك بەندکراوێکی گەرۆکی لێدەهات لە ناو ماڵدا.

بەڵام کاتێك ئیسلام هات ئەم نەهامەتیەی لەسەر ئافرەتان لاداو، لەم کوێت و بەندە ڕزگاری کردن، خەولەی کچی سەعلەبە یەکێك بو لە قوربانیەکانی ئەم نەریتە سەقەتە، مێردەکەی کە ناوی ئەوسی کوڕی صامت بوو، ڕۆژێکیان لێی توڕە بوو پێی گووت: تـــۆ وەکـــو پشتی دایکم

[1] ١ـ النساء: ٣

وەهای، بەم ووتەیەش خەولە کەوتە ناو کۆتی (ظهار)ەوە، پاشان خەولە هاتە لای پێغەمبەری خوداﷺو سکالای حالی خۆی لە لا کرد، بەڵام پێغەمبەری خواداﷺ فەرمووی لەم بارەیەوە هیچم بۆ دانەبەزیوە، چەند جارێك دەهات و دەچوو و پرسیاری لە پێغەمبەرﷺ دەکرد، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ هەر دەیفەرموو: هیچم بۆ دانەبەزیوە، جاری کۆتایی خەولە فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من چەند جارێکیان هاتم بۆ لای تۆ بەڵام تۆ هەر دەڵێی هیچم بۆ دانەبەزیوە، لەبەر ئەوە من ئەم جارەیان سکالای خۆم بەرز دەکەمەوە بۆ لای خودای گەورە، جا کاتێك خەولە سکالاکەی خۆی بەرز کردەوە بۆ لای خودا " خودای پەروەدگاریش وەڵامی دایەوەو چارەسەری کێشەکەی کردو ئەم ئایەتەی دابەزاند: ﴿قَدْ سَمِعَ اللَّهُ قَوْلَ الَّتِي تُجَادِلُكَ فِي زَوْجِهَا وَتَشْتَكِي إِلَى اللَّهِ وَاللَّهُ يَسْمَعُ تَحَاوُرَكُمَا إِنَّ اللَّهَ سَمِيعٌ بَصِيرٌ﴾[1][2] واتا: بێگومان ئەی پێغەمبەرﷺ خودای گەورە وتوێژی ئەو ئافرەتەی بیست و وەریگرت کە لەگەڵ تۆدا دەدواو سکالاشی بۆ لای خودا بەرز کردەوە، بەڕاستی خودا بیسەرە و بینایە. پاشان خودای گەورە چارەسەری بۆ کێشەکەی داناو، وەك تەمبێ کردنیش کەفارەتی لەسەر ئەو پیاوانە دانا کە (ظهار) لەگەڵ خێزانەکانیاندەکەن .

٧ـ ئافرەت مافی بەشداریکردنی ڕامیاری و بەڕێوە بردنی نەبوو: وەك گوتمان سەردەمی پێش ئیسلام سەردەمی بەهێزەکان بوو، لەبەر ئەوە بێهێزەکان نەیان دەتوانی تواناکانی خۆیان لە زۆربەی بوارەکاندا دەربخەن، ئافرەتیش یەکێك بو لە بێهێزەکان، لەبەر ئەوە لە زۆر ماف و زۆر بوار بێبەش کرابوو و ڕێگای پێنەدەدرا تواناکانی خۆی تاقی بکاتەوە، یەکێك لەم بوارانە بواری ڕامیاری و کاربەدەستی بوو، بەڵام کاتێك ئیسلام هات ئەم ڕۆڵ و مافەی بۆ ئافرەت گێڕایەوە و ئافرەتی لە ڕوی ڕامیاری و بەڕێوەبردنەوە هێنایە پێشەوە، بۆیە سەیر دەکەین لەگەڵ ئەوەی چەندین پیاوی کارامەو لێهاتوو هەبوون،بەڵام پێشەواعمری کوڕی خطابرضي الله عنهئافرەتێکی بەناوی شفاءی کچی عبدالله ی کرد بە بەرپرس و چاودێری بازاڕ!

١ـ جامع الأحكام القران ، تفسير القرطبي : ١٧/ ٢٢٩

٢ـ المجادلة : ١

٨ـ لە پێش هاتنی ئیسلام ئافرەت نەفرەت بو بەڵام ئیسلام کردی بە نیعمەت و هۆکاری خۆشبەختی پیاو لە دونیادا. وەك باسمان کرد لای نەفامەکانی عەرەب کچ عەیبە بو، وە لای جولەکەکانیش نەفرەت بوو!! بەڵام لە سەر زاری پیرۆزی پێغەمبەرەوەﷺ ئافرەتی چاك بوو بە نیعمەت، پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرموویەتی: (أَرْبَعَةٌ مِنَ السَّعَادَةِ: الْمَرْأَةُ الصَّالِحَةُ، وَالْمَسْكَنُ الْوَاسِعُ ،وَالْجَارُ الصَّالِحُ ،وَالْمَرْكَبُ الْهَنِيءُ)[1] واتا: چوار شت لە خۆشبەختی دنیان: ئافرەتی چاك، خانوی فراوان و باش، دراوسێی چاك، وەڵاخی سواری چاك ـ ئۆتۆمبێلی چاك ـ .

## ڕێزی ئافرەت لە ئیسلامدا

ئەوانەی ڕابران تەنها چەند بەراوردێکی کەمی ئافرەتی پێش ئیسلام بوو بە ئافرەتی دوای ئیسلام، ئێستاش دێینە سەر باسی ڕێزی ئافرەت لە ئیسلامدا، جا سەرەتا پێویستە ئەوە بزانین کە ئافرەت یان دایکە یان کچە یان خوشکە یان هاوسەرە یان هەر ئافرەتێکی ترە بە گشتی، ئیسلامیش بۆ هەر یەکێك لەمانە ڕێزی تایبەتی داناوە:

* ئافرەت دایکە و ڕێزدارە: دایك لە ئیسلامدا لە هەموو بونەوەرێك و مرۆڤێکی تر ڕێزدارترە، بەڵکو ئەوەندە ڕێزدارە خودای گەورە بەهەشتی منداڵەکانی لە ژێر پێی ئەودا داناوە، معاویەی کوڕی جاهمە هاتە خزمەتی پێغەمبەرﷺگووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ دەمەوێت بچم بۆ جەنگ لە پێناوی خودادا، جا هاتووم ڕاوێژت پێبکەم جەنابت دەڵێی چی؟ پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرمووی:(هل لك أم ؟)واتا: ئایا دایکت ماوە؟ گووتی: بەڵێ، فەرمووی: (فإلزمها فإن الجنة تحت رجليها)[2]واتا: بڕۆ خزمەتی بکە و گوێڕایەڵی بە چونکە بەهەشت لە ژێر پێی ئەودایە! وە أبو هريرةرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُدەفەرموێت: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوداﷺگووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺکێ لە هەموو کەس لە پێشترە چاکەی لە گەڵ بکەم؟ پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی:(أمك)واتا: دایکت، دواتر گووتی: پاشان کێ؟ فەرمووی:(أمك)واتا: دایکت، داوتر گووتی: پاشان کێ ؟ فەرمووی:(أمك) واتا: دایکت، دواتر گووتی: پاشان کێ؟ فـەرمووی:

---

١ـ پێشەوا ابن حبان گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا نسائی گێڕاویەتەوەو حاکم و زەهەبیش بە صحیحیان داناوە.

(ثم أبوك)[1] واتا: پاشان باوکت. لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری ڕێزدارﷺ سێ جار دایکی بەسەر باوکدا پێش خستووە، ئەمەش گەورترین ڕێزە بۆ دایکان، لە کاتێکدا لەو وڵاتانەی بانگەشەی مافی ئافرەتان دەکەن دایکان لە خەڵوەتگای پیران و دوور لە منداڵ و خۆشەویستانیان سەردەنێنەوە.

* ئافرەت کچە: گەورەمان أبو سعیدی خدریرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(مَن عالَ ثلاثَ بَناتٍ فأَدَّبَهُنَّ وَزَوَّجَهُنَّ وأَحسَنَ إليهِنَّ فَلَهُ الْجَنَّةَ)[2] واتا: هەر کەسێك سێ کچان بە خێو بکات و، بە پەروەردەیەکی جوان پەروەردەیان بکات و، پاشان بیان دات بە شوو و بەباشی مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، ئەوە لە پاداشتیا دەچێتە بەهەشت.

* ئافرەت خوشکە: گەورەمان أبو سعیدی خدریرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لا يَكونُ لأَحَدِكُم ثلاثُ بناتٍ أَو ثلاثُ أخواتٍ فَيُحسِنُ إليهِنَّ إلا دَخَلَ الْجَنَّةَ)[3] واتا: هیچ کەسێك لە ئێوە سێ کچ یان سێ خوشکی نابن و چاکەیان لەگەڵدا بکات، مەگەر بەهۆیانەوە نەچێتە بەهەشت .

* ئافرەت هاوسەرە: ژیانی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ لەگەڵ هاوسەرە بەڕێزەکانیدا جوانترین پێشەنگە بۆ مرۆڤایەتی، پێغەمبەرﷺ خێزانەکانی خۆشدەویست، ڕێزی دەگرتن، لەگەڵیان بە سۆز و میهرەبان بوو، هەرگیز قسەیەکی ناشیرینی پێنەگوتوون، هەرگیز ئازاری نەداون، خاتوو عائیشە رضی الله عنها دەفەرموێت: (ماضَرَبَ رَسولُ اللهِ خادِماً لَهُ قَطّ وَلا إمرأَةً لَهُ قَطّ)[4] واتا: هەرگیز پێغەمبەری خوداﷺ نە لە خزمەتکارەکانی وەنە لە خێزانەکانی نەداوە، وە پێغەمبەری خۆشەویستﷺ موسڵمانان هانــدەدات لەسەر ڕێزگرتنی خێزانەکانیان و دەفەرموێت: (خَيرُكُم

---

١ - پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

٢-پێشەوا ابن حبان گێراویەتەوە .

٣- پێشەوایان ترمذی و احمد گێراویانەتەوە .

٤- پێشەوایان مسلم و ابو داود ابن ماجە و احمد گێراویانەتەوە

خیرُکُمْ لأَهلهِ، وَأَنا خَیرُکُمْ لأَهلِی)[1] واتا: باشترینتان ئەوکەسەیە لەگەڵ ماڵ و خێزانی باش بێت، وە منیش لە هەمووتان باشترم لەگەڵ ماڵ و خێزانەکانم. وە پێغەمبەری خوداﷺ لە حەجی ماڵئاوایدا زۆر پێداگری کرد و جەختی کردەوە لەسەر ڕێزگرتن و چاکەکردن لە گەڵ ئافرەتاندا و فەرمووی: (اسْتَوصَوا بِالنساءِ خَیراً)[2] واتا: وە صیەتتان لێدەکەم لەگەڵ ژنەکانتان باش بن.

* ئافرەت بە گشتی ڕێزدارە: ئەمانەی سەرەوە ڕێزی ئافرەتانی نزیك بوو، بەڵام لەئیسلامدا ئافرەت بەگشتی دور بێت یان نزیك هەر ڕێزدارە، پێغەمبەری خوداﷺ لە زۆر کات و شوێندا ئامۆژگاری موسڵمانانی کردووە کە لەگەڵ ئافرەتاندا چاك و باش بن، وە پێغەمبەری خوداﷺ جەنگی ڕاگەیاند لەگەڵ جولەکەکانی (بنی قینقاع)و لە مەدینەدەری کردن، تەنها لەبەر ئەوەی بێ ڕێزیان بەرامبەر ئافرەتێك کرد، وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنما النساءُ شَقائِقُ الرِّجالِ)[3] واتا: بێگومان ئافرەتان خوشکی دایك و باوکی پیاوانن ـ بەواتای دەبێت ئافرەتان وەك براکانیان ڕێزیان بگیردرێت.

جا ئەی خوشکی موسڵمانم: بزانە کە مافی ئافرەت تەنها لە ئیسلامدایە، چارەسەری کێشە و ئاریشەکانی ئافرەت تەنها لە ئیسلام دایە، وە بزانە ئەوانەی بانگەشەی مافی ئافرەت دەکەن هەموویان لەگەڵ تۆی بەڕێزدا درۆزنن، وە هەموویان تەنها و تەنها بۆ بە لاڕێدابردنی تۆی موسڵمانی خاوەن شەرم و شکۆ کار دەکەن، وە لە ئیسلامدا هەموو ڕۆژێك یادی تۆیە و جەژنی تۆیە، چونکە هەموو ڕۆژێك بە ملیۆنەها کەس لە دوونیادا قورئان و سوننەت دەخوێنێتەوە، ئەم قورئان و سوننەتەش پڕیەتی لە باسی تۆ، پڕیەتی لە یادی تۆ، پڕیەتی لە مافی تۆ!! لەبەر ئەوە تۆی بەڕێزیش بەهیچ شێوەیەك بەشداری یادی٨ی مارس مەکەو بە دروشمە درۆینەکانی ڕێکخراوە ئافرەتیە پاشکۆییەکانی حیزبە عەلمانی و شیۆعیەکان هەڵمەخەڵەتێ و هەموو مافە ڕەواکانت لە ئیسلامدا بدۆزەرەوە .

---

١ـ پێشەوایان ترمذی و ابن ماجە و دارمی و بیهقی گێڕاویانەتەوە . وە ترمذی دەفەرموێت: حسن غریب صحیح.

٢ـ پێشەوایان مسلم و ابن ماجە گێڕاویانەتەوە.

٣ـ پێشەویان بزار و احمد و ابو داود ترمذی گێڕاویانەتەوە و سیوطی دەفەرموێت ـ صحیح ـ ە

# جـــــەژنی

# دایـــــك

خودای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى﴾

# جەژنی دایك

بە درێژایی مێژوو زۆرێك لە ئاینەکان و وولآتانی دوونیا ڕۆژێکیان دیاری کردووە بۆ دایك و جەژنی دایکیان تێدا گێڕاوە وەك: جەژنی ڕۆمانیەکان بۆ هیلیریا، وە پەرستنی یۆنانیەکان بۆ کوبیلی، وە جەژنی مەسیحیەکانی ئەوروپا لە یەکشەممەی دایکدا..... هتد، بەڵآم ئەم جەژنی دایکە هەرچەندە چاولێکەری ئەم جەژنانەی مێژووییە، بەڵآم بەو بەرگە تازەیەوە بۆ یەکەم جار لە ئەمریکادا داهێنراوە، پاشان گواستراوەتەوە بۆ وولآتانی تری دوونیا، وە جێگای ئاماژەیە کە وولآتانی دوونیا یەك دەنگ نین لەسەر دیارکردنی ڕۆژێکی تایبەت و دیاریکراو بۆ ڕۆژی جەژنی دایك، بەڵکو هەر وولآتەو ڕۆژێکی تایبەت بەخۆی دیاریکردووە بۆ جەژنی دایك، بەڵآم زۆربەی ئەو ڕۆژانە دەکەونە مانگی ئازار و نیسانەوە، بۆ نمونە: لە وولآتانی عەرەبی لەگەڵ یەکەم ڕۆژی بەهاردا واتا ٣/٢١دا یادی جەژنی دایك دەکەنەوە، وە لە وولآتی نەرویج لە ڕۆژی ٢ی شوبات، وە لە ئەرجەنتین لە ١٠/٣ئۆکتۆبەردا، وە لە وولآتانی باشوری ئەفریقیا لە ١ی ئازاردا، وە لە ئەمریکا لە یەکشەممەی دووەمی مانگی ئازاردا.... هتد. جا هەر وولآتە و لە ڕۆژی دیاریکراوی خۆیدا و بە شێوەیەکی دیاریکراو جەژنی دایك ڕێك دەخەن و تیایدا چەندین کار و چالاکی دەربارەی ڕێز و گەورەیی دایك ئەنجام دەدەن، لە بەشێك لە وولآتان منداڵانی تەمەن ١٤ بۆ ١٦ساڵی چەند وێنەیەکی تایبەت بەو یادە دەکێشن و دەیانخەنە ناو پێشانگایەکی گەڕۆکەوە کە ناوی پێشانگای دایکی لێنوسراوە و چەندین شار و وولآت دەیگێڕن، وە هەر چوار ساڵ جارێك دەیگوازنەوە.[1]

ئێمەش لێرەدا بە پشتیوانی خودا دەچینە سەر باسی حوکمی ئەو جەژنەو گەورەیی دایك لە ئیسلامدا.

١ـ سایتی ملتقى أهل الحديث، وە سایتی ویکیبدیا، الموسوعة الحرة،

# حوکمی یاد کردنەوەی جەژنی دایك

زانایانی سەردەم جیاڕان دەربارەی یاد کردنەوەی جەژنی دایك، بەشێکیان دەفەرموون: دروست نیە یادی بکرێتەوە، وە بەشێکی تریشیان ڕێگایان داوە یادی بکرێتەوە و بەکارێکی ڕێگا پێدراو ـ مباح ـ ی دەزانن، ئەوەی خوارەوەش ڕاکانیانە:

یەکەم/ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: دروست نیە یادی جەژنی دایك بکرێتەوە، چونکە ئەمە داهێنانە لە ینداو خۆ چواندنە بە کافران، پێغەمبەریش ﷺ فەرموویەتی: (من تَشَبَّهَ بقومٍ فهُوَ مِنهُم)[1] واتا: هەر کەسێك خۆی بچوێنێت بە هەر گەلێك و ئوممەتێك ئەوە لەگەڵ ئەواندا ئەژمار دەکرێت. ئەوەش ڕای زانایانی سعودیە[2] و خەلیج[3] و بەشێکی تری زانایانە، وەك شێخ محمد متولی الشعراوی و ئامێدی و دکتۆر محمود میصری و کۆمەڵێکی تریش لە زانایان.

محمد متولی الشعراوی دەفەرموێت: (عيد الأمِ اخترَعَهُ الغربُ ، فَقَلَّدناهُم تقليداً أعمى ولم نفكُر في الأسبابِ التي جَعلتِ الغربُ يَبتَكِرُ عيدَ الأمِ ... إذن لَيسَ هُناكَ ضَرورةٌ لِهذا العِيدِ عِندَنا)[4] واتا: جەژنی دایك داهێنراوی وولاتانی ڕۆژئاوایە ، ئێمەش بە کوێرانە دوایان کەوتووین و یادی دەکەینەوە، بێ ئەوەی بزانین ئەو هۆکارانە چین کە وولاتانی ڕۆژئاوای هاندا بۆ دانانی ئەم جەژنە ... وە ئێمە هیچ پێویستیمان بە وەها ڕۆژێك نیە بۆ دایك .

وە دکتۆر محمود میصری دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (من عَمِلَ عمَلاً ليس عَلَيهِ أمرنا فهوَ ردٌّ)[5] واتا: هەر کەسێك هەر شتێك دابهێنێت کە فەرمانی ئێمەی لەسەر

١ـ پێشەوا ابو داود گێڕاویەتەوە.

٢ـ فتاوى اللجنة الدائمة: ٣/ ٥٩ـ ٦١

٣ـ بنکەی فتوای قطری(إسلام ويب) ژمارەی فتوا:١٥٣٥٩٥

٤ـ الفتاوى : ٣٢١ـ ٣٢٢

٥ـ پێشەوایان بوخاری مسلم گێڕاویانەتەوە.

نەبێت ئەوە ڕەت دەكرێتەوە، بێگوومان بەناو جەژنی دایكیش داهێنراوە، لەبەر ئەوە هیچ كەسێك بۆی دروست نیە لەو ڕۆژەدا دروشمی تایبەت بەو ڕۆژە بەرز بكاتەوە و خۆشحاڵی تێدا دەربڕێت و دیاری پێشكەش بە یەكتر بكات، وە پێویستە لەسەر موسڵمان شانازی بكات بە دینەكەیەوە و ئەو جەژنانەی بەس بن كە خودا و پێغەمبەرەكەیﷺ بۆیان دیاری كردوون.[2]

دووەم/ یادكردنەوەی ئەم جۆرە جەژن و بۆنانە دەچێتە ژێر ئایەتی: ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ﴾[3] واتا: ڕۆژە تایبەتەكانی خودایان بیر بخەرەوە، لەبەر ئەوە دروستە یادیان بكرێتەوە، ئەوەش ڕای زانایان دكتۆر یوسف القرضاوی و دكتۆر علی جمعە و بەشێكی تری زانایانە، دكتۆر قرضاوی دەفەرمووێت: (أما الأعيادُ الوطنيةِ ، مثل عيدُ الإستقلالِ أو الوحدةِ ، أو الأعياد الإجتماعيةِ مثلُ: أعيـــــــــاد الأمومةِ والطفولةِ والعمالِ والشبابِ و نحوها ، فلا حرجَ على المسلمِ من أن يهنيءَ بها أو يشاركَ فيها بإعتبارهِ مواطناً أو مقيماً في هذه الديار ، على أن يحرصَ على تَجَنُّبِ المحرَّماتِ التي قد تقعُ في تلكَ المناسبات)[4] واتا: هەرچی جەژن و بۆنە نیشتمانیەكانی وەك: جەژنی سەربەخۆ و یەكگرتنی وڵات، وە هەرچی جەژن و بۆنە كۆمەڵایەتیەكانی وەك: جەژنی دایك و منداڵ و كرێكاران و گەنجان و هاوشێوەكانیانن" ئەوە هیچ ڕێگریەك نیە و دروستە ئەگەر موسڵمان تێیاندا بەشداری بكات و جەژنە پیرۆزەش بكەن لە بێباوەڕانی ئەهلی ئاشتی ، بۆ ئەو كەســــەی هاونیشتیمانی بێباوەڕانە وە یان دانیشـــتوی وڵاتێكی بێباوەڕانە ، بەڵام دەبێت ئەو كەسە زۆر ئاگاداربێت و خۆی بپارێزێت لەو كارە حەرام و ناپەسەندانەی لەم جەژنانە دەكەون.

وە دكتۆر علی جومعە دەفەرمووێت: دروستە و شەرعیە كە یادی ڕۆژی دایك و بێ باوكان و

٢ـ من روائع الفتاوى المعاصرة: ٢٢٨

٣ـ ابراهيم: ٥

٤ـ فتاوى معاصرة ، الدكتور يوسف القرضاوى : ٣/ ٦٩١

جەژنەکانە نەریتیەکانی تر بکرێتەوە، چونکە دەچنە ژێر فەرمانی ئایەتی خوداوە کە دەفەرموێت: ﴿وَذَكِّرْهُم بِأَيَّامِ اللَّهِ﴾[1] بەلاّم نابێت یادکردنەوەیان تەنها لە ڕۆژێکدا کورت بکرێتەوە.[2]

جا ئەوەی ڕابرا ڕای زانایان بوو دەربارەی یادکردنەوەی ڕۆژی دایك، بەلاّم وەك لە سەرەتای حوکمی جەژنە جیهانیەکانیش ئاماژەم پێکرد ڕای یەکەم نزیکترە لە پێکان، چونکە ئەم جۆرە جەژنانە ئەگەر بچنە باسی نەریتەکانیشەوە، ئەوە لە دوو ڕووەوە هەر نکوڵی لێکراو و قەدەغەن:

یەکەم/ یادکردنەوەی ئەم جەژنانە خۆ چواندنە بە کافران و شوێنکەوتنیانە. پێغەمبەری خوداش ﷺ نکوڵی کردووە لە خۆ چواندن بە کافران و شوێنکەوتنیان.

دووەم/ یادکردنەوەی ئەم جەژن و بۆنانە ڕێگایەکە بۆ خۆشەویست کردنی بێباوەڕان لە دڵی ئەو چینەی کە ئەم جەژن و بۆنەیەی بۆ دانراوە، لەبەر ئەوە وەك (سد الذريعة) پێویستە ئەم جەژن و بۆنانە یادیان نەکرێتەوە. والله أعلم.

## ڕێزی دایك وباوك لە ئاینی ئیسلامدا

بەپێی ئەوەی لە زۆرێك لە وولاّتاندا لەگەڵ ڕۆژی دایکدا یادی ڕۆژی باوکیش دەکەنەوە، لەبەر ئەوە ئێمە لێرەدا لە هەموو باسەکاندا لەگەڵ باسکردنی ڕێزو مافەکانی دایکدا باسی ڕێز و مافەکانی باوکیش دەکەین، جا دیارە کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر داکۆکی کردووە لە مافەکانی دایك و باوك زۆر ڕێزی لێناون، بە شێوەیەك لە زۆر جێگای قورئاندا کاتێك خودای پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات یەکتا پەرست بین" بە دوایدا فەرمانمان پێدەکات لەگەڵ دایك و باوکماندا چاکەکار بین، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ

---

١ـ ابراهيم: ٥

٢ـ چارپێکەوتنێکی دەنگ و ڕەنگی لە سایتی( يوم السابع)

إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى...﴾[1] واتا: ئەی خەڵکینە خودای گەورە بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدەن، وە چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوکتان و خزمەکانتان...

وە کاتێك خودای پەروەردگار پەیماننامەی لە نەوەکانی ئیسرائیسل وەرگرت یەکێك لە بڕگەکانی ئەوە بوو کە لەگەڵ دایك و باوکیاندا چاکەکار بن، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿وَإِذْ أَخَذْنَا مِيثَاقَ بَنِي إِسْرَائِيلَ لَا تَعْبُدُونَ إِلَّا اللَّهَ وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾[2]واتا: یادی ئەو پەیماننامەیە بکەنەوە کە خودای پەروەردگار لە نەوەکانی ئیسرائیلی وەرگرت کە تێیدا هاتبوو هیچ خودایەك نەپەرستن تەنها (اللّٰه) نەبێت، وە لەگەڵ دایك و باوکیشتاندا چاکە کار بن.

وە خودای پەروەردگار تەواویەتی سوپاسگوزاری بەندەکانی بەستۆتەوەبە سوپاسکردنی خۆی و پاشان دایك و باوك، بەواتای هەرکەسێك بیهەوێت تەواوترین سوپاسگوزاری خودای پەروەردگار بکات" پێویستە سوپاسی خودا بکات، پاشان سوپاسی دایك و باوکی بکات، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ﴾[3]واتا: سوپاسگوزاری من بکە پاشان سوپاسی دایك و باوکت بکە. پێشەوا ابن عەبباس رضي الله عنهما دەفەرمووێت: خودای پەروەردگار سێ شتی بەیەکەوە گرێداون، هیچیان بەبێ ئەوی تر وەرناگرێت، نوێژو زەکاتی بەیەکەوە گرێداوە، هەرکەسێك نوێژ بکات بەڵام زەکات نەدات ئـــەوە خودای پەروەردگار نوێژەکەشی لێوەرناگرێت، چونکـــە فەرموویەتی: ﴿وَأَقِيمُوا الصَّلَاةَ وَآتُوا الزَّكَاةَ﴾ وە خودای پەروەردگار گوێڕایەڵی خۆی و پێغەمبەرەکەی ﷺ بە یەکەوە گرێداوە و دەفەرمووێت: ﴿أَطِيعُوا اللَّهَ وَأَطِيعُوا الرَّسُولَ﴾ جا هەرکەسێك گوێڕایەڵی خودا بکات بەڵام گوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ نەکات" ئەوە گوێڕایەڵی

١ـ النساء: ٣٦

٢ـ البقرة: ٨٣

٣ـ لقمان: ١٤

خۆیشی لێوەرناگرێت، وە خودای پەروەردگار سوپاسگوزاری خۆی گرێداوە بە سوپاسگوزاری دایك و باوکەوە و دەفەرمووێت: ﴿أَنِ اشْكُرْ لِي وَلِوَالِدَيْكَ﴾ جا هەر کەسێك سوپاسی خودا بکات لەسەر نیعمەتەکانی بەڵام سوپاسی دایك و باوکی نەکات" ئەوە خودای پەروەردگار سوپاس گوزاری خۆیشی لێوەرناگرێت.[1]

وە خودای گەورە پێغەمبەرەکەیﷺ ڕاسپاردووە ئوممەتەکەی ئاگادار بکاتەوە کە لەسەری حەرام کردوون هاوبەشی بۆ دابنێن، وە فەرمانیشی پێکردوون لەگەڵ دایك و باوکیاندا چاکە کار بن و دەفەرمووێت: ﴿قُلْ تَعَالَوْا أَتْلُ مَا حَرَّمَ رَبُّكُمْ عَلَيْكُمْ أَلَّا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا﴾[2] واتا: بڵێ ئەی باوەڕداران وەرن پێتان بڵێم کە خودای گەورە چی لەسەر حەرام کردوون، خودای گەورە لەسەری حەرام کردوون کە هاوبەشی بۆ بڕیار بدەن، وە فەرمانیشی پێکردوون کە لەگەڵ دایك و باوکتاندا چاکە کار بن. بەواتای ئەوەی خراپە کردن یەکێکە لەو تاوانانەی کە خودای گەورە لەسەر زاری پێغەمبەرەکەیەوەﷺ ئێمەی لێ ئاگادار کردوتەوە.

## بەهەشت لە ژێر پێی دایکاندایە

زۆرینەی زانایان دەفەرموون ئەو گوتەیەی کە دەڵێت: (الجنة تحت أقدام الأمهات) لاوازە وە یان هەڵبەستراوە ـ موضوع ـ، بەڵام کە سەیری فەرموودەکانی پێغەمبەری خوداﷺ بکەین دەبینین کە چەندین فەرموودەی صەحیحمان هەیە جێگیری دەکەن کە بەڕاستی بەهەشت لە ژێر پێی دایکان دایە:

---

١ـ الزواجر: ٢/ ١٤٧

٢ـ الأنعام: ١٥١

ابو هريرە‌ﷺ لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( رَغِمَ أَنْفُ ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُ ثُمَّ رَغِمَ أَنْفُ قِيلَ مَنْ يَا رَسُولَ اللَّهِ قَالَ مَنْ أَدْرَكَ أَبَوَيْهِ عِنْدَ الْكِبَرِ أَحَدَهُمَا أَوْ كِلَيْهِمَا فَلَمْ يَدْخُلِ الْجَنَّةَ)[1]واتا: لوتی بەخۆڵ بێت، پاشان لوتی بەخۆڵ بێت، پاشان لوتی بەخۆڵ بێت، گووتیان: کێ ئەی پێغەمبەری خوداﷺ؟ فەرمووی: ئەو کەسەی دایك و باوکی یان یەکێکیان لە لای ئەو پیر دەبن و وا ناکات بەهۆی دایك و باوکیەوە بچێتە بەهەشت. بەواتای ئەوەندە خزمەتیان ناکات و چاکەکار نابێت لەگەڵیان کە خودای گەورە بەهۆیەوە بیباتە بەهەشت.

وە پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوداﷺ دەیهەویست بچێت بۆ غەزا، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: (هَلْ لَكَ أُمٌ؟ قالَ: نَعم، قالَ: فَالْزِمها" فَإِنَّ الجَنَّةَ تَحْتَ رِجْلَيها)[2] واتا: ئایا دایکت ماوە؟ گووتی: بەڵێ، فەرمووی: بڕۆ خزمەتی ئەو بکە چونکە بەهەشت لە ژێر پێیەکانیدایە.

وە پێغەمبەری خوداﷺ رازی بونی خودای پەروەردگاری بەستوتەوە بە ڕازیبونی دایك و باوکەوە و دەفەرموێت: (رِضَا الرَّبِّ في رِضَا الْوالِدَينِ، وَسخطه في سخطهما)[3]واتا: بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودا پەیوەستە بە ڕازیبونی دایك و باوکەوە، وە توڕەبونی خوداش پەیوەستە بە توڕەبوونی دایك و باوکەوە. بەواتای هەر موسڵمانێك مرد و دایك و باوکی لێی ڕازیبوون" ئەوە خودای پەروەردگاریش لێی ڕازیە، وە هەر موسڵمانێك بمرێت و باوك و دایکی لێی توڕە بن" ئەوە خودای پەروەردگاریش لێی توڕەیە..

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاو یەتەوە.

٢ـ پێشەوا نسائی گێڕاویەتەوە و (صحیح).

٣ـ پێشەوا طبرانی گێڕاویەتەوە.

# ئازاردانی دایك و باوك یەكێكە لە تاوانە گەورەكان

سالمی كوڕی عبدالله لە باوكیەوەرضي الله عنهما بۆمان دەگێڕێتەوە كە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (ثَلاثَةٌ لا يَنْظُرُ اللهُ إِلَيهِمْ يَومَ الْقِيامَةِ: الْعاقُ لِوالِدَيهِ، وَالْمرأة الْمُتَرجِّلَةُ الْمُتَشَبِّهَةُ بالرِّجالِ، وَالدَّيوثُ. وَثَلاثَةٌ لا يَدخُلُونَ الجَنَّةَ: الْعاقُ لِوالِدَيهِ، وَالْمُدمِنُ الخَمرِ، والمَنَّانُ بِما أَعْطى)[1]واتا: سێ كەس هەن خودای پەروەردگار لە ڕۆژی قیامەتدا بە چاوی ڕەحمەت سەیریان ناكات: كەسێك ئازاری دایك و باوكی بدات، وە ئافرەتێك خۆی بچوێنێت بە پیاوان، وە (گەواد) ئەو كەسەی خراپە لە ماڵ و خێزانی دەبینێت و بێدەنگ دەبێت، وە سێ كەسیش هەن ناچنە بەهەشتەوە: كەسێك ئازاری دایك و باوكی بدات، وە كەسێك بەردەوام بێت لەسەر مەی خواردنەوە، وە كەسێك لەگەڵ بەخشیندا منەت بكات.

جا بەڕاستی ئەم فەرموودە زۆر ترسێنەرە و تۆقێنەرە، وە گەورەترین هەڕەشەی خودایە لەو كەسانەی كە ئازاری دایك و باوكیان دەدەن، چونكە پێغەمبەری خوداﷺ لەو فەرموودەیەدا هەواڵی داوە بە دوو سزای زۆر توند و سامناك بۆ ئەو كەسانەی كە ئازاری دایك و باوكیان دەدەن، ئەوانیش بریتین لە:

یەكەم/ خودای پەروەردگار بە چاوی ڕەحمەت سەیری ناكات، ئەوەش لە ڕۆژێكدایە كە هەموو گیانلەبەرێك پێویستی بە ڕەحمەتی خودا هەیە.

٢ـ ناچێتە بەهەشتەوە!! لە قیامەتیش تەنها دوو ماڵ هەیە: بەهەشت و دۆزەخ، كە نەچێتە بەهەشت كەواتا دەچێتە دۆزەخەوە.

پاشان هەر شتێك دڵی دایك و باوك ئازار بدات خودای پەروەردگار بەتاوانی گەورەی ئەژماری كردووە و نكۆڵی ئەنجامدانی كردووە، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا

---

١ـ پێشەوایان نسائی و احمد گێڕاویانەتەوە.

﴿فَلَا تَقُل لَّهُمَا أُفٍّ وَلَا تَنْهَرْهُمَا وَقُل لَّهُمَا قَوْلًا كَرِيمًا﴾[1] واتا: هەر کاتێك یەکێك لە دایك و باوك وە یان هەردوکیان بە پیری کەوتنە لای تۆ" تەنانەت ئۆفیشیان لە دەست مەکە، وە هەرگیز پێیاندا هەڵمەشراخێ و هاواریان بەسەردا مەکە، وە بەردەوامیش با قسە وگفتوگۆت لەگەڵیاندا باش و چاك و جوان بێت.

جا ئەگەر ئۆف کردن لەدەستیان نکۆڵی لێکرابێت" دەبێت حاڵی کەسێك چۆن بێت کە قسەی ناشیاو بە باوك و دایکی دەڵێت؟ وە یان لێیان دەدات؟ خودا بمانپارێزێت لەو تاوانە گەورە.

وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّ مِنْ أكبَرِ الْكَبائِرِ أنْ يَلْعَنَ الرَّجُلَ والِدَيهِ) واتا: یەکێك لە هەرە تاوانە گەورەکان ئەوەیە کە پیاو نەفرین لە دایك و باوکی خۆی بکات، وە لە گێڕانەوەی پێشەوا (مسلم)دا هاتووە:(أنْ يَشْتِمَ رَجلٌ والِدَيهِ)واتا: پیاوێك جنێو بە دایك و باوکی بدات، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ جا چۆن پیاو جنێو بە دایك و باوکی خۆی دەدات و نەفرینیان لێدەکات؟ فەرمووی: (يَسُب الرَّجلُ أبا الرَّجلِ، فيَسبُّ أباهُ أو يسبُ أمَهُ)[2] واتا: جنێودان و نەفرین کردن لە دایك و باوك ئەوەیە: کەسێك جنێو بە دایك و باوکی خەڵکی بڵێت وە یان نەفرینیان لێبکات، ئەویش بەو هۆیەوە جنێو بە دایك و باوکی بداتەوە و نەفرینیان لێبکات.

کەواتا: هەرشتێك دڵی دایك و باوك ئازار بدات، وە یان ببێتە هۆی زیان پێگەیاندن و ئازار دانیان" ئەوە تاوانێکی گەورەیە و حەرامە.

## خودای پەروەردگار تۆڵەی ئازاردانی دایك و باوك پێشدەخات

پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (كُلُّ الذُّنوبِ يُؤَخِرُ اللهُ ما شاءَ مِنْها إلى يَومِ القِيامَةِ إلا

١ـ الإسراء: ٢٣

٢ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

عُقُوقَ الْوالِدَينِ فَإِنَّ اللهَ تَعالى يُعَجِّلُهُ لِصاحِبِه في الْحَياةِ قَبلَ الْمَماتِ)[1]واتا: هەموو تاوانێك خودای پەروەردگار تۆڵە و سزایەکە دوا دەخات بۆ ڕۆژی قیامەت، تەنها ئازاردانی دایك و باوك نەبێت، خودای پەروەردگار پەلە لە تۆڵە و سزایەکەی دەکات و پێش مردن تۆڵە لە ئەنجام دەرەکەی دەکاتەوە.

وە لە گێڕانەوەی پێشەوا بوخاریدا: (كُلُّ ذُنُوبٍ يُؤَخِّرُ اللهُ مِنْهَا مَا شَاءَ إِلَى يَوْمِ الْقِيَامَةِ إِلَّا الْبَغْيُ وَعُقُوقُ الْوَالِدَيْنِ)واتا: واتا: هەموو تاوانێك خودای پەروەردگار تۆڵە و سزایەکە دوا دەخات بۆ ڕۆژی قیامەت، تەنها ستەم و سنور بەزاندن و ئازاردانی دایك و باوك نەبێت، خودای پەروەردگار پەلە لە تۆڵە و سزایەکەیان دەکات و پێش مردن تۆڵە ئەنجامدەرەکانیان دەکاتەوە.

جا بەشێك لە زانایان دەفەرموون: تۆڵە کردنەوەکە بەوە دەبێت کە خودای گەورە منداڵی خراپی پێدەدات و بەهەمان شێوە ئەوانیش ئازاری دەدەنەوە، شێخ محمد حسان لە کتێبی دواین ڕوداوەکانی کۆتایی جیهان ـ أحداث النهاية ـ دا دوو بەسەر هاتی ڕاستەقینەمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت:

١ـ ڕۆژێکیان لە گۆڕەپانێکی گشتیدا بینیم کۆمەڵێك خەڵك کۆبوبونەوە و غەڵبە غەڵب پەیدا بوبو، لە نێوانیاندا پیرە مێردێك دانیشتبو و دەگریا، منیش ڕاوەستام و پرسیارم کرد: ئەمە چیە؟ چی ڕویداوە؟ گووتیان ئەم کوڕە- ئاماژەیان کرد بۆ کوڕێك کە دانیشتبوو- زللەیەکی لەو پیاوە پیرەیدا، منیش گووتم: پەنا دەگرم بە خودا!! ئینجا ویستمان لە کوڕەکە بدەینەوە، پیاوە پیرەکە گووتی: نەخێر وازی لێبهێنن لێی مەدەن،گووتمان: بۆ؟ گووتی: ئەوە کوڕمە...!! گووتمان: جا خراپتر، ئەوە کوڕێکی سەرپێچی کارە تۆی ڕەنجاندووە پێویستە تەمبێ بکرێت، گووتی: نەخێر

١ـ پێشەوا حاکم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا بوخاری لە أدب المفرد دا گێڕاویەتەوە.

لێی مەدەن، چونکە ئەوە قەرزێکی خۆم بوو وەرم گرتەوە، چونکە من ماوەیەك پێش ئێستا لە هەمان جێگا زللەم لە ڕوی باوکی خۆم دا!! سبحان الله!!

٢ـ کوڕێك باوکەکەی بە ڕاکێشان لە ماڵ بەدەرێ کرد، کاتێك دەگەنە تەنیشت دەرگاکە باوکەکە دەڵێت: کوڕم بەسە هیچی تر ڕام مەکێشە و لێرە جێم بهێڵە، ئینجا دەستی بە گریان کرد و بە کوڕەکەی گووت: سوێند بەخودا ئەی کوڕی خۆم من پێش زیاتر لە سی ساڵ باوکی خۆم تەنها هەتا لای بن دەرگاکە ڕاکێشا.[1] سبحان الله ئەویش قەرزەکەی وەرگرتەوە. پێغەمبەری خودا فەرموویەتی: (بَرُّوا آباءَكُم تَبَرُّكُم أَبْناؤُكُم وعِفُّوا تَعِفَ نِساؤُكُم)[2]واتا: چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوکتان" منداڵەکانتان لەگەڵتاندا چاك دەبن، وە داوێنپاك بن" خێزانەکانتان داوێنپاك دەبن.

جا خوێنەری بەڕێز موسڵمانی خۆشەویست: ئاگاداری دڵی دایك و باوکت بە، هەرگیزاو هەرگیز بیانو بە دەست خۆت مەدە بۆ ئەوەی دڵی دایك و باوکت بڕەنجێنیت، چونکە هیچ بیانوییەك نیە بۆ ڕەنجاندنی دڵی دایك و باوك، وەرن با بەیەکەوە هەڵوەستەیەك بکەین بۆ بەسەرهاتی جورەیج، ئەو کات بڕیار بدە ئاخۆ هیچ بیانوییەك هەیە بۆ ڕەنجاندنی دڵی باوك و دایك:

ابو هریرە‌رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە‌ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لَمْ يَتَكَلَّمْ فِي الْمَهْدِ ، إِلَّا ثَلَاثَةٌ ـ عِيسَى ابْنُ مَرْيَمَ ـ وَصَاحِبُ جُرَيْجٍ ، وَكَانَ جُرَيْجٌ رَجُلًا عَابِدًا، فَاتَّخَذَ صَوْمَعَةً، فَكَانَ فِيهَا فَأَتَتْهُ أُمُّهُ ، وَهُوَ يُصَلِّي ، فَقَالَتْ : يَا جُرَيْجُ ، فَقَالَ : يَا رَبِّ أُمِّي وَصَلَاتِي !! فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِهِ ، فَانْصَرَفَتْ، فَلَمَّا كَانَ مِنْ الْغَدِ ، أَتَتْهُ ، وَهُوَ يُصَلِّي، فَقَالَتْ: يَـا جُرَيْجُ

١ـ دوایین ڕوداوەکانی کۆتایی جیهان: ٢٩٦

٢ـ پێشەوا طبرانی گێڕاویەتەوە.

فَقَالَ: يَا رَبِّ أُمِّي وَصَلَاتِي !! ، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِهِ ، فَانْصَرَفَتْ ، فَلَمَّا كَانَ مِنَ الْغَدِ ، أَتَتْهُ ، وَهُوَ يُصَلِّي ، فَقَالَتْ: يَا جُرَيْجُ ، فَقَالَ : أَيْ رَبِّ أُمِّي وَصَلَاتِي !، فَأَقْبَلَ عَلَى صَلَاتِهِ ، فَقَالَتْ: اللَّهُمَّ: لَا تُمِتْهُ ، حَتَّى يَنْظُرَ إِلَى وُجُوهِ الْمُومِسَاتِ ! فَتَذَاكَـرَ بَنُو إِسْرَائِيلَ ، جُرَيْجًا ، وَعِبَادَتَهُ ، وَكَانَتْ امْرَأَةٌ بَغِيٌّ يُتَمَثَّلُ بِحُسْنِهَا ، فَقَالَتْ : إِنْ شِئْتُمْ لَأَفْتِنَنَّهُ لَكُمْ ، قَالَ : فَتَعَرَّضَتْ لَهُ، فَلَمْ يَلْتَفِتْ إِلَيْهَا ، فَأَتَتْ رَاعِيًا كَانَ يَأْوِي إِلَى صَوْمَعَتِهِ ، فَأَمْكَنَتْهُ مِنْ نَفْسِهَا ، فَوَقَعَ عَلَيْهَا، فَحَمَلَتْ ، فَلَمَّا وَلَدَتْ ، قَالَتْ : هُوَ مِنْ جُرَيْجٍ ، فَأَتَوْهُ ، فَاسْتَنْزَلُوهُ وَهَدَمُوا صَوْمَعَتَهُ، وَجَعَلُوا يَضْرِبُونَهُ ، فَقَالَ: مَا شَأْنُكُمْ ؟؟ ، قَالُوا: زَنَيْتَ بِهَذِهِ الْبَغِيِّ ، فَوَلَدَتْ مِنْكَ!! ، فَقَالَ: أَيْنَ الصَّبِيُّ ؟؟، فَجَاءُوا بِهِ ، فَقَالَ : دَعُونِي حَتَّى أُصَلِّيَ ، فَصَلَّى ، فَلَمَّا انْصَرَفَ، أَتَى الصَّبِيَّ، فَطَعَنَ فِي بَطْنِهِ ، وَقَالَ : يَا غُلَامُ ، مَنْ أَبُوكَ ؟؟، قَالَ: فُلَانٌ الرَّاعِي، قَالَ: فَأَقْبَلُوا عَلَى جُرَيْجٍ يُقَبِّلُونَهُ وَيَتَمَسَّحُونَ بِهِ، وَقَالُوا: نَبْنِي لَكَ صَوْمَعَتَكَ مِنْ ذَهَبٍ، قَالَ: لَاأَعِيدُوهَا مِنْ طِينٍ كَمَا كَانَتْ ، فَفَعَلُوا )[1]واتا: هیچ کەسێك بە منداڵی قسەی نەکردووە تەنها سێ کەس نەبێت: ئەوانیش عیسای کوڕی مەریەم وە هاوڕێکەی جورەیج، جورەیج پیاوێکی خوا پەرست بوو، خۆی یەکلایی کربۆوە بۆ خودا پەرستی و دور لە چاوی خەڵك خەڵوەتگەیەکی دروست کردبوو ە تیایدا خەریکی خوا پەرستی بوو، ڕۆژێکیان نوێژی دەکرد لەو کاتەدا دایکی هات و بانگی کرد: ئەی جورەیج، جورەیجیش گووتی: ئەی خودایە من لە نوێژدام نوێژەکەم ببڕم، یان وەڵامی دایکم نەدەمەوە!! بڕیاریدا کە نوێژەکەی نەبڕێت و وەڵامی دایکی نەدایەوە، دایکی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، ڕۆژی دواتر دایکی هاتەوە و بانگی جورەیجی کرد، بەهەمان شێوەی ڕۆژی پێشو جورەیج لە نوێژدا بوو، لە دڵی خۆیدا گووتی: خودایە نوێژەکەم ببڕم یان وەڵامی دایکم نەدەمەوە؟! بەهەمان شێوەی ڕۆژی ڕابـــردوو بڕیاریدا لە نوێژەکەی بەردەوام بێت و وەڵامی دایکی نەداتەوە،

١ـ پێشەوایان: بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

دایکیشی گەڕایەوە بۆ ماڵەوە، بۆ ڕۆژی دواتر دیسان دایکی هاتەوە بۆ لای جورەیج، دیسان جورەیج نوێژی دەکرد، دایکی بانگی کرد: ئەی جورەیج، بەهەمان شێوە جورەیج لە دڵی خۆیدا گووتی: ئایا نوێژەکەم ببڕم یان وەڵامی دایکم نەدەمەوە؟! دیسان بڕیاریدا وەڵامی دایکی نەداتەوە و لەسەر نوێژەکەی بەردەوام بێت، دایکیشی دڵی گەرم بوو و گووتی: خودایە ئەم کوڕەم مەمرێنە هەتاکو سەیری ڕوی ئافرەتە داوێن پیسەکان دەکات. خودای پەروەردگاریش دووعای دایکی جورەیجی گیرا کرد: بەنی ئیسرائیل باسی خواپەرستی جورەیجیان دەکرد، ئافرەتێکی داوێن پیس هەبوو گووتی: ئەگەر دەتانهەوێت توشی فیتنەی دەکەم، جا ئەو ئافرەتە داوێن پیسە چوو بۆ لای جورەیج و خۆی بۆ ڕازاندەوە و خۆی پێشکەش کرد، بەڵام جورەیج تەنانەت ئاوڕیشی لێنەدایەوە، پاشان ئافرەتەکە چوو بۆلای شوانێك کە سەردانی خەڵوەتگەکەی دەکرد، توانی شوانەکە لە خشتە بەرێت و توشی زینای کرد و بەهۆی ئەو زینایەوە منداڵی بەسك کەوت، کاتێك منداڵەکەی بوو گووتی: ئەو منداڵەم لە جورەیجی خواپەرست بووە!! ئەوانیش هاتن بۆلای جورەیج و لە خەڵوەتگەکەی دەریانهێنا و خەڵوەتگەکەیان ڕوخاند و دەستیان کرد بە لێدانی، ئەویش گووتی: چی بووە؟ گووتیان: تۆ داوێن پیسیت لەگەڵ ئەو ئافرەتە کردووە و ئێستاش منداڵی لە تۆ بووە!! ئەویش گووتی: منداڵەکەم بۆ بهێنن، ئەوانیش منداڵەکەیان بۆ هێنا، گووتی: لێم گەڕێن تاکو نوێژ بکەم، پاشان جورەیج نوێژی کرد، کە لە نوێژەکەی بویەوە چو بۆ لای منداڵەکەو لە سکی منداڵەکەی داو گووتی: ئەی منداڵ کێ باوکی تۆیە؟ ئەویش هاتە زمان و گووتی: فڵان شوانە..

جا کاتێك خەڵکەکە ئەوەیان بینی ڕویان کردە جورەیج و ماچیان دەکرد و بۆ پیرۆز بوون دەستیان پێدا دەهێنا و گووتیان: ڕێگامان بدە خەڵوەتگەکەت لە ئاڵتون بۆ دروست بکەینەوە، ئەویش گووتی: نەخێر، هەروەکو خۆی چۆن پێشتر لە قوڕ دروست کرابوو ئاوا لە قوڕ بۆم دروست بکەنەوە!!

جا خوێنەری بەڕێز بڕوانە: بیانوەکەی جورەیج تا ڕاددەیەك شەرعیش بوو، چونکە لە نوێژدا بوو کاتێك دایکی بانگی دەکرد، بەڵام لە هەمان کاتیشدا خودای پەروەردگار بیانوەکەی وەر نەگرت و دوعای دایکی لێی گیرا کرد و بەم فیتنە تاقی کردەوە، ئایا تۆ چۆن بیانوو بەدەست خۆت دەدەیت بۆ ئەوەی دڵی دایکت بڕەنجێنیت، چۆن خۆشیەکانی دوونیا و دەورو بەرت پێش دەخەیت بەسەر دایکتدا؟؟!!

## مافەکانی دایك و باوك لەسەر منداڵ

خودای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەیﷺ لە قورئانی پیرۆز و فەرمودە صەحیحەکاندا چەند مافێکیان بۆ دایك و باوك داناوە لەسەر منداڵ، کە پێویستە لەسەر منداڵ ئەو مافانە بە دایك و باوکی بدات، جا هەر کاتێك منداڵ ئەو مافانەی بە دایك و باوك دا" ئەو سەربەرزی دونیاو قیامەت دەبێت، ئەوانەی خوارەوەش مافی دایك و باوکە لەسەر منداڵ:

یەکەم/ چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکدا: ئاینی پیرۆزی ئیسلام واجبی کردووە لەسەر کوڕ و کچ کە چاکەکار بن لەگەڵ دایك و باوك دا، خودای پەروەردگار دفەرمووێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ حُسْناً﴾[1] واتا: ئێمە فەرمانمان داوە بە ئادەمیزاد کە چاکەکار و چاك ڕەفتار بێت لەگەڵ دایك و باوکیدا. وە گەورەمان عبدالله ی کوڕی مەسعودرَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەفـــەرمووێت: پرسیـــارم لە پێغەمبەری خودا کرد: (أَيُّ الْعَمَلِ أَحَبُّ إِلَى اللهِ تَعَالَى؟) واتا: چ کردەوەیەك زۆر لای خودای گەورە خۆشەویستە؟ فەرمووی: (الصَّلاةُ عَلَى وَقْتِهَا)واتا: نوێژ کردن لە کاتی خۆیدا، منیش گووتم: پاشان چ کارێك؟ فەرمووی: (بِرُّ الْوالِدَيْنِ)[2] واتا: چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوك دا. کەواتا چاکە کردن لەگەڵ دایك و باوکدا هەم ئەرکە، وە هەم پاداشتێکی گەورەشی هەیە.

١ـ العنکبوت: ٨

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

ئینجا بزانە لە کاتی چاکە کردندا دایك بە پێش باوك دەخرێت، گەورەمان ابوهریرە رضي الله عنه دەفەرموێت: پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خوداﷺ کردوو گووتی: (یارسولَ الله، مَنْ أَحقُّ النّاسِ بِحُسنِ صَحابَتِي؟)واتا:ئەی پێغەمبەری خوداﷺکێ لەهەموو کەس لە پێشترە بۆ ئەوەی چاکەی لەگەڵدا بکەم؟ فەرمووی: (أُمُّكَ)واتا:دایکت، گووتی پاشان کێ؟ فەرمووی: (أُمُّكَ) واتا: دایکت، گووتی: پاشان کێ؟ فەرمووی:(أُمُّكَ)واتا:دایکت، گووتی: پاشان کێ؟ فەرمووی: (أَبوكَ)[1]واتا: باوکت.

جا ئەم پێشخستنەی دایکیش بەسەر باوکدا لەبەر ئەوەیە کە دایك ئەزیەت و ئازاری زیاتری بینیوە لە باوك بۆ پێگەیاندنی منداڵ، دایك منداڵی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ لە سکی دا هەڵگرتووە، پاشان ئازاری منداڵ بوونی بینیوە، پاشانیش شیری پێداوە و بەشداری بەخێو کردن و پەروەردەکردنیشی کردووە، بەڵام باوك تەنها لە پەروەردەکردندا بەشداری کردووە، لەوانی تر بەشدار نەبووە، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّيْنَا الْإِنسَانَ بِوَالِدَيْهِ إِحْسَانًا حَمَلَتْهُ أُمُّهُ كُرْهًا وَوَضَعَتْهُ كُرْهًا وَحَمْلُهُ وَفِصَالُهُ ثَلَاثُونَ شَهْرًا﴾[2]واتا: فەرمانمان کردووە بە ئادەمیزاد کە لەگەڵ دایك و باوکیدا چاکەکار بێت، دایکی زۆر بە ئێش و ئازارەوە لە سکیدا هەڵیگرتووە، پاشان بە ئێش و ئازار دیناوە و بوویەتی،وە ماوەی لە سکدابوون و شیر خواردنییَشی دوو ساڵە.

دووەم/ گوێڕایەڵی کردنیان لە هەموو کار و بارێکی ڕێگا پێدراوی شەرعی: ابو درداء دەفەرموێت: (أَوصانِي رَسولُ اللهِ ﷺبِتِسعٍ) واتا: پێغەمبەری خوداﷺ ئامۆژگاری کردم و وەصیەتی لێکردم بە نۆ شت... یەکێك لەوانە فەرمووی: (وأَطِعْ والِدَيكَ وَإِنْ أَمَـــــراكَ أَنْ

١- پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢- الأحقاف: ١٥

تَخرُجَ مِنْ دُنياكَ، فاخرُج لَهُما..)[1]واتا: گوێڕایەڵی دایك و باوكت بكە" هەتا ئەگـــــەر فەرمانیشت پێبكەن دەست لە دوونیاكەت هەڵبگریت" ئەوە دەستی لێهەڵبگرە.

كەواتا: بۆ هەر شتێك دایك و باوك فەرمان بە منداڵ بكەن و لە سنوری شەرع نەچێتە دەرەوە ئەوە پێویستە لەسەر منداڵ جێبەجێی بكات، بەڵام ئەگەر لە سنوری شەرع چویە دەرەوە ئەوەی گوێڕایەڵیان ناكرێت، چونكە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (لا طاعَةَ لِمَخلُوقٍ في معصِيَّةِ الله عَزَّوَجلَّ)[2]واتا: هیچ گوێڕایەڵیەكی دروستكراوەكان و بونەوەرەكان ناكرێت كە سەرپێچی دروستكاری تێدابێت. وە خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَإِن جَاهَدَاكَ عَلَى أَن تُشْرِكَ بِي مَا لَيْسَ لَكَ بِهِ عِلْمٌ فَلَا تُطِعْهُمَا وَصَاحِبْهُمَا فِي الدُّنْيَا مَعْرُوفًا﴾[3]واتا: ئەگەر دایك و باوكت هەوڵ و كۆششیان لەگەڵ كردی بۆ ئەوەی بەبێ زانیاری هاوەڵ بۆ من بڕیار بدەیت" ئەوە گوێڕایەڵیان مەكە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لە دوونیادا خزمەتیان بكە و لەگەڵیاندا چاك و باشبە.

جا ئەگەر سەیری پێغەمبەران و هاوەڵان بكەین بەڕاستی زۆر بە جوانی و ڕێك و پێكی ئەم ئایەتەیان جێبەجێ كردووە، بۆنمونە: ئیبراهیم پێغەمبەر علیه السلام زۆر هەوڵیدا لەگەڵ باوكیدا بۆ ئەوەی بڕوا بە خودای تاك و تەنیا بهێنێت، بەڵام باوكی هەموو جارێك زۆر بە توندی بەرەو ڕوی دەبویەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئیبراهیم علیه السلام بێ ڕێزی بە باوكی نەدەكرد، بەڵكو هەر باوكی خۆم بانگی دەكرد و دەیگووت: ﴿إِذْ قَالَ لِأَبِيهِ يَا أَبَتِ لِمَ تَعْبُدُ مَا لَا يَسْمَعُ وَلَا يُبْصِرُ وَلَا يُغْنِي عَنكَ شَيْئًا﴾[4]واتا: ئیبراهیم بە باوكی گووت: ئەی باوكی خۆم تۆ بۆ شتێك دەپەرستی كـــــە

---

١ـ پێشەوا بوخاری لە (أدب المفرد) دا گێڕاویەتەوە و (حسن)

٢ـ پێشەوا احمد لە مسندەكەیدا گێڕاویەتەوە.

٣ـ لقمان: ١٥

٤ـ مریم: ٤٢

نە دەبیستێت و نە دەبینێت و نە هیچ سودێکیشت پێدەگەیەنێت، کەچی باوکی لە وەڵامیدا دەیگووت: ﴿قَالَ أَرَاغِبٌ أَنتَ عَنْ آلِهَتِي يَا إِبْرَاهِيمُ لَئِن لَّمْ تَنتَهِ لَأَرْجُمَنَّكَ وَاهْجُرْنِي مَلِيًّا﴾[1] واتا: ئەی ئیبراهیم علیه السلام تۆ بۆ ئەوەندە بێزاری لە خوداکانی من، ئەگەر وازنەهێنیت ئەوە بێگومان بەردبارانت دەکەم، لەبەر ئەوە بڕۆ ونبە لەبەر چاوانم و هەر نەتبینمەوە. کەچی لەگەڵ ئەوەشدا ئیبراهیم علیه السلام زۆر بە ڕێزەوە مامەڵەی لەگەڵ باوکیدا کردوو گووتی: ﴿قَالَ سَلَامٌ عَلَيْكَ سَأَسْتَغْفِرُ لَكَ رَبِّي إِنَّهُ كَانَ بِي حَفِيًّا﴾[2]واتا: سلاوت لێبێت وا من دەڕۆم، بەڵام بەردەوام داوای هیدایەت و لێخۆشبونت بۆ دەکەم لە پەروەردگارم، چونکە ئەو زاتێکە زۆر منی خۆشدەوێت و ڕێزم دەگرێت.

وە بەهەمان شێوەی ئیبراهیم علیه السلام هاوەڵی بەڕێزیش ابو هریرەش رضي الله عنه نمونەیەکی بەرزە بۆ ئێمە، ابو هریرە رضي الله عنه موسڵمان بوبوو،بەڵام دایکی موسڵمان نەبوبوو، لەبەر ئەوە ابوهریرە رضي الله عنه زۆر هەوڵی لەگەڵ دایکیدا دەدا بۆ ئەوەی موسڵمان ببێت، کەچی دایکی وەڵامی نەدەدایەوە، هەتا ڕۆژێکیان ابوهریرە رضي الله عنه بانگی دایکی کرد بۆ ئیسلام، کەچی دایکی بە توندی وەڵامی دایەوە و قسەی ناشیرینشی بە پێغەمبەری خودا ﷺ گووت، بەڵام ابوهریە رضي الله عنه هیچ بێڕێزیەکی پێنەکرد و بە گریانەوە هات بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و فەرمووی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ من بەردەوام بانگی دایکم دەکەم بۆ ئیسلام بەڵام ئەو وەڵامم ناداتەوە، ئەمڕۆش بانگهێشتم کرد بۆ ئیسلام کەچی ئەو قسەی ناشیرینی بە تۆش گووت، لەبەر ئەوە داوات لێدەکەم دووعای بۆ بکەی خودا هیدایەتی بدات و موسڵمان ببێت، پێغەمبەریش ﷺ دووعای کرد و فەرمووی: (اللهُمَّ اهدِ أُمَّ أبي هريرةَ)واتا: خودایە هیدایەتی دایکی ابوهریرە بدەیت. ابوهریرە رضي الله عنه دەفـــــەرموێت:

---

١- مريم: ٤٦

٢- مريم: ٤٧

منیش بە دڵخۆشیەوە گەڕامەوە بۆ لای دایکم بۆ ئەوەی مژدەی پێبدەم، کە گەیشتمەوە لای دەرگای ماڵمان بینیم بەر دەرگاکە تەڕ بوو، کاتێك دایکم گوێی لە دەنگی پێکانم بوو گووتی: لە جێگای خۆت بوەستە ئەی ابو هریرە، منیش وەستام و گوێم لە چۆڕەچۆڕی ئاو بوو، دایکم خۆی شۆرد و خۆی پۆشتە کرد و دەرگای کردەوە و پاشان گووتی: (أشهد أن لا إله إلا الله، وأشهد أنَّ محمداً عبده و رسوله) منیش خێرا گەڕامەوە بۆ لای پێغەمبەرﷺ و لە خۆشیاندا دەگریام و گووتم: مژدەت لێبێت ئەی پێغەمبەری خوداﷺ خودای گەورە دووعاکەی گیرا کردیت و هیدایەتی دایکمی دا، پێغەمبەریشﷺ سوپاسی خودای کرد و هەندێ قسەی خێری کرد.[1]

## گوێڕایەڵی کردنی دایك و باوك بە دەستهێنانی سەرفرازیە

پێشتر گووتمان یەکێك لە مافەکانی دایك و باوك گوێڕایەڵی کردنیانە، بەڵام گوێڕایەڵی کردنیان جگە لەوەی کە مافە بەڵام بەدەستهێنانی سەرفرازی و سەربەرزیشە، چونکە ئەستەمە ئەگەر دایك و باوك فەرمانێك بە جگەرگۆشەکەیان بکەن کە زیانی بۆی هەبێت، خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا بەسەرهاتی دوو کوڕمان بۆ باس دەکات کە لەم دوو بەسەرهاتەدا بە شێوەیەکی کردەیی جێگیری دەکات کە سەرفرازی لە گوێڕایەڵی دایك و باوك دایە، ئەو دوو بەسەرهاتەش بەسەرهاتی کوڕەکەی نوح و کوڕەکەی ئیبراهیمن علیهما السلام:

یەکەم/ بەسەرهاتی کوڕەکەی نوح: کوڕەکەی نوح بڕوای بە خودای تاقانە نەهێناو شوێن باوکی نەکەوت و گوێڕایەڵی باوکی نەکرد، جا کاتێك خودای پەروەردگار تۆفانەکەی هەڵستاند کوڕەکەی نوح علیه السلام لە شوێنێکی چەپەکدا گیری خواردبوو، ئەویش دڵی بۆی سوتاو بانگی کرد: ﴿يَا بُنَيَّ ارْكَب مَّعَنَا وَلَا تَكُن مَّعَ الْكَافِرِينَ﴾[2] ئەی کوڕی خۆم وەرە لەگەڵ ئێمەدا سەرکەوە

---

١- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢- هود: ٤٢

بۆ ناو کەشتیەکەو لەگەڵ بێباوەڕاندا مەبە، کەچی کوڕەکەی گوێڕایەڵی نەکرد و گووتی: ﴿قَالَ سَآوِي إِلَى جَبَلٍ يَعْصِمُنِي مِنَ الْمَاءِ﴾پەنا دەبەم بۆ ئەو چیایە و لەو تۆفان و ئاوە دەمپارێزێت، نوحیش فەرمووی: ﴿قَالَ لَا عَاصِمَ الْيَوْمَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ إِلَّا مَن رَّحِمَ﴾ ئەمڕۆ هیچ پەناگەیەك نیە و هیچ شتێك نیە کەس بپارێزێت لە تورەیی و خەشمی خودا، مەگەر کەسێك خودا خۆی ڕەحمی پێبکات، بەڵام ئەم کوڕە لاسارە هەر بەگوێی باوکی نەکرد و ﴿وَحَالَ بَيْنَهُمَا الْمَوْجُ فَكَانَ مِنَ الْمُغْرَقِينَ﴾[1] دوای ئەم وتوێژە شەپۆلێکی ئاو لە کوڕەکەیدا و خنکا و بە بێباوەڕی مرد.

٢ـ بەسەرهاتی کوڕەکەی ئیبراهیم علیهما السلام، ئیبراهیمی پێغەمبەر علیه السلام هەتا تەمەنی سەد و دە ساڵی خودای پەروەردگار منداڵی پێنەدا، دوای ئەو هەموو تەمەنە زۆرە خودای پەروەردگار کوڕێکی پێدا، جا کاتێك کوڕەکەی تەمەنی بوو بە چەند ساڵێك ـ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: سیانزە ساڵ بووە، بەشێکی تر دەفەرموون: بلۆغی بوبو[2] ـ خودای پەروەردگار فەرمانی پێکرد کە منداڵەکەی سەر ببڕێت و بیکات بە قوربانی بۆ خودای گەورە، ئیبراهیمیش بۆ ئەم کارە قورس و گرانە پرسی بە کوڕەکەی کرد کە ناوی ئیسماعیل بوو و فەرمووی: ﴿قَالَ يَا بُنَيَّ إِنِّي أَرَى فِي الْمَنَامِ أَنِّي أَذْبَحُكَ فَانظُرْ مَاذَا تَرَى﴾ ئەی کوڕی خۆم بێگومان من لە خەودا بینیم و ئاگادرایان کردمەوە کە تۆ سەر ببڕم، جا با بزانم تۆ ڕات چۆنە و دەڵێی چی؟ ئەم کوڕە لە خواترس و چاکەکارەش فەرمووی: ﴿قَالَ يَا أَبَتِ افْعَلْ مَا تُؤْمَرُ سَتَجِدُنِي إِن شَاءَ اللَّهُ مِنَ الصَّابِرِينَ﴾[2] ئەی باوکی خۆم چ فەرمانێکت پێکراوە جێبەجێی بکە، منیش ئەگەر خودا بیهەوێت لە دان بەخۆیا گران دەبم، جا کاتێك هەردووکیـــان تەسلیمی فـــەرمانی خودا بوون و ئامادەبوون بۆ ئەنجامدانی فەرمانی خودا، خودای پەروەردگار بانگی ئیبراهیمی کـردو فەرمووی:

---

١ـ هود: ٤٣

٢ـ الصافات: ١٠٢

﴿قَدْ صَدَّقْتَ الرُّؤْيَا إِنَّا كَذَلِكَ نَجْزِي الْمُحْسِنِينَ (١٠٥) إِنَّ هَذَا لَهُوَ الْبَلَاءُ الْمُبِينُ(١٠٦) وَفَدَيْنَاهُ بِذِبْحٍ عَظِيمٍ (١٠٧) وَتَرَكْنَا عَلَيْهِ فِي الْآخِرِينَ(١٠٨) سَلَامٌ عَلَى إِبْرَاهِيمَ﴾[1] بێگومان ئەو فەرمانەی لە خەودا پێمان کردیت تۆ بە باشی جێبەجێت کرد ئێمەش ئاوا بە باشی پاداشتی چاکەکاران دەدەینەوە، بەڕاستی ئەوە تاقیکردنەوەیەکی گەورە و گران بوو، وە ئێمە ئەوە بەرانێکی گەورەمان بۆ ناردی و لە جیاتی ئیسماعیل دەیکەینە قوربانی، وە ئەم بەسەرهات و گوێڕایەڵیەت بۆ خودای گەورە لە ناو گەلاندا دەهێڵینەوە، سڵاو درودت لەسەر بێت ئەی ئیبراهیم.

جا ئەگەر بێت و سەیری ئەم دوو بەسەرهاتە قورئانیە بکەین دەبینین:

١ـ کوڕەکەی نوح بۆ ڕزگار بوون بە قسەی باوکی نەکرد و گوێڕایەڵی نەکرد لە دەرئەنجامدا تێداچوو، بەڵام ئیسماعیل بۆ مردن و سەر بڕین گوێڕایەڵی باوکی کرد لە دەرئەنجامدا ڕزگاری بوو،

٢ـ خودای پەروەردگار بەسەرهاتی هەردووکیانی لە قورئاندا تۆمار کرد و هەردوکیان لە ناو گەلاندا مانەوە، کوڕەکەی نوح لەگەڵ باوکیدا هەتا هەتایە وەك نمونەیەکی ناشیرین دەمێنێتەوە، بەڵام ئیسماعیل لەگەڵ باوکیدا بۆ هەتاهەتایە وەك نمونەیەکی بەرز و جوان دەمێنێتەوە، کەواتا گوێڕایەڵی کردنی دایك و باوك سەرفرازیە!!

سێهەم/ یارمەتی دانی دایك و باوك لە کاتی پێویستیداو دابین کردنی بژێوی ژیان بۆیان:
یەکێکی تر لە مافەکانی دایك و باوك لەسەر منداڵ ئەوەیە" هەر کاتێك باوك و دایك پێویستیەکیان بە منداڵ هەبوو ئەو بە خۆشحالی و بێ دوو دڵی پێویستیەکەیان جێبەجێ بکات، وە هەر کاتێك نەبوو بون بژێویان بۆ دابین بکات، پیاوێك پرسیاری لە پێغەمبەری خودایﷺکردو

١ـ الصافات: ١٠٥ـ ١٠٩

گووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺمن ماڵ و منداڵ و سەروەت وسامانم هەیە، باوکیشم پێویستی بە سامانی من هەیە چی بکەم؟ پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: (أنتَ وَمالُكَ لِوالِدِكَ، إنَّ أَولادَكُم مِن كَسبِكُم، فكُلُوا مِن كَسبِ أولادِكُم)[1] واتا: تۆش و ماڵەکەشت هی باوکتن، بێگوومان منداڵەکانتان لە بەرهەمی خۆتانن، ئێوەش لەبەرهەمی خۆتان بخۆن. وە لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنّ أطيبَ ما أكَلَ الرَّجُلُ مِن كَسبِهِ، وإنَّ وَلَدَهُ مِنْ كَسبِهِ، فكُلُوا مِنْ أموالِهِم)[2] واتا: پاکترین شتێك کە پیاو دەیخوات بەرو بومی دەستی خۆیەتی، بێگومـــــان منداڵیش لە بەرو بومی دایك و باوك خۆیانە، لەبەر ئەوە لە ماڵی منداڵەکانتان بخۆن.

جا بە پشتیوانی ئەم فەرموودانە کۆدەنگی زانایان لەسەر ئەوەیە کە واجبە لەسەر منداڵ لەکاتی پێویستیدا بژێوی دایك و باوکیان دابین بکەن.[3]

چوارەم/ دووعای خێر بۆ کردنیان: خودای پەروەردگار فێرمان دەکات و تێمان دەگەیەنێت کە پێویستە لەسەرمان دووعای خێر بۆ دایك وباوکمان بکەین، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿ وَقُل رَّبِّ ارْحَمْهُمَا كَمَا رَبَّيَانِي صَغِيرًا﴾[4] واتا: دووعا بۆ دایك و باوکت بکە و بڵێ: پەروەردگارا ڕەحم بە دایك و باوکم بکەو لەگەڵیاندا بە سۆزبە هەرودکو چۆن ئەوان بە سۆزەوە بە منداڵی منیان پەروەردە کرد. وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إذا مـــاتَ ابنُ آدمَ، انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِنْ ثَلاثٍ : صَدَقَةٍ جارِيَةٍ، أو عِلمٍ يَنتَفِعُ بِهِ، أو وَلَدٍ صالحٍ يَدعُو لَهُ)[5] واتـــا:

١ـ پێشەوایان ابوداود و ابن ماجە و احمد گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوایان ابوداود و ابن ماجە و احمد گێڕاویانەتەوە.

٣ـ مغني المحتاج: ٣/ ٤٤١

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٥ـ الإسراء: ٢٤

کاتێك ئادەمیزاد دەمرێت کردەوەکانی لێی دەپچڕێن تەنها لە سێ شتەوە نەبێت: خێرێکی ماوەو بەردەوام، زانستێك کە بڵاویکردبێتەوە و بەهۆیەوە سودی پێبگات، وە یان منداڵێکی باش و چاك کە دووعای خێری بۆ بکات. هەر لەبەر ئەوە هەر کاتێك ابوهریرەرضي الله عنهبیوستبایە لە ماڵ بچێتە دەرەوە دەچوە بەر دەرگای دایکی و دەیفەرموو: (السَّلامُ عَلَيكِ يا أُمَّاه وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ، فَتَقُولَ: وَعَليكَ السَّلامُ يا وَلَدِي وَرَحْمَةُ اللهِ وَبَرَكاتُهُ، فَيَقُولَ: رَحِمَكِ اللهُ كَما رَبَّيْتِنِي صَغِيراً، فَتَقولَ: رَحِمَكَ اللهُ كَما بَرَرْتَنِي كَبِيراً)واتا: سڵاو و سۆز و بەرەکەتی خودات لێبێت ئەی دایکی خۆم، ئەویش دەیفەرموو: سڵاو و سۆز و بەرەکەتی خودا لە تۆش بێت ئەی کوڕی شیرینم، ئینجا ابوهریرەرضي الله عنه دووعای بۆ دایکی دەکرد و دەیفەرموو: خودا لەگەڵت بە سۆز و بە ڕەحمەت بێت ئەی دایکی خۆم هەروەك چۆن ئاوا بە باشی بە منداڵی پەروەردەت کردم، دایکیشی دەیفەرموو: خودا لەگەڵت بە سۆز و بە ڕەحمەت بێت ئەی کوڕی خۆم هەروەك چۆن بە پیری ئاوا لەگەڵمدا باش بوویت!!

پێنجەم/ پرس و ڕاوێژ پێکردنیان و وەرگرتنی ڕایان لە کارو بارەکانداو و گوێڕایەڵی کردنیان لەکاتی ئامۆژگاریدا: گەورەمان ابو سعیدی خودریرضي الله عنهدەفەرمووێت: پیاوێك لە یەمەنەوە کۆچی کرد بۆ لای پێغەمبەرﷺ و پرسی پێکرد بۆ جیهاد کردن، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (هَلْ لَكَ أَحدٌ بِالْيَمَنِ؟ قالَ: أَبَوايَ، قال: أَذِنا لَكَ ؟ قالَ: لا، قالَ: فَارجِع إِلَيهِما فَاسْتَأْذِنْهُما، فَإِنْ أَذِنا لَكَ فَجاهِد، وَإِلَّا فَبِرَّهُما)[٢]واتا: ئایا کەست هەیە لە یەمەن؟ گووتی: بەڵێ باوك و دایکم هەیە، فەرمووی: ئایا ڕێگایان پێداوی؟ گووتی: نەخێر، فەرمووی: بگەڕێوە بۆ لایان، ئەگەر ڕێگایـــان پێدای ئەوە بگەڕێوە بۆ لامان و جیهاد بکە، وە ئەگەر ڕێگایان پێنەدایت ئەوە بەگوێیان بکە و لەگەڵیاندا چاکەکار بە.

٢ـ پێشەوایان ابوداود و بیهقی گێڕاویانەتەوە.

شەشەم/ ڕێز گرتنیان و هەڵسان بۆیان لەکاتی هاتن و ڕۆیشتنیانداو دەست ماچ کردنیان، پێویستە لەسەر موسڵمان هەر کاتێك باوك و دایکی هاتنە لای لەبەریان هەڵسێت و بە ڕێزەوە بە خێرهاتنیان بکات و دەستیان ماچ بکات، خاتوو عائیشە رضي الله عنها دەفەرمووێت: (مَا رَأَيْتُ أَحَدًا كَانَ أَشْبَهُ كَلامًا وَحَدِيثًا مِنْ فاطمة بِرَسُولِ اللَّهِﷺ، وَكَانَتْ إِذَا دَخَلَتْ عَلَيْهِ رَحَّبَ بِهَا، وَقَامَ إِلَيْهَا فَأَخَذَ بِيَدِهَا فَقَبَّلَهَا وَأَجْلَسَهَا فِي مَجْلِسِهِ ، وَكَانَ إِذَا دَخَلَ عَلَيْهَا رَحَّبَتْ بِهِ ، وَقَامَتْ إِلَيْهِ فَأَخَذَتْ بِيَدِهِ فَقَبَّلَتْهُ، وَأَجْلَسَتْهُ فِي مَجْلِسِهَا)[1]واتا: هیچ کەسێکم نەبینیوە ئەوەندەی فاطمة رضي الله عنها بە پێغەمبەرﷺ بچێت، هەر کاتێك دەهاتە لای پێغەمبەرﷺ، لەبەری هەڵدەستاو بەخێرهاتنی دەکرد و دەستی دەگرت و ماچی دەکرد و لە دانیشتگای خۆی دایدەنیشاند، بەهەمان شێوە هەر کاتێك پێغەمبەری خوداﷺ دەچو بۆ ماڵی فاطمة رضي الله عنها ، ئەویش لەبەری هەڵدەستا و بەخێر هاتنی دەکرد و دەستی دەگرت و ماچی دەکرد و لە لای خۆی دایدەنیشاند.

جا ئەوانەی ڕابران بەشێك بوون لەو مافانەی کە لە ئیسلامدا دیاریکراون بۆ دایك و باوك، ئینجا بەشێك لە زانایان چەند مافێکی تریشیان باس کردووە وەك: (بەدەمەوە چونیان کاتێك بانگت دەکەن و خۆ بەکەم گرتن لە ئاستیانداو نەچونە ژور بۆ لایان بە بێ وەرگرتنی مۆڵەت و....) بەڵام ئەوانەش لەبنەڕەتدا هەر دەچنەوە ناو ئەو مافانەی باسمان کردن.

ئینجا بزانە: ئەوانەی باسمان کردن مافی دایك و باوك بوو لەسەر منداڵ، وەك گوتمان هەر کەسێك جێبەجێیان بکات سەر بەرزی دوونیاو قیامەت دەبێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جێبەجێ کردنیان بەڵگە نیە لەسەر ئەوەی کە مرۆڤ بتوانێت لە سەداسەد پاداشتی دایك و باوکی بداتەوەو

---

١ـ پێشەوا بیهقی گێراویەتەوە.

مافی ته‌واویان پێبدات، چونكه‌ دایك و باوك ئه‌وه‌نده‌ مافیان به‌سه‌ر منداڵه‌وه‌ هه‌یه‌، وه‌ ئه‌وه‌نده‌ گه‌وره‌ن هیچ شتێك ناتوانێت پاداشتیان بداته‌وه‌، پیاوێكی یه‌مه‌نی به‌ كۆڵی طـه‌وافی به‌یتی به‌ دایكی ده‌كرد، له‌و كاته‌دا چاوی به‌ عبدالله ی كوڕی عمر رضي الله عنه كه‌وت، ئه‌و پیاوه‌ چو بۆ لای و لێی پرسی و گووتی: ئه‌ی ابن عمر من به‌كۆڵم طـه‌واف به‌ دایكم ده‌كه‌م ئایا توانیومه‌ مافه‌كانی خۆی بده‌مه‌وه‌ و پاداشتی بده‌مه‌وه‌؟ عبدالله ی كوڕی عمریش رضي الله عنه فه‌رمووی:(لا،ولا بِزَفرةٍ مِن زَفَراتِهِ)[1] واتا: نه‌خێر، نه‌تتوانیوه‌ ته‌نها پاداشتی یه‌كێك له‌و ژانانه‌شی بده‌یته‌وه‌ كه‌ له‌ كاتی له‌ دایك بونت به‌ تۆیه‌وه‌ بینیویه‌تی!!

جا خوێنه‌ری به‌ڕێز: ئه‌وه‌ی ڕابرا ڕێزی دایك و باوك و گه‌وره‌یی دایك و باوك و مامه‌فه‌كانیان بوو له‌ ئیسلامدا، كه‌ بێگومان هیچ ئاینێك و هیچ نه‌ته‌وه‌یه‌ك ئه‌وه‌نده‌ی ئیسلام ڕێزی له‌ دایك و باوك نه‌گرتووه‌ و مافی پێنه‌داون، له‌به‌ر ئه‌وه‌ ئێمه‌ی موسڵمان هیچ پێویستمان به‌وه‌ نیه‌ كه‌ چاو له‌ وولاتانی كوفر بكه‌ین و ئه‌وان ڕۆژێكمان بۆ دیاری بكه‌ن بۆ دایك، محمد متولی الشعراوی ده‌فه‌رموێت: (فَالْمُفكرونَ الأوروبيون وَجَدو أنَّ الأبناءَ يَنْسَونَ أمهاتِهِم، و لا يؤَدون حَقَّ الرِّعايةِ لَهُنَّ، فأَرادوا أن يَجْعَلوا يوماً في السَّنَةِ ليذَّكَّرَ فيهِ الأبناءُ بِأُمَّهاتِهِم، أمَّا عِندنا فَعِيدُ الأُمِّ في كُلِّ لَحظَةٍ مِنَ اللَحظاتِ الحَياةِ، فالإنسان مِنَّا ساعةَ خُرُجِهِ مِنَ البَيتِ يُقَبِّلُ يَدَ أُمِّهِ... و يَطلبُ دُعائَها.. و يزورها بالهَدايا.. إذن لَيسَ هُناكَ ضَرُرَةٌ لِهذا العيدِ عِندَنا، .... في أوروبا يَترُكُ الوَلَدُ أُمَّهُ تَعِشُ في المَلجَأ.. و أبوهُ يَعيشُ في مَكانٍ آخَر لا يدرِ عنهُ شيئاً، و لَيسَ في حَياتِنا مِثلُ ذلكَ، فَالإسلامُ أَعطانا تكاتُفاً...)[2] واتا: بیرمه‌ندانی ئه‌ورو‌پا كاتێك بینیان كه‌ منداڵه‌كان دایكیان له‌ بیر كردووه‌و مافی دایكایه‌تیان پێناده‌ن و پشتگوێیان خستوون،

١ـ پێشه‌وا بوخاری له‌ أدب المفردا گێڕایه‌ته‌وه‌.

٢ـ الفتاوی: ٣٢١ـ ٣٢٢

بیریان لەوە کردەوە کە ڕۆژێکی ساڵ دیاری بکەن بۆ ئەوەی لەو ڕۆژەدا منداڵەکان یادی دایکیان بکەنەوە، بەڵام لای ئێمە هەموو کات و ساتێك جەژنی دایکە، چونکە لای ئێمە کاتێك کوڕێك یان کچێك لە ماڵ دەچێتە دەرەوە دەچێت دەستی دایکی ماچ دەکات و داوای دووعای خێری لێدەکات، وە کاتێك دەگەڕێتەوە دەچێت سەردانی دەکات و دیاری پێدەدات، لەبەر ئەوە ئێمە هیچ پێویستیەکمان بەو جۆرە جەژنانە نیە، بەڵام لە ئەوروپا پێویستیان پێیەتی" چونکە لە ئەوروپا کوڕ دەچێت دایکی لە خەڵوەتگا بەجێدەهێڵێت، وە باوکیشی لە جێگایەکی تر دەژیت و هیچ شتێکی دەربارە نازانێت، بەڵام لای ئێمە بەو شێوە نیە، چونکە ئیسلام ئەوەندەی پێداوین کە بەسمان بێت.



# درۆی نیسان

# (١ی نیسان)

پێغەمبەری خۆشەویستی فەرموویەتی:(آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ : إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ)

# درۆی سپی (١ی نیسان)

ساڵانە و لە جیهاندا ڕۆژی ١ی نیسان بە ڕۆژی جیهانی درۆ یاخود درۆی سپی بەناو بانگە، لەم ڕۆژەدا بەشێکی خەڵکی هەتا کەسایەتیە فەرمیەکان و دەزگاکانی ڕاگەیاندنیش هەواڵێك یان لێدوانێك دەدەن پاشان خۆیان بە درۆ دەخەنەوەو دەڵێن : ئەمە درۆی نیسان بوو، وە ئەوەی جێگای داخە ئەوەیە بەشێکی موسوڵمانانیش کەوتونەتە ئەم هەڵەیەوە، وەبەشێکی موسوڵمانان وا تێگەیەنراون کە درۆکردن لەم ڕۆژەدا ڕێگا پێدراوەو حەڵاڵە! جا بە پشتیوانی خودا ئێمە لێرەدا تیشکێك دەخەینە سەر ئەم ڕۆژەو موسوڵمانان لە ترسناکی درۆکردن لەم ڕۆژە ئاگادار دەکەینەوە.

# درۆی نیسان لە چی یەوە هاتووە

وەکو زۆرێکی تر لە ڕۆژە جیهانیەکانی مێژویەکی دیاری کراو و هۆکارێکی دیاری کراو نیە بۆ دەستپێك و سەرەتای سەرهەڵدانی درۆی نیسان، بەڵام بە شێوەیەکی گشتی دەربارەی درۆی نیسان ئەم هۆکارو بەسەرهاتانەی خوارەوە گێڕدراونەوە:

یەکەم/ لە ساڵی ١٥٦٢دا پاپا (غریغۆریۆس) ڕۆژ ژمێرێکی تازەی پێشکەش کرد، کە بەپێی ئەم ڕۆژ ژمێرە، ئاهەنگ گێران بە بۆنەی سەری ساڵی زاینی لە ڕۆژی ١ی نیسانەوە دەکرا بە ١ی کانونی دووەم، پاشان لە ساڵی ١٥٨٢دا (چارلزی نۆیەم) پادشای فەرەنسا بڕیاریدا ڕۆژی یەکەمی ساڵ لە ١ی نیسانەوە بگۆڕێت بۆ ١ی کانونی دووەم، بەڵام بەشێك لە خەڵکی بەم گۆڕانکاریە ڕازی نەبون، بۆ ئەو مەبەستەش ساڵانە لە یەکی نیساندا ئاهەنگی سەری ساڵیان بە گاڵتەجاڕی و درۆکردن دەکردەوە، دراوسێ و دۆست و برادەران هەڵدەستان بە نوکتە کردن و فێڵ کردن لە یەکتری و دیاری بەتاڵیان بۆ یەکتری دەنارد، وە یان یەکتریان بانگهێشت دەکرد بۆ سەر ئاهەنگ

و خوانێکی درۆین کەهیچ بونێکی نەبو، تا وای لێهات ئەم ڕۆژەیان ناونا بە ڕۆژی درۆی سپی یان درۆی نیسان، پاشان وەك چاولێکەری ئەم نەخۆشیە هەمو دونیای گرتەوە.[1]

دووەم/ هەندێکی تر دەڵێن: ئەم ڕۆژە پەیوەندی هەیە بە جەژنی (هۆلی) هیندەکانەوە، چونکە هیندۆسەکان لە ڕۆژی ٣١ی مارس هەڵدەستان بە درۆکردن، یان داهێنانێکی درۆینیان دەکرد، وەیان کارێکی درۆینیان دەکرد، ئەمەش بۆ خۆشی و گاڵتەجاڕی، بەڵام ڕاستی درۆ و فێڵەکەیان هەتا ئێوارەی ڕۆژی ١ی نیسان ئاشکرا نەدەکرد.[2]

سێ یەم/ بەشێکی تر لە لێکۆڵەرەوان دەڵێن: درۆ کردن لەو ڕۆژە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەکانی ناوەڕاست، لەو سەردەمەدا مانگی نیسان، مانگی تکاکردن بو بۆ تاوانباران و کەم هۆشەکان و ئازاددەکران، وە کەسە هۆشمەندەکانیش دووعا و تکایان بۆ دەکردن، بۆیە لەو ماوەیەدا جەژنێك بڵاوبۆوە بە ناوی جەژنی(جميع المجانين)، وەك چاولێکەری لە جەژنی(جميع القديسين).پاشان بە تێپەڕبونی کات گۆڕا بۆ ڕۆژی درۆ.

چوارەم/ بەشێکی تر لە لێکۆڵەرەوان دەڵێن: ڕۆژی جیهانی درۆ بەم شێوە بەربڵاوە، تەنها لە سەدەی نۆزدەیەم بە دواوە بڵاوبۆتەوە.[3]

پێنجەم/ ڕایەکی تر دەڵێت: درۆی نیسان پەیوەندیەکی ئاینی هەیە، ئەویش ئەوەیە: کە لە ڕۆژی ١ی نیساندا کۆتا شاری ئەوروپا کەشاری (غەرناتە) بو لە دەستی موسوڵمانان سەنرایەوە، ئەمەش دوای ئەوەی کە ئیسلام نزیکە هەشت سەدە حوکمی زێڕینی ئەوروپای کرد، بۆ ئەو مەبەستە لەو کاتەوە هەتا ئێستا هەمو ساڵێك ئەوروپیەکان لەڕۆژی ١ی نیساندا ، بە بۆنـــەی

---

١ـ سایتی : المدی

٢ـ هەمان سەرچاوە

٣ـ الموسوعة الحرة(ويكيبيديا)

سەرکەوتنی فێڵ و تەڵەکەو پیلانەکانیان دژی ئیسلام و دەرکردنی حوکمی ئیسلام لە ئەوروپا ناهەنگ دەگێڕن[1]

جا موسڵمانی بەڕێز: هۆکاری ڕۆژی درۆی جیهانی هەرکامێك لەم هۆکارانەی سەرەوە بێت هیچ پەیوەندیەکی بەتوزی موسڵمانەوە نیە، بەڵکو ئەم هۆکارانەی سەرەوە لە دوخاڵ تێناپەڕن:

١ـ ئەگەر هۆکاری ئەم ڕۆژە هۆکارو بەسەرهاتی یەکەم هەتا چوارەمی سەرەوە بێت" ئەوە یادکردنەوەی خۆچواندنە بەکافران، پێغەمبەری خوداﷺ فـــەرموویەتی:(من تشبه بقوم فهو منهم)[1]واتا: هەرموسڵمانێك خۆی بچوێنی بە هەر گەل و نەتەوەیەك ئەوە لەوان ئەژمار دەکرێت.

٢ـ وە ئەگەر هۆکاری ئەم ڕۆژە هۆکارو بەسەرهاتی پێنجەمی ڕابردو بێت" ئەوە یادکردنەوەی کافربونە، چونکە چۆن دەبێت موسڵمانی ڕاستەقینە خۆشحاڵ بێت بە تێکشکانی موسڵمانان؟!

## حوکمی درۆی نیسان

لە ئیسلامدا درۆی سادەش قەدەغەیە و حەرامە، وە پێغەمبەری ڕێزدارﷺدرۆکردنی بە نیشانەیەکی دوو ڕویی ئەژمار کردووە و دەفەرمووێت:(آيَةُ الْمُنَافِقِ ثَلاثٌ : إِذَا حَدَّثَ كَذَبَ ، وَإِذَا وَعَدَ أَخْلَفَ، وَإِذَا اؤْتُمِنَ خَانَ) [1]واتا: نیشانەی مرۆڤی دوو ڕوو سیانن: ئەگەر قسەی کرد درۆ دەکات، وەئەگەر پەیمانی دا نایباتە سەر، وە ئەگەر سپاردەیەکی لەلا دانرا خیانەتی لێ دەکات، جا ئەم درۆی نیسانە لە چەندین ڕووەوە حوکمەکەی لە درۆی سادە توندترە لەوانە:

١ـ بەشێك لە خەڵکی درۆی١ی نیسان بە حەڵاڵ دەزانێت،هەرکەسێکیش حەرامێك کە خوداو پێغەمبەرەکەیﷺبە حەرامیان داناوە بە حەڵاڵ بزانێت، وە بە پێچەوانەوەش ئەوە کافـــرە و لـــە

١ـ ڕوژنامەی کۆمەڵ.

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

گەلی ئیسلام دەچێتە دەر، عەدی کوڕی حاتمرضي الله عنهدەفەرموێت: هاتمە لای پێغەمبەری خوداﷺ خاچێکم لە مل دابوو، پێغەمبەرﷺفەرمووی: (يا عُدَي اطرَحْ هذا الْوَثَنَ مِنْ عُنُقِكَ، فَطَرَحتُهُ فَلَمّا انتَهَيتُ إلَيهِ وَهوَ يَقرأُ:﴿اتَّخَذُوا أَحْبَارَهُمْ وَرُهْبَانَهُمْ أَرْبَاباً مِنْ دُونِ اللَّهِ﴾[1] حتّى فَرَغَ مِنها قُلتُ: إنا لَسنا نَعبُدُهُم، فقال:أَلَيسَ يُحَرِّمُونَ ما أَحَلَّ اللهُ فَتُحَرِّمُونَهُ، ويُحِلّونَ ما حَرَّمَ اللهُ فَتَستَحِلّونَهُ؟ قال: قُلتُ: بَلى، قالَ: فَتِلكَ عِبادَتُهُم)[2]واتا: ئەی عەدی ئەم بتە لە ملی خۆت بکەرەوە، منیش خاچەکەم فڕێدا، کاتێك گەیشتمە لای پێغەمبەرﷺ گوێم لێی بوو ئەم ئایەتەی دەخوێندەوە: گاور و جولەکەکان قەشە و حاخامەکانیان کردووە بە خودای خۆیان و جگە لە خودای ڕاستی (الله) دەیان پەرستن، کاتێك لێی بویەوە گوتم: خۆ ئێمە نایان پەرستین؟ فەرمووی: ئایا ئەوان حەرامێك حەلاڵ ناکەن کە خوداحەرامی کردووە و ئێوەش بە حەلاڵی دەزانن، وە حەلاڵێکیش حەرام ناکەن کەخودا بە حەلاڵی داناوە و ئێوەش بە حەرامی دەزانن؟ گوتم: بەڵێ! فەرمووی: جا ئەمە پەرستنیانە!

جا هەرکەسێك حەرامێك حەلاڵ بکات، وە بە پێچەوانەشەوە، ئەوە مافی خودایەتی بە خۆی داوە، بۆیە ئەوە بێگومان کافرە.

٢ـ ئەم جۆرە درۆیە شوێنکەوتن و چاولێکەری و خۆچواندنە بە کافران ، ئەمانەش هەمویان بە دەقی فەرمودەی (صحيح) قەدەغەن ، ئێمە لە حوکمی ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی سەری ساڵی زاینی دا ڕوونمان کردەوە کە هەرکەسێك خۆی بچوێنێت بەکافران لەگەڵ ئەواندا ئەژمار دەکرێت.

## قێزەونی درۆ لە ئیسلامدا

صەفوانی کوڕی سولەیم رحمه الله دەفەرموێت: (قِيلَ لِرَسُولِ اللهِﷺأَيَكونُ الْمُؤمِنُ جَباناً؟ فَقالَ:

---

٢ـ التوبة : ٣١

٣ـ پێشەوایان ترمذی و طبرانی و بیهقی گێڕاویانەتەوە و فەرمودەیەکی (حسن)

نعم، فَقِيلَ لَهُ: أَيَكُونُ الْمُؤمِنُ بَخِيلاً؟ فَقَالَ: نعم، فَقِيلَ لَهُ: أَيَكُونُ الْمُؤمنُ كَذاباً؟ فَقالَ: لا)[1] واتا: بە پێغەمبەری خودایانﷺگووت: ئایا دەکرێت باوەڕدار ترسنۆك بێت؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان: ئایا دەکرێت باوەڕدار چاوچنۆك بێت؟ فەرمووی: بەڵێ، گوتیان ئایا دەکرێت باوەڕدار درۆزن بێت؟ فەرمووی: نەخێر!!

بەواتای: مرۆڤی باوەڕدار بە سروشتی مرۆڤبونی دەکرێت هەندێك صیفەتی ناشیاوی تێدابێت، بەڵام لە ناو هەمو ئەو صیفەتە ناشیرنانەدا بە هیچ شێوەیەك نابێت درۆزن بێت" چونکە درۆ صیفەتی دوو ڕوەکانە، وە کاتێك موسڵمان درۆ دەکات هەتا فریشتە تایبەتەکانیشی لێی دور دەکەونەوە، چونکە درۆ بۆگەنە! گەورەمان ابن عمرﷺلە پێغەمبەری خوداوەﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إذا كَذَّبَ الْعَبدُ تَباعَدَ عَنهُ الْمَلَكُ الْمُوَكّلُ بِهِ مِيلاً مِنْ نَتنِ ماجاءَ بِهِ)[2] واتا: کاتێك بەندەیەك درۆیەك دەکات، ئەو فریشتەیەی لە گەڵی دایە میلێك لێی دور دەکەوێتەوە، لە بەر برگەنی ئەو درۆیەی کردوویەتی!

## درۆزن لە دۆزەخە

گەورەمان عبداللە ی کوڕی مسعودﷺلە پێغەمبەری خوداوەﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إِيّاكُم وَالْكِذبَ فَإِنَّ الْكِذبَ يَهدِي إِلى الْفُجُورِ وَإِنَّ الْفُجُورَ يَهدِي إِلى النّارِ، وَإِنَّ الرَّجُلَ لَيَكذِبَ وَيَتحرّى الْكِذبَ حَتّى يُكتَبُ عِندَ اللهِ كَذّاباً)[3] واتا:ئاگاداربن درۆمەکەن، چونکە درۆ مرۆڤ دەبات بەرەو تاوان، وە تاوانیش مرۆڤ دەگەیەنێت بە دۆزەخ، وە پیاوی وا هەیە ئەوەندە درۆ دەکات و درۆ دێنێت و دەبات هەتا لای خودای پەروەردگار بە درۆزن دەنوسرێت!!

---

١ـ پێشەوایان مالك و بیهقی بەسەنەدێکی(حسن) گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا ترمزی گێڕاویەتەوەو دەڵێت :(حسن غريب)ە

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

بەڵام بەداخەوە لەگەڵ ئەم فەرموودە هەڕەشە ئامێزانەشدا،کەچی تائێستاش درۆکردن نەخۆشەیەکی کوشندەی ناوموسوڵمانانە، هەتا مرۆڤی وا هەیە بەردەوام دەمی بەدرۆ دەکاتەوە، بە شێوەیەك بە ئاشکرا مرۆڤ هەستی پێدەکات کە ئەم کەسە لای پەروەردگار بە درۆزن نوسراوە.

## درۆی بە پاساو

ئێستا وای لێهاتووە مرۆڤەکان بۆ هەر درۆیەکیان پاساوێکیان پێیە، بە شێوەیەك درۆی ڕاستەقینە هەرناوی نەماوە، لەو درۆ سەردەمیانە: درۆی سیاسی، درۆی مەصلەحەت، درۆی بازرگانی، درۆی گاڵتەو گەپ، درۆی نوکتە، درۆی نیسان ...هتد، ئەمەشیان وەك مەی ئەم سەردەمە وایە کە پێغەمبەری خوداﷺهەواڵی دەربارەی داوەو فەرموویەتی: (لَيَشرَبنَ ناسٌ مِنْ أُمَّتي الخَمرَ يُسَمُونَها بِغَيرِ إِسمِها)[1] واتا: خەڵکانێك لە ئوممەتەکەم پەیدا دەبن مەی دەخۆنەوە، بەڵام بە جگە لە ناوی خۆی ناوی دەنێن! ئەمەش بە ئاشکرا لەم ڕۆژگارەدا بە چاوی خۆمان دەیبینین، چەندین ناویان بۆ مەی داناوە وەك: خواردنەوە ڕوحیەکان یان ویسکی،بیرە، شامپانیا.. جا ئەوانە هەمویان هەر مەین و حەرامن با ناویشیان جیابێت! بە هەمان شێوە درۆش هەرناوێکی لێبنێیت هەر درۆیە، جا بۆ ئەوکەسانەی بەردەوام پاساو بۆ درۆیەکانیان دێننەوە بەسەرهاتی ئیبراهیم علیه السلام بەسە بۆ ئەوەی ڕێنمونی وەربگرن:

پێغەمبەری خۆشەویستمانﷺلە فەرموودەیەکدا باسی خراپی حاڵی خەڵکی دەکات لە ڕۆژی قیامەتدا و دەفەرموێت: خەڵکی قیامەت دەچن بۆ لای ئادەم علیه السلام پاشان دەچن بۆ لای نوح علیه السلام داوای شەفاعەتیان لێدەکەن ، بەڵام هەر یەکەی بە هۆی ڕێگرێکەوە ناتوانن شەفاعەت بکەن دواتر دێن بۆلای ابراهیم علیه السلام دەڵێن:(يا إبراهيمُ أَنتَ نَبِيُ اللهِ وَخَلِيلُهُ مِن أَهلِ الْأرضِ، اشفَعْ لَنا إِلى رَبِّكَ، أَمّا تَرى ما نَحنُ فِيهِ، فَيُقولُ لَهُم إِنَّ رَبِّي قَد غَضِبَ غَضَباً لَم يَغضَبْ قَبلَهُ

---

١ـ پێشەوایان ابو داود و ابن ماجە و احمد گێڕاویانەتەوە.

وَلَن يَغضَبَ بَعدَهُ مِثلَهُ، وَاَنّي قَدْ كَذَبْتُ ثَلاثَ كِذباتٍ، نَفسِي نَفسِي اِذهَبُوا إلى غَيرِي)[1]
واتا: ئەی ابراهیم تۆ پێغەمبەری خودا و دۆستی خودا بوی لەسەر زەوی، بچۆ تکامان بۆ بکە لای پەروەردگار، ئایا نابینی ئێمە لە چی حاڵێك داین؟! ئەویش دەفەرموێت: بەڕاستی ئەمڕۆ پەروەردگارم بە شێوەیەك تورە بووە کە نەپێش ئێستا بەم شێوەیە تورە بووە، وە نە لەمەو دواش بەم شێوەیە تورە دەبێت، وە منیش لە دونیادا سێ درۆم کردووە، بۆیە من ناتوانم تکاتان بۆ بکەم و من ئەمڕۆ هاوار هاواری خۆمە! بڕۆن بۆ لای کەسێکی تر.

بڕوانە برای موسڵمان: پێغەمبەر ابراهیم علیه السلام بەهۆی گوتنی ئەم سێ ناڕاستیەوە لە (شفاعة العظمی) تکای گەورە بێبەش دەبێت و ڕوی نیە بچێتە خزمەتی خودای گەورە و تکا بکات بۆ بونەوەر، جا بابزانین ابراهیم علیه السلام ئەم سێ ناڕاستیەی بۆچی گووتن؟

هاوەڵی بەڕێز أبو سعید رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(ما مِنْها كِذبةٌ إلا ما حَلَّ بِها مِن دِينِ اللهِ)[2] واتا: ابراهیم علیه السلام هیچ کامێك لەم سێ ناڕاستیانەی لەبەر خۆی نە گووتن، بەڵکو هەرسێکیانی لە پێناوی دینی خودادا گووتن و بەرگری پێ لە دینی خودا کردن، ئەمەی خوارەوەش سێ درۆیەکەی إبراهیم علیه السلام:

وە گەورەمان أبو هريرة رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لَم يَكذِبْ إبراهيمُ النَبيُّ علیه السلام قَطُّ إلا ثَلاثَ كِذباتٍ ثِنتَينِ في ذاتِ اللهِ، قَولُه : ﴿إني سَقيم﴾[3] وَقَولُهُ : ﴿بَلْ فَعَلَهُ كَبِيرُهُم هذا﴾[4] وَواحدةٌ في شَأنِ سارَة، فَإنَّهُ قَدِمَ أَرضَ جَبّارٍ وَمَعَهُ سارةُ، وَكانَت أَحسنُ النّاسِ، فقالَ لَهــا: إنَّ هذا الجَبّــارَ إنْ يَعلَمْ أَنَّكِ امْــرَأَتي يَغلِبُني

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .
٢ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە و دەڵێت:(حسن)
١ـ الصافات : ٨٩
٢ـ الأنبياء: ٦٣

عَلَيكِ، فَإنْ سَأَلَكِ فَأَخبِرِيهِ أَنَّك أُختِي، فَإنَّكِ أُختِي فِي الإِسلامِ، فَإنِّي لا أَعلمُ فِي الأَرضِ مُسلِماً غَيرَكِ وَغَيرِي)[1] واتا: ئیبراهیم علیه السلام لە تەمەنیدا تەنها سێ ناڕاستی گوتووە، دوانیان بەتەنها لەبەر خاتری خودا بوون، ئەوانیش ئەوەدووانەن:

یەکەم/ گەلەکەی حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام ساڵانە جەژنێکیان هەبو لەم جەژنەدا دەچونە دەرەوەی شار، جا بۆ ئەم جەژنە بانگهێشتی حەزرەتی ئیبراهیمشیان علیه السلام کرد، بەڵام حەزرەتی ئیبراهم علیه السلام بۆ ئەوەی بەتەنها بمێنێتەوە لە ناو شار و بتوانێت بتەکان بشکێنێت، بیانوی هێنایەوە و فەرمووی: من نەخۆشم، ئەوە لە کاتێکدا نەخۆشیش نەبو!

دووەم/ کاتێك گەلەکەی لە جەژن گەڕانەوە بینیان بتەکانیان شکاون، پرسیان کێ لەناو شار ماوەتەوە؟ گوتیان ئیبراهیم ، بۆیە هاتن بۆ لای حەزرەتی ئیبراهیم و لێیان پرسی: کـــێ ئــەم بتانەی شکاندووە؟ فەرمووی: سەیرکەن تەورەکە لەسەر شانی بتە گەورەکەیە، کەواتا بتە گەورەکە بتەکانی تری شکاندووە، ئەمە لە کاتێکدا بۆ خۆی بتەکانی شکاند بوو، ئەمەش بۆ ئەوەبوو پێیان بڵێت: بتەکانی ئێوە ئەوەندە لاواز و بێهێزن ناتوانن بەرگری لە خۆیان بکەن، جا چۆن بە کەڵکی خوایەتی دێن!

سێ یەم/ حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام چۆ ناو خاکێکەوە پادشایەکی ستەم کار حوکمی دەکرد، کاتێك دەستەو پێوەندەکانی پادشا حەزرەتی ئیبراهیمیان علیه السلام بینی، هەواڵیان دا بە پادشا و پێیان گوت: پیاوێك هاتۆتە ناو خاکی تۆوە ئافرەتێکی جوانی لە گەڵدایە ، پادشا بانگی حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام کرد و لێی پرسی ئەوە کێ یە لەگەڵتدا؟ ئەویش فەرمووی: خوشکمە، جا حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام گەڕایەوە بۆ لای خاتو سارا و پێی فەرموو: (یا سارة لَيسَ على وَجهِ الأَرضِ مُؤمِنٌ غَيرِي وَ غَيرُكِ، وَإنْ هذا سَأَلَني عَنكِ فَأَخبرتُهُ أَنَّكِ أُختِي، فلا

١- پێشەوایان أبو داود احمد گێڕاویانەتەوە.

تکذبني)[1] واتا: ئەی سارا لە سەر ڕوی زەویَ تەنها من و تۆ باوەڕدارین ئەم پادشایە پرسیاری لێکردم دەربارەی تۆ، منیش گوتم: ئەوە خوشکمە تۆش بە درۆم مەخەرەوە. ئینجا پادشایەکە بەدوای خاتوو سارای دا نارد، کاتێك خاتوو سارا چۆ ژورەوە بۆلای پادشاکە ویستی دەستدرێژی بکاتە سەر، بەڵام پەروەردگار لە جێگای خۆی ڕەقی کرد، پادشایەکە داوای لە خاتوو سارا کرد دووعای بۆ بکات چاك ببێتەوە زیانی پێناگەیەنێت، ئەویش دووعای بۆ کرد و چاك بویەوە، بەڵام پادشایەکە بیَ پەیمان بوو و دووبارە ویستی دەست درێژی بکاتە سەر، بەڵام دووبارە پەروەردگار ڕەقی کرد، دیسان پادشایەکە داوای دووعای لە خاتوو سارا کرد و پەیمانی پێدا زیانی پێنەگەیەنێت، خاتوو ساراش دووعای بۆ کردو چاك بویەوە، بەڵام بۆ جاری سیَ یەم ئەم پادشا ستەمکارە بیَ پەیمان بوو و پەروەردگاریش ڕەقی کرد، ئینجا ئەمجارەشیان لە سەر داواکاری پادشاکە خاتوو سارا دووعای بۆ کرد و چاك بویەوە، ئەمجارەیان پادشاکە بانگی دەست و پێوەندەکەی کرد و گوتی: ئێوە مرۆڤتان بۆمن نەهێناوە بەڵکو شەیتانتان بۆ هێناوم، برۆن بیبەنە دەرەوە و هاجەرەشی بە خزمەتکار بدەنیَ، جا کاتێك گەڕایەوە بۆ لای حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام بینی ئیبراهیم نوێژ دەکات و دووعا دەکات بۆ ئەوەی خودای گەورە سارا لە دەستی ئەم ستەمکارە بپارێزیَ، جا خاتو سارا فەرمووی: ئەی ئیبراهیم خودای گەورە فێڵی ستەمکارەکەی بەسەر خۆیدا شکاندەوە.

جا ابن حجری عەسقەلانی رحمه الله لە (فتح الباري)دا چەند ڕایەکی گێڕاوەتەوە دەربارەی ئەوەی بۆچی حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام گووتی ئەوە خوشکمە و نەیگوت ئەوە خێزانمە:

* ڕایەك دەڵێت حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام لەبەر ئەوە گووتی ئەوە خوشکمە: چونکە پادشای ئەو شارە دەستوری وابو تەنها دەستدرێژی دەکردە سەر ئافرەتی بە شوو.

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

* ڕایەکی تر دەڵێت: ئەگەر ئەم پادشایە بیزانیبایە کە حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام شووی خاتوو سارایە، ئیرەیی پێدەبرد و دەیکوشت. لەبەر ئەوە حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام فەرمووی: ئەوە خوشکمە.

* ڕایەکی تر دەڵێت: دەستوری ئەم پادشایە وابو هەر ئافرەتێك شووی هەبوایە، ئەم پادشایە لێی نزیك نەدەبۆوە هەتا شووەکەی نەکوشتبایە، لەبەر ئەوە حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام فەرمووی: ئەوە خوشکمە.[1]

جا خوێنەری بەڕێز: بڕوانە حەزرەتی ئیبراهیم علیه السلام لەسەر ئەم سێ قسە ناڕاستە، کە هەرسێکیانیشی بۆ خزمەتی دینی خودا کردنی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بەهۆیانەوە لە تکای گەورە(شفاعة العظمی) بێبەش دەبێت!! ئایا تۆ چۆن ڕێگا بەخۆت دەدەیت پاساوێکی نادروست بۆ درۆیەکەت بهێنیتەوە و درۆیەکەت بکەیت بە دوو درۆ؟!

## خراپترین درۆ

وەك گوتمان بەهەمو شێوەیەك درۆکردن حەرامە، بەڵام لەناو درۆیەکاندا هەندێکیان لە هەندێکیان گەورەترە و تاوانیان زیاترە، لەوانە :

١ـ درۆکردن بە دەم خوداوە. خودای پەروەردگاردەفەرموێت: ﴿وَيَوْمَ الْقِيَامَةِ تَرَى الَّذِينَ كَذَبُوا عَلَى اللَّهِ وُجُوهُهُم مُّسْوَدَّةٌ أَلَيْسَ فِي جَهَنَّمَ مَثْوًى لِّلْمُتَكَبِّرِينَ﴾[2] واتا:لە ڕۆژی قیامەتدا دەبینیت ئەوانەی درۆ بە دەمی خوداوە دەکەن و، شتێك دەدەنە پاڵ خودا کە شیاوی خودا نیەو، شتێك لە دینی خودا زیاد دەکەن کە پێچەوانەی قورئان وسوننەت و بنچینەکانی تری شەریعەتی ئیسلامە، ڕوەکانیان ڕەش دەبێت، ئایا لە دۆزەخدا جێگا نیە بۆ خۆ بە زل زانان .

---

١ـ فتح الباری:٦/٤٧٤-٤٧٥

٢ـ الزمر : ٦٠

٢ـ درۆ کردن بە دەم پێغەمبەری خوداوەﷺ:گەورەمان أبو هريرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کەفەرموویەتی: (مَنْ كَذَّبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّداً فَلْيَتَبَوَّا مَقعَدَهُ مِنَ النَّارِ)[1]واتا: هەرکەسێك بە ئەنقەست درۆ بە دەم منەوە بکات" با جێگای خۆی لە دۆزەخ ئامادە بکات.

* جا درۆ کردن بە دەم خودا و پێغەمبەرەوەﷺ تەنها ئەوە ناگرێتەوە کەسێك شتێك بڵێت کە خودا و پێغەمبەرﷺ نەیانفەرمووبێت، بە لکو کەسێکیش دەگرێتەوە کە بەبێ زانیاری دەم لە بابەتەکانی شەرع دەکوتێت، بۆیە لەسەر موسوڵمانان بە گشتی و گەنجانی خۆشەویست بە تایبەتی پێویستە خۆیان بپارێزن لە قسە کردن لە بابەتێکی شەرعیدا کە زانیاریان دەربارەی نیە.

٣ـ ئەو کەسانەی بڕوایان بە ڕۆژی قیامەت نیەو ئایەتەکانی خودا بەدرۆ دەخەنەوە لە هەموو کەس درۆزنترن و جێگایان دۆزەخە. خودای پەروەردگار لەسەر زاری ئەو کەسانەی لە دۆزەخدا دەبرێنە ناو سەقەرەوە دەفەرموێت: ﴿وَكُنَّا نُكَذِّبُ بِيَوْمِ الدِّينِ﴾[2]واتا: ئێمە ڕۆژی قیامەتمان بە درۆ دەخستەوە و بڕوامان پێی نەبوو. وە خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَوْ تَرَى إِذْ وُقِفُوا عَلَى النَّارِ فَقَالُوا يَا لَيْتَنَا نُرَدُّ وَلَا نُكَذِّبَ بِآيَاتِ رَبِّنَا وَنَكُونَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[3]واتا: ئەگەر ئەوانە ببینی لە قیامەتدا کە لەسەر لێواری دۆزەخ ڕاگیراون و بەدەم ئاهو حەسرەتەوە دەڵێن: خۆزگە جارێکی تر بیان گێڕابایینەوە بۆ دنیا، ئەوسا هەرگیز ئایەت و بەڵگەکانی خودامان بە درۆ نەدەزانی و باوەڕی بە تینمان پێی دەبوو.

٤ـ درۆکردن بۆ ئەوەی خەڵکی پێبکەنێت ـ نوکتە کردن ـ پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (وَيلٌ لِلَّذِي يُحَدِّثُ بِالحَدِيثِ لِيُضحِكَ بِهِ الْقَومُ فَيَكْذِبُ، وَيلٌ لَهُ وَيلٌ لَهُ)[4]واتا:

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ المدثر : ٤٦

٣ـ الأنعام : ٢٧

٤ـ پێشەوایان أبو داود ترمذی گێڕاویانەتەوە ، وە ترمذی دەفەرموێت :(حسن)ە

هاوارو ئازار یان چاڵێك لە چاڵەکان دۆزەخ بۆ ئەو کەسەی قسەی درۆ دەکات و قسە هەڵدەبەستێت بۆ ئەوەی خەڵکی پێی پێبکەنن، هاوار بۆ ئەو، هاوار بۆ ئەو.

## درۆکردن لەگەڵ منداڵ

لە ناو خەڵکیدا درۆکرد لەگەڵ منداڵ زۆر بەر بڵاوە، بە شێوەیەك کاتێك بیانهەوێت منداڵەکانیان کارێك بکەن" بەڵێنێکی بە درۆیان پێدەدەن، وە کە بیانهەوێت کارێك نەکەن بەهەمان شێوە بەڵێنێکی بەدرۆیان پێدەدەن، بۆ نمونە دەڵێن فلان کار بکەیت" فلانە شتەت بۆ دەکڕم، یان ئەگەر ئەمساڵ لە قوتابخانە یەکەم بیت دیاریەکت بۆ دەکڕم، یان لەگەڵم مەیە بۆ فلانە شوێن کە هاتمەوە دیاریەکت بۆ دەهێنم، جا ئەم منداڵە کارەکەی ئەنجام دەدات و چاوەڕێی هاتنەوەی باوك و دایکیەتی، بەڵکو دیاریەکەی بۆ بهێنن" بەڵام دێنەوە و بەڵێنەکەیان نەبردۆتە سەر و درۆیان لە گەڵدا کردووە!! ئەمەش جگە لەوەی درۆ کردنی تێدایە و تاوانە، دەبێتە هۆی بێ متمانە بونی دایك و باوکیش لای منداڵ، وە پاشان ئەوانیش لە ئاییندەدا چاو لە باوك و دایکیان دەکەن و فێری درۆ دەبن لەگەڵ دەوروبەردا، عبداللە ی کوڕی عامر رضي الله عنه دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ هاتە ماڵمان، منیش منداڵ بوم دەچوم یاری بکەم، دایکم بانگی کردم گوتی: ئەی عبداللە وەرە شتێکت بدەمێ، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (وَما أَرَدتَ أَنْ تُعطِيَهُ) واتا: ئایا دەتویست چی بدەیەی؟ دایکم گووتی: دەمویست خورمای بدەمێ، پێغەمبەری خوداشﷺ فـــەرمووی: (أمّا إنَّكِ لَو لَمْ تَفعَلِي لَكُتِبَتْ عَلَيكِ كِذبَةٌ)[1] واتا: ئەگەر هاتباو بە فێڵ بانگت بکردباو هیچت پێنەدابا ئەوە درۆیەکت لەسەر دەتوسرا!

---

١- پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە .

# درۆی ڕێگا پێدراو

لە ئاینی پیرۆزی ئیسلامدا چەند درۆیەك ڕێگایان پێدراوەو، خاوەنەکەیان تاوانبار نابێت، خاتو أم کلثوم رضی الله عنها دەفەرموێت: (ما سَمِعتُ رَسولَ اللهِﷺ يُرَخِّصُ فِي شَيءٍ مِنَ الْكِذبِ، إلا فِي ثَلاثٍ: الرّجلِ يَقولُ القَولَ يُرِيدُ بِهِ الإِصلاحَ، وَالرّجلِ يَقولُ القَولَ فِي الحَربِ، وَالرَّجُلِ يُحَدِّثُ امرَأَتَهُ، وَالَمرأةُ تُحَدِّثُ زَوجَها)[1]واتا: ئەم بیستووە پێغەمبەری خوداﷺ ڕێگای بە درۆ دابێت تەنها لە سێ حاڵەتدا نەبێت: پیاوێك قسەیەکی درۆ بکات مەبەستی پێی ڕێکخستنەوەو چاکسازی نێوان دوو کەس یان دوو هۆز و نەتەوە بێت، وە پیاوێك لە جەنگی کافراندا درۆیەك یان فێڵێك لە کافران بکات بۆ مەبەستی سەر خستی سوپای ئیسلام، وە پیاوێك خۆشەویستی بۆ ژنەکەی دەربڕێت یان ژنێك خۆشەویستی بۆ پیاوەکەی دەر ببڕێت،

* پێشەوا قاضی عیاض رحمه الله دەفەرموێت: هیچ جیاوازیەك نیە لە نێوان زانایاندا کە لەم حاڵەتانەدا دروستە موسوڵمان درۆ بکات، وە پێشەوا نووی رحمه الله دەفەرموێت: هیچ جیاڕاییەك نیە لە نێو زانایاندا، ئەگەر ستەمکارێك بە دوای کەسێکی بێ تاوان بکەوێت بۆ ئەوەی بیکوژێت، ئەم کەسە خۆی شاردبێتەوە، ئەوە واجبە ئەگەر درۆ بکەیت و بڵێیت پێی نازانم[2].

جا موسوڵمانی بەڕێز جگە لەم کاتانەی ڕابردوو، بە هیچ شێوەیەك دروست نیە مرۆڤی موسڵمان درۆ بکات، وە باتایبەت لە ڕۆژی١ی نیسان دا، چونکە هەرکەسێك لە ڕۆژی ١ی نیساندا درۆ بکات، ئەگەر کافریش نەبێت" ئەوە بێگومان تاوانێکی یەکجار گەورەی ئەنجامداوە و خۆی بە کافران چواندووە .

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ منهاج شرح صحيح مسلم بن حجاج١٦/٣٧٣ـ٣٧٤.

# ڕۆژی جیهانی نازداران

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَلِيلاً)

# ڕۆژی جیهانی نازداران(یوم العالمی للیتامی)

(یتیم) لە زمانی عەرەبی بەو کەسە دەگوترێت: کە دایك و باوکی وە یان تەنها باوکی لە دەست دابێت و نەمابن، وە ئێمە لێرەدە ووشەی(یتیم) بە نازدار مانا دەکەین، چونکە ووشەکانی تر کە لە زمانی کوردا بۆ (یتیم) بەکارهاتوون لە ڕوی بەکارهێنانەوە جوان نین، جا ساڵانەو لە ڕۆژی حەوتی نیساندا(٤/٧)دا، وە یاخود لە ڕۆژی هەینی یەکەمی مانگی نیساندا بەشێك لە وولاتانی جیهان یادی ڕۆژی جیهانی نازداران دەکەنەوە، لەم ڕۆژەدا چەندین کارو چالاکی تایبەت بەم یادە ڕێکدەخرێت و تێیاندا باسی مافەکانی نازداران و چۆنیەتی مامەڵە کردن لە گەڵیاندا و چەندین تەوەری تری تایبەت بە نازداران دەکرێت، جێگای ئاماژەیە ئەم ڕۆژە لە لایەن ڕێکخراوی نەتەوە یەکگرتوەکانی تایبەت بە منداڵان( یونسێف) وە دیاریکراوە،

# حکمی شەرعی یادکردنەوەی ئەم ڕۆژە

یادکردنەوەی ئەم ڕۆژەش وەکو باقی ڕۆژە جیهانیەکانی تر جێگای جیاڕایی زانایانە، بەشێکیان بە دروست و ڕەوای دەزانن وە بەشێکیشیان بە کارێکی حەرام و قەدەغەی دادەنێن:

وەك پێشتر گووتمان زانایانی سعودیە و خەلیج بەشێوەیەکی یەکلایی یادکردنەوەی ئەم ڕۆژە و باقی ڕۆژەکانی تری ساڵ جگە لە جەژنی ڕەمەزان و قوربان نەبێت" گشتیان ڕەتدەکەنەوە، بەبەڵگەی: (مَن أحدثَ في أمرِنا هذا ما لَيسَ فيهِ فهو رَدٌّ)[1]

بەڵام زانایانی ئەزهەر ڕایان پێچەوانەیە لەگەڵ زانایانی سعودیەو خەلیج و یادکردنەوەی ئەم

---

١- پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

ڕۆژە بە دروست دەزانن، شیخ أسامه فتوح کە لە زانایانی ئەزهەرە دەفەرمووێت: یادکردنەوەی ئەم ڕۆژە و هاوشێوەی ئەم ڕۆژەش دەچنە باسی نەریتەکان(عادات)ەوە لەبەر ئەوە یادکردنەوەیان دروستەو ئەو فەرموودەی پێغەمبەرﷺ نایگرێتەوە کە دەفەرمووێت: (مَن أحدثَ في أمرِنا هذا ما لَيسَ مِنهُ فهو رَدٌ) چونکە ئەو فەرموودەیە تایبەتە بە عیبادەتەوە، نەوەکو نەریتەکانەوە، وە کاتێك ئەو ڕۆژە دەخەینە تاقیگەی (مفاسد و مصالح)ەوە دەبینین دەچێتە چوارچێوەی هاوکاری کردن لەسەر خێر وچاکە(تعاون على البر والتقوى) وە ئەم ڕۆژە ڕێنمونی تێدا دەکرێت بۆ چاکەو یارمەتی و سەرپەرشتی نازداران و ....[1]

## ڕێزی نازداران لە ئیسلامدا

بەر لەوەی ئاینی پیرۆزی ئیسلام بێت نازداران هیچ مافێکیان نەبوو، وە خاوەنی پێگەیەکی نزم بوون لە ناو کۆمەڵگادا،[2] وە زرر جار کاتێك کە منداڵێك باوکی دەمرد خزمە نزیکەکانی دەستیان دەگرت بەسەر ماڵ و سامانەکەیدا و دوای گەورە بوونی بۆیان نەدەگێڕایەوە، بەڵام ئاینی پیرۆزی ئیسلام هات و ڕێز و کەسایەتی گێڕایەوە بۆ نازداران و ستەم لێکردنیانی کرد بە هێڵی سور و چەندین هەڕەشەی لەو کەسانە کرد کە بێڕێزی بە نازداران دەکەن و ماڵ و سەروەت و سامانیان بە ستەم دەخۆن، ئەوانەی خوارەوەش بەشێکن لەو ڕێز و پلە و پایانەی کە ئیسلام بە نازداران و چاکەکاران لەگەڵ نازدارانی داوە:

* سەرەتا گەورەترین ڕێز و پلە و پایە بۆ نازداران ئەوەیە کە گەورەترین و خۆشەویســــترین

---

١ـ سایتی: المنارات.

٢ـ ئەمەش یەکێك بوو لە لادانەکانی مرۆڤایەتی لە پەیامی پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام، لەگەرنا هەموو پێغەمبەران و هەموو دینە ئاسمانیەکانی تری پێش ئیسلام پێداگریان کردووە لەسەر ڕێزگرتن و یارمەتیدانی نازداران.

بونەوەری خودا کە گەورەمان پێغەمبەری محمدﷺ بە بێ نازی باوك و دایکی گەورە بووە!! ئەوەش ئەوەمان پێدەڵێت: کە لەدەستدانی دایك و باوك دابەزینی پلەو پایە نیە" بەڵکوو بەرزبونەوەی پلەو پایەیە، ئەگەرنا هەرگیزاو هەرگیز خودای پەروەردگار خۆشەویستترینی کەسی خۆی بە بێ دایك و باوکی گەورە نەدەکرد.

* باشترین ماڵ ئەو ماڵەیە کە نازدارێکی تێدایەو بە باشی مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، وە پێچەوانەکەشی بە پێچەوانەوە، گەورەمان ابو هریرەرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: ( خَيْرُ بَيْتٍ فِي الْمُسْلِمِينَ بَيْتٌ فِيهِ يَتِيمٌ يُحْسَنُ إِلَيْهِ، وَشَرُّ بَيْتٍ فِي الْمُسْلِمِينَ بَيْتٌ فِيهِ يَتِيمٌ يُسَاءُ إِلَيْهِ)[1] واتا: باشترین ماڵ ئەو ماڵەیە کە نازدارێکی تێدایەو چاك مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت، وە خراپترین ماڵیش ئەو ماڵەیە کە نازدارێکی تێدایەو خراپ مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێت.

* ئەو کەسەی یارمەتی نازداران دەدات هاوڕێی پێغەمبەرەﷺ لە بەهەشتدا: پێغەمبەری خوداﷺ لە فەرموودەیەکدا کە سەهلی کوڕی سەعدرضي الله عنه بۆمان دەگێڕێتەوە هانمان دەدات لەسەر یارمەتی نازداران و دەفەرمووێت: (أَنَا وَكَافِلُ الْيَتِيمِ كَهَاتَيْنِ فِي الْجَنَّةِ، وَأَشَارَ بِالسَّبَّابَةِ وَالْوُسْطَى، وَفَرَّقَ بَيْنَهُمَا قَلِيلاً)[2] واتا: من و سەرپەرشتیاری نازداران لە بەهەشتدا وەکو ئەو دوو پەنجە وەهاین" ئاماژەی بۆ هەردوو پەنجەی شەهادە و ناوەڕاست کردوو کەمێك لێکی جیاکردنەوە.

* ئیسلام یارمەتیدانی نازدارانی بە چارەسەر داناوە: پیاوێك هاتە لای پێغەمبەری خوداﷺ و سکاڵای دڵ ڕەقی خۆی لەلای ئەو کرد، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (أَتُحِبُّ أن يَلِينَ قَلْبَكَ، و

١- پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢- پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

تُدرِكَ حاجَتَك؟ ارْحَمِ اليَتيمَ، وامسَح رأسَهُ، وَأَطعِمهُ مِن طعامِكَ" يَلِنْ قَلبُكَ، و تدرك حاجتُكَ)[1]واتا: ئایا دەتهەوێت دڵت نەرم بێت و پێویستیەکانت جێبەجێ ببێت" ئەوە بەسۆزبە لەگەڵ نازداراندا و دەست بەسەریاندا بهێنەو لە خواردنی خۆت بیاندەیە" ئەوکات دڵت نەرم دەبێت و پێویستیەکانیشت بۆ دێنەجێ.

* ڕەنجاندنی نازداران و ستەم لێکردنیان یەکێکە لە تاوانە گەورەکان: خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ الَّذِينَ يَأْكُلُونَ أَمْوَالَ الْيَتَامَى ظُلْمًا إِنَّمَا يَأْكُلُونَ فِي بُطُونِهِمْ نَارًا وَسَيَصْلَوْنَ سَعِيرًا﴾[2]واتا: بێگومان ئەو کەسانەی ماڵ و سامانی نازداران بە ستەم دەخۆن" ئانەوانە تەنها ئاگر دەخۆن و ئەو ماڵە لە قیامەتدا دەبێتە ئاگر لە ناو سکیاندا، وە لە قیامەتدا دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە. وە خودای پەروەردگار لە ئایەتێکی تردا نکوڵی کردووە لە ڕەنجاندنی دڵی نازداران و دەفەرموێت: ﴿فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ﴾[3]واتا: ئەی پێغەمبەرﷺ وە ئەی باوەڕداران بەهیچ شێوەیەك نازداران مەچەوسێننەوە و دڵیان مەڕەنجێنن. پێشەوا عمری کوڕی خطابرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إِنَّ الْيَتِيمَ إِذَا ضُرِبَ اهْتَزَّ عَرْشُ الرَّحْمَنِ لِبُكَائِهِ ، فَيَقُولُ اللَّهُ تَعَالَى: يَا مَلَائِكَتِي مَنْ أَبْكَى الَّذِي غَيَّبْتُ أَبَاهُ فِي التُّرَابِ، وَهُوَ أَعْلَمُ بِهِ. قَالَ: تَقُولُ الْمَلَائِكَةُ: رَبَّنَا لَا عِلْمَ لَنَا. قَالَ : فَإِنِّي أُشْهِدُكُمْ أَنَّ مَنْ أَرْضَاهُ فِيَّ ، فَأُرْضِيهِ مِنْ عِنْدِي يَوْمَ الْقِيَامَةِ. قَالَ : وَكَانَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ يَمْسَحُ رُؤُوسَهُمْ وَيَلْطُفُ بِهِم. وَكَانَ عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِرضي الله عنه يَفْعَلُ ذَلِكَ)[4]واتا: بەڕاستی کاتێك نازدارێك لێیدەدرێت عەرشی

---

١- پێشەوا بیهقی لە (شعب الإیمان)دا گێڕاویەتەوە و (حسن)

٢- النساء: ١٠

٣- الضحی: ٩

٣- پێشەوایان ابو نعیم أصبهانی لە (أخبار: ٢/ ٢٦٩)دا و سەمەرقەندی لە تنبه الغافلین: ٢٣٢)دا باسیان کردووە.

خودا دەکەوێتە لەرزە لەبەر گریانی ئەم نازدارە، ئینجا خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ئەی فریشتەکانم" ئەوە کێیە ئەو کەسە دەگریەنێت کەمن باوکی ئەوم لە ژێر زەویدا شـــاردوتەوە!! وە بۆ خۆشی شارەزاترو زانــــاترە، فریشتەکان دەڵێن: پەروەردگارە ئێمە نازانین، خودای پەروەردگاریش دەفەرمووێت: ئەوە من ئێوە دەکەم بە شاهید" هەر کەسێك بچێت لەبەر خاتری من دڵی ئەو نازدارە بداتەوە و ڕازی بکات" ئەوە من لە قیامەتدا لەلایەن خۆمەوە ڕازی دەکەم!! جا لەبەر ئەوە پێغەمبەری خوداﷺ دەستی بەسەری نازداراندا دەهێناو لەگەڵیاندا نەرم و نیان و بەسۆز بوو، بەهەمان شێوە پێشەوا عمری کوڕی خطابیش‌رضي الله عنه وەهای دەکرد.

جا ئەوەی ڕابرا بەشێك بوون لە ڕێزی نازداران و ئەو کەسانەی سەرپەرشتی نازداران دەکەن، ئێستا دێینە سەر باسی مافەکانی نازداران لە ئیسلامدا.

## مافەکانی نازداران لە ئیسلامدا

ئاینی پیرۆزی ئیسلام چەند مافێکی داناوە بۆ نازداران لەسەر دەوڵەت وکەس وکار و کۆمەڵگا، وە پێویستە لەسەر دەوڵەت وکەس و کاریان وکۆمەڵگاش بە گشتی ئەو مافانەیان پێ بدەن، ئەمانەی خوارەوەش دیارترین مافەکانی نازدارانن لە ئیسلامدا:

١ـ پێویستە لەسەر خزمە نزیکەکانیان بەشێوەیەکی جوان بەخێویان بکەن و بژێوی ژیانیان بۆ دابین بکەن، جا ئەگەر سەروەت و سامانی خۆیان هەبوو لە هی خۆیان، ئەگەر نا پێویستە خزمە نزیکەکانیان بژێوی ژیانیان دابین بکەن، خودا و پێغەمبەرەکەی ﷺ لە چەندین ئایەت و فەرموودەدا ئاماژەیان بە مافی بەخێو کردن و بژێوی نازداران کردووە بەسەر خزمە نزیکەکانیانەوە، وە خزمە نزیکەکانی هانداوە بۆ سەرپەرشتی نازداران، عەمری کوڕی جەموح هاتەخزمەت پێغەمبەری خوداﷺ و لێی پرسی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ من پیر بووم و ماڵ و سامانێکی زۆرم هەیە، ئایا ئەو ماڵ وسامانە چۆن ببەخشم و بیدەم بەکێ؟ خودای پەروەردگار

لە وەڵامیدا ئەم ئایەتەی دابەزاند و فەرمووی: ﴿يَسْأَلُونَكَ مَاذَا يُنفِقُونَ قُلْ مَا أَنفَقْتُم مِّنْ خَيْرٍ فَلِلْوَالِدَيْنِ وَالْأَقْرَبِينَ وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ وَمَا تَفْعَلُوا مِنْ خَيْرٍ فَإِنَّ اللَّهَ بِهِ عَلِيمٌ﴾[1][2] واتا: ئەی پێغەمبەرﷺ پرسیارت لێدەکەن: چ ببەخشن و چۆن ببەخشن؟ تۆش لەوەڵامدا پێیان بڵێ: هەر خێرێکتان هەیە بۆ بەخشین ئەوە بیبەخشن بە دایك و باوك و خزمە نزیکەکانتان و نازداران و هەژاران و ڕێبواران، وە بزانن بێگومان هەر خێر و چاکەیەك بکەن خودای گەورە پێی زانا و ئاگادارە. وە پێغەمبەری خوداﷺ لە فەرموودەیەکدا دەفەرموێت: (كافِلُ اليَتيمِ لهُ أو لِغيرِهِ، أنا وهوَ كهاتينِ في الجَنَّةِ)[2] واتا: ئەو کەسەی کە سەرپەرشتی نازدارێکی خزم یان نازدارێکی خەڵك دەکات ئەوە لەگەڵ مندا وەکو ئەم دوو پەنجەیە وەهایە لە بەهەشتدا، ئاماژەی بە پەنجەی شەهادە و ناوەڕاست کرد.

٢ـ پێویستە لەسەر خزمە نزیکەکانی سەرپەرشتی نازداران بکەن و بە شێوەیەکی جوان و چاك پەروەردەیان بکەن و سەرپەرشتی هەموو سەروەت و سامان و داراییەکانیان بکەن هەتا ئەو کاتەی گەورە و هۆشیار دەبن، پاشان بەشێوەیەکی جوان و بە ئامادەبوونی دوو شاهید ئەو سەروەت و سامانەیان بۆ بگێڕنەوە و سەرپەرشتیەکەیان بدەنەوە دەست خۆیان، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَابْتَلُوا الْيَتَامَى حَتَّى إِذَا بَلَغُوا النِّكَاحَ فَإِنْ آنَسْتُم مِّنْهُمْ رُشْدًا فَادْفَعُوا إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ وَلَا تَأْكُلُوهَا إِسْرَافًا وَبِدَارًا أَن يَكْبَرُوا وَمَن كَانَ غَنِيًّا فَلْيَسْتَعْفِفْ وَمَن كَانَ فَقِيرًا فَلْيَأْكُلْ بِالْمَعْرُوفِ فَإِذَا دَفَعْتُمْ إِلَيْهِمْ أَمْوَالَهُمْ فَأَشْهِدُوا عَلَيْهِمْ وَكَفَى بِاللَّهِ حَسِيبًا﴾[3] واتا: نازداران تاقی بکەنەوە بەوەی کە هەندێك پارەیان بدەنێ و بزانن چۆن مامەڵەی

---

١ـ البقرة: ٢١٥

٢ـ جامع الأحكام للقرطبي: ٣/ ٣٧

٣ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣ـ النساء: ٦

پێوە دەکەن، وە سەرپەرشتیان بکەن هەتا کاتی هاوسەرگیریان دێت، ئەوسانەگەر هەستتان کرد ژیرو سالارن ئەوە ماڵ و سامانەکەیان پێبدەنەوە، نەکەن ماڵ و سامانیان بخۆن بەوەی زێدەمەسرەفی بکەن لە خەرجکردنیدا، لەترسی ئەوەی نەوەکو گەورە بن و زوو لەدەستان بسێننەوە، جا ئەوەی دەوڵەمەندە با دەستی بپارێزێت، وە ئەوەی هەژاریشە با لێی بخوات بەلام لە سنور دەرنەچێت و زێدەمەسرەفی تێدا نەکات، وە کاتێك کە ماڵ و سامانەکەیان بۆ دەگێڕنەوە" ئەوە شاهیدیان لەسەر بگرن، هەرچەندە تەنها خودا بەسە بۆ لێپرسینەوە و چاودێری.

٣ـ چاکە لەگەڵ کردن و بەخشین پێیان، یەکێکیترە لە مافەکانی نازداران بەسەر و کۆمەڵگادا بە گشتی و دەوڵەت بە تایبەتی: ئێمە لە مافی یەکەمدا گوتمان لەسەر خزمە نزیکەکانی نازدار پێویستە ئەگەر بەخێویان بکەن و بژێوی نازداران بگرنە ئەستۆ، بەلام لە کاتێکدا ئەگەر نازدارێك خزمی نزیکی نەبوو، وەیان خزمە نزیکەکانی توانای دەستەبەر کردنی بژێوی ژیانیان نەبو"ئەوە لەسەر دەوڵەت و موسڵمانان پێویستە کە سەرپەرشتی ئەو نازدارە بکەن، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا غَنِمْتُم مِّن شَيْءٍ فَأَنَّ لِلَّهِ خُمُسَهُ وَلِلرَّسُولِ وَلِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ وَابْنِ السَّبِيلِ﴾[1] واتا: بزانن ئەو ماڵ و داراییەی کە لە جەنگەکاندا بەدەستتان هێناوە ئەوە پێنج یەکی بۆ خودا و پێغەمبەرﷺو خزمانی نزیکی پێغەمبەرﷺ و نازداران و هەژاران و ڕێبوارانە.

جا ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە نازداران مافیان هەیە لە ماڵی گشتی دەوڵەتدا، چونکە غەنیمە ماڵی گشتیە و خودای پەروەردگاریش بەشێکی لێ بڕیارداوە بۆ نازداران.

وە هەرچی موسڵمانانیشن بە گشتی بەهەمان شێوە لەسەریان پێویستە دەستباری نازداران بگرنەوە، خودای پەروەردگار ستایشی ئەو کەسانە دەکات و بە بالآیاندا هەڵدەدا کە یـــارمەتی

١ـ الأنفال: ٤١

نازداران دەدەن و دەفەرمووێت: ﴿وَيُطْعِمُونَ الطَّعَامَ عَلَى حُبِّهِ مِسْكِينًا وَيَتِيمًا وَأَسِيرًا﴾[1]واتا: یەکێك لە صیفەتی بەندە چاکەکان ئەوەیە: کە نان و خواردن دەبەخشن بە هەژاران و نازداران و دیلەکان، لە کاتێکدا ئەو نان و خۆراکەیان زۆر خوشدەوێت و دڵیان پێیوەیە.

وە گەورەمانکەعبی کوڕی مالكرَضِيَ اللهُ عَنْهُدەفەرمووێت: کێشە کەوتـــە نێوان ابی لبابە و نازدارێکەوە لەسەر بەری دارخورمایەك کە لە نێوانیاندا بوو، کێشەکەیان هێنایە لای پێغەمبەری خوداﷺ، پێغەمبەری خوداشﷺ حەقەکەی بە ابی لبابە دا، لەو کاتەدا نازدارەکە دەستی کرد بە گریان، پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: (دَعهُ لَهُ)واتا: ئەی ابالبابە لێی گەڕێ با بۆ ئەو بێت، بەڵام ابو لبابە گووتی: نەخێر نایدەمێ، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: (فَأَعطِهِ إِياهُ وَ لَكَ مِثلَهُ فِي الْجَنَّةِ)واتا: پێی بدە هاوشێوەی ئەو دارخورمایەت پێدەدرێت لە بەهەشتدا، بەڵام ابو لبابە هەر ڕازی نەبوو پێی نەدا، دواتر ابو دحداح چوو بۆ لای ابی لبابە و فەرمووی: ئەی ئەبالبابە ئایا ئەو دار خورمایەت دەفرۆشی بە دوو باغی خورما؟ ئەویش گووتی: بەڵێ، پاشان ابو دحداح هاتە خزمەت پێغەمبەری خوداوﷺفەرمووی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئەگەر ئەو دار خورمایە بدەم بەو نازدارە ئایا خودای گەورە هاوشێوەی ئەوم پێدەدات لە بەهەشتدا؟ فەرمووی: بەڵێ، ئەویش دارخورمایەکەی دا بە نازدارەکە، پێغەمبەری خوداشﷺ چەند جارێك فەرمووی: (كَم مِنْ عَذقٍ دوَّاحٍ لِأَبِي الدَّحداحِ فِي الْجَنَّةِ)[2] واتا: دەبێت چەند دارخورمای گەورەی ڕازاوە ئامادە کرابن بۆ ابودحداح لە بەهەشتدا.

---

١ـ الإنسان: ٨

٢ـ پێشەوایان: احمد و ابن حبان و طبرانی گێڕاویانەتەوە و (صحیح)

# ئادابەکانی مامەڵە کردن لەگەڵ نازداراندا

١ـ دڵدانەوەو دڵخۆشکردنیان...: بەشیری کوڕی عەقرەبەر دەفەرمووێت: کاتێك باوکم لە غەزای ئوحوددا شەهید بوو، هاتمە لای پێغەمبەری خودا دەگریام، پێغەمبەری خوداﷺ فەرمووی: (یا حبیب، مایُبکِیكَ؟ أَمَا تَرْضَى أَنْ أَكُونَ أَنَا أَبُوكَ، وَعَائِشَةُ أُمُّكَ؟ قُلْتُ: بَلَى، بِأَبِي أَنْتَ وَأُمِّي يَا رَسُولَ اللّٰهِ)[1] واتا: ئەی خۆشەویست، بۆ دەگری؟ ئایا ڕازی نابی کە من باوکت بم و عائیشەش دایکت بێ؟!! منیش گوتم: بەڵێ ڕازیم بە دایك و باوکەوە بە قوربانت بم ئەی پێغەمبەری خوداﷺ.

٢ـ بەهیچ شێوەیەك نابێت بێڕێزی بکرێت بە نازداران و نابێت هیچ ووشە و کردارێکیان لەگەڵ بەکار بهێنرێت کە دڵیان گەردێ بگرێت: خودای پەروەردگار نکۆڵی کردووە لە ڕەنجاندنی دڵی نازداران و دەفەرمووێت: ﴿فَأَمَّا الْيَتِيمَ فَلَا تَقْهَرْ﴾[٣] واتا: ئەی پێغەمبەرﷺوە ئەی باوەڕداران بەهیچ شێوەیەك نازداران مەچەوسێننەوە و دڵیان مەڕەنجێنن. وە خودای پەروەردگار هەڕەشەی کردووە لەو کەسانەی کە ڕێزی نازداران ناگرن و دەفەرمووێت: ﴿كَلَّا بَل لَّا تُكْرِمُونَ الْيَتِيمَ﴾[٢] واتا: نەخێر ئائەوانە ڕێزی نازداران ناگرن و نازیان پێنادەن....... ئائەوانە کاتێك قیامەت دێت پەشیمان دەبنەوە و دەڵێن: ﴿يَقُولُ يَا لَيْتَنِي قَدَّمْتُ لِحَيَاتِي * فَيَوْمَئِذٍ لَّا يُعَذِّبُ عَذَابَهُ أَحَدٌ * وَلَا يُوثِقُ وَثَاقَهُ أَحَدٌ﴾[٣] واتا: ئەوسا دەڵێن: ئای خۆزگە بۆ ئەم ژیانە شتێکمان پێش بخستبایە لە کردەوەی چاك، وە ئەو کردەوە چاکانەی لە دونیا نەماندەکرد- لە ناویاندا ڕێزی نازداران ـ بمانکردبایە، جا ئەو ڕۆژە هیچ کەسێك وەکو ئەو کەسە ئازار و سزا نادرێت،

---

١ـ پێشەوا بوخاری لە( تأریخ الکبیر)دا و ابن ابی حاتم لە (الجرح والتعدیل)دا گێڕاویانەتەوە.

٢ـ الفجر: ١٧

٣ـ الفجر: ٢٤ـ ٢٦

وە هیچ كەسێك وەكو ئەو نابەسترێتەوە.

٣- پێویستە لەسەر موسڵمانان بە جوانترین شێوە مامەڵەیان لەگەڵدا بكەن و سۆز و نەرم و نیانیان بۆ بنوێنن و دەست بەسەریاندا بهێنن، ابو أمامە رضي الله عنه دەفەرموێت: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (مَنْ مَسَحَ رَأْسَ يَتِيمٍ لَمْ يَمْسَحْهُ إِلَّا لِلَّهِ ، كَانَ لَهُ بِكُلِّ شَعْرَةٍ مَرَّتْ عَلَيْهَا يَدُهُ حَسَنَاتٌ)[1] واتا: هەركەسێك دەست بەسەری نازدارێكدا بهێنێت تەنها لەبەر خاتری خودا" ئەوە بەهەر مویەك كە دەستی بەسەریدا هێناوە چەندین چاكەی بۆ دەنوسرێت.

٤- نابێت ماڵ و سامانی نازداران بەهەدەر بدرێت و تێكەڵ بەماڵی تر بكرێت: خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَآتُوا الْيَتَامَى أَمْوَالَهُمْ وَلَا تَتَبَدَّلُوا الْخَبِيثَ بِالطَّيِّبِ وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَهُمْ إِلَى أَمْوَالِكُمْ إِنَّهُ كَانَ حُوبًا كَبِيرًا﴾[2] ئەی خەڵكینە ماڵ و سامانی نازداران بدەنەوە دەستی خۆیان كاتێك گەورە بوون و هۆشمەندیان لێدەركەوت، ماڵ و سامانی پیسی خۆتان مەگۆڕنەوە بە ماڵ و سامانی پاكی ئەوان، وە بەهیچ شێوەیەك ماڵ و سامانی ئەوان لەگەڵ ماڵ و سامانی خۆتاندا مەخۆن، بەڕاستی ئەو كارە گوناهو ستەمێكی گەورەیە.

پێشەوایان مقاتل و كلبی رحمهماالله دەفەرموون: ئەم ئایەتە دەربارەی پیاوێكی غەطفانی دابەزی، ئەم پیاوە برازیەكی نازداری لەلا بوو، ئەم برازایەی ماڵ وسامانێكی زۆری هەبوو و هەمووی لای ئەو مامەی بوو، كاتێك نازدارەكە گەورەبوو داوای ماڵەكەی كردەوە، بەلام مامەكەی نكۆڵی كرد لەوەی ماڵەكەی بداتەوە، خودای پەروەردگاریش ئەم ئایەتەی دابەزاند، جاكاتێك ئەم پیاوە غەطفانیــە ئەم ئایەتی بیست گووتی:(نَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الحوبِ الْكَبيرِ!وَرَدَّ الْمالِ)[1] واتا:پەنا دەگرم بەخودا لە ستەم وتاوانی گەورە،پاشان ماڵەكەی بۆبرازایەكەی گێڕایەوە.

---

١- پێشەوایان احمد لە مسندداو طبرانی لە معجم الكبیردا گێڕاویانەتەوە.

٢- النساء: ٢

جا هەرکەسێك ماڵ و سامانی نازدارێکی لایە با وەك ئەم پیاوە غەطفانیـــە بڵێت: (نَعُوذُ بِاللهِ مِنَ الحُوبِ الْكَبِيرِ) وە ماڵەکە بگێڕێتەوە بۆ نازدارەکە.

٥ـ خودای گەورە مافەکانی نازدارانی دوای مافەکانی خزمە نزیکەکان و پێش مافی هەژاران داناوە، پێویستە موسڵمانیش بەپێی ئەم ڕیزبەندیە مافەکانی نازداران بدات و مامەڵەیان لەگەڵدا بکات، خودای پەروەردگار دەفەرموویت: ﴿وَاعْبُدُوا اللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا بِهِ شَيْئًا وَبِالْوَالِدَيْنِ إِحْسَانًا وَبِذِي الْقُرْبَى وَالْيَتَامَى وَالْمَسَاكِينِ﴾[٢]واتا: ئەی خەڵکینە تەنها خودا بپەرستن و هیچ هاوبەشێکی بۆ بڕیار مەدەن، وە چاکەکاربن لەگەڵ دایك و باوکتان و خزمە نزیکەکانتان و نازداران و هەژاراندا...

لە کۆتایی ئەم باسەدا دوای ئەوەی ئەم ئایەت و فەرموودانەمان باس کرد دەربارەی گەورەیی نازداران و مافەکانیان و چۆنیەتی مامەڵ کردن لەگەڵیاندا، بۆمان دەرکەوت کە چاکە کردن لەگەڵ نازداراندا ئەم سود قازانجانە بە مرۆڤی موسڵمان دەگەیەنێت:

١ـ ئەو کەسەی چاکە لەگەڵ نازداراندا دەکات دەبێتە هاوڕێی پێغەمبەرﷺلە بەهەشتدا، بێگومان ئەوەش گەورەترین شەرەف و پلە پایەیە.

٢ـ ئەو نازدارەی یارمەتی دەدەیت ئەگەر خزم بێت" ئەوە پاداشتەکەی دوو بەرامبەرە، هەم پاداشتی بەجێهێنانی پەیوەندی خزمایەتی وە هەم پاداشتی یارمەتیدانی نازدارێك.

٣ـ یارمەتی دانی نازداران بەڵگەیە لەسەر سروشتی پاکی مرۆڤایەتی و باوەڕی تەواو.

٤ـ دەربڕینی سۆز و خۆشەویستی بۆ نازدارێك باشترین چارەسەرە بۆ دڵڕەقی.

٥ـ ئەو ماڵەی نازدارێکی تێدا پەروەردە دەکرێت" بە شاهیدی پێغەمبەرﷺ باشترین ماڵە.

---

١ـ جامع الأحكام القرآن: ٥/ ١٢

٢ـ النساء: ٣٦

٦ـ ڕیزگرتنی نازدارێك ڕێزگرتنی پێغەمبەری خودایەﷺ چونکە هەردووکیان هاوبەشن لە صیفەتی نازداریدا.

٧ـ سەرپەرشتی کردنی نازداران جوانترین صیفەتە کە خوداو پێغەمبەرەکەیﷺ وەصفیان کردووە و پاداشتی گەورەیان بۆ بڕیار داوە.

٨ـ سەرپەرشتی کردنی نازداران لە لایەن دایکیانەوە دوای مردنی باوکیان بەڵگەیە لەسەر چاکیەتی و پاکیەتی دایکیان، چونکە بە بەڵێنداری پێغەمبەرﷺ دەچێتە بەهەشتەوە، وە تەنها خەڵکی چاك و پاکیش دەچێتە بەهەشت.

٩ـ یارمەتیدانی نازداران کۆمەڵگایەکی دڵنەرم و بێ ڕق و کینە بنیاد دەنێت.[(١)(٢)]

جا خوێنەری بەڕێز: ئەوەی ڕابرا بەشێك بوون لە ماف و شێوازی مامەڵە و ڕێز و گەورەیی نازداران لە ئیسلامدا، دیسان دەیڵێینەوە لە ئیسلامدا هەموو ڕۆژێك ڕۆژی نازدارانە" لەبەر ئەوە ئێمەی موسڵمان هیچ ئیشێکمان بە دیاریکردنی ڕۆژێك نیە بۆ نازداران.....



١ـ موسوعة نضرة النعيم: ٨/ ٣٢٥٣

٣ـ بۆ ئەم بابەتە سودم وەرگرتووە لە کتێبی تبصرة الأنام بالحقوق في الإسلام: ١٣٣ـ ١٤٣

# جەژنی کرێکارانی جیهــــــان

پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (ما أَكَلَ أَحَدٌ طَعاماً خَيراً مِنْ أَنْ يأكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ وَإنَّ نَبِيَ اللهِ داود كانَ يأكُلُ مِن عَمَلِ يَدِهِ)

# جەژنی کرێکارانی جیهان (١ی ئایار)

لە وولاتانی ئەوروپا و ئەمریکا هەتا سەدەی هەژدەش چینی کرێکار چینێکی چەوساوەو ماف خوراو و بێ کەس بو، پاشان لە سەدەی هەژدە وردە وردە کرێکاران کەوتنە خۆیان و داوای مافەکانی خۆیانیان دەکرد، دواتر لە ژێر فشاری کرێکاران دا کۆمەڵێك ڕێکخراوی چاودێری کرێکاری دروست بون، لەوانە: کۆمەڵەی نیشتیمانی بۆ پارێزگاری لە کرێکاران لە بەریتانیا لەساڵی ١٨٣١، دوای ئەوە لە وولاتانی تریش کرێکاران کەوتنە خۆیان، بۆ نمونە لە فەڕەنسا لە ساڵی ١٨٨٤دا مافی کردنەوە ڕێکخراوی چاودێری کرێکارانیان بە دەست هێنا، وە لە ئیتاڵیا هەتا ساڵی ١٨٨٩ مانگرتن لە کارو داواکردنی ماف لە لایەن کرێکارانەوە قەدەغەبو، کەواتا: سەرهەڵدانی بزوتنەوە کرێکاریەکان لە ئەوروپا دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی هەژدە، وە لە ئەمریکاش هەتا کۆتاییەکانی سەدەی هەژدە چینی کرێکار وەك مرۆڤی پلە دوو سەیر دەکراو کارێکی زۆریان پێدەکرد و مافێکی کەمیان پێدەدا، لە بەر ئەوە لە کۆنگرەی جنێفی ساڵی ١٨٦٦ بانگەشە کرا بۆ دەنگ بەرزکردنەوە بۆ کەمکردنەوەی ماوەی کارکردن بۆ هەشت کاتژمێر، ئەم بانگەشەیە لە ئەمریکا دەنگدانەوەیەکی زۆری بەخۆیەوە بینی،هەتا لە ساڵی١٨٨٤دا ڕێکخراوی (فرسان العمل) ی ئەمریکی داوای جێبەجێ کردنی بڕیاری کارکردنی هەشت کاتژمێری دا لە شەممەی یەکەمی مانگی ئایاری ١٨٨٦دا،

## سەرەتای سەرهەڵدانی ئەم جەژنە

لە مانگی ئایاری ساڵی ١٨٨٦دا کرێکاران لە شاری شیکاغۆ خۆپیشاندانێکی گەورەیان ڕێکخست و تیایدا داوای کەمکردنەوەی ماوەی کارکردنیان دەکرد بۆ هەشت کاتژمێر، لە کاتێکدا خۆپیشاندانەکە بە هێمنی بەڕێوەدەچو پۆلیسی شاری شیکاغۆ دەستی کرد بەتەقە کردن لە کرێکارانی خۆپیشاندەر، بە بیانوی ئەوەی گوایە خۆ پیشاندەران تەقەیان لە پۆلیس کردووە،

لە ئەنجامدا زیاتر لە دوو سەد کرێکار بونە قوربانی، پاشان پۆلیس ژمارەیەکی لە هەڵسوڕاو و چاودێرانی کرێکارەکان دەستگیر کرد، دوای دادگاییەکی نا دادپەروەرانە هەشتیان حوکمی لە سێدارەدانیان بۆ دەرچوو و ئەوانی تریش حوکمی سجنیان بۆ دەرچوو بۆ ماوەی سێ بۆ پازدە ساڵ، ئەو هەڵسوڕاو چاودێرانەی حوکمی سێدارەیان بۆ دەرچوو بریتی بون لە: (ألبرت بارسون، أوجست سبايس، سمول فيلدن، مايكل شواب، جورج أنجل، أدولف فيشر، لويس لنج، وأوسكار نيب ) وە لە ١٨٨٧/١١/١١دا حوکمەکەیان بەسەردا جێبەجێ کرا.

* وە بە شێکی تر دەڵێن ڕوداوی ١ی ئایار بەم شێوەیە بووە: لە ساڵی ١٨٨٦دا دوای ئەوەی پۆلیس تەقەی لە چوار خۆ پیشاندەر کردبوو لە کۆمپانیای (ماكورميك) بۆ چنینەوەی بەرو بومی کشتوکاڵی، بۆ ڕۆژی دواتر کرێکاران لە گۆڕەپانی (هايماركت) کۆبونەوە بۆ دەربڕینی نارەزایی بەڵام لە ناکاودا نارنجۆکێك لە ناو خەڵکەکە تەقیەوە و بو بە هۆی کوژرانی دوازدە کەس کە حەوتیان پۆلیس بون، ئەو کات کەس نەیزانی کێ ئەم نارنجۆکەی تەقاندووە، دواتر هەشت کەسیان لە سەر ئەم بابەتە درانە دادگا کە هیچ پەیوەندیەکیان بەم کارەوە نەبوو، وە حوکمی سێدارەیان بۆ حەوتیان دەرکرد جێگای باسە پاش ١١ساڵ بەرپرسی پۆلیسی شیکاغۆ لە نەخۆشخانە لە کۆتاییەکانی تەمەنیدا ویژدانی جوڵاو دانی نا بەوەی کە تەقاندنەوەی نارنجۆکەکە کاری پۆلیس بووە، بەمەش خەڵکی ئەمریکی بە گشتی و کرێکاران بەتایبەتی وروژان و داوای پێداچونەوەی دادگاییەکەیان کرد، دوای دووبارە کردنەوەی دادگاییەکە بڕیاری بێ تاوانی کرێکاران دراو ١ی ئایاریش کرا بە جەژنی جیهانی کرێکاران .[1]

١- سایتی: euro news وە منتديات الأحلام وە ویکیبیدیا.

# پەیوەندی شیوعیەکان بەم جەژنەوە

ئەوەی ڕابرا هۆکاری سەرهەڵدانی جەژنی جیهانی کرێکاران بو، وەك ئاماژەمان پێکرد ئەم جەژنە سەرەتا لە ئەمریکا سەری هەڵداوە نەوەك لە ئەوروپا و وولاتانی یەکیەتی سوڤیەتی، بەڵام ئەوەی ئەمڕۆ تێبینی دەکرێت ئەوەیە: کە لە جیهاندا بە گشتی و لە عێراق و کوردستانیش بە تایبەتی حیزبە شیوعی و مارکسیەکان خۆیان دەکەن بە خاوەنی ئەم جەژنەو بانگەشەی بۆ دەکەن و لە ڕۆژی ١ی ئایاردا ئاهەنگ و خۆپیشاندان و کارو چالاکی ڕێکدەخەن و گوتاف دژی سەرمایەداری دەڵێنەوەو داوای مافی کرێکاران دەکەن، هەتا لۆگۆ و ئالآی حیزبی شیوعی کوردستان چەکوچ و داسی تێدایە، وەك ئاماژە بۆ چینی کرێکار، جا با بزانین پەیوەندی حیزبە شیوعی و سۆسیالیستیەکان بەم جەژنەوە چیە؟

دوای گەرم و گوڕ بونی خۆ پیشاندانە کرێکاریەکان لە ئەمریکا لە دوای ساڵی ١٨٨٠وە، لە ساڵی ١٨٨٩دا کۆنگرەی حیزبە سۆسیالستەکان(إشتراکی)یەکانی جیهان بەسترا لە پاریس، دوای تەواوبونی کۆنگرەکە لە ڕاگەیەندراوێکدا پشتگیری خۆیان بۆ داواکاری و خۆ پیشاندانەکانی کرێکارانی ئەمریکا دەربڕی، وە بڕیاریاندا لە ١ی ئایاری ساڵی ١٨٩٠دا خۆ پیشاندانی گەورە لە زۆرێك لە وولاتانی شیوعی و سۆسیالستی ڕێك بخەن، لە دوای ئەم مێژووە وە زیاتر ڕێگا درا بە یادکردنەوەی ڕۆژی کرێکاران، وە ئەم ڕۆژە گرنگیەکی تایبەتی هەیە لای حیزب و وولاتانی شیوعی و سۆسیالستی لە جیهاندا، وە دەشکرێ بڵێین: ئەم پەیوەندی جەژنی کرێکاران بە شیوعیەکانەوە یەکگرتنەوەی ئایدۆلۆژیای شیوعیەکانە لەگەڵ باری ژیانی کرێکاران، چونکە حیزبە شیوعیەکان کار لە سەر چینی هەژار دەکەن، کرێکارانیش زۆربەیان هەژارن، وە بەتایبەت لەم ڕۆژگارەدا کە حیزبە شیوعیەکان لە زۆرینەی وولاتانی دونیا لە پاشەکشەدان، ئەم جەژنانە بە هەل دەزانن بۆ هاتنەوە سەر شانۆی سیاسەت و بڵاوکردنەوەی ئایدۆلۆژیاکەیان لەم جۆرە

بۆنانەدا، ئەگەرنا وەك گوتمان خاوەنی ڕاستەقینەی جەژنی کرێکاران ئەمریکیەکانن نەوەك شیۆعیەکان.

## حوکمی بەشداری جەژنی کرێکاران

ئەم جەژنەش وەکو باقی جەژنەکانی تری وەك: (سەری ساڵی زاینی و ڤالانتاین و هەشتی مارس و....) جەژنێکە لە وولاتانی کوفرەوە هاتووە و هیچ پەیوەندیەکی بە ئێمەوە نیە، کەواتا: حوکمی ئەم جەژنەش وەکو جەژنەکانی ترە و قەدەغەیە ـ حرام ـ ە مرۆڤی موسڵمان بەگشتی و کرێکارانی موسڵمان بەتایبەتی بەشداری تێدا بکەن، وە بەتایبەت کە ئەم جەژنە حیزبە شیۆعیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن و خۆیان بەخاوەنی دەزانن ئەوە وەك (السد الزريعة) نابێت بەشداری تێدا بکرێت، نەوەکو کرێکارێکی بێ ئاگا لە شەرعە جوان و تەواوەکەی ئیسلام وا بزانێت کە ئەوە تەنها شیۆعیەکانن داوای مافەکانیان دەکەن و دڵی بەلایاندا بچێت، وە ئێمەی موسڵمان هیچ پێویستیەکمان بەم جۆرە جەژنانە نیە، چونکە هەرگیز لە ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلامدا مافی کرێکار نەخوراوەو کرێکار نەچەوسێنراوەتەوە، بەڵکو ئەگەر هەموو وولاتانی دونیا بێنو مافەکانی ئیسلام بە کرێکارەکانیان بدەن" ئەوە لە دونیادا کێشەیەك نامێنێت بەناوی کێشەی کرێکاران.

## ئیسلام هانی مرۆڤ دەدات بۆ کار

کە بە وردی سەیری قورئانی پیرۆز بکەین دەبینین لە زیاتر لە ۲۹۰ئایەتدا پەروەردگار باسی کار(عمل) و وەرگێراوەکانی ـ مشتقات ـ کردووە، بەمەش بۆمان دەردەکەوێت کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی کار و پاداشتە، ئاینی هێزو بازویە، ئاینی پیشەو بەر و بومە،ئاینی دەستی ماندو لە سەر سکی تێرە، هەر بۆیە لە ئیسلامدا دەستی کارکەر و بەخشەر ڕێزدارترە لە دەستی بێکار و وەرگر، پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرموویەتی: (اليَدُ الْعُلْيا خَيرٌ مِنَ اليَدِ السُّفْلى، وَاليَدُ

الْعُليا الْمُنفِقَةُ والسُّفلى السَّائِلَةُ)[1]واتا: ده‌ستی به‌رز باشتره‌ له‌ ده‌ستی نزم و نه‌وی، وه‌ ده‌ستی به‌رز ده‌ستی په‌یداكه‌ر و به‌خشه‌ره‌، وه‌ ده‌ستی نزم و نه‌وی ده‌ستی ته‌مبه‌ڵ و وه‌رگره‌. وه‌ پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستﷺ فه‌رموویه‌تی:(ما أَكَلَ أَحَدٌ طَعاماً خَيراً مِنْ أَنْ يَأْكُلَ مِنْ عَمَلِ يَدِهِ وَإِنَّ نَبِيَ اللهِ داود كانَ يَأكُلُ مِن عَمَلِ يَدِهِ)[2]واتا: مرۆڤ هیچ خۆراكێك ناخوات باشتر له‌ و خۆراكه‌ی كه‌ به‌ ده‌ستی خۆی په‌یدای ده‌كات، وه‌ پێغه‌مبه‌ر داودیش علیه السلام له‌ به‌ری ده‌ستی خۆی ده‌خوارد .

جا پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست ﷺ موسڵمانان هان ده‌دات له‌ سه‌ر كاركردن و پێیان ده‌فه‌رموێت: كاركردنتان پێ شه‌رم نه‌بێت، چونكه‌ خۆشه‌ویسترین و به‌رێزترینی بونه‌وه‌ره‌كان لای په‌روه‌ردگار كاریان كردووه‌،ئه‌وانیش پێغه‌مبه‌رانن علیهم الصلاة والسلام. گه‌وره‌مان أبو هریرهرضي الله عنه له‌ پێغه‌مبه‌ری خوداوهﷺ بۆمان ده‌گێڕێته‌وه‌ كه‌ فه‌رموویه‌تی: ( ما بَعَثَ اللهُ نَبيًّا إلا رَعَى الْغَنَمَ فَقالَ أصحابُهُ وَأَنتَ؟فَقالَ نَعَم كُنتُ أَرعاها عَلى قَرارِيط لأَهلِ مَكَّةَ)[3]واتا:خودای گه‌وره‌ هیچ پێغه‌مبه‌رێكی نه‌ناردووه‌ مه‌گه‌ر ئه‌و پێغه‌مبه‌ره‌ شوانی كردووه‌!هاوه‌ڵه‌ به‌رێزه‌كان گووتیان: تۆش شوانیت كردووه‌ ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ؟ فه‌رمووی: به‌ڵێ منیش شوانیم كردووه‌ بۆ خه‌ڵكی مه‌ككه‌.وه‌ زۆرێك له‌ پێغه‌مبه‌ران علیهم الصلاة والسلام پیشه‌وه‌ر بوون بۆ نمونه‌: ئیدریس علیه السلام به‌رگدرو بووه‌، نوح علیه السلام دارتاش بووه‌، داود علیه السلام ئاسنگه‌ر بووه‌، ئیبراهیم علیه السلام كوتاڵ فرۆش بووه‌... هتد. وه‌ هه‌ر كه‌سێكیش به‌ شێوه‌یه‌كی دروست كار و كاسبی بكات له‌ ڕۆژی قیامه‌تدا له‌گه‌ڵ ئه‌م پێغه‌مبه‌ره‌ پیشه‌وه‌رانه‌دا ده‌بێت، پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستﷺفه‌رموویه‌تی: (التاجرُ الصَّدوقُ

---

١ـ پێشه‌وایان بوخاری ومسلم گێڕاویانه‌ته‌وه‌ .

٢ـ پێشه‌وا بوخاری گێڕاویه‌ته‌وه‌ .

٣ـ پێشه‌وا بوخاری گێڕاویه‌ته‌وه‌ .

الأمين مَعَ النَّبيِّينَ وَالصِّدِّيقِينَ وَالشُهَداءِ)[1] واتــا: بــازرگانی ڕاستگۆ و دەست پاك لەگەڵ پێغەمبەران و ڕاستگۆیان و شەهیداندا دەبێت لە قیامەتدا.

## كاركردن بۆ پەیداكردنی بژێوی ژیان كاركردنە لە پێناوی خودادا

پاك و پێگەردی بۆ خودا! ئەمە چ دینێكە ئەم ئیسلامە، مرۆڤ كار بكات بۆ بەدەست هێنانی خۆشگوزەرانی خۆی كەچی خودا گەورە بۆی بە چاكە دابنێت!! پێغەمبەری خودا ﷺ لەگەڵ كۆمەڵێك لە هاوەڵان بەلای پیاوێكدا تێپەڕین، بینیان زۆر بە گورج و گۆڵی كار دەكات، هاوەڵەكان گوتیان: خۆزگە ئەم گورج و گۆڵیەی لە پێناوی خودادا بەكار هێنابایە! پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: (فقال رسوُلَ اللهِ:إنْ كانَ خَرَجَ يَسعَى على وَلَدِه صِغاراً" فَهُوَ في سَبيلِ اللهِ، وَإنْ كانَ خَرَجَ يَسعَى عَلى أَبَوَيَنِ شَيخَينِ كَبِيرَينِ" فَهوَ في سَبيلِ اللهِ، وَإن كانَ خَرَجَ على نَفسِهِ يعفها"فَهُوَ في سَبِيلِ اللهِ)[2] واتا: ئەگەر ئەم پیاوە لە ماڵ هاتبێتە دەرەوە بۆ ئەوەی كار بكات و بژێوی منداڵە بچكۆلەكانی پەیدا بكات ئەوە لە پێناوی خودا دایە، وە ئەگەر لە ماڵ هاتبێتە دەرەوە بۆ ئەوەی كار بكات و بژێوی دایك و باوكە پیرەكەی دابین بكات ئەوەش لە پێناوی خودا دایە، وە ئەگەر لە ماڵ هاتبێتە دەرەوە بۆ ئەوەی كار بكات و بژێوی خۆی پەیدا بكات و دەست بۆ خەڵكی پان نەكاتەوە ئەوەش لە پێناوی خودا دایە.

وەهەروەها باسی پیاوێكیان كرد بۆ پێشەوا عمری كوڕی خطاب رضي الله عنه كە بەردەوام لە مزگەوتەو خەریكی خودا پەرستی یە، پێشەوا عمر رضي الله عنه فەرمووی:كێ بژێوی ژیانی بۆ دەستەبەر دەكات؟ گوتیان: براكەی، ئەویش فەرمووی: (أَخُوُه خَيرٌ مِنهُ)واتا: براكەی لە خۆی باشترە!

---

١ـ پێشەوایان الترمذی و الدار القطنی و البیهقی گێڕاویانەتەوە . وە الترمذی دەفەرموێت: (حسن)

٢ـ پێشەوا بیهقی گێڕاویەتەوە.

وە پێغەمبەری خوداﷺفەرموویەتی:(ما مِنْ مُسلِمٍ يَغرِسُ غَرْساً أَو يَزرِعُ زَرعاً، فَيَأكلُ مِنهُ طَيرٌ أَو إِنسانٌ أَو بَهِيمَةٌ إلا كانَ لَهُ بِه صَدَقَةٌ)[1]واتا: هەر موسڵمانێك نەمامێك بچێنێت یان کشتوکاڵێك بڕوێنێت، لە بەری ئەم نەمامە یان ئەم کشتوکاڵە باڵندەیەك یان مرۆڤێك یان چوار پێیەك لێی بخوات ئەوە بۆی بە چاکە دەنوسرێت لای پەروەردگار. وە گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالكڕەزایلە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إنْ قامَتْ على أَحَدِكُم الْقِيامةُ وَ في يَدِهِ فَسِيلَةٌ فَلْيَغرِسْها)[2]واتا: ئەگەر بەسەر یەکێك لە ئێوەدا قیامەت هەڵستا و لەو کاتەدا نەمامە خورمایەکی بە دەستەوە بو با نەمامەکە بچەقێنێت.

جا ئەگەر بە وردی سەیری ئەم فەرمودەیە بکەین پێغەمبەری خوداﷺ موسڵمانان هان دەدات لە سەرە مەرگیشدا هەر خەریکی کار بن، پێغەمبەرﷺ نافەرموێت: ئەگەر قیامەت بەسەر یەکێکتاندا هەڵستا باخەریکی نوێژ و ڕۆژو و خێر و چاکـە بێت! بەڵکـو دەفەرمووێت: با نەمامەکەی بچەقێنێت !! ئەمەش ئەوپەڕی گرنگی دانە بەکار.

## مافەکانی کرێکار لە ئیسلام دا

پێشتر گوتمان هەتا سەدەی هەژدە لە وڵاتە بەناو دادپەروەر و پێشکەوتووەکانی ئەمریکاو ئەوروپا چینی کرێکار چینێکی ماف خوراو و چەوساوە و پلە دوو بو، بە هەمان شێوە لە پێش ئیسلامیشدا لای هەندێك دین و نەتەوە کار کردن تەنها بۆ بەندەکان (عبد) بوو، وە لای هەندێك ئاین و نەتەوەی تر کارکردن تەنها بۆ کەسانی بێ ڕێز و ژێر دەستە بو ، لەبەر ئەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلام یەکەم ئاینە لە ڕوی مێژووەوە کە دانی نابێت بە مافەکانی کرێکار و مافی بۆ دیاری

---

١- پێشەوا بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

٢- پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە .

کردبێتن، وە لە چەندین دەقی قورئان و فەرموودەدا داکۆکی کراوە لە مافی کرێکاران، ئەمانەی خوارەوەش بەشێکن لە مافەکانی کرێکاران لە ئیسلامدا:

١ـ مافی کار: لەسەر دەوڵەت پێویستە مافی کاری یەکسان بۆ هەموو هاووڵاتیەك بە پێی تواناو تایبەتمەندی و شارەزایی خۆی دابین بکات، ئەمەش بۆ ئەوەی بازاڕ و کار لە سەر چەندکەسێکی دیاری کراو قۆرخ نەکرێت، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿كَيْ لَا يَكُونَ دُولَةً بَيْنَ الْأَغْنِيَاءِ مِنكُمْ﴾[1] واتا: بۆ ئەوەی بازاڕ و کار نەبێت بە کاڵایەك تەنها بەدەستی دەوڵەمەندانەوە

٢ـ کرێکار ڕێزدارە و پێویستە وەك مرۆڤێکی ئاسایی سەیری بکرێت، وە پێویستە خاوەنی کار لەگەڵی بەڕێز و بە سۆز بێت، پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرموویەتی: ( إخوانكم خولكم، جعل الله تحت أيدكم ...)[2] واتا: براکانتان خزمەتتان دەکەن، خودای گەورە بە کرێکاری و خزمەتکاری خستونەتیە ژێر دەستی ئێوە ...

جا لەم فەرموودەیەدا پێغەمبەری ڕێزدارﷺ پلەی کرێکاری بەرز کردۆتەوە بۆ پلەی برا، لەبەر ئەوە پێویستە وەك برا ڕێزی لێبگیردرێت.

٣ـ پێویستە کرێکار خۆراکی باشی پێبدرێت و پۆشاکی باشی بکرێتە بەر، ئەبو ذری غفاری لە پێغەمبەری خۆشەویستەوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (فَمَنْ كانَ أَخُوهُ تَحْتَ يَدِهِ فَلْيُطعِمْهُ مِما يَأكل، وَلْيَلبِسهُ مِما يَلبِسُ ...)[3] واتا: هەرکەسێك براکەی بو بە کرێکاری یان خزمەتکاری، با لەو خواردنەی پێبدات کە بۆخۆی دەیخوات، وە لەو پۆشاکەی بکاتە بەری کە بۆخۆی لەبەری دەکات.

---

١ـ الحشر : ٧

٢ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

٣ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

٤ـ نابێت کارێك بخرێتە سەر شانی کرێکار کە لە توانایدا نەبێت، وە ئەگەر کارێکی گران خرایە سەرشانی یان دەبێت خاوەن کار یارمەتی بدات یان کرێکارێکی تر بۆ یارمەتی بگرێت، پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرموویەتی:(..وَلاتُكَلِّفُوهم مايَغلِبُهم،فَإنْ كَلَّفتُمُوهُم فَأعِينُوهُم)[1] واتا: کار ێك مەخەنە سەر شانیان کە لە توانایاندا نەبێت، وە ئەگەر کارێکی گرانیشتان خستە سەر شانیان یارمەتیان بدەن. وە هاوەڵی بەڕێز عەمری کوڕی حریث رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕتەوە کە فەرموویەتی:(ما خَفَّفتَ عَنْ خادِمِكَ مِنْ عَمَلِهِ،كانَ لَكَ أجراً في مَوازِينِكَ)[2]واتا: هەر کارێك لە سەر خزمەتکار و کرێکارەکەت سوك و ئاسان بکەیت، ئەوە بۆت دەبێتە پاداشت و چاکە لەسەر تەرازوی چاکانت لە قیامەت.

٥ـ بەر لەوەی عارەقی ناوچاوانی بسرێت پێویستە کرێی کارەکەی پێبدرێت، وە لەم ڕۆژگارەدا کە کرێکاران بە هەفتانە یان مانگانە کرێیان پێدەدرێت پێویستە لەسەری هەفتەو سەری مانگدا ماف و کرێی خۆیان پێبدرێت و نابێت لێیان دوا بخرێت بە هیچ بیانویەك، گەورەمان عبدالله ی کوڕی عمر رضي الله عنهما لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (اعطُوا الأجيرَ حَقَّهُ قَبلَ أن يَجِفَّ عَرَقُهُ)[3]واتا: کرێی کرێکار بدەن بەر لەوەی عارەقی ناوچاوانی بسرێت، وە أبوهريرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (قَال اللهُ تَعالى: ثَلاثةٌ أنَا خَصمُهُم يَومَ الْقِيامَةِ ...ورَجُلٌ استَأجَر أَجِيراً فَاستَوفى مِنهُ وَلَم يُعطَ أجْرَهُ)[4]واتا: سێ کەس من نەیاریانم لە ڕۆژی دوایی .... یەکێك لەوانە: پیاوێك

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوایان إبن حبان و أبو يعلى گێڕاویانەتەوە .

٣ـ پێشەوایان ابن ماجه و البيهقي گێڕاویانەتەوە .

٤ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

کەسێك بە کرێ بگرێت و کارەکەی پێبکات و کرێیەکەی نەداتێ .

٦ـ نابێت بە هیچ شێوەیەك ئازاری دەرونی لاشەیی کرێکار بدرێت، چونکە ئەمە لە سوننەتی پێغەمبەری ڕێزدارﷺ بەدەرە، ئەنەسی کوڕی مالك رَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەفەرموێت: (واللهِ لَقَدْ خَدمتُهُ سَبعَ سِنِينَ أَو تِسعَ سِنِينَ ما عَلِمتُ قالَ لِشَيءٍ صَنَعتُ: لِمَ فَعَلتَ كَذا وكَذا، وَلا لِشَيءٍ تَركتُ هَلا فَعَلتَ كَذا وَكَذا)[1]واتا: حەوت ساڵان یان نۆ ساڵان خزمەتی پێغەمبەری خوداﷺ کرد، جارێکیان لێم نەبیست بۆ ئیشێك کە بم کردبێت بیفەرموو بێت ئەو کارەت بۆ ئاوا کرد و بۆ ئاوات نەکرد، وە بۆ ئیشێکیش کە نەم کردبێت، بۆ ئەوکارەت نەکرد، بەواتای: هەرگیز پێغەمبەری خوداﷺ ئازاری دەرونی نەداوە. وە خاتوو عائیشة رضی الله عنها دەفەرموێت:(ما ضَرَبَ رسولُ اللهِﷺ شَيئاً قَطُّ بِيَدِهِ وَلا إمرَأةً وَلا خادِماً)[2]واتا: هەرگیز پێغەمبەری خوداﷺ بە دەستەکانی لە هیچ شتێکی نەداوە، نە لە خێزانی وە نە لە خزمەتکاری نەداوە.

٧ـ پێویستە خاوەن کار هەموو خێر و چاکەیەکی ئاشکرا و نهێنی و دنیا و قیامەتی بۆ کرێکارەکانی بوێت، بە تایبەت ئەگەر کرێکارەکەی کە سێکی کافر یان سارد و سڕ بو لە ئەنجامدانی پێویستیەکانی دین، یان خویەکی خراپی هەبوو، پێویستە خاوەن کارەکە ئامۆژگاری بکات و ڕێنمونی بکات، گەورەمان ئەنەسی کوڕی مالكرَضِيَ اللهُ عَنْهُ دەفەرموێت: گەنجێکی جولەکەی وەك خزمەتکار لای پێغەمبەرﷺکاری دەکرد، دواتر ئەم گەنجە نەخۆشیەکی کوشندەی توشبوو، پێغەمبەرﷺ بەردەوام سەردانی دەکرد، هەتا گەیشتە سەرەمەرگ، پێغەمبەری خوداﷺ داوای لێکرد بڕوا بهێنێت، گەنجەکە بە چاوی پرسیارەوە سەیری باوکی کرد، باوکیشی گوتی:گوێڕایەڵی باوکی قاسم ﷺ بکە،گەنجەکەش موسڵمان بوو و پاشان گیانی دەرچوو، پێغەمبەریشﷺ لــــە

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

ماڵیان هاتە دەرەوە و دەیفەرموو: (الحمدُ للهِ الذی أنقَذَهُ مِنَ النّارِ)[1] واتا: سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە ئەم گەنجەی لە ئاگری دۆزەخ ڕزگار کرد .

٨ـ پشوودان: پێویستە کاتی پشوو بۆ کرێکاران دیاری بکرێت، چ ڕۆژانە وە چ هەفتانە و مانگانە، بەواتای نابێت بەدرێژایی شەوو ڕۆژ کاریان پێبکرێت، وە نابێت هەموو ڕۆژەکانی هەفتە و مانگ کار بکەن، بەڵکو پێویستە کاتی بەتاڵیان پێبدرێت بۆ پشوو و سەردان و جێبەجێ کردنی پەیوەندیە کۆمەڵایەتیەکان و ئەرکەکانی ماڵەوە و...هتد پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی:(وإنَّ لِنَفسِكَ حَقٌ)[2] وە فەرموویەتی: (فَإنَّ لِجَسَدِكَ عَلَيكَ حَقّاً)[3] واتا: بێگومان دەرون و لاشەت مافی لەسەرت هەیە و دەبێت مافی خۆیان پێبدەیت.

٩ـ لەسەر دەوڵەت و خاوەن کۆمپانیاکان پێویستە پێویستیە بنەڕەتیەکانی وەك: (جێگای نیشتەجێبون و ئۆتۆمبێل و هاوسەر و...هتد) بۆ کرێکاران دابین بکەن، مستوردی کوڕی شداد رضي الله عنه دەفەرموێت: گوێم لە پێغەمبەری خوداﷺ بو دەیفەرموو: (من ولى لنا عملاً وَليسَ لَهُ مَنزِلٌ فَليَتَّخِذ مَنزلاَ، أَو لَيسَت لَهُ زوج فَليَتَزَوّج، أَو لَيسَ لَهُ خادِمٌ فَليَتّخِذ خادِماً، أو ليست لَهُ دابّةٌ فَليَتَّخِذ دابّةً)[4] واتا:هەرکەسێك کارێك بۆ ئێمە بکات، ئەگەر خانوی نەبو باخانو بکات، ئەگەر هاوسەری نەبو با هاوسەرگیری بکات، وە ئەگەر خزمەتکاری نەبو با خزمەتکار بگرێت،وە ئەگەر وولاخی سواری نەبوو با وولاخێك بکرێت.

١٠ـ پێویستە کەشێکی ئارام و جێگایەکی ئارام بۆ کرێکار دەستەبەر بکرێت لەکاتی

---

١ـ ـ پێشەوایان بوخاری و ترمذی گێراویانەتەوە .

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە .

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە .

٤ـ پێشەوا احمد گێراویەتەوە .

کارکردندا، بۆ ئەوەی ژیانی پارێزراو بێت و مەترسی لەسەر ژیان و ئەندامەکانی لاشەی نەبێت، ئەمەش وەك (سد للزرعة)، پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرموویەتی (**لاضرر ولا ضراراً**)[1]جا زانایانی أصول الفقه چەندین بنچینەیان لەم فەرموودەیە وەرگرتووە ، لەوانە: (أن الضرر يزال) واتا: زەرەد و زیان دەبێت لابدرێت، جا دەبێت کەشێکی نارام بۆ کرێکار بڕەخسێنرێت بەر لە ڕودانی هەر کارەساتێك.

١١ـ پێویستە کرێکاران دڵنیایی ـ ضمان ـ ی بژێوی ژیانیان لە لایەن دەوڵەتەوە پێبدرێت، چ دوای نەخۆشی و کەمئەندامی و پیری و پەککەوتەیی،وە چ دوای مردنی بۆ کەس و کارەکەی، أبو هريرهرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(**فأيما مُؤمِنٍ ماتَ وَتَرَكَ مالاً فَليَرِثْهُ عَصَبَتُهُ مَنْ كانُوا، وَمَن تَرَكَ دَيناً أَو ضَياعاً فَلْيَأْتِنِي، فَأَنامَولاهُ**)[2]واتا: هەرکەسێك مرد و میراتی لە دوای خۆی بە جێهێشت، با خزمە نزیکەکانی لە نێوانی خۆیاندا دابەشی بکەن جا هەرکەسێکن، وە ئەگەر ماڵیشی لە دوا بە جێنەما و قەرزیشی لەسەر بون یان پێویستیەکی ژیانی هەبوو با بێت بۆ لای من، هەتاکو لە خانەی دارایی ـ بيت المال ـ ی موسڵمانان بۆی جێبەجێ بکەم.

## ئەرکەکانی سەر شانی کرێکار

بەپێی ئەوەی کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی ئەرك و مافە، لەبەر ئەوە هەتا ئەرکەکانت جێبەجێ نەکەیت"مافت پێنادرێت، ئەمەش یاسایەکی خودایە بۆ هەردوو کاروباری (عبادات ومعاملات) تـۆی موسڵمان هەتا ئەرکە دینیەکانت (عبادات)جێبەجێ نەکەیت" نابێت چاوەڕێی پاداشت بیت لە ڕۆژی قیامەتدا، خـودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿**وَأَمَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُـوا**

١ـ پێشەوایان ابن ماجه و مالك و احمد و دار القطني گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

الصَّالِحَاتِ فَيُوَفِّيهِمْ أُجُورَهُمْ﴾[1] واتا: ئەوانەی بڕوایان بەخودا هێناوەو کردەوەی چاکە دەکەن" ئائەوانە خودای گەورە بە تەواوەتی پاداشتیان دەداتەوە. بەهەمان شێوە لەکاروباری نێوانی بەندەکانیشدا (معاملات)دا کاتێك ماف هەیە ئەگەر ئەرکەکانی سەر شانت جێبەجێ بکەیت، بەواتای ئەم مافانەی لە ڕابردوودا باسمان کردن بۆ ئەو کرێکارانەیە کە ئەم ئەرکانەی خوارەوە جێبەجێ دەکەن:

١ـ پێویستە کرێکار زانیاری تەواوی هەبێت دەربارەی پێویستیەکانی کار لە ڕوی شەرعەوە، بۆ ئەوەی بە تەواوەتی بە ئەرکی سەر شانی خۆی هەڵبستێت و کەمتەرخەمی نەکات لە کارەکەیداو تاوانبار نەبێت لای پەروەردگاری، پێشەوا عمری کوڕی ﷺ فەرموویەتی: (لا يَبِيعُ فِي سُوقِنا إلا مَنْ تَفَقَّهَ فِي الدِّينِ)[2] واتا: هەرکەسێك شارەزایی دەربارەی شەرع نەبێت، با لە بازاڕی موسڵمانەکاندا کڕین و فرۆشتن نەکات و کار نەکات.

٢ـ هەست کردن بە بەرپرسیاریەتی بەرامبەر کارەکەی و چاودێری خودا بەسەریەوە. وە بزانێت ئەم کارە ئەمانەتە بە دەستیەوە، وە خیانەت کردنیش لە ئەمانەت یەکێکە لە نیشانەکانی دوو ڕووەکان ـ منافق ـ پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (آيةُ الْمنافِقِ ثلاثٌ .... وَإذا اؤْتُمِنَ خانَ)[3] واتا نیشانەکانی مرۆڤی دوو ڕوو سیانن...یەکێك لەوانە کاتێك سپاردەیەکی درایە دەست ناپاکی لێدەکات.

٣ـ پێویستە کرێکار پابەند بێت بە پەیمان و کاتی کار، بەداخەوە لـەم ڕۆژگارەدا زۆرێك لـە کرێکارانی موسڵمان کەوتونەتە تاوانی بێ پەیمانی و بێ بەڵێنیەوەو لە کاتی دیاریکراودا ناچنە سەر کارەکانیان، خودای گەورەش فەرموویەتی: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا أَوْفُوا بِالْعُقُودِ﴾[2] واتا: ئەی

١ـ آل عمران : ٥٧

٢ـ پێشەوا ترمذی گێراویەتەوەو دەفەرموێت: (حديث حسن غريب)

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

ئەو کەسانەی بڕواتان هێناوە بە ئەمەك و بەوەفا بن بەرامبەری بەڵێنەکانتان، وە پێغەمبەری ڕێزدارﷺ بێ پەیمانی بەیەکێك لە نیشانەکانی دوو ڕوویی ئەژمار کردووە و فەرموویەتی:(آية المنافق ثلاث: إذا وعد أخلف...)[3]واتا: نیشانەکانی مرۆڤی دوو ڕوو سیانن یەکێك لەوانە: ئەگەر پەیمانی دا نایباتە سەر و وەفای پێناکات.

٤ـ پێویستە کرێکار کارەکەی بەباشترین شێوە ئەنجامبدات، خاتووعائیشە لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إنَّ اللّٰهَ يُحِبُّ إذا عَمَلَ أَحَدُكُم عَمَلاً أَنْ يُتقِنَهُ)[4]واتا: خودای گەورە پێی خۆشە ئەگەر کەسێك لە ئێوە کارێکی کرد بە باشترین شێوە ئەنجامی بدات.

٥ـ ماڵ و خێزان و کچ وخوشك و مەحرەمەکانی تر و کەل وپەلەکانی خاوەن کار لای کرێکار سپاردەن نابێت خیانەتیان لێبکات.

٦ـ گوێڕایەڵی خاوەن کار: پێویستە لەسەر کرێکار گوێڕایەڵی خاوەن کار بکات لە هەر کارێکی ڕەوا کە پێی دەسپێرێت.

٧ـ بە هیچ شێوەیەك نابێت فێڵ لە کارەکەی دابکات، چونکە مرۆڤی فێڵکار لە ئوممەتی پێغەمبەر نیە، پێغەمبەری خۆشەویستﷺفەرموویەتی:(مَنْ غَشَّ فَلَيسَ مِنا)[4]واتا: هەرکەسێك فێڵ بکات" لە ئوممەتی ئێمە نیە.

٨ـ نابێت کرێکار و فەرمان بەر کار و جێگاکەیان بقۆزنەوە و لە ڕێیەوە سودی تر بە دەست بهێنن. پێغەمبەری خۆشەویستﷺفـــەرموویەتی: (مَنِ استَعمَلناهُ عَلى عَمَلٍ ،فَرَزَقناهُ رِزقاً فَمَا

١ـ المائدة : ١

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

٣ـ پێشەوایان البیهقی و طبرانی و أبو یعلی گێڕاویانەتەوە .

٤- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە .

أَخَذَهُ بَعدَ ذٰلِكَ فَهُو غُلُولٌ)[1]واتا: هەرکەسێك کارێکمان پێسپارد و موچەو مافێکمان لە بەرامبەریدا پێیدا " ئەوە هەرسودێك جگە لەم موچەو مافە لەسەر کارەکەی بەدەست بهێنێت ئەوە ناپاکی کردنە.

جا خاوەن کاری بەڕێز کرێکاری خۆشەویست: ئەوەی ڕابرا ئەرك و مافی هەردووکتان بو لە ئیسلامدا، ئێوەش بە پێی ئەم ئەرك و مافانە کارەکانتان جێبەجێ بکەن و بزانن ئەوەی شێوعیەکان و ڕێکخراوە کرێکاریەکانی سەر بە حیزبە عەلمانیەکان بانگەشەی بۆ دەکەن لە چوارچێوەی دروشمی باق و بریق ناچێتە دەر، ئەوە زیاتر لە سەدەیەکە لە جەژنەکانی کرێکاراندا بانگەشەی بۆ دەکەن کەچی نەیانتوانیوە لە هیچ کوێیەکی دوونیا خۆشبەختی بۆ کرێکاران بهێنن و ئەم دروشمانە لە گووتەوە بکەن بە کردار، وە کرێکار و خاوەن کاری موسڵمان بەو هێزە ئیمانیە مەعنەویەی لە پشتیەوەیەتی ئەرك و مافەکانیان بە پێی ڕێنماییەکانی ئیسلام ڕایی دەکەن و هیچ پێویستیان بەوە نیە کافران ڕۆژێکیان وەك جەژن بۆ دیاری بکەن.



---

١- پێشەوا أبو داود گێڕاویەتەوەو ترمذیش بە (صحیح)ی داناوە.

# ٥/٣١ ڕۆژی بەرەنگار بونەوەی جگەرە

ساڵانەو لە ڕۆژی ٥/٣١ دا زۆرێك لە وولاّتانی جیهان یادی ڕۆژی بەرەنگار بونەوەی جگەرە دەکەنەوە، لەم ڕۆژەدا چەندین کۆڕ و سیمینار دەبەسترێت و چەندین پۆستەر و نوسین بلاّودەکرێنەوە و تێیاندا هۆشداری بلاّو دەکەنەوە دەربارەی زەرەد و زیانەکانی جگەرە، وە لە بەشێك لە وولاّتانی جیهان بۆ ماوەی ٢٤کاتژمێر جگەرە کێشان قەدەغە دەکرێت، جا بیروکەی دانانی ڕۆژێك بۆ بەرەنگار بونەوەی جگەرە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٨٧دا لە لایەن کۆمەڵەی تەندروستی جیهانیەوە سەری هەڵدا، ئەوەبوو پێشنیازیان کرد کە ڕۆژی ٤/٧ی ١٩٨٧ بکرێت بە ڕۆژی جگەرە نەکێشان، کە ئەو ڕۆژە هاوکات بوو لەگەڵ تێپەڕینی چل ساڵ بەسەر دامەزراندنی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی، پاشان و لە ساڵی ١٩٨٨دا کۆمەڵەی تەندروستی جیهانی بڕیاری ژمارە (WHA42.19)، دەرکرد، کە تیایدا داوای دەکرد ڕۆژی ٥/٣١ بکرێت بە ڕۆژی بەرەنگار بونەوەی جگەرە، جا لەو کاتەوە هەتا ئێستاش ئەو وولاّتانەی کە ئەندامن لە کۆمەڵەی تەندروستی جیهانی ساڵانەو لە ڕۆژی ٥/٣١دا یادی ڕۆژی بەرەنگاربونەوەی جگەرە دەکەنەوە.[١]

## حوکمی شەرعی ئەم یادە

ئەم یادەش وەك بەشێکی تری یادەکان جێگای جیاڕایی زانایانە، بەشێك لە زانایان دەفەرموون: دروست نیە یادی بکرێتەوە چونکە یادێکە لە وولاّتانی کوفرەوە هاتووە، وە بیدعەیە و داهێنراوە، بەشێکی تریان دەفەرموون: ئەم یادە هیچ پەیوەندیەکی بە دینەوە نیە بەڵکو دەچێتە باسی نەریتەکانەوە، لەبەر ئەوە یاد کردنەوەی دروستە.[٢]

---

١- سایتی موسوعە الحرە(ویکیبیدیا) و(مسموع)

٢- بڕوانە لاپەڕە ٢٤٦ لەو پەڕتوکەی کتێبی بەردەستت.

# زەرەد و زیانە تەندروستیەكانی جگەرە

دیارە زەرەد و زیانەكانی جگەرە زۆرن، بەڵام ئێمە لێرەدا هەندێكیان باس دەكەین كە لە ڕێی توێژینەوە و لێكۆڵینەوەكانی دەزگا و كۆمەڵە تەندروستیەكانی جیهان و زانكۆكانی جیهانەوە پێی گەیشتوون، ئەمانەی خوارەوەش بەشێكن لەو زەرەد و زیانانە:

١ـ جگەرە هۆكاری سەرەكیە بۆ نەخۆشی كوشندەی شێرپەنجە و نەخۆشیەكانی سیەكان، لە توێژینەوەیەكدا دەركەوتووە كە یەك لەسەر سێی هۆكاری شێرپەنجە جگەرەیە.

٢ـ كۆمەڵەی تەندروستی جیهانی لە توێژینەوەیەكدا دەریخستووە كە جگەرە لە هەر شەش چركەیەكدا لە شوێنێكی ئەم جیهانە مرۆڤێك دەكاتە قوربانی و دەیكوژێت، چا ئەم كوشتنەش یان بەهۆی بەكارهێنانی ڕاستەوخۆی جگەرەوەیە، وە یان بە هۆی ناڕاستەوخۆ، بەواتای ئەوانەی لە تەنیشتی جگەرەكێشانیشەوە دادەنیشن بە ناڕاستەوخۆ زیانی جگەرەیان بەر دەكەوێت و دەبنە قوربانی. وە هەر لەو توێژینەوەدا دەركەوتووە كە یەك لەسەر پێنجی ئەو كەسانەی لە سەرانسەری دونیادا بە نەخۆشی سەرەتان دەمرن هۆكارەكەی جگەرە كێشانە. وە لە ڕاپۆرتێكی ڕێكخراوی تەندروستی جیهانیدا هاتووە كە لە سەدەی بیستەمدا جگەرە سەد ملیۆن كەسی كوشتووە، ئەم ڕێژەیەش لە سەدەی بیست و یەكدا دەبێتە یەك ملیار كەس، ڕاپۆرتەكە ئەوەشی ڕون كردۆتەوە ئەگەر هەوڵی جددی نەدرێت ئەوە تا ساڵی ٢٠٣٠ساڵانە جگەرە هەشت ملیۆن كەس دەكوژێت،[1] وە هەر لەبەر ئەوە دكتۆر جۆن سفرین لە كۆمەڵەی پزیشكانی ئەمریكا دەڵێت: جگەرە تاكە چەكی كۆكوژە كە لە سەرانسەری دوونیا هەڕەشە لە ژیانی مرۆڤایەتی دەكات. وە دكتۆر (بۆڵ بۆنن) بەڕێوەبەری كۆمەڵەی پزیشكانی ئەمریكـــــا دەڵێت: مەبەستی

١ـ جگەرە كێشان لە ڕوانگەی شەرع و زانستەوە، نوسینی سیف الله عوسمان خۆرانی: ١٧

سەرەکیمان بریتیە لە بەدیهێنانی جیهانێکی بێ دوکەڵ و بێ جگەرە.[1]

٣ـ پیر بونی پێش وەختەو مردنی پێش وەخت، لە توێژینەوەیەکی زانستیدا دەرکەوتووە کە جگەرە هۆکارە بۆ پیر بونی پێش وەختە،وە مردنی مرۆڤ دە ساڵ پێش دەخات،[2]

٤ـ بە پێی لێکۆڵینەوەیەکی کەنەدی، ئەو ژنە دوو گیانانەی کە لە گەڵ پیاوی جگەرە خۆردا دەژین، وە یان لەگەڵ پیاوی جگەرە خۆردا کار دەکەن، دەبێتە هۆکاری بونی منداڵی مردوو، یان منداڵی قەبارە بچوك و یان منداڵی سەر گچکە.[3]

٥ـ توتن کە جگەرەی لێ دروست دەکرێت"چوار هەزار ماددەی کیمیاوی ژەهراوی تێدایە، کە مادده ژەهراویەکانی بریتین لە: (نیکۆتین، یەکا ئۆکسیدی کاربۆن، تار، تولیدین، یولنیوم، بایرین، سیاند هایدرۆجین، الزرنیخ...) ئەم ماددانە هەموویان کوشندەن، بۆ نمونە: پزیشکەکان دەڵێن: ئەگەر نیکۆتینی تەنها یەك جگەرە لە ڕێی دەرزیەوە لە کەسێکی ساغ بدرێت بێگومان دەیکوژێت. وە ماددەکانی تری وەك (تار، تولیدین، یولنیوم، بایرین) ئەوانە ماددەی شێرپەنجەیین و هۆکارن بۆ توشبون بە شێرپەنجە. وە ماددەکانی تری وەك: (یەکا ئۆکسیدی کاربۆن، سیاند هایدۆجین، الزرنیخ) ئەمانەش ژەهراوی و خنکێنەرن.[4]

٦ـ جگەرە کێشان لاشەی مرۆڤ ماندو دەکات، بە شێوەیەك کێشانی یەك جگەرە بە ئەندازەی بیست دەقیقە لێخوڕینی پایسکل لاشەو دڵی مرۆڤ ماندوو دەکات، بە واتای کێشانی یەك پاکەت جگەرە بە ئەندازەی هەشت کاتژمێر لێخوڕینی پایسکل مرۆڤ هیلاك و ماندوو

١ـ موقع الكحيل لإعجاز العلمي.

٢ـ بێگومان مردن بە دەست خودایە، وە مردن دیاری کراوە، بەڵام دەست گرتن بە هۆکاریشەوە(الأخذ بالأسباب) شەرعیە.

٣ـ سایتی زانایان.

٤ـ جگەرە کێشان لە ڕوانگەی شەرع و زانستەوە، نوسینی سیف الله عوسمان خۆرانی: ١٧

دەکات.[1]

٧ـ توێژینەوەیەکی تری زانستی دەریخستووە کە نەخۆشی (اعتلال اللطخة AMD) کە توشی تۆڕی چاو دەبێت و هیچ چارەسەرێکیشی نیە، لە زۆربەی کاتەکاندا ئەم نەخۆشیە توشی ئەو کەسانە دەبێت کە جگەرە کێشن، وە دکتۆر (ریتشارد إدواردز) کە تایبەتمەندە لە تەندروستی گشتی لە زانکۆی مانشستر دەڵێت: جگەرە کێشەکان چوار بەرامبەری کەسانی تر مەترسی کوێر بونیان لەسەرە،[2] وە توێژینەوەیەکی زانستی سەلماندویەتی کە ئەو دوکەڵەی لە دەمی جگەرە کێش بەرز دەبێتەوە کاریگەری لەسەر پەردەی دەرەوەی چاو هەیەو توشی کزانەوە و هەوکردنی دەکات.[3]

٨ـ توێژینەوەیەکی زانستی کە لە زانکۆی(سانت هیلین) لە شاری لیڤەرپوڵی بەریتانیا ئەنجامدراوە، دەریخستووە کە کێشانی بیست جگەرە لە ڕۆژێکدا بۆ ماوەیەکی درێژ، دەبێتە هۆکاری توشبون بە ئیلتهابی جومگەکان و ڕوماتیزم، وە توێژینەوەکە دەریخستووە کە ئەو کەسانەی بۆ ماوەی چل بۆ پەنجا ساڵ جگەرە دەکێشن، سێزدە بەرامبەری کەسانی جگەرە نەکێش مەترسی توشبونیان بە نەخۆشی ڕوماتیزم لەسەرە.[4]

٩ـ جگەرە هۆکاری سەرەکیە بۆ نەخۆشیەکانی کۆ ئەندامی دەماری سەر، چونکە یەکەم شوێنێ کە نیکوتین هێرشی بۆ دەبات لە لاشەی مرۆڤ بریتیە لە کۆ ئەندامی دەماری سەر.[5]

١٠ـ جگەرە کە ماددەی نیکۆتینی تێدایە، کاریگەری بەردەوامی هەیە لەسەر مێشك

---

١ـ جگەرە کێشان لە ڕوانگەی شەرع و زانستەوە: ٢٥

٢ـ سایتی الکحیل

٣ـ جگەرەکێشان و زیانەکانی ، حەرامکردنی لە قورئاندا، دکتۆر مصطفى زەڵمی: ٤٩

٤ـ سایتی الکحیل.

٥ـ جگەرەکێشان زیانەکانی ، حەرامکردنی لە قورئاندا: ٥٠

لـــە ئەنجامی بەردەوام بوون لەسەر جگەرە کێشان، زۆر جار دەبێتە هۆی سەر ئێشە و گێژ بوون و شێوانی بیرکردنەوە و هەستی بینین و بێ خەوی و دارمانی توانای لاشە.[1]

١١ـ جگەرە هۆکاری سەرەکیە بۆ توشبون بە نەخۆشی بریندار بونی گەدە(قرحه المعده) ئامارە ئەمەریکیەکان سەلماندویانە کە ٧٨٪ی ئەو کەسانەی توشی نەخۆشی برینداربونی گەدە دەبن، ئەو کەسانەن کە جگەرە دەکێشن.[2]

١٢ـ جگـــەرە دەبێتە هۆی خراپ بوونی نەخۆشی ڕەبۆ، چونکـە جگـــەرە دژی کاری دەرمانەکانی چارەسەری ڕەبۆ دەوەستێتەوە و نەخۆشیەکە خراپتر دەکات.[3]

١٣ـ جگەرە کێشان هۆکارە بۆ پوکانەوە و کەم بونەوەی توانای (جنسی) بە شێوەیەك ئەو کەسانەی جگەرە دەکێشن سێزدە بەرامبەری کەسی ئاسایی ئەگەری توشبونیان بە پوکانەوە و کەم بونەوەی توانای جنسی زیاترە.[4]

١٤ـ ئەوانەی سەرەوە بە هۆی جگەرە کێشانی ڕاستەوخۆوە بوون، وە جگەرە کێشانی ناڕاستەوخۆش یەکێکی ترە لە مەترسیەکان بۆ سەر ژیانی مرۆڤ، لە توێژینەوەیەکدا کە لە زانکۆی(هارفارد) ئەمریکی بۆ ٣٢ هەزار ئافرەت کراوە و بۆ ماوەی دە ساڵ بەردەوام بووە دەرکەوتووە، کـە جگـــەرە کێشانی ناڕاستەوخۆ گەلێك سامناکترە لەوەی کـــە زانایـان چاوەڕوانیانکردووە، ئەو ژنانەی توێژینەوەکەیان لەسەر کراوە تەمەنیان لە نێوان(٣٦بۆ ٦١) ساڵیدا بووە، لەو ئافرەتانە (١٥٢)یان توشی شێوانی دڵ بوون، لەوانە (٢٥)یان بە حاڵەتی کوشندە، ئەوەش ئەوە دەگەیەنێت کە ساڵانە (٥٠) هەزار ئەمریکی بەهۆی جگـــــەرە کێشانی

١ـ جگەرە کێشان، زیانەکانی حەرامکردنی لە قورئاندا: ٥٢

٢ـ هەمان سەرچاوە: ٥٥ـ٥٦.

٣ـ جگەرە کێشان لە ڕوانگەی شەرع و زانستەوە: ٢٩.

٤ـ سایتی الکحیل.

ناڕاستەوخۆوە گیانیان لە دەست داوە.[1]

# حوكمی شەرعی جگەرە

بە هۆی ئەوەی جگەرە ماوەیەکی ئەوەندە زۆر نیە پەیدابووە، چونکە دروستکردنی یەکەم جگەرە بەو شێوەی ئێستا دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٨٤٣لە فەڕنسا، لەبەر ئەوە زانایانی پێشینەی ئومەت و هەر چوار مەزهەبەکە قسەیان لێنەکردووە، وە لەسەر دەمی پەیدابونی جگەرەشدا نەزانراوە کە جگەرە ئەوەندە خراپە، بەڵکو یەکەمجار کە(نیکۆی) نێردراوی پادشای فەڕەنسا توتن تاقی دەکاتەوە، وەها لە خەڵکی دەگەیەنێت کە توتن و جگەرە سودی پزیشکیان هەیە بۆ لاشەی مرۆڤ، لەبەر ئەوە بەشێك لە زانایان کە لە سەرو بەندی پەیدا بوونی جگەرە هەبوون، فتوای ڕەوایی (مباح) ی جگەرەیان داوە، بەڵام دوای ئەوەی لە سەردەمی تازەدا بە بەڵگەی زانستیەوە سەلمێنرا کە جگەرە چەندین زەرەد زیانی جەستەیی و دارایی و کۆمەڵایەتی هەیە، لەبەر ئەوە زانایانی هاوچەرخ بە پشتیوانی چەندین بەڵگە لە قورئان و سوننەت جگەرەکێشانیان بە کارێکی حەرام داناوە، لەو زانایانە: (دکتۆر وەهبە زوحەیلی وە دکتۆر یوسف القرضاوی وە دکتۆر مصطفی زەلمی وە لیژنەی بەردەوامی فتوای سعودی، وە لە زانایانی میصر: أحمد سنهوری حەنبەلی، ابراهیم اللقانی مالکی، وە لە زانایانی مەغریب: ابو الغیث القشاش المالکی، وە لە زانایانی دیمەشق: نجم الدین بدرالدین، العربی الغزی العامری الشافعی، وە لە زانایانی یەمەن: ابراهیم بن جمعان ، وە أبوبکر بن أهدل، وە لە زانایانی حەرەمەین: عبدالمالك العصامی، محمد بن علامە، وە عمر البصری، وە لە زانایانی تورکیا: محمد الخواجە، وە عیسا شهوا الحنفی، وە مکی بن فروح المکی، وە سعد البلخی المدنی،[2] وە المسیری شیخ النابلسی، وە إمام شرنبلالی، وە

١ـ جگەرە کێشان، زیانەکانی حەرامکردنی لە قورئاندا: ٤٢

٢ـ الفتاوی المعاصرە، دکتۆر یوسف القرچاوی: ٦٩٨/١.

علاءالدیـــن العصكفی، وه اسماعیل النابلسی، الشیخ العمادی، وه شهاب الدین القلیوبی، وه النجم الغزی ، وه سلیمان البجیرمی)[1]

جا ئەم زانایانە بۆ حەرام کردنی جگەرە چەندین بەڵگەیان لە قورئان و سوننەت بە دەستەوەیە لەوانە:

١ـ خودای پەروەردگار بەشێك لە پەیامی پێغەمبەرﷺبەوە دیاری دەکات کە تیایدا هەرچی پاك بێت بە حەڵاڵ دانراوە، وە هەرچی پیسیش بێت بە حەرام دانراوە و دەفەرمووێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾[2]واتا: لە پەیامی ئەم پێغەمبەرەداﷺ هەرچی پاك بێت بە حەڵاڵ دانراوە، وە هەرچی پیس و ناپوخت و بێکەڵك بێت بە حەرام دانراوە. وە هیچ گومانێکیش نیە کە جگەرە پیسەو بێ کەڵکەو ناپوختە، وە هۆکارێکی سەرەکیشە بۆ پیس کردنی ژینگە، وە خودی لاشەی مرۆڤیش پیس دەکات.

٢ـ خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُلْقُوا بِأَيْدِيكُمْ إِلَى التَّهْلُكَةِ﴾[3]وە دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَقْتُلُوا أَنفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رَحِيمًا﴾[4]واتا: بەدەستی خۆتان خۆتان مەکوژن و خۆتان بە هیلاك مەدەن. وەك لە باسی زەرەدو زیانەکانی جگەرەش باسمان کرد کە لە سەدەی ڕابردودا جگەرە ١٠٠ملیۆن کەسی کوشتووە،

٣ـ خودای پەروەردگار و پێغەمبەرەکەیﷺ نکوڵیان کردووە لەوەی مرۆڤ پارە و سەروەت و سامان بە هەدەر بدات، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تُبَذِّرْ تَبْذِيرًا * إِنَّ الْمُبَذِّرِيـــــنَ

١ـ الفتاوى الآمدية: ١/ ٣٩١ـ ٣٩٢.

٢ـ الاعراف: ١٥٧

٣ـ البقرة: ١٩٥.

٤ـ النساء: ٢٩

كَانُوا إِخْوَانَ الشَّيَاطِينِ وَكَانَ الشَّيْطَانُ لِرَبِّهِ كَفُورًا﴾[1] واتا: ماڵ و سامان بە هەدەر مەدە، چونکە بەڕاستی ئەوانەی ماڵ و سامان بە هەدەر دەدەن وەك برای شەیتان وەهان، وە شەیتانیش لە بەرامبەر ناز و نیعمەتەکانی خودادا زۆر ناشکور و بێ نمەکە. وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ كَرِهَ لَكُم ثلاثًا: قِيلَ وَقال، وَكَثرةَ السُّؤالِ، وَإِضاعةَ المالِ)[2] واتا: بەڕاستی خودای گەورە ڕقی لە سێ شت دەبێتەوە: گوتیان و دەڵێن، وە زۆر پرسیار کردن لە شتی بێ مانا، وە ماڵ بە فیڕۆ دان. وە هیچ گومانێکیش نیە ئەو پارەی بە جگەرە دەدرێت بە هەدەر دەچێت و نەوەك بێ سود بەڵکو بە زیانیش تەواو دەبێت، وەك ئەوە وەهایە بە پارەی خۆت نەگبەتی بکڕیت.

٤ـ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: جگەرە ماددەیەکی سەرخۆشکەرە، مەرج نیە وەك مەی بەتەواوەتی هۆشت لا بدات، بەڵکو ئەو کەسەی جگەرە دەکێشێت وەکو مەی هۆگر و ئالودەی دەبێت، وە کاتێك مرۆڤی جگەرە کێش قوم لە جگەرەکەی دەدات دوکەڵ و تامی جگەرەکە لەگەڵ ڕوحی تێکەڵ دەبێت، ئەمەش جۆرێکە لە سەرخۆشبون، چونکە پێشەوا عمری کوڕی خطابرضي الله عنه دەربارەی مەی فەرمویەتی: (الخَمرُ ما خامرَ العقلَ)[3] واتا: مەی بەو شتە دەگوترێت کە عەقڵ دادەپۆشێت و هۆش بۆ لای خۆی دەبات. بێگومان ئەو کەسانەی جگەرە دەکێشن بە جگەرەوە ئالودە دەبن و جگەرەکە کار لە بیر و هۆش و عەقڵیان دەکات، ئەوەش کاتێك دەردەکەوێت کە جگەرە کێشێك جگەرە تەرك دەکات، دەبینیت ئەم کەسە بەردەوام خەیاڵی لای جگەرەکەیەتی، وە زۆر جار ئەو کەسانە توشی سەر ئێشەو هەڵچونی دەرونی دەبن!

---

١ـ الإسراء: ٢٧

٢ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٣ـ* فتاوى المعاصر: ٦٩٦/١. وە جگەرە کێشان زیانەکانی ...، زەڵمی: ٨١، وە فەرمودەکە بوخاری گێڕاویەتەوە.

٥ـ سەلمانی فارسی رضي الله عنه بە ابو دردانی رضي الله عنه فەرموو: (**إنَّ لربِّكَ عليك حقًّا، وإنَّ لِنفسكَ عليك حقًّا، ولأهلك عليك حقًّا، فأعْطِ كلَّ ذي حقٍّ حقَّهُ**) واتا: بەڕاستی خودای پەروەردگار مافی لەسەرت هەیە، وە لاشەت مافی لەسەرت هەیە، وە خێزانت مافی لەسەرت هەیە، تۆش لەسەرت پێویستە مافی هەموویان بدەیت، ابو درداء هات ئەمەی بۆ پێغەمبەری خوداﷺ باس کرد، پێغەمبەری خۆشەویستیشﷺفەرمووی: (**صَدقَ سلمان**) [١]واتا: سەلمان ڕاستی کردووە. بەڵام کەسی جگەرە کێش ئەم مافانە هەرسێکیان پێشێل دەکات:

مافی خودا پێشێل دەکات بەوەی بەدەستی خۆی خۆی بە هیلاك دەدات و ماڵ بەهەدەر دەدات و سنوری قەدەغە دەشکێنێت.

وە مافی لاشەی پێشێل دەکات بەوەی بەهۆی جگەرە کێشانەوە لاشەی خۆی توشی چەندین نەخۆشی دەکات و بەم هۆیەشەوە لاشەی ئازار دەکێشێت.

وە مافی خێزانیشی پێشێل دەکات بەوەی بەردەوام بۆنی ناخۆش لە دەم و لاشەی دێت، جا من لێرەدا پرسیارێك لە جگەرەکێشەکان دەکەم: ئایا ئەگەر خێزانت بۆنی جگەرە لە دەمی بێت لەگەڵی دەخەویت؟؟ بێگومان نەخێر!!

٦ـ جگەرە کێشان دەبێتە هۆی زیان گەیاندن بە ژینگەو کەسانی دەوروبەر، وەك لە زیانەکانی جگەرەشدا باسمان کرد ئەو کەسانەی لەگەڵ جگەرە کێشدا دەژین، وە یان هاوڕێیەتیان دەکەن، ئەگەر هەیە توشی هەمان ئەو نەخۆشیانە بن کە جگەرە کێش توشی دەبێت، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (**لا ضَرَرَ ولا ضِراراً**)[٢]واتا: نە زیان بە کەس بگەیەنە و نە زیانیش لە کەس قبوڵ بکە.

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان ابن ماجە و مالك و احمد گێڕاویانەتەوە.

جا ئەوانەی ڕابران بەشێکی کەم بوون لە بەڵگەکانی زانایان بۆ حەرام کردنی جگەرە، زۆر بەڵگەی تر مابو باسی بکەین، بەڵام لە ترسی درێژبونەوە نەمان نوسین، ئەگەرنا دکتۆر وەهبە زوحەیلی حەڤدە بەڵگەی هێناوە بۆ حەرامی جگەرە.[1] وە ئەم بەڵگانە دیسان بەڵگەشن بۆ حەرامی نێرگەلە، چونکە نێرگەلە زۆر لە جگەرە خراپترە، بە شێوەیەك یەك قوم نێرگەلە بە ئەندازەی پەنجا جگەرە زیانی هەیە، لەبەر ئەوە نێرگەلەش وەکو جگەرە حەرامە.

جا لەگەڵ بونی ئەم بەڵگە بێ پێچ و پەنایانە لەسەر حەرامی جگەرە، وە لەگەڵ ئاشکرابوونی ئەم هەموو زەرەدو زیانانەی جگەرە، کەچی بە داخەوە لەگەڵ ئەوەشدا ئێستا لە سەرانسەری دونیادا زیاتر لە یەك ملیار و سێ سەد ملیۆن کەس جگەرە دەکێشێت، وە ساڵانە زیاتر لە سی ملیۆن کەس دەچنە ڕیزی جگەرە کێشان و دەبنە جگەرە کێش، وە بەداخەوە موسڵمانانیش لە سەرانسەری دونیادا بەشێکی زۆری ئەم جگەرە کێشانە پێك دەهێنن، بۆ نمونە: سعودیە کە لانکەی ئیسلامەتیە ساڵانە ١٥ملیار جگەرە دەکڕێت بە بڕی هەشت ملیار دۆلار، وە میصر ساڵانە هەشتا ملیۆن جگەرە بەکار دەهێنێت، وە زۆرترین ڕێژەی جگەرە کێشان لە ناو موسڵمانان لە تورکیایە، بەشێوەیەك ٪٦٧خەڵکی لە تورکیا جگەرە کێشە، وە لە وولاتانی تری عەرەبیش ساڵانە زیاتر لە دوو سەد ملیار جگەرە بەکار دێت، بە شێوەیەك ئەو پارەیەی بۆ کڕینی جگەرە بەکاری دەهێنن زۆر زیاترە لەو پارەیەی کە بۆ بوارەکانی تەندروستی و جگەرە تەرخانی دەکەن[2] وە لە کوردستانی خۆشمان ساڵانە ڕێژەیەکی زۆری جگەرە بەکاردێت، بۆ نمونە: تەنها لە ساڵی ٢٠١٠دا بە بەهای سەد و پەنجا و هەشت ملیار و هەشت سەد ملیۆن دینار جگەرە لە مەرزی ابراهیم خەلیلەوە هاوردەی کوردستان کراوە، وە هەر لەو ساڵەدا بە بەهای پەنجاو پێنج ملیار و پێنج سەد ملیۆن دینار لە مەرزی باشماخەوە جگەرە هاوردە کـــراوە، وە بە

١ـ الفقه الإسلامي و أدلته: ٦/ ١١٥ـ ١١٦.

٢ـ موقع الكحيل لإعجاز العلمي.

پێی ووتەی بازرگانانی جگەرە مانگانە لە کوردستان سێ بۆ چوار ملیۆن دۆلار بۆ کڕینی جگەرە بە هەدەر دەدرێت، بەو پێیەش ساڵانە زیاتر لە چل ملیۆن دۆلار بۆ کڕینی جگەرە بە هەدەر دەڕوات.[1]

## بانگهێشت نامەیەك بۆ موسڵمانە جگەرە کێشەکان

خوشك و برای موسڵمانی جگەرەکێش: دوای ئەوەی بۆت ڕون بۆوە کە جگەرە حەرامە و ئەو هەموو زەرەد و زیانەی هەیە، وەرە و ناوی خودای لێبێنەو وازبێنە لە جگەرە کێشان، وەرە با ئەو مەوقیفە ئیمانیە دووبارە بکەینەوە کە ئەصحابەکان لە ڕۆژی حەرامبونی مەیدا نواندیان، گەورەمان ئەنەس رضي الله عنه دەفەرمووێت: لە ماڵی ابو طلحة مەیم دەگێڕا، گوێمان لە دەنگێك بوو بانگەوازی دەکرد، ابو طلحة رضي الله عنه فەرمووی: بچۆ دەرەوە بزانە ئەم بانگەوازە چیە؟ منیش هاتمەوە گووتم: ئەمە بانگەواز دەکات کە مەی بۆ هەتا هەتایە حەرام کراوە، ابوطلحة فەرمووی: برۆ مەیەکە برێژە سوێند بەخودا هەرگیز نایخۆمەوە[2] وە ئەو ڕۆژەی مەی بە یەکجاری تێدا حەرام کرا کۆڵانەکانی مەدینە جۆگەلەی مەیان پێدا دەڕۆیشت، چونکە هەموو موسڵمانان ئەو مەیەی هەیان بوو ڕشتیان، دەبا ئێمەی موسڵمانیش ئەم مەوقیفە ئیمانیە دووبارە بکەینەوە، جگەرەکانمان بشکێنین، چەرخ و پاکەتەکەمان فڕێبدەین و چاوەڕێی پاداشت بین لە خودا، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (إنك لا تدع شيئاً إتقاء الله تعالى إلا أعطاكَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ خيراً مِنهُ)[3] واتا: بێگومان تۆ لەبەر خودا واز لە هەر شتێکی حەرام بهێنیت، ئەوە خودای گەورە باشتر لە ئەو شتەت پێدەدات.

---

١ـ سایتی زانایان.

٢ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا احمد بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویەتەوە.

# ٦/١ ڕۆژی جیهانی منداڵان

لە لایەن ڕێکخراو و کۆمەڵە جیهانیەکانەوە ساڵانە چەند ڕۆژێك دیاریکراوە بۆ منداڵان، هەر ڕۆژەو لە ژێر ناوێکدا، بۆ نمونە: ڕۆژی ٤/٢ ڕۆژی خوێندن و پەرتوکی منداڵان، وەڕۆژی ٦/١ ڕۆژی پارێزگاریکردن لە منداڵان، وە ڕۆژی ٦/١٢ ڕۆژی ڕوبەڕوبونەوەی کارکردن بە منداڵان، وە ڕۆژی ٦/١٦ ڕۆژی منداڵانی ئەفریقیا، وە ڕۆژی ١١/٢٠ ڕۆژی جیهانی مافەکانی منداڵ. بەڵام لەناو ئەو ڕۆژانەدا دوو ڕۆژیان زۆر دیارو بەرچاون لە جیهاندا کە بریتین لە:

یەکەم/ ڕۆژی جیهانی منداڵان لە ٦/١دا، ئەم ڕۆژە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٤٩وە لە کۆنگرەی پاریسی یەکێتی ئافرەتانی دیموکراتی جیهانیەوە دیاریکرا، وە لەدوای ئەو ساڵەوە واتا لە ساڵی ١٩٥٠ز وە زۆرێك لە وڵاتانی جیهان لەو ڕۆژەدا یادی ڕۆژی جیهانی منداڵان دەکەنەوە.

دووەم/ ڕۆژی جیهانی مافەکانی منداڵ لە ڕۆژی ١١/٢٠دا. لە ساڵی ١٩٥٤ز کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بڕیاری ژمارە(٨٣٦) دەرکرد و تێیدا وڵاتانی جیهانی ڕاسپارد بۆ ئەوەی ڕۆژێکی دیاری بکەن بۆ مافەکانی منداڵ، وە لەو ڕۆژەدا کار بکەن لەسەر برایەتی و تێگەیشتنی منداڵانی دوونیا و باشکردنی ژیان و گوزەرانی منداڵان، دواتر ڕۆژی ١١/٢٠ی هەموو ساڵێکیان دیاریکرد وەك ڕۆژی جیهانی مافەکانی منداڵان.[1]

## منداڵ کێ یە؟

تەمەنی منداڵی ئەو قۆناغە هەستیارەی ژیانە کە لە لەدایکبونەوە دەست پێدەکات و هەتا پانزە ساڵی لای شــەرع وە هەتا هەژدە ساڵی لای یاسای دەستکرد و ڕێککەوتننامەی نەتــەوە

١ـ پێگەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان(un)

یەکگرتووەکان بەردەوام دەبێت، جا لەو ماوەیەدا تەمەنی منداڵی بەچەند قۆناغێکدا تێدەپەڕێت کە بریتین لە:

١ـ قۆناغی مەلۆتکەیی یان شیرەخۆری(الصبی)، ئەم قۆناغە لە لەدایکبونەوە دەست پێدەکات و بۆ ماوەی دوو ساڵ بەردەوام دەبێت بە بەلگەی: ﴿وَالْوَالِدَاتُ يُرْضِعْنَ أَوْلَادَهُنَّ حَوْلَيْنِ كَامِلَيْنِ لِمَنْ أَرَادَ أَن يُتِمَّ الرَّضَاعَةَ﴾[1] واتا: هەر دایکێك لە دایکان دەیهەوێت شیری تەواو بدات بە منداڵەکەی" با دوو ساڵی تەواو شیر بدات بە منداڵەکەی.

٢ـ قۆناغی منداڵی سەرەتایی (المرحلة الطفولة المبكرة ـ غير مميز): ئەم قۆناغە لە دوو ساڵیەوە دەستپێدەکات هەتا کۆتایی پێنج ساڵی، لەم قۆناغەدا منداڵ شارەزای هەندێك لە جموجوڵە بنەڕەتیەکانی ژیان دەبێت، وەك ڕۆیشتن و زمان و پشت بەخۆبەستن و...هتد.

٣ـ قۆناغی منداڵی کۆتایی (المرحلة الطفولة المتأخرة ـ مميز): ئەم قۆناغە لە شەش ساڵیەوە دەست پێدەکات و بەردەوام دەبێت هەتا سەروی دوازدە ساڵی، وە ئەم قۆناغە بە هەرزەکاری دواتر بالغ بوون کۆتایی دێت.[2]

جا ئەم قۆناغانە هەرسێکیان بەیەکەوە تەمەنی منداڵی پێکدەهێن، وە ئیسلام بۆ ئەم قۆناغەی تەمەن چەند ئەرك و مافێکی داناوە کە پێویستە مرۆڤ ڕەچاویان بکات کە گرنگترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

## مافەکانی منداڵ لە ئیسلامدا

١ـ لەسەر باوك پێویستە هاوسەری شایستە هەڵبژێرێت بۆ ئەوەی ببێت بە دایکێکی باش بۆ منداڵەکانی، وە بە پێچەوانەوەش لەسەر دایکیش پێویستە پیـــاوی شیاوی هەڵبژێرێت بـــۆ

١ـ البقرة: ٢٣٣

٢ـ الطفولة... تعريفات و خصائص، دكتور موسى نجيب موسى، شبكة الألوكة.

ئەوەی ببێت بە باوکی منداڵەکانی، خودای پەروەردگار لە قورئانی پیرۆزدا ڕێنمونیمان دەکات بۆ ئەوەی بەدوای خێزانی باشدا بگەڕێین و ئاواتی بۆ بخوازین، بۆ ئەوەی لە دوونیاو قیامەتدا ژیانێکی خۆش بەرینە سەرو دەفەرمووێت: ﴿رَبَّنَا هَبْ لَنَا مِنْ أَزْوَاجِنَا وَذُرِّيَّاتِنَا قُرَّةَ أَعْيُنٍ وَاجْعَلْنَا لِلْمُتَّقِينَ إِمَامًا﴾[1] واتا: ئەوانەی کە دەڵێن پەروەردگارە لە هاوسەران و نەوەکانمان کەسانێکمان پێببەخشە کە ببنە مایەی ڕوناکی دیدەمان و شادمانی دڵمان، وە بمانکە بە پێشەوا بۆ پارێزکاران و خواناسان... ئائەوانە پاداشتیان ژورە ڕازاوە و بەرز و خۆشەکانی بەهەشتە... ﴿أُولَئِكَ يُجْزَوْنَ الْغُرْفَةَ بِمَا صَبَرُوا وَيُلَقَّوْنَ فِيهَا تَحِيَّةً وَسَلَامًا﴾[2]

پیاوێك منداڵەکەی هێنایە لای پێشەوا عمر رضي الله عنه گووتی: ئەی فەرمانڕەوای باوەڕداران ئەم کوڕەم زۆر لاسارەو ئازارم دەدات!! پێشەوا عمر رضي الله عنه ڕوی کردە کوڕەکەو گووتی: ئەوە لە خودا ناترسیت بۆ ئازاری باوکت دەدەیت؟ ئایا نازانی مافەکانی دایك و باوك بەسەرتەوە ئەوە.. ئەوەیە...؟ کوڕەکە گووتی: ئەی فەرمانڕەوای باوڕداران ئایا منداڵ هیچ مافێکی لەسەر باوکی هەیە؟ فەرمووی: بەڵێ مافی منداڵ لەسەر باوك بریتیە لە: یەکەم/ پێویستە باوك دایکێکی باشو نەجیب زادە بۆ منداڵەکانی هەڵبژێرێت، بۆ ئەوەی خەڵکی تانەو تەشەرەی لێنەدەن بەهۆی دایکیەوە. دووەم/ پێویستە باوك ناوێکی خۆش بۆ منداڵەکەی دابنێت. سێهەم/ پێویستە باوك منداڵەکانی فێری قورئان و نوسین و خوێندنەوە بکات. کوڕەکە گووتی: دەبا پێت بڵێم: باوکم دایکێکی باشی بۆ هەڵنەبژاردووم، بەڵکو دایکم ئافرەتێکی سندیەو بە چوار سەد درهەم کڕیویەتی، وە ناوی لێناوم (جعل) ـ واتا نێرینەی شەمشەمە کوێرە ـ وە تەنها یەك ئایەتیشی لە قورئان فێر نەکردووم!! کاتێك پێشەوا عمر رضي الله عنه گوێی لەوە بوو، ڕوی کردە باوکـــــی کوڕەکەو

١ـ الفرقان: ٧٤

٢ـ الفرقان: ٧٥

فه‌رمووی: (تقول: إبني يَعُقُنِي، فَقَد عَقَقتَهُ قَبلَ أن يَعُقّكَ، قُم عنّي)[1]واتا: هاتوی سكالاّ ده‌كه‌ی و ده‌ڵێی كوڕه‌كه‌م لاساره‌و وئازارم ده‌دات؟! به‌ڕاستی به‌ر له‌وه‌ی ئه‌و ئازار تۆ بدات تۆ ئازاری ئه‌وت داوه‌، هه‌سته‌ له‌به‌ر چاوم ونبه‌!!

٢ـ پێویسته‌ له‌سه‌ر دایك و باوك به‌ر له‌وه‌ی ده‌ستبكه‌ن به‌ كاری سه‌رجێی دووعا بكه‌ن بۆ ئه‌وه‌ی خودای گه‌وره‌ منداڵی باش و چاكیان پێبدات، پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویست فه‌رموویه‌تیﷺ: ( لَوْ أَنّ أَحَدَهُمْ إِذَا أَرَادَ أَنْ يَأْتِيَ أَهْلَهُ قَالَ : بِاسْمِ اللَّهِ اللَّهُمّ جَنّبْنَا الشّيْطَانَ وَجَنّبْ الشّيْطَانَ مَارَزَقْتَنا، فَقُضيَ بَينَهُما ولَدٌ لَم يَضُرَّهُ)[2]واتا: هه‌ر كه‌سێك ویستی بچێته‌ لای خێزانی با بڵێت: به‌ناوی خودا، خودایه‌ گیان ئێمه‌ بپارێزه‌ له‌ شه‌یتا، وه‌ ئه‌و منداڵه‌ی پێشمان ده‌ده‌یت له‌ شه‌یتان بیپارێزه‌، جا ئه‌گه‌ر هاتوو له‌و سه‌رجێیه‌ منداڵیان بوو" ئه‌وه‌ شه‌یتان هیچ زیانێكی پێناگه‌یه‌نێت.

٣ـ پێویسته‌ له‌سه‌ر باوك و دایك دور بكه‌ونه‌وه‌ له‌ خواردنی هه‌ر شتێك كه‌ زیان به‌ ته‌ندروستی منداڵه‌كه‌یان ده‌گه‌یه‌نێت وه‌ك: جگه‌ره‌و مه‌ی و مادده‌ هۆشبه‌ره‌كان،[3]وه‌ دور بكه‌ونه‌وه‌ له‌هه‌ر كارو كرده‌وه‌یه‌ك كه‌ به‌هۆیانه‌وه‌ منداڵه‌كه‌یان له‌كه‌دار ببێت دوای له‌دایكبونی، وه‌ك دزی و قۆڵبڕی و ده‌م شڕی و زمان پیسی و داوێن پیسی و...هتد

٤ـ پێویسته‌ له‌سه‌ر دایك و باوك كاتێك منداڵیان بوو، ڕێوڕه‌سمه‌ ئیسلامیه‌كانی بۆ جێبه‌جێ بكه‌ن كه‌ بریتین له‌مانه‌:

أـ مه‌لاّشوی به‌ خورما شیرن بكه‌ن، كه‌ له‌شه‌رعدا پێی ده‌گوترێت: (تحنيك) چونكه‌ پێغه‌مبه‌ری خۆشه‌ویستﷺ ده‌می منداڵانی موسڵمانانی شیرین(تحنيك) ده‌كرد.[4]

---

١ـ تنبيه الغافلين، سمرقندی: ٨٣

٢ـ پێشه‌وایان بوخاری و مسلم گێڕویانه‌ته‌وه‌.

٣ـ تبصرة الأنام بالحقوق في الإسلام: ١١٥

٤ـ پێشه‌وایان بوخاری و مسلم گێڕویانه‌ته‌وه‌.

ب ـ لە ڕۆژی یەکەم یان حەوتەمی لەدایکبونیدا بانگ بەگوێی ڕاست و قامەت بەگوێی چەپیدا بلێین، گەورەمان عبداللە ی کوڕی ابی رافع لە باوکیەوە‌ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (رَأَيْتُ النَّبِيَّ ﷺ أَذَّنَ فِي أُذُنِ الْحَسَنِ يَوْمَ وَلَدَتْهُ بِالصَّلاةِ)[1] واتا: پێغەمبەری خودام ﷺ بینی بانگی دەگووت بە گوێی حەسەندا لەو ڕۆژەی کە لەدایك بوبوو.

ج ـ لە حەوتەم ڕۆژی لەدایکبونی منداڵەکەیاندا ناوێکی جوان و خۆش و شەرعی بۆ منداڵەکەیان دابنێن، پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّكُمْ تُدْعَوْنَ يَوْمَ القِيامَةِ بِأَسْمائِكُمْ وأَسماءِ آبائِكُمْ فَأَحْسِنُوا أَسْماءَكُمْ)[2] واتا: ئێوە لە ڕۆژی قیامەتدا بەناوی خۆتان و ناوی باکتانەوە بانگ دەکرێن، لەبەر ئەوە با ناوەکانتان ناوی خۆش و و جوان بن، وە لەناو ناوەکانیشدا جوانترین ناو ناوەکانی عبداللە وە عبدالرحمن و ناوی پێغەمبەرانن بەگشتی و ناوی محمدە بەتایبەتی، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (إِنَّ أَحَبَّ أَسْمائِكُمْ إِلى اللهِ عَزَّ وَجَلَّ عَبْدُ اللهِ، وَعَبْدُ الرَّحْمَنِ)[3] واتا: خۆشەویسترین ناو لای خودای گەورە (عبداللە و عبدالرحمن)ە. وە پێغەمبەری خودا ﷺ ناوی کوڕەکەی خۆی بەناوی پێغەمبەر ئیبراهیمەوە ناو ناوە، کاتێك ئیبراهیمی کوڕی پێغەمبەر ﷺ لەدایکبوو، پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (وُلِدَ لي اللَّيْلَةَ غُلامٌ فَسَمَّيْتُهُ باسْمِ أَبي: إِبْرَاهِيم صلى الله عليه وسلم)[4] واتا: ئەمشەو منداڵێکمان لەدایکبوو، منیش بەناوی باکمەوە ئیبراهیم ناوم ناوە. وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (تَسَمَّوا بِاسْمِي)[5] واتا: منداڵەکانتان بە ناوی منەوە ناو بنێن.

---

١ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان ابوداود و احمد و الدارمي و البيهقي گێڕاویانەتەوە.

٣ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٥ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

وە ئەگەر کچیش بوو ئەوە بەهەمان شێوە سوننەتە ناوێکی وەهای لێبنێن کە گەورە بوو پێی شەرم نەبێت و خەڵکی تانەی لێنەدەن، وە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆخۆی کاتێك گوێی لە ناوێکی ناخۆش بوایە ناوەکەی دەگۆڕی بۆ ناوێکی خۆش.

وە سوننەتە ئەو کەسەی بانگ بەگوێیدا دەڵێت دوای بانگ گووتن بەگوێیدا دووعای خێری بۆ بکات هەروەك چۆن دایکی مەریەم گووتی: ﴿وَإِنِّي سَمَّيْتُهَا مَرْيَمَ وَإِنِّي أُعِيذُهَا بِكَ وَذُرِّيَّتَهَا مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ﴾[1] واتا: بەڕاستی ئەوە من ناوم لەو کچەم نا مەریەم، وە خودایە من دەیپارێزم بەتۆ خۆی و وەچەکانی. وە پێغەمبەری خۆشەویستیش کاتێك ناوی منداڵێکی دەناو دەمی شیرین دەکرد دووعای خێری بۆ دەکرد، ابو موسای ئەشعەری دەفەرمووێت: منداڵێکمان بوو، منیش بردم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ، پێغەمبەریش ﷺ دەمی شیرین کردو ناوی لێنا ئیبراهیم، پاشان: (وَدَعَا لَهُ بِالْبَرَكَةِ وَدَفَعَهُ إِلَيَّ)[2] واتا: دووعای خێری بۆ کردو دایەوە بە من.

د- سوننەتە لە حەوتەم ڕۆژی لەدایکبونیدا هۆزەبانەی بۆ بکەن .سومرە رضي الله عنه بۆمان دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرموویەتی: (كُلُّ غُلامٍ رَهِينٌ بِعَقِيقَتِهِ تُذْبَحُ عَنْهُ يَوْمَ سابِعِهِ، وَيُحْلَقُ، وَيُسَمَّى)[3] واتا: هەموو منداڵێك بارمتەیە بەو هۆزەبانەیەی کە لە ڕۆژی حەوتەمیدا بۆی سەر دەبڕدرێت،وە هەر لەڕۆژی حەوتەمدا سەری بۆ دەتاشرێت و ناوی لێدەنرێت.

و- سوننەتە لەڕۆژی حەوتەمی لەدایکبونیدا سەری بتراشن و پاشان مووەکانی بە زێڕ یان زیو بکێشن و پارەکەی بۆ بکەن بەخێر، بەبەڵگەی فەرموودەکەی ڕابردوو کە فەرمووی: (وَيُحْلَقُ).

---

١- آل عمران: ٣٦

٢- پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٣- پێشەوایان ابوداد و ترمزی گێڕاویانەتەوە، وە ترمزی دەفەرمووێت: حسن صحیح

٤ـ پێویستە لەسەر دایك و باوك منداڵەکانیان فێری ئاداب و ئەرکانەکانی ئیسلام بکەن، وە بەتایبەت لە تەمەنی حەوتساڵیدا پێویستە فەرمانی پێبکەن کە نوێژ بکات و ڕۆژ و بگــرێت، وە ئەگەر کچ بوو لە حەوت ساڵیدا فێری پۆشینی حیجابی بکەن، وە جگە لەمانەش ڕێنمونیان بکەن بۆ هەرچی کاری چاکەیە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مُرُوا أَوْلاَدَكُمْ بِالصَّلاَةِ وَهُمْ أَبْنَاءُ سَبْعِ سِنِينَ وَاضْرِبُوهُمْ عَلَيْهَا وَهُمْ أَبْنَاءُ عَشْرٍ وَفَرِّقُوا بَيْنَهُمْ فِي الْمَضَاجِعِ)[1]واتا: فەرمان بە منداڵەکانتان بکەن بە نوێژ کردن کاتێك تەمەنیان بوو بە حەوت ساڵ، وە لە دە ساڵیدا کە نوێژیان نەکرد لێیان بدەن، وە هەر لە دە ساڵیدا جێگایان لێجیابکەنەوە.

وە لەناو هەموو کردەوە چاکەکانیشدا بەتایبەت فێری عەقیدەیەکی پاك و ڕێکیان بکەن، بۆ ئەوەی نەکەونە داوی بێ عەقیدەی و بێ باوەڕیەوە، هەروەك چۆن پێغەمبەران بەگشتی و ئیبراهیم و یەعقوب علیهماالسلام بەتایبەتی ئامۆژگاری منداڵەکانیان دەکرد بە بیروباوەڕو عەقیدەی ڕاست و دروست، خودای گەورە لەسەر زاری ئەو دوو پێغەمبەرەوە دەفەرموێت: ﴿وَوَصَّى بِهَا إِبْرَاهِيمُ بَنِيهِ وَيَعْقُوبُ يَا بَنِيَّ إِنَّ اللّهَ اصْطَفَى لَكُمُ الدِّينَ فَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسْلِمُونَ﴾[2]واتا: هەردووك پێغەمبەر ئیبراهیم و یەعقوبعلیهماالسلام وەصیەتیان بۆ منداڵەکانیان کردوو فەرمویان: ئەی ڕۆڵەکانمان بەڕاستی خودای پەروەدگار تەنهادینی ئیسلامی قبوڵەو هەر ئەو دینەشی بۆ ئێوە هەڵبژاردووە، ئێوەش هەتا دوا هەناسەتان هەر لەسەر ئەو دینە بن و مەمرن تەنها بە موسڵمانی نەبێت. وە پاشانیش پێغەمبــەر یەعقوب علیه السلام لەسەرە مـــەرگدا هەتا دڵنیایی لێوەر نەگرتن دڵی ئارامی نەگرت و فەرمووی: ﴿أَمْ كُنتُمْ شُهَدَاءَ إِذْ حَضَرَ يَعْقُوبَ الْمَوْتُ إِذْ قَالَ لِبَنِيهِ مَا تَعْبُدُونَ مِن بَعْدِي قَالُوا نَعْبُدُ إِلَهَكَ وَإِلَهَ آبَائِكَ إِبْرَاهِيمَ وَإِسْمَاعِيلَ وَإِسْحَاقَ إِلَهًا وَاحِدًا وَنَحْنُ

١ـ پێشەوایان أبوداود و احمد گێراویانەتەوە.

٢ـ البقرة: ١٣٢

لَهُ مُسْلِمُونَ﴾[1]واتا: ئایا ئێوە ـ ئەی جولەکە و گاورەکان بڕوا بە محمد ناهێنن و خۆشتان بە شوێن کەوتەی ئیبراهیم و یەعقوب دەزانن ـ ئامادەی سەرەمەرگی یەعقوب بوون، کاتێك بە کوڕەکانی گووت: ئایا دوای من چی دەپەرستن؟ گووتیان: دوای تۆ خودای تۆو باب و باپیرانت ئیبراهیم إسماعیل و إسحاق دەپەرستین، کە خودایەکی تاك و تەنهایە و ئێمە هەمومان فەرمانبەردارو ملکەچی ئەوین.

٥ـ پێیوستە لەسەر دایك و باوك پەروەردەیەکی باش و هاوچەرخی مندالەکانیان بکەن، چونکە دایك و باوك بەرپرسن لەهەر هەڵەیەکی مندالەکانیان دوای گەورە بونیان" ئەگەر لە منداڵیدا پەروەردەیەکی باشیان نەکردبن. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (أَلا كُلُّكُمْ رَاعٍ، وَكُلُّكُمْ مَسْئُولٌ عَنْ رَعِيَّتِهِ، ... وَالرَّجُلُ رَاعٍ عَلَى أَهْلِ بَيْتِهِ وَهُوَ مَسْئُولٌ عَنْهُمْ، وَامْرَأَةُ الرَّجُلِ رَاعِيَةٌ عَلَى بَيْتِ بَعْلِهَا وَوَلَدِهِ وَهِيَ مَسْئُولَةٌ عَنْهُمْ)[2]واتا: هەمووتان وەکو شوان وەهان، بەرپرسن لەو کەسانەی لەبەر دەستتاندان، ... پیاو بەرپرسە بەسەر ماڵەوە و پرسیاریشی لێدەکرێت لەسەر ئەو کەسانەی کە لەبەر دەستی دان، وە ئافرەت بەرپرسە بەسەر ماڵی مێردەکەیەوە و پرسیاریشی لێدەکرێت دەربارەی ماڵی مێردەکەی.

وە پێویستە مندالەکانمان لەهەر هەڵەیەك ئاگادار بکەینەوە کە ئەنجامی دەدەن، بۆ ئەوەی لەسەر ئەم هەڵەیە ڕانەیەن و بەردەوام نەبن، عمری کوڕی ابی سەلمەرضي الله عنهدەفەرموێت: من منداڵ بووم لەلای پێغەمبەرﷺ بووم، ڕۆژێکیان نانم دەخوارد، منیش دەستم لەهەموو قاپەکـــە دەگێڕا، پێغەمبەری خوداﷺفەرمووی: (ياغلامُ سَمِّ الله، وكُلْ بِيَمِنِيكَ، وكُلْ مِما يَلِيكَ)[3]واتا: ئەی گەنج کاتێك نانت خوارد(بسم الله) بکە، پاشان بەدەستی ڕاست بخۆ، وە لەو بەشـــە بخـــۆ

١ـ البقرة: ١٣٣

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

کەدەکەوێتە لای تۆ.

٦ـ پێویستە لەسەر دایك و باوك ودەوڵەت خوێندنێکی هاوچەرخ بۆ منداڵان دابین بکەن: چونکە پێغەمبەری خوداﷺ زۆر گرنگی بە فێرکردنی منداڵان داوە، هەتا کاتێك حەفتا کەس لە بێباوەڕان لە غەزای بەدردا بەدیل گیران" یەکێك لە مەرجەکانی ئازادکردنیان بریتی بو لەوەی کە دە منداڵی موسڵمانان فێری نوسین و خوێندنەوە بکەن.

٧ـ پێویستە لەسەر باوك بژێوی ژیانی منداڵەکانی دابین بکات. هەتا ابن منذر کۆدەنگی زانایانی گێڕاوەتەوە لەسەر ئەوەی کە پێویستە ـ واجبە ـ باوك بژێوی ژیانی منداڵەکانی دابین بکات، وە پێشەوا نەوەوی لە (منهاج الطالبین)دا دەفەرمووێت: (يَلْزَمُهُ نَفَقَةُ الوالد وإن علا، والوَلَدِ وإن سَفَلَ..)[1] واتا: واجبە لەسەر کوڕ بژێوی ژیانی دایك و باوك و نەنك و باپیرانی دابین بکات ئەگەر پێویستیان پێی بوو، وە بەهەمان شێوە بژێوی منداڵیش لەسەر باوك واجبە. وە بەبەڵگەی ئەو ئایەتەی خودا کە دەفەرمووێت: ﴿فَإِنْ أَرْضَعْنَ لَكُمْ فَآتُوهُنَّ أُجُورَهُنَّ﴾[2] واتا: ئەگــەر هاتوو خێزانەکانتان تەڵاقدا لەکاتێکدا منداڵی شیرەخۆرەتان هەبوو" وە خێــزانە تەڵاقدراوەکەش شیری بەمنداڵەکەتاندا" ئەوە کرێی شیر پێدانەکەی بدەنێ.

جا ئەگەر کرێی شیر پێدان لەسەر باوك بێت" ئەوە بێگومان دیارە دابین کردنی بژێوی ژیانی منداڵیش هەر لەسەر باوکە.

وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (كَفَى بِالْمَرْءِ إِثْمًا أَنْ يُضَيِّعَ مَنْ يَقُوتُ)[3] واتا: بەسە تاوانی بۆ ئەو کەسەی کە بژێوی کەسێکی لەسەرەو پێی نادات.

جا دابین کردنی بژێوی ژیانی منداڵ دەبێتە ڕێگر لەوەی ئەگەر منداڵ کار بکات، چونکە

٢ـ ڕوناکی رب العالمین ڕونکردنەوەی منهاج الطالبین: ٤/ ٤٣٤

٣ـ الطلاق: ٦

٤ـ پێشەوا أبوداود گێڕاویەتەوە.

ئەگەر منداڵ بژێوی ژیانی دابین بێت" ئەوە پەنا بۆ كار كردن نابات، پاشان لەسەر دەوڵەت پێویستە بەدواداچون بكات بۆ ئەو منداڵانەی كە لەسەر شەقامن وە یاخود كار دەكەن، ئەگەر ئەو منداڵانە باوكیان هەبوو" ئەوە دەوڵەت دەبێت لەسەر باوكی پێویست بكات بژێوی ژیانی دابین بكات، وەئەگەر باوكی هەبوو بەڵام هەژار و نەدار بوون، وە یاخود باوكی كەمئەندام و خـــاوەن پێویستی بوو، یان نەخۆش بوو، ئەوە لەسەر دەوڵەت پێویستە بژێوی ژیانیان دابین بكات، وە ئەگەر باوكیشی نەبوو" بەهەمان شێوە لەسەر دەوڵەت پێویستە لە ماڵی دەوڵەت ـ بیت المال ـ موچەیان بۆ ببڕێتەوە و بژێوی ژیانیان دابین بكات.

٨ـ پێویستە لەسەر دایك و باوك و كۆمەڵگا مامەڵەیەكی نەرم ونیان لەگەڵ منداڵدا بكەن: گەورەمان ابوهریرةرضي الله عنه دەفەرمووێت: ئەقرەعی كوڕی حابس پێغەمبەری خودایﷺ بینی كە حەسەنی كوڕی عەلی رضي الله عنهما ماچ دەكرد، ئەقرەع گووتی: من دە منداڵم هەیە یەكێكیشیانم ماچ نەكردووە!! پێغەمبەری خوداشﷺ فەرمووی: (إِنَّهُ مَنْ لا يَرحَمْ، لا يُرحَمْ)[1]واتا: هەر كەسێك سۆزی نەبێت" خوداش سۆزو ڕەحمی پێناكات. وە لەگێڕانەوەیەكی تردا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (أَرَأَيتَ إِنْ كانَ اللهُ نَزَعَ الرَّحْمَةَ مِنْ قَلبِكَ فَما ذَنْبِي؟)[2]واتا: ئایا تاوانی من چیە كە خودای گەورە سۆزو ڕەحمی لەدڵت دەرهێناوە؟

ئەنەسی كوڕی مالكرضي الله عنه دەفەرمووێت: (كَانَ النَّبِيُّﷺأَحْسَنَ النَّاسِ خُلُقًا وَكَانَ لِي أَخٌ يُقَالُ لَهُ أَبُو عُمَيْرٍ قَالَ أَحْسِبُهُ فَطِيمًا وَكَانَ إِذَا جَاءَ قَالَ يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ، نُغَرٌ كَانَ يَلْعَبُ بِهِ)[3]واتا: بەڕاستی پێغەمبـــەری خـــوداﷺ ڕەوشتی لە هەموو كەس جوانتر بـــوو، من

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا حاكم گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەویان بوخاری مسلم گێڕاویەتەوە.

برایەکم هەبوو پێیان دەگووت: ابوعومەیر تازە لەشیر برابۆوە،وە بولبولێك یاخود زەڕنەقوتەیەکی هەبوو یاری پێدەکرد،جا هەر کاتێك پێغەمبەرﷺ دەهات بۆ ماڵمان دەیفەرموو: ئەی عومەیر بولبولەکەت چ لێکرد؟ جا پێغەمبەرﷺ ئەو فەرموودەی تەنها بۆ ئەوە دەفەرموو هەتا دڵی ئەو منداڵە خۆشبکات، چونکە لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەرﷺ ابوعومەیری بینی دڵتەنگ بوو، پرسی بۆ ئاوا دڵتەنگە؟ گووتیان چونکە بولبولەکەی مردووە، ئینجا پێغەمبەرﷺ فەرمووی: (يَا أَبَا عُمَيْرٍ مَا فَعَلَ النُّغَيْرُ)[1]

٩ـ پێویستە لەسەر دایك و باوك دادپەروەربن لە نێوانی منداڵەکانیاندا لەکاتی بەخشیندا: نوعمانی کوڕی بەشیر دەفەرمووێت: باوکم منی لەگەڵ خۆیدا برد بۆلای پێغەمبەری خوداﷺو گووتی: (إِنِّي نَحَلْتُ ابْنِي هَذَا غُلاَماً كَانَ لِي، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ:أَكُلَّ وَلَدِكَ نَحَلْتَهُ مِثْلَ هَذَا؟" فَقَالَ: لاَ، فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ: فَارْجِعْهُ)[2]واتا: ئەی پێغەمبەری خوداﷺمن بەندەیەکم هەبوو بە دیاری دام بەو کوڕەم، پێغەمبەریشﷺفەرمووی: ئایا بەهەموو کوڕەکانی تریش بە دیاری بەندەت پێداون؟ گووتی: نەخێر، پێغەمبەریشﷺفەرمووی کەواتا لەو بەخشینە پاشگەز بەرەوە. وە لە گێڕانەوەیەکی تردا پێغەمبەرﷺفەرمووی: (اتَّقُوا اللَّهَ وَاعْدِلُوا فِي أَوْلاَدِكُمْ" فَرَجَعَ أَبِي، فَرَدَّ تِلْكَ الصَّدَقَةَ)[3]واتا: لەخودا بترسێن و دادپەروەربن لە نێوانی منداڵەکانتاندا، باوکیشم پەشیمان بویەوە و بەخشینەکەی وەرگرتەوە.

خوێنەری بەڕێز: ئەوانەی ڕابران بەشێك بوون لە مافەکانی منداڵ لەسەر دایك و باوك و کۆمەڵگاو دەوڵەت لە ئیسلامدا، بێگومان ئەگـــەر بێت و نەوەکو هەر موسڵمان بەڵکو ئەگـــەر

١ـ پێشەوا ابوداود گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٣ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

هه‌موو دونیاش به‌پێی ئه‌م مافانه‌ی ئیسلام مامه‌ڵه له‌گه‌ڵ منداڵدا بکات" ئه‌وه هیچ منداڵێك له‌سه‌ر ڕوی زه‌وی کێشه‌ی مافی نامێنێت، به‌ڵکو منداڵان به‌وپه‌ڕی ئاسوده‌ییه‌وه ژیانی منداڵیان به‌ڕێده‌که‌ن.

## منداڵ تاقیکردنه‌وه‌ی خودایه!!

دوای ئه‌وه‌ی که مافه‌کانی منداڵمان زانین، پێویسته ئه‌وه‌ش بزانین که منداڵ تاقیکردنه‌وه‌ی خودایه بۆ ئێمه، خودای گه‌وره ده‌فه‌رموویێت: ﴿وَاعْلَمُوا أَنَّمَا أَمْوَالُكُمْ وَأَوْلَادُكُمْ فِتْنَةٌ وَأَنَّ اللَّهَ عِندَهُ أَجْرٌ عَظِيمٌ﴾[1]واتا: بزانن که ماڵ سه‌روه‌ت و سامان و منداڵه‌کانتان تاقیکرنه‌وه‌ن بۆ ئێوه، جا هه‌رکه‌سێك له تاقیکردنه‌وه‌که‌یاندا سه‌رکه‌وتوو بێت و به‌هۆیانه‌وه له عیبادتی خودا بێ ئاگا نه‌بێت" ئه‌وه خودای گه‌وره پاداشتی زۆر و بێ سنوری لایه بۆ ئه‌وانه. وه پێویسته ئه‌وه بزانین که خودای گه‌وره به‌نده‌کانی به‌چه‌ند شێوه‌یه‌ك به منداڵ تاقی ده‌کاته‌وه که بریتین له‌مانه‌ی خواره‌وه:

یه‌که‌م/ خودای گه‌وره به‌شێك له به‌نده‌کانی تاقیده‌کاته‌وه به‌وه‌ی که منداڵیا پێنادات، زۆر که‌س هه‌یه زۆر حه‌ز ده‌کات خودا منداڵی پێبدات" به‌ڵام خودای گه‌وره تاقیده‌کاته‌وه و منداڵی پێنادات.خودای گه‌وره ده‌فه‌رموویێت: ﴿وَيَجْعَلُ مَن يَشَاءُ عَقِيمًا إِنَّهُ عَلِيمٌ قَدِيرٌ﴾[2]واتا: مرۆڤی واهه‌یه خودای گه‌وره ویستی له‌سه‌ره که منداڵی پێنه‌دات و نه‌زۆك بێت، به‌ڕاستی خودای گه‌وره زاناو به توانایه.

جا پێویسته له‌سه‌ر ئه‌و که‌سانه به هه‌ردووك هێزی دانبه‌خۆداگرتن و ڕازی بوون به به‌شی خودا سه‌رکه‌ون به‌سه‌ر ئه‌م تاقیکردنه‌وه‌یه‌دا، چونکه ئه‌گه‌ر دانبه‌خۆداگرن و به به‌شی خودا ڕازی بن"

---

١ـ الأنفال: ٢٨

٢ـ الشورى: ٥٠

ئەوە بەهۆیەوە بەهەشت بەدەست دەهێنن، عەطائی کوڕی أبی رباح دەفەرمووێت: ابن عباس رضي الله عنهما پێمی فەرموو: (أَلاَ أُرِيكَ امْرَأَةً مِنْ أَهْلِ الجَنَّةِ ؟ قُلْتُ: بلى، قال: هذه المرأةُ السَّوْداءُ، أَتَتِ النبيَّ ﷺ فقالتْ: إني أُصْرَعُ، وإني أتَكَشَّفُ، فادْعُ اللهَ لي، قال: (إن شِئتِ صبرتِ ولك الجنَّةُ، وإن شِئتِ دعَوتُ اللهَ أن يُعافيَكِ). فقالتْ: أصبرُ، فقالتْ: إني أتَكَشَّفُ، فادْعُ اللهَ أنْ لا أتَكَشَّفَ، فدَعا لها)[1] واتا: ئایا ئافرەتێکی ئەهلی بەهەشتت نیشان بدەم؟ گووتم: بەڵێ، فەرمووی: ئەو ئافرەتە ڕەشە هاتە لای پێغەمبەرﷺو گووتی: من فێم دێتێ، وەکاتێك فێم هاتێ عەورەتم دەردەکەوێت، جا دووعام بۆ بکە بۆ ئەوەی خودا شیفام بدات، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ئەگەر حەز دەکەی دان بەخۆدابگرەو بەوهۆیەوە بەهەشت بەدەست بهێنە، وە ئەگەر حەزیش دەکەی دوعات بۆ دەکەم خودا شیفات بدات، ئەویش گووتی: دان بەخۆدا دەگرم، بەڵام من کاتێك فێم دەگرێت عەورەتم دەردەکەوێت، لەبەر ئەوە دوعام بۆ بکە ئەوجار کە فێم لێهات عەورەتم دەرنەکەوێت، پێغەمبەریشﷺدووعای بۆ کرد.کەواتا: ئەم فەرموودەیە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە هەر کەسێك نەخۆشیەکی هەبێت و لەسەری دان بەخۆدا بگرێت" ئەوە بەهۆیەوە بەهەشت بەدەست دێنێت.

وە پێویستە لەگەڵ دان بەخۆداگرتنیشدا هیچ کاتێك بێ ئومێد نەبن لە بەخششندەیی خودای میهرەبان، چونکە خودای ئەوان هەمان ئەو خودایەیە کە لە تەمەنی سەدو دە ساڵیدا منداڵی بە ئیبراهیمی پێغەمبەردا علیه السلام بەشێوەیەك کاتێك فریشتەکان هەواڵی منداڵیان بە ئیبراهیم و خێزانەکەی دا، خێزانی ئیبراهیم سەری سوڕماو گووتی: ﴿قَالَتْ يَا وَيْلَتَى أَأَلِدُ وَأَنَا عَجُوزٌ وَهَذَا بَعْلِي شَيْخًا إِنَّ هَذَا لَشَيْءٌ عَجِيبٌ﴾[2] واتا: وەی ڕۆ من چۆن منداڵم دەبێت" لەکاتێکدا من

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ هود: ٧٢

پیرم و ئەوەش مێردەکەمە کە پیرو بەساڵاچووە، بەڕاستی ئەوە شتێکی سەرسوڕهێنەرە!! فریشتەکانیش گووتیان: ﴿قَالُوا أَتَعْجَبِينَ مِنْ أَمْرِ اللَّهِ...﴾[1]واتا: ئایا تۆ سەرت لە کاری خودا دەسوڕمێت؟! بەڵێ ئەم کارە سەرسوڕهێنەرە، بەڵام بۆ خودای گەورە کارێکی زۆر ئاسانە،وە ئێمە ڕۆژانە چەندین هەواڵی لەو شێوەیە دەبیستین، دەبیستین کە فلانە کەس دوای ماوەیەکی زۆر لەپێکهێنانی ژیانی هاوسەری ـ دوای دە ساڵ، پانزە ساڵ...ـ خودا منداڵی پێداون.

دووەم/ مرۆڤی وا هەیە خودای گەورە منداڵی پێدەدات" بەڵام بەمنداڵەکەی تاقی دەکاتەوە بەوەی کە منداڵەکەی منداڵێکی لاسار و خراپە: جا لەسەر دایکان و باوکان پێویستە بەهێزی ئامۆژگاری و دووعای خێر و دانبەخۆداگرتن بەسەر ئەو تاقیکردنەوەدا سەر بکەون، ئەوکات خودای گەورە ئەو تاقیکردنەوەیان بۆ دەکات بەخێر، بەڵام بەو مەرجەی کە لەمنداڵیدا هەوڵیان لەگەڵدابێت بۆ پەروەردوکردنی بە پەروەردەی ئیسلامی، وە ئەوەش بزانن کە لاساری منداڵەکەیان ڕق و توڕەی خودا نیە لێیان" بەڵکو تاقیکردنەوەیە، چونکە پێغەمبەران کە خۆشەویستترین مرۆڤن بەلای خوداوە" بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر هەبووە کوڕەکەی لاسار بووە، بۆنمونە: کوڕەکەی نوح پێغەمبەر باوەڕی بە باوکی نەهێنا، وە کاتێك باوکی بانگی کرد بۆ ئەوەی سەرکەوێت بۆ ناو کەشتیەکە و ڕزگار بێت لە تۆفانەکە بەقسەی باوکی نەکرد و لاساربوو!

بەڵام بەداخەوە ئێمە کاتێك منداڵێکم لاسار دەبێت" لەجیاتی دووعای خێری بۆ بکەین دووعای خراپی لێدەکەین، ئەوەش لەکاتێکدا پێغەمبەری خوداﷺنکوڵی کردووە لەوەی دووعای خراپ لە منداڵەکانمان بکەین و فەرموویەتی: (لاتَدْعُوا عَلَى أَنْفُسِكُمْ، وَلَا تَدْعُوا عَلَى أَوْلَادِكُمْ)[2] واتا: دووعای خراپ نە لە خۆتان و نە لەمنداڵەکانیشتان مەکەن.

---

١ـ هود: ٧٣

٢ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

سێهەم/ مرۆڤی وا هەیە خودای گەورە بە کچ تاقیدەکاتەوە، خودای گەورە دەفەرمووێت: ﴿لِّلَّهِ مُلْكُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ يَخْلُقُ مَا يَشَاءُ يَهَبُ لِمَن يَشَاءُ إِنَاثًا...﴾[1] واتا: هەر بۆ خودا خاوەنداریەتی ئاسمانەکان و زەوی و ئەوەی کە لە ناویشیاندایە،هەرچی بیهەوێت دروستی دەکات، وە بەهەر کەس بیهەوێت کچی پێدەبەخشێت...

لەم ئایەتەوە بۆمان ڕون بۆوە کە بێگومان بونی کچ بە ویستی خودایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زۆرکەس هەیە کاتێك هەواڵی پێدەدەن کە کچی بووە لەناخەوە دڵتەنگ دەبێت و دەم و چاوی ڕەش دادەگیرێت،وە زۆر موسڵمانیش هەیە کاتێك دەڵێن فلاّنە کەس تەنها کچیان دەبێت"دەڵێت: ئەوانە وەجاخ کوێرن!! ئەو دوو هەڵوێستانەش هەردووکیان صیفەتی بێباوەڕانن چونکە:

یەکەم/ کاتێك بێباوەڕان هەواڵی کچیان پێدەدرا دەم و چاویان ڕەش دادەگیرا و ماوەیەك پێیان شورەیی بوو بچنە ناو خەلکی، خودای گەورە بۆمان باس دەکات و دەفەرمووێت: ﴿وَإِذَا بُشِّرَ أَحَدُهُم بِالْأُنثَىٰ ظَلَّ وَجْهُهُ مُسْوَدًّا وَهُوَ كَظِيمٌ﴾[2]واتا: ئەو بێباوەڕانە ئەگەر موژدەی کچ بدرێت بە یەکێکیان ئەوە ڕوە گرژ و مۆن دەبێت و ڕەش دادەگیرێت و سینەی پڕ دەبێت لە خەم و پەژارە.

دووەم/ وە ئەو کەسانەش کە تانە لەو ژن و مێردانە دەدەن و بە وەجاخ کوێر ناویان دەبەن" ئەوانەش بەهەمان شێوە صیفەتێکی بێباوەڕانیان تێدایە، چونکە بێباوەڕانی مەککە تانەیان لە پێغەمبەری ڕێزدارﷺ دەدا بەوەی کە تەنها کچی بۆ دەمێنن و پێیان دەگووت وەجاخ کوێر!! بەڵام خودای پەروەردگار زۆر بە توندی وەڵامی دانەوە و فەمووی: ﴿إِنَّ شَانِئَكَ هُوَ الْأَبْتَرُ﴾[3]واتا:

١ـ الشورى: ٥٠

٢ـ النحل: ٥٨

٣ـ الكوثر: ٣

بێگومان ئەو کەسانەی کە ڕقیان لەتۆیە ئەو کەسان پاش بڕاو و وەجاخ کوێرن! جا بەڕاستی خودای گەورە ڕاستی فەرموو، ئەو کەسانەی دوژمنی پێغەمبەرنﷺ وەجاخ کوێرن، وە پێغەمبەرەکەیﷺ بەهیچ شێوەیەك وەجاخ کوێر نیە، چونکە لە ڕوی ڕاستی و واتایی ـ حقیقی و معنوی ـ و پێغەمبەرﷺ وەجاخ کوێر نیە، لەڕوی حەقیقەتەوە ئەو کەسانەی لەنەوەی خاتو فاطمەی کچی پێغەمبەرن شانازی بەخۆیانەوە دەکەن، وە لەناو موسڵمانانیشدا پێیان دەگووترێ (سید)، وە لەڕی واتایشەوە ـ معنوی ـ وە پێغەمبەرﷺ پەیامێکی بەجێهێشتووە کە هەر کەسێك دەستی پێوە بگرێت سەربەرزی دوونیا و قیامەت دەبێت. بەهەمان شێوە ئەو کەسەی تەنها کچیشی دەبن ڕەنگە ئەو کچانەی باشترین بەرهەم و باشترین نەوەیان لێیەیدا ببێت کە خێری دوونیا و قیامەتیان تێدا بێت. ئینجا خودای گەورە کچی وەك ڕێگایەکی گەیشتن بەبەهەشتی داناوە بەپێچەوانەی کوڕەوە، پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرمووێت: (مَنْ كَانَ لَهُ ثَلَاثُ بَنَاتٍ فَصَبَرَ عَلَيْهِنَّ، وَأَطْعَمَهُنَّ،وَسَقَاهُنَّ، وَكَسَاهُنَّ مِنْ جِدَتِهِ، كُنَّ لَهُ حِجَابًا مِنْ النَّارِ يَوْمَ الْقِيَامَةِ)[1] لە گێڕانەوەی بوخاریدا:(مَنْ ابْتُلِيَ مِن هذهِ البناتِ بِشَيْءٍ)[2] واتا: هەر کەسێك بەکچان تاقی بکرێتەوە، وەیان سێ کچی هەبن و لەسەریان دانبەخۆداگر بێت و بەپێی توانای خۆی نانیان پێبدات و پۆشاکیان بۆ بکات و ئاویان پێبدات" ئەوە ئەو کچانەی بۆی دەبن بە پەردەیەك و پارێزەرێك لە ئاگری دۆزەخ. وە لە گێڕانەیەکی تردا پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَنْ كَانَتْ لَهُ أُنْثَى، فَلَمْ يَئِدْهَا، وَلَمْ يُهِنْهَا، وَلَمْ يُؤْثِرْ وَلَدَهُ عَلَيْهَا، قَالَ: يَعْنِي الذُّكُورَ، أَدْخَلَهُ اللَّهُ الْجَنَّةَ)[3] واتا: هەر کەسێك مێینەیەکی هەبێت و زیندەبەچاڵی نەکات، وە سوکایەتی پێنەکات و

١ـ پێشەوا ابن ماجە گێڕاویەتەوە و (صحیح).

٢ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوایان احمد و ابوداود.

جیاوازی پێنەکات لەگەڵ کوڕەکانیدا، ئەوە خودای گەورە بەوهۆیەوە دەیباتە بەهەشتەوە!!

ئینجا تەنها خودا دەزانێت ئاخۆ کوڕ باشترە بۆ ژیانی باوك و دایك یان کچ، لە کتێبی (قصص أعجبتنی) دا بەسەرهاتێکمان بۆ دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: کچێکی بەڕەوشت و جوان مامۆستا بوو لە یەکێك لە قوتابخانەکان، ئەم کچە داخوازی هەبوو، بەڵام ڕەتی دەکردەوە شو بکات، هاوڕێیەکی خۆی بەردەوام پێی دەگووت: باشە تۆ بۆ شو ناکەیت لە کاتێکدا تۆ هێشتا گەنجیت و جوانی و ڕێك و پێکی؟ کچەکە گووتی: بەسەر هاتێك هەیە دەمهەوێت بۆتی بگێڕمەوە جا ئەوکات پێدەڵێم بۆ شو ناکەم، بەسەر هاتەکەش ئەوەیە: ئافرەتێك هەبوو خودای گەورە تەنها کچی دەبوون، هەتا پێنج کچی بوون، لەبەر ئەوە بەردەوام مێردەکەی هەڕەشەی جیابونەوەی لێدەکرد، دیسان ئەو ئافرەتە سکی پەیدا بوو، کە منداڵەکەیان بوو قەدەری خودا وابو ئەویشیان کچ بوو، لەبەر ئەوە پیاوەکە زۆر هەراسان بوو، بڕیاریدا کە ئەو کچە بەرێت لەبەر دەرگای مزگەوت دایبنێت بەڵکو کەسێك بۆخۆی بیباتەوە، ئەم پیاوە هەتا حەوت ڕۆژان شەوانە دوای نوێژی خەوتنان ئەو کچەی دەبرد لەبەر دەرگای مزگەوت دایدەنا بەڵکو کەسێك هەڵیبگرێتەوە، لەماڵەوەش هەموو جارێك دایکی قوڕئانی بەسەر ئەو منداڵەدا دەخوێند هەتا خودا بیپارێزێت، جا کاتێك بەیانی دوای نوێژی بەیانی دەچۆوە سەیری دەکرد کەس ئەو منداڵەی هەڵنەگرتۆتەوە، لەبەر ئەوە بەناچاری منداڵەکەی هێنایەوە و بەخێوی کرد، دایکی بەمە زۆر خۆشحاڵ بوو، داوتر ئەم ئافرەتە سکی پەیدا بۆوە ئەو جارەیان کوڕ بوو، کەواتا: منداڵەکان بوون بە شەش کچ و کوڕێك، پاشان قەدەری خودا وابوو ئەم ژن و پیاوە هەر کوڕیان بون و کچەکانیان مردن هەتا هاوکێشەکە تەواو پێچەوانە بویەوە و بون بە بوون بە پێنج کوڕ و کچێك، تەنها ئەو کچە مایەوە کە باوکەکەی چەندین جار هەوڵی لەناو بردنی دابوو لەگەڵ پێنج برایدا، پاشان دایکیشیان مرد، دواتر کوڕەکان و کچەکە گەورە بوون، باوکیشیان پیر بوو، ئێستا باوکیان پێویستی بە یارمەتی منداڵەکانیەتی بەڵام کێ یارمەتی بدات؟ کوڕەکان گەنجن و ناتوانن

یارمەتی باوكیان بدەن، هەردەبێت كچەكە یارمەتی بدات، پاشان كوڕەكان هەموویان ژنیان هێناو چونەماڵی خۆیان، وە هەر یەكەیان لە جێگایەكن و ڕێگایان دورە، وە زۆر سەرقاڵن لەبەر ئەوە مانگی جارێك سەردانی باوكیان دەكەن، بەڵام ئەو كچەی كە باوكی چەند جارێك هەوڵی لەناو بردنیدا بڕیاریدا كە لەگەڵ باوكیدا بێت و هەتا مردن خزمەتی بكات!! جا دەزانن ئەو كچە كێبوو كە باوكی هەوڵی لەناوبردنی دەدا و خوداش پاراستی؟ بێگومان ئەو كچە من بووم، وە منیشم كە لەبەر باوكم شو ناكەم و بڕیارم داوە هەتا مردن خزمەتی بكەم!! سبحان الله ویستی خودا!! ئەم باوكە چەند جارێك دەیویست كەسێك لەناو بەرێت كە ڕۆژگارێك دەبێتە یارمەتیدەر و فریادڕەس و خزمەتكاری! بەڵام خودای كار لەجێ پاراستی بۆ ئەوەی بیكات بە پەند بۆ ئەویش و بۆ ئێمەش.

٤ـ موسڵمانی وا هەیە خودای پەروەردگار كوڕ و كچیشی پێدەدات: ﴿أَوْ يُزَوِّجُهُمْ ذُكْرَانًا وَإِنَاثًا﴾[1].دیسان ئەوەشیان تاقیكردنەوەی خودایە، ئاخۆ ئەو موسڵمانە سوپاسی خودایان لەسەر دەكات، یان نا؟ جیاوازیان لە نێواندا دەكات یان نا؟ ئاخۆ بەپەروەردەیەكی ئیسلامی پەروەردەیان دەكات یان نا؟ ئاخۆ ئەو مافانەی لەسەرەوە باسمان كردن بە دادپەروەرانە پێیان دەدات یان نا؟ جا ئەگەر سوپاسی خودای لەسەر كردن و پەروەردەیەكی ئیسلامیانەی كردن و جیاوازی لە نێواندا نەكردن و مافەكانی پێدان" ئەوە لە تاقیكردنەوەكەیاندا سەر كەوتوو دەبێت إن شاءالله.

٥ـ موسڵمانی وا هەیە خودای گەورە منداڵی پێدەدات" بەڵام منداڵەكەی بۆ نامێنن، جا یان ئەوەتا منداڵەكانی لەبار دەچێت، وەیان ئەوەتا منداڵەكانی دوای لەدایكبون دەمرن.ئەوەشیان دیسان هەر تاقیكردنەوەیەی خودایە، جا سەركەوتن بەسەر ئەو تاقیكردنەوەدا بە دان

---

١ـ الشورى: ٥٠

بەخۆداگرتن و ڕازیبون بە قەدەری خودا دەکرێت، ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوداﷺ لە هاوەڵەکانی پرسی: ئایا دەزانن وەچاخ کوێر کێ یە؟ گوتیان: ئەو کەسەی منداڵی بۆ ڕاناوەستن!! فەرمووی: نەخێر، بەڵکو: (ولکنَهُ الذي لم يُقَدِّمْ من ولَدِهِ شيئاً)[1] واتا: وەجا کوێـر ئەو کەسەیە کە لە پێش خۆیدا هیچ منداڵێکی نەمـــردووە.

لە فەرموودەیەکی تردا پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَن ماتَ له ثلاثةٌ منَ الوَلَدِ لم يَبلُغوا الحِنثَ كانَ لهُ حِجاباً مِنَ النارِ، أو دَخلَ الجَنَةَ)[2]واتا:هەر کەسێك سێ منداڵی پێش باڵغ بوون بمرن، ئەوە خودای گەورە بۆی دەکات بە پەردەیەك لە ئاگرو دەیباتە ناو بەهەشتەوە.

معاویەی کوڕی قوڕڕە لە باوکیەوەرضي الله عنه بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: (أَنَّ رَجُلًا كَانَ يَأْتِي النَّبِيَّﷺوَمَعَهُ ابْنٌ لَهُ فَقَالَ لَهُ النَّبِيُّﷺ:أَتُحِبُّهُ؟ فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ أَحَبَّكَ اللَّهُ كَمَا أُحِبُّهُ فَفَقَدَهُ النَّبِيُّﷺفَقَالَ لِي مَا فَعَلَ ابْنُ فُلَانٍ؟ قَالُوا: يَا رَسُولَ اللَّهِ مَاتَ، فَقَالَ النَّبِيُّﷺ:لِأَبِيهِ أَمَا تُحِبُّ أَنْ لَا تَأْتِيَ بَابًا مِنْ أَبْوَابِ الْجَنَّةِ إِلَّا وَجَدْتَهُ يَنْتَظِرُكَ فَقَالَ الرَّجُلُ:يَا رَسُولَ اللَّهِ أَلَهُ خَاصَّةً أَمْ لِكُلِّنَا قَالَ بَلْ لِكُلِّكُمْ)[3]واتا: پیاوێك هەبوو دەهات بۆ لای پێغەمبەرﷺوکوڕێکی خۆی لەگەڵدا بوو، پێغەمبەرﷺ پێی فەرموو: ئایا ئەو کوڕەتت خۆش دەوێت؟ گوتی: خودای گەورە تۆی خۆش بوێت هەروەکو چۆن من ئەو کوڕەمم خۆشدەوێت، ڕۆژێکیان پێغەمبەرﷺهەواڵی ئەو پیاوە پرسی و پێمی فەرموو: کوڕەکەی ئەو پیاوە چی لێهاتووە؟ گوتیان: مردووە ئەی پێغەمبەری خودا، پێغەمبەریشﷺبە باوکی کوڕەکەی فەرموو: ئایا پێت خۆش نیە لە ڕۆژی قیامەتدا بۆلای هەر دەرگایەکی بەهەشت ڕۆیشتیت لەوێ کوڕەکەت چاوەڕێت بکات؟! پیاوەکە

١- پێشەوا مسلم گێراویەتەوە.

٢- پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

٣- پێشەوا احمد گێراویەتەوە.

گووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ئایا ئەو پاداشتە بەتایبەت بۆ منە یان بۆ هەموومانە؟

پێغەمبەرﷺ فەرمووی: بەڵکو بۆ هەمووتانە.

خوێنەری بەڕێز: ئەوەی ڕابرا مافەکانی منداڵ و چۆنیەتی مامەڵە لەگەڵ کردنی بوو لە ئیسلامدا، ئەوە ئەو مافانە بوون کە تازە بەتازە وولاتانی ئەورووپاو ئەمریکا بیری لێدەکەنەوە و ساڵانە ڕۆژێکی بۆ دیاری دەکەن، لەکاتێکدا ئیسلام پێش هەزارو چوار سەدوو ئەوەندە ساڵە پێش ئێستا ئەو مافانەی بۆ منداڵان دیاری کردووە و بە شێوەیەکی کردەیی پێیداوون، بەڵام ئەوەی تێبینی دەکرێت لەگەڵ ئەوەی کە ساڵانە ملیۆنەها دۆلار بۆ چارەسەر کردنی کێشەکانی منداڵان سەرف دەرێت، بەڵام تائێستاش لە جیهاندا کێشەکانی منداڵان هەر ڕو لە زیادبوونە!! تا ئێستاش ئەو مافانەی وولاتە زلهێزەکانی دوونیا بۆ منداڵان داوای دەکەن زۆربەیان سنوری مەرەکەبی سەر کاغەزیان تێنەپەڕاندووەو نەهاتونەتە مەیدانی کارەوە، تا ئێستاش لەم دوونیایەدا ملیۆنەها منداڵی کارکەر هەیە، وە لەهەمووشیان ترسناکتر ساڵانە لە لایەن دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە سەدان و هەزاران ڕوداوی توندوتیژی دژی منداڵان بڵاو دەکرێتەوە، ئەوانەش هەموویان پێمان دەڵێن: بەڕاستی تەنها ئیسلام و یاسا و ڕێساکانیەتی کە چارەسەرە بۆ هەموو گرفت و کێشەیەك، لە ناویشیاندا کێشەکانی منداڵان.



# ٦/٥ ڕۆژی جیهانی ژینگە

بۆ یەکەم جار ڕۆژی جیهانی ژینگە لە ساڵی ١٩٧٢ز دا دیاری کراو یادی کرایەوە، وە هەر لەو ساڵەدا کارنامەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ ژینگە (UNEP) بنیات نرا، جا لە دوای ئەم ساڵەوە هەمو ساڵێك لە ڕۆژی ٦/٥دا یادی ڕۆژی جیهانی ژینگە دەکرێتەوە، وە ئەم یادەش هەر ساڵە و لە شارێك دەکرێتەوە، جێگای ئاماژەیە لەم یادکردنەوەنەدا باس لەوە دەکرێت چۆن بتوانرێت ژینگەیەکی تەندروست بۆ وولاتانی دنیا فەراهەم بکرێت، وە هەر لەم یادکردنەوانەدا باس لە گرنگترین ئەو مەترسیانە دەکرێت کە هەڕەشە لە ژینگەی جیهان دەکەن، وە هەر لەو ڕۆژەدا چەندین کارو چالاکی ژینگەیی ئەنجام دەدرێت، وەك نەمام چاندن و سازکردنی کۆڕ و سیمینار و بڵاوکردنەوەی توێژینەوە لە سەر ژینگە و.... چەندین چالاکی تر.[1]

جا خوێنەری بەڕێز: سەیرکە نەتەوە یەکگرتووەکان تازە بە تازە و چەند ساڵێکە باسی گرنگی ژینگە دەکات، بەڵام با بڕوانین ئاخۆ شەریعەتی ئیسلام و قورئان و سوننەت چەند دەمێکە گرنگیان بە ژینگە داوە، چەندە مرۆڤایەتی بە گشتی وموسڵمانانیان بە تایبەتی هانداوە لەسەر پاراستنی ژینگە:

## ژینگە چیە

ژینگە(البیئة) بە هەموو ئەو شتانەدەگوترێت کە لە دەور و بەرمانن و کاریگەریان هەیە لەسەر بە زیندویی هێشتنەوەی گیانلەبەران لەسەر ڕوی زەوی، ئەوەش ئاو و هەوا و خۆڵ و کانزاکان و خودی بونەوەر خۆیشی دەگرێتەوە.

وە یاخود ژینگە بریتیە: لە هەموو ئەو شتانەی لە ناوەوە و دەرەوە لە هەموو کات و

١ـ الموسعة الحرة(ویکیبیدیا)، و جامعة الملك سعود بن عبدالعزیز للعلوم الصحیة

ساتێکدا دەوری مرۆڤیان داوە.[1]

کەواتا: بە پێی ئەم پێناسانە بێت هەر شتێك لە دەور و بەری مرۆڤ هەبێت و کاریگـەری هەبێت لەسەر ژیانی مرۆڤ پێی دەگوترێت ژینگە، وە هەر بە پێی ئەم پێناسانە مرۆڤ و ژینگە دوو توخمی کاریگەرن لەسەر یەکتر، بە شێوەیەك هەر دووکیان کاریگەریان لەسەر یەکتر هەیە، هەمە ژینگە دەتوانێت کاریگەری لەسەر مرۆڤ بکات وە هەم بە پێچەوانەوەش.

## جۆرەکانی ژینگە

ژینگە بە شێوەیەکی گشتی دەکرێت دوو بەشەوە:

یەکەم/ ژینگەی سروشتی(خۆڕسك) بریتیە لەو ژینگەی کە خودای پەرەوەردگار بە بێ ئەوەی دەستی مرۆڤی تێدابێت ڕازاندویەتەوە و دروستی کردووە. ئەمەش هەموو ئەو شتانەی دەورو بەرمان دەگرێتەوە کە بەبێ دەست و ویستی مرۆڤ پەیدا بوون وەك ئاوو هەواو چیاکان و دەریاکان و .....هتد.خودای پەروەدگار دەفەرموێت: ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ وَالْفُلْكِ الَّتِي تَجْرِي فِي الْبَحْرِ بِمَا يَنفَعُ النَّاسَ وَمَا أَنزَلَ اللَّهُ مِنَ السَّمَاءِ مِن مَّاءٍ فَأَحْيَا بِهِ الْأَرْضَ بَعْدَ مَوْتِهَا وَبَثَّ فِيهَا مِن كُلِّ دَابَّةٍ وَتَصْرِيفِ الرِّيَاحِ وَالسَّحَابِ الْمُسَخَّرِ بَيْنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ لَآيَاتٍ لِّقَوْمٍ يَعْقِلُونَ﴾[2]واتا: بەڕاستی لە دروستکردنی ئاسمان و زەوی و گۆڕانکاری کردن لە شەو و ڕۆژ و ئەو کەشتیانەی کە دەگەڕێن بە دەریادا و بە هۆیانەوە سود بە مرۆڤەکان دەگەیەنن، وە لە و ئاو و بارانەی کە خودا لە ئاسمانەوە دەیبارێنێت و ئینجا بەهۆیەوە زەوی زیندوو دەکاتەوە دوای مردنی، وە هەروەها لە دروستکردنی

---

١ـ موسوعة الفقه الإسلامي، و قضايا معاصرة، دكتور وهبة الزحيلي: ٧٨٢/١٢

٢ـ البقرة: ١٦٤

جۆرەها گیانلەبەر و بڵاوکردنەوەیان بە زەویدا، وە هەروەرها لە گۆڕانکاری کردن لە ئاو و هەوادا و ڕاگرتن و هاتوچۆ پێکردنی هەورەکان لە نێوانی ئاسمان و زەویدا، گەورەترین بەڵگەن بۆ هەرکەسێکی هۆشمەند و عاقڵ کە بە هۆیانەوە بیر لە دەسەڵات و توانای خودای پەروەردگار بکاتەوە.

جا خودای پەروەردگار لەم ئایەتەدا باسی ئەو ژینگەیەمان بۆ دەکات کە بۆ ئێمەی ڕام کردووە کە بریتیە لە هەموو پێداویستیەکانی دەورو بەرمان لە خواردن و خواردنەوە و باران و ئاو و هەواو .... هتد. وە خودای پەروەردگار هەر یەکێکی لەم پێداویستیان بە پاکی بۆ ئێمە دابین کردووە، وەئەوانەشی کە بە بەندەکانی سپاردووە لە تەواو کرنی فەرمانی پێکردووین کە پاکیان بکەینەوەو پاکیان ڕابگرین،ئەمانەی خوارەوەش بەشێکن لەوشتە پاکانەی خودا پێیداوین:

* خودای گەورە ئاوێکی پاکی لە ئاسمانەوە بە هۆی بارانەوە بۆ دابین کردووین، وە فەرمانیشی پێکردووین خۆمانی پێپاك بکەینەوە، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت : ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا﴾[1] وە دەفەرمووێت: ﴿وَيُنَزِّلُ عَلَيْكُم مِّنَ السَّمَاءِ مَاءً لِّيُطَهِّرَكُم بِهِ﴾[2] واتا: ئێمە لە ئاسمانەوە ئاوێکی پاکمان بۆ ناردونەتە خوارەوە، ئەم ئاوەش بۆ ئەوەیە بەهۆیەوە پاك ببنەوە.

* خودای پەروەردگار فەرمانی بە ابراهیم کرد ماڵی بەیت پاك بکاتەوە لە هەمرو پیسیەکی بەرجەستە و واتایی ـ مادی و مەعنەوی۔ بۆ ئەوەی ئەو کەسانەی سەردانی ماڵی خودا دەکەن لە هەردوو ڕووەوە بێنە ناو ژینگەیەکی پاکەوە ﴿وَطَهِّرْ بَيْتِيَ لِلطَّائِفِينَ وَالْقَائِمِينَ وَالرُّكَّعِ السُّجُودِ﴾[3] ئەوەش بۆ ئێمەیە یاسایە دەبێت ئێمەش ماڵەکانمان پاك وخاوێن بێت.

---

١ـ الفرقان: ٤٨

٢ـ الأنفال: ١١

٣ـ الحج: ٢٦

* پاك كردنەوەی ژینگەی ماڵ و خێزان و منداڵ لە هەموو پیسیەكی بەرجەستە و واتایی، خودای پەروەردگار فەرمان بە ماڵ و خێزانی پێغەمبەرﷺ ئێمەش دەكات كە خۆمان ڕوت نەكەینەوە و نوێژو بكەین و زەكات بدەین و فەرمان بەرداری خودا و پێغەمبەرﷺبكەن بۆ ئەوەی پاك ببینەوە و دەفەرموویت: ﴿إِنَّمَا يُرِيدُ اللَّهُ لِيُذْهِبَ عَنكُمُ الرِّجْسَ أَهْلَ الْبَيْتِ وَيُطَهِّرَكُمْ تَطْهِيرًا﴾[1]

* واجبە كاتێك مرۆڤی موسڵمان نوێژ دەكات جێگای وەستانی و لاشەیی و پۆشاكی پاك بێت، ئەمەش بۆ ئەوەی لە ژینگەیەكی پاكدا نوێژەكەی بكات، خودای پەروەردگار فەرمانمان پێدەكات بەم پاك و خاوێنیە و پێشمان دەفەرموویت كە پاك و خاوێنانی خۆش دەوێت: ﴿وَثِيَابَكَ فَطَهِّرْ﴾[2] وە دەفەرموویت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾[3]

* خودای پەروەردگار فەرمانمان پێدەكات تەنها شتە پاكەكان بخۆین و ئاوی پاكیش بخۆینەوە، وە هەرچی شتی پیسە لەسەر ئێمەی حەرام كردووە بۆ خواردن و خواردنەوە: ﴿قُلْ أُحِلَّ لَكُمُ الطَّيِّبَاتُ﴾[4] وە دەفەرموویت: ﴿وَحُلُّوا أَسَاوِرَ مِن فِضَّةٍ وَسَقَاهُمْ رَبُّهُمْ شَرَابًا طَهُورًا﴾[5]

* خودای پەروەردگار قورئانێكی پاكی بۆ ناردووین:﴿رَسُولٌ مِّنَ اللَّهِ يَتْلُو صُحُفًا مُّطَهَّرَةً﴾[6] وە فەرمانمان پێدەكات تەنها بە لاشەیەكی پاكەوە دەست لە قورئانی پیرۆز بدەین، ئەمەش بۆ ئەوەی كۆڕو دانیشتگا زانستیەكانمان لە ژینگەیەكی پاكدا بەڕێوە بچن. ﴿لَّا يَمَسُّهُ إِلَّا

١ـ الأحزاب: ٣٣

٢ـ المدثر: ٤

٣ـ البقرة: ٢٢٢

٤ـ المائدة: ٤

٥ـالإنسان: ٢١

٦ـ البينة: ٢

الْمُطَهَّرُونَ﴾[1]

* خودای پەروەردگار فەرمانی پێکردووین تەنها لە ڕێگای دروستەوە سەروەت و سامان پەیدا بکەین، وە پاشان فەرمانی پێکردووین ئەگەر ماڵمان هەبوو زەکاتی لێبدەین، ئەوەش بۆ ئەوەی ژینگەی کاسبی و سەروەت و سامانمان پاك و خاوێن بێت: ﴿خُذْ مِنْ أَمْوَالِهِمْ صَدَقَةً تُطَهِّرُهُمْ وَتُزَكِّيهِم بِهَا وَصَلِّ عَلَيْهِمْ إِنَّ صَلَاتَكَ سَكَنٌ لَّهُمْ وَاللَّهُ سَمِيعٌ عَلِيمٌ﴾[2]

* خودای پەروەردگار نکوڵی کردووە لەوەی لە کاتی سوڕی مانگانە ـ حیض ـ دا بچینە لای خێزانەکانمان، چونکە ئەو سوڕی مانگانە ڕەحمی ئافرەت پاك دەکاتەوە لە پاشماوە، ئەوەش بۆ ئەوەی بەردەوام پەیوەندی ڕەگەزی هاوسەریمان لە ژینگەیەکی پاکدا بێت: ﴿وَيَسْأَلُونَكَ عَنِ الْمَحِيضِ قُلْ هُوَ أَذًى فَاعْتَزِلُوا النِّسَاءَ فِي الْمَحِيضِ وَلَا تَقْرَبُوهُنَّ حَتَّى يَطْهُرْنَ فَإِذَا تَطَهَّرْنَ فَأْتُوهُنَّ مِنْ حَيْثُ أَمَرَكُمُ اللَّهُ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ التَّوَّابِينَ وَيُحِبُّ الْمُتَطَهِّرِينَ﴾[3]

* خودای پەروەردگار فەرمانی پێکردووین دوای ئەنجامدانی پەیوەندی هاوسەریەتی و لەش گران بوون خۆمان بشۆرین، بۆ ئەوەی لاشەمان پاك بێتەوە لە هەموو ئەو ماددانەی لە کاتی سەرجێی لە کونەکانی لاشەمان دێتە دەرەوە، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وإِن كُنتُمْ جُنُبًا فَاطَّهَّرُوا﴾[4] واتا: هەر کاتێك لەش گران بوون ئەوە خۆتان پاك بکەنەوە.

* خودای پەروەردگار پێغەمبەرانی علیهم الصلاة والسلام ڕەوانە کردووە بۆ ئەوەی ژینگەی بەرجەستە و واتایی مرۆڤەکان پاك بکەنەوە، خودای پەروەردگار لەسەر زاری گەلی لوطەوە

١ـ الواقعة: ٧٨

٢ـ التوبة: ١٠٣

٣ـ البقرة: ٢٢٢

٤ـ المائدة: ٦

دەفەرموویّت: ﴿قَالُوا أَخْرِجُوا آلَ لُوطٍ مِّن قَرْيَتِكُمْ إِنَّهُمْ أُنَاسٌ يَتَطَهَّرُونَ﴾[1] واتا: گووتیان لوط وشوێنکەوتوەکانی لە شارەکەتان بکەنە دەرەوە،چونکە ئەوانە کەسانێکن خۆیان بە پاك ڕادەگرن.

* خودای پەروەردگار فەرمانمان پێدەکات کاتێك ویستمان نوێژ بکەین دەست نوێژ بگرین و خۆمان پاك بکەینەوە، ئەوەش بۆ ئەوەی ژینگەی پەرستشەکانمان ژینگەیەکی پاك بێت و بە پاکی لەگەڵ خودای گەورەدا بدوێین. خودای گەورە دەفەرموویّت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا قُمْتُمْ إِلَى الصَّلَاةِ فَاغْسِلُوا وُجُوهَكُمْ وَأَيْدِيَكُمْ إِلَى الْمَرَافِقِ وَامْسَحُوا بِرُءُوسِكُمْ وَأَرْجُلَكُمْ إِلَى الْكَعْبَيْنِ﴾[2] واتا: ئەی ئەو کەسانەی باوڕتان هێناوە هەر کاتێك ویستتان نوێژ بکەن و هەستان بۆ نوێژکردن ئەوە دەم و چاو و دەستەکانتان بشۆن هەتا ئەنیشکان، وە پاشان دەستی تەڕ بهێنن بەسەر سەرتاندا، دواتر قاچەکانتا بشۆن هەتا قولە پێیان.

* خودای پەروەردگار مرۆڤەکانی لەسەر سروشتێکی پاك دروست کردووە، وە فەرمانیشمان پێدەکات خۆمان لەسەر ئەم سروشتە پاکە بهێڵینەوە و خۆمان بە نەخۆشی دوو ڕوویی ـ نفاق ـ پیس نەکەین، چونکە دوو ڕوەکان دڵیان پیسە، خودای پەروەردگار دەفەرموویّت: ﴿ أُولَئِكَ الَّذِينَ لَمْ يُرِدِ اللَّهُ أَن يُطَهِّرَ قُلُوبَهُمْ ﴾[3] واتا:ئانەوانە کەسانێکن خودای پەروەردگار نەیوستووە دڵەکانیان پاك بکاتەوە.

جا ئەوانەی ڕابران چەند نمونەیەك بوون دەربارەی ئەو ژینگە سروشتیە پاکەی کە خودای پەروەردگار بۆ ئێمەی دروست کردووە، وە فەرمانیشمان پێدەکات ئەم ژینگانەمان بە پاکی بهێڵینەوەو پیسیان نەکەین بە هیچ جۆرێکی پیسی، نە بە پیسی بەرجەستە، وە نە بە پیسی واتایی.

---

١ـ النمل: ٥٦

٢ـ المائدة: ٦

٣ـ المائدة: ٤١

دووەم/ ژینگەی دەستکرد: بریتیە لەو ژینگەی کە مرۆڤ دەستی هەبووە لە بەرهەمهێنانی وەك چاندنی دار و درەخت و دروستکردنی باغ و ڕازاندنەوەی ماڵ و شەقام و شار و... هتد،

جا ئێستا لە دونیادا ئەو ڕێکخراو و لایەنانەی پەیوەستن بە ژینگەوە کار دەکەن لەسەر ئەوەی ژینگەیەکی تەندروست بۆ هەموو هەستیارەکانی مرۆڤ فەراهەم بکەن، بە شێوەیەك هەستیارەکانی مرۆڤ وەك (بینین، بیستن، بۆن کردن، تام کردن ـ خواردن و خواردنەوەـ ) چێژ وەر بگرێت لەو ژینگەیەی لە دەورو بەریەتی، وەهەروەها ئاو و هەوایەکی پاك هەڵبمژێت،

کە بە وردی سەیری ئیسلام بکەین دەبینین زۆر گرنگی داوە بە هەریەکێك لەم ژینگانەو هەوڵی فەراهەمکردنی داون، بە پشتیوانی خودا ئێمە لێرەدا باسیان دەکەین:

١ـ ژینگەی بینین: پێغەمبەری خوداﷺ لە چەندین فەرموودەدا هانمان دەدات کە دار و درەخت بچێنین، بێگومان چاندنی دار و درەختیش ژینگە جوان دەکات و چێژ بە بینین دەدات، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَا مِنْ مُسْلِمٍ يَغْرِسُ غَرْسًا أَوْ يَزْرَعُ زَرْعًا فَيَأْكُلُ مِنْهُ طَيْرٌ أَوْ إِنْسَانٌ أَوْ بَهِيمَةٌ إِلا كَانَتْ لَهُ صَدَقَةٌ )[1]واتا: هەر موسڵمانێك نەمامێك بنێژێت، وە یان کشتوکاڵێك بکات، ئەگەر باڵندەیەك یان مرۆڤێك یان چوار پێیەك لەم دارو درەخت و کشتوکاڵە بخوات" ئەوە بۆی بەخێر دەنوسرێت. وە لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمووێت: (إِنْ قَامَتِ السَّاعَةُ وَفِي يَدِ أَحَدِكُمْ فَسِيلَةٌ ، فَإِنِ اسْتَطَاعَ أَنْ لا يَقُومَ حَتَّى يَغْرِسَهَا، فَلْيَغْرِسْهَا)[2] واتا: ئەگەر قیامەت هەڵستاو لە دەستی یەکێکتاندا نەمامێك هەبوو" ئەگەر توانی بەر لە هەڵستانی

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوایان احمد و ابو داود گێڕاویەتەوە.

ئەمامەکە بچێنێت، ئەوە با بیچێنێت. وە پێغەمبەری خوداﷺ هاوەڵە بەڕێزەکانی هانداوە کە بەرگ و پۆشاکی جوان و پاك لەبەر بکەن، ئەمەش دیسان بۆ ئەوەی ژینگەی بینیی موسڵمانان پاك و جوان بێت، أبی أحوصی جوشمی لە باوکیەوە بۆمان دەگێڕێتەوە و دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ منی بینی پۆشاکێکی کۆنم لەبەردا بوو، ئەویش فەرمووی: ئایا سەروەت و سامانت هەیە؟ منیش گووتم بەڵێ، فەرمووی چ سەروەتێکت هەیە؟ گووتم: لە هەموو جۆرێکی سەروەت وسامان، خودای گەورە مەڕو ماڵات و حوشترێکی زۆری پێداوم، فەرمووی: ( فَلْتُرَ نِعَمُ اللَّهِ وَكَرَامَتُهُ عَلَيْكَ.. )[1]واتا: دەی با خەڵکی نیعمەتەکانی خودات بەسەرەوە ببینن. بەواتای برۆ پۆشاکێکی جوان لەبەر بکـــە بۆ ئەوەی خەڵکی بەو پۆشاکـــە جوانەوە بتبینن، لە فەرموودەیەکی تردا گەورەمان عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لَا يَدْخُلُ الْجَنَّةَ مَنْ كَانَ فِي قَلْبِهِ مِثْقَالُ ذَرَّةٍ مِنْ كِبْرٍ)واتا: هەر کەسێك بە ئەندازەی تۆزقاڵی دەنکە گەنمە شامیەك خۆبەزلزانی تێدا بێت ناچێتە بەهەشتەوە، پیاوێك گووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ مرۆڤی وا هەیە ئارەزو دەکات پۆشاکی جوان لەبەر بکات و پێڵاوی جوان لە پێی بکات، ئایا ئەوەش خۆ بەزلزانیە؟ ئەویش فەرمووی: (إِنَّ اللَّهَ جَمِيلٌ يُحِبُّ الْجَمَالَ)[2]واتا: نەخێر ئەوە خۆ بەزلزانی نیە، چونکە خودای گەورە جوانە و شتی جوانیشی خۆش دەوێت.

٢ـ ژینگەی بیستن: ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر گرنگی داوە بە ژینگەی بیستن، بە شێوەیەك خودای پەروەردگار فەرمانی کردووە کە لە کاتی قسە کردندا زۆر دەنگمان بەرز نەکەینـــەوە، ئەوەش بۆ ئـــەوەی ژینگـــەی بیستنی مرۆڤەکـــانی تر پیس نەکەین، خودای پەروەردگـــار

---

١ـ پێشەویان: ترمذي و النسائي و أبو داود و احمد گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوایان مسلم و ترمذي و أبو داود و ابن ماجه و أحمد گێڕاویانەتەوە،

دەفەرمووێت: (وَاقْصِدْ فِي مَشْيِكَ وَاغْضُضْ مِن صَوْتِكَ إِنَّ أَنكَرَ الْأَصْوَاتِ لَصَوْتُ الْحَمِيرِ)[1]واتا: هەوڵ بدە لە ڕۆیشتندا مام ناوەند برۆ و بەرەو ئامانجێکی چاك هەنگاو بنێ و بە دەنگێکی هێواش و لەبار گفتوگۆ بکەو بدوێ، چونکە بە ڕاستی بێزار ترین و ناخۆشترین دەنگ دەنگی کۆمەڵە گوێدرێژێکە بەیەکەوە.

وە هەتا ئاینی پیرۆزی ئیسلام فەرمانمان پێدەکات لە کاتی نوێژ کردنیشدا دەنگمان زۆر بەرز نەکەینەوە، ئەوەش بۆ ئەوەی ژینگەی بیستنی نوێژخوێنانی تر تێك نەچێت، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلَا تَجْهَرْ بِصَلَاتِكَ وَلَا تُخَافِتْ بِهَا وَابْتَغِ بَيْنَ ذَلِكَ سَبِيلًا﴾[2]واتا: ئەی باوەڕداران لە کاتی نوێژ کردندا نە زۆر دەنگتان بەرز بکەنەوە، وە نەزۆریش نزمی بکەنەوە، بەڵکو لە نێوانی هەر دووکیاندا بارێکی مام ناوەند هەڵبژێرن.

٣ـ ژینگەی بۆن کردن و هەوا: وەك پێشتر باسمان کرد کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام هانمان دەدات کە دار و درەخت بڕوێنین، بێگومان ئەو دارو درەختانەش بۆنێکی خۆش و هەوایەکی پاك دەبەخشن بە ژینگە، وە پێغەمبەری خۆشەویست ﷺ فەرمانی پێکردووین کە بۆ هەموو کۆڕو کۆبونەوەیەك خۆمان بۆن خۆش بکەین، بۆ نمونە: سوننەتە مرۆڤی موسڵمان بۆ جەژنەکان خۆی بشۆرێت و بۆنی خۆش لە خۆی بدات، وە بەهەمان شێوە سوننەتە موسڵمانان لە ڕۆژی جومعەدا کاتێك دەچن بۆ جومعە خۆیان بشۆرن و بۆنی خۆش لە خۆیان بدەن، ئەوەش لەبەر ئەوەی موسڵمانان لە ڕۆژی جومعەدا کۆ دەبنەوەو یەکتر دەبینن، بۆ ئەوەی ژینگەی بۆن کردنی یەکتر پیس نەکەن، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (لَا يَغْتَسِلُ رَجُلٌ يَوْمَ الْجُمُعَةِ وَيَتَطَهَّرُ مَا اسْتَطَاعَ مِنْ طُهْرٍ وَيَدَّهِنُ مِنْ دُهْنِهِ أَوْ يَمَسُّ مِنْ طِيبِ بَيْتِهِ ثُمَّ يَخْرُجُ فَلَا يُفَرِّقُ بَيْنَ اثْنَيْنِ ثُمَّ

١ـ لقمان: ١٩

٢ـ الإسراء: ١١٠

يُصَلِّي مَا كُتِبَ لَهُ ثُمَّ يُنْصِتُ إِذَا تَكَلَّمَ الْإِمَامُ إِلَّا غُفِرَ لَهُ مَا بَيْنَهُ وَبَيْنَ الْجُمُعَةِ الْأُخْرَى)[1]واتا: هەر موسڵمانێك لە ڕۆژی جومعەدا خۆی بشۆڕێت و خۆی پاك بكاتەوە، وە سەری چەور بكات و بۆنی خۆش لە خۆی بدات، پاشان بێتە مزگەوت و جێگا لە موسڵمانان تەنگ نەكات و لێكیان جیا نەكاتەوە، پاشان ئەو نوێژە سوننەتە بكات كە بۆی دانراوە، دواتر بێدەنگ بێت كاتێك ووتاربێژ قسەی كرد" ئەوە خودای پەروەردگار لە تاوانی نێوانی ئەو جومعە و جومعەی ڕابردوی خۆش دەبێت.

ئینجا پێغەمبەری خوداﷺ نكوڵی كردووە لە كەسێك كە بە بۆنی ناخۆشەوە بێتە ناو موسڵمانان و ژینگەی بۆن كردنیان پیس بكات، جابر لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە كە فەرموویەتی: (مَنْ أَكَلَ ثُوماً أَوْ بَصَلاً فَلْيَعْتَزِلْنَا، وِلْيَعْتَزِلْ مَسْجِدَنَا ، وَلْيَقْعُدْ فِي بَيْتِهِ)[2]واتا: هەر كەسێك لە ئێوە سیر و پیوازی خوارد با نەیەتە ناومان و نەیەتە ناو مزگەوتەكەمانەوە، بەڵكو با لە ماڵی خۆی دابنیشێت،

لە فەرموودەیەكی تردا پێغەمبەری خوداﷺ هۆكاری ئەو نكوڵیەی ئاشكرا دەكات، گەورەمان جابر دەفەرمووێت: پێغەمبەری خوداﷺ نكوڵی لێكردبوین لەوەی سیر و پیواز بخۆین، ئێمەش لەبەر پێویستی خواردمانن، پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: ( مَنْ أَكَلَ مِنْ هذهِ الشَّجَرَةِ الْمُنتنة فَلا يَقرِبَنَّ مَسجِدَنا، فَإِنَّ الْمَلائِكَةَ تَتَأَذَّى مِمَّا يَتَأَذَّى مِنْهُ الْإِنْسُ)[3]واتا: هەر كەسێك لەو دارە بۆگەنەی خواردووە با لە مزگەوتەكەمان نزیك نەبێتەوە، چونكە مرۆڤەكان ئازار دەدات بە بۆنە ناخۆشەكەی، وە فریشتەكانیش بە هەر شتێك ئازار دەچێژن كە مرۆڤەكان ئازاری پێدەچێژن.

---

١- پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢- پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٣- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٤ـ ژینگەی تام کردن: دیارەی ئەو شتەی مرۆڤ تامی لێدەکات لە دو وشت تێنایەڕێت، یان خواردنە وە یان خواردنەوەیە، ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش زۆر گرنگی بەم دوو جۆرەی ژینگە داوە:

أـ ژینگەی خۆراك: ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر گرنگی بە خۆراکی مرۆڤەکان داوە، بە شێوەیەك هەرچی پاك بێت بە حەڵاڵی داناوە، بە پێچەوانەوەش هەر شتێك پیس بێت خودای پەروەردگار بە حەرامی داناوە، خودای پەروەردگار دەربارەی پێغەمبەرﷺ دەفەرمووێت: ﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ﴾[1] واتا: ئەو پێغەمبەرە شەریعەتێکی پێیە هەرچی پاك و خاوێنە بۆیان حەڵاڵ دەکات، وە هەرچی پیس و نا پوختە لێیان حەرام دەکات، وە لە ئایەتێکی تردا خوداي پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿حُرِّمَتْ عَلَيْكُمُ الْمَيْتَةُ وَالدَّمُ وَلَحْمُ الْخِنزِيرِ وَمَا أُهِلَّ لِغَيْرِ اللَّهِ بِهِ وَالْمُنْخَنِقَةُ وَالْمَوْقُوذَةُ وَالْمُتَرَدِّيَةُ وَالنَّطِيحَةُ وَمَا أَكَلَ السَّبُعُ إِلَّا مَا ذَكَّيْتُمْ وَمَا ذُبِحَ عَلَى النُّصُبِ وَأَن تَسْتَقْسِمُوا بِالْأَزْلَامِ ذَلِكُمْ فِسْقٌ﴾[2] واتا: لەسەرتان حەرام کراوە گۆشتی مردارەوە بوو و خوێن و گۆشتی بەراز و وە ئەو مەڕو ماڵاتانەی کە لە کاتی سەر بڕیندا ناوی جگە لە خودایان لەسەر دێت، وەهەروەها مەڕو ماڵاتی خنکاو و ئەو مەڕو ماڵاتەش کە بەهۆی ئازاردانەوە مردار بووە، ئەوەش کە دەکەوێتە خوارەوە، ئەوەش کە بە قۆچ و لێدانی ماڵاتێکی تر مردار بووە، ئەوانەش کە دڕندە پەلاماری دابن وە فریای چەقۆ و سـەربڕین نەکەوتبن وە ئەو ماڵاتـــانەی کە لەو جێگایانە سەردەبڕدرێن کە بتیان تێدایـەو هاواریان بۆ غەیری خودا تێدا دەبردرێت، وە لەسەرتان حەرام کراوە داواکردنی چارەنوس و بەخت گرتنەوە، جا هەر کەسێك یەکێك لەم کارانە بکات ئەوە سەرپێچی فەرمانی خودای کردووە.

جا کە سەیری ئەم ئایەتە بکەین دەبنین هەر کامێك لەو خواردنانە پیس بوون، جا یان بە پیس

١ـ الأعراف: ١٥٧

٢ـ المائدة: ٣

بونی حەقیقی وە یان پیس بونی واتایی ـ معنوی ـ لەبەر ئەوە خودای پەروەردگار حەرامی کردوون.

ب ـ ژینگەی ئاو: بەهەمان شێوەی ژینگەی خۆراك خودای پەروەردگار و شەریعەتی ئیسلام زۆر گرنگیان بە ژینگەی ئاو داوە، بە شێوەیەك وەك باسمان کرد خودای پەروەردگار لە ئاسمانەوە ئاوێکی پاکی بۆ ناردووینە خوارەوە، وە نکۆڵیشی کردووە لە پیس کردنی و پیس کردنی بە حەرام داناوە، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَأَنزَلْنَا مِنَ السَّمَاءِ مَاءً طَهُورًا﴾[1] واتا: ئێمە لە ئاسمانەوە ئاوێکی پاکمان بۆ ناردونەتە خوارەوە کە بارانە. جا بە هۆی ئەم بارانەشەوە کانیاو و سەرچاوەکان دەتەقن و دەژینەوە، پێغەمبەریشﷺ نکۆڵی کردووە لەوەی کەسێك ئاوی کانیەك یان سەرچاوەیەك پیس بکات و دەفەرموێت: (اتَّقُوا الْمَلاعِنَ الثَّلاثَ: الْبَرَازَ فِي الْمَوَارِدِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَالظِّلِّ)[2] واتا: خۆتان بپارێزن لەو سێ شتانەی کە نەفرینیان لێکراوە: پیسایی کردن و پیس کردنی سەرچاوەی ئاو، وە پیسایی کردن لە سەر ڕێگا، وە پیسایی کردن لە ژێر سێبەر.

جا ئێستا بۆمان دەرکەوت کە هەردووك جۆری ژینگە، هەم ژینگەی سروشتی و هەم ژینگەی دەستکرد لە ئیسلامدا گرنگی زۆریان پێدراوە، وە هەردوکیشیان دەستبەر کراون، لەبـــەر ئـــەوە دەتوانین بڵێین ئەگەر وڵاتانی دوونیا بەڕاستی بە دوای چارەسەری ژینگەدا دەگەڕێن" پێویستە شەریعەتی ئیسلام و قورئان و سوننەت بکەن بەسەر چاوە و دەستوری چارەسەری کێشەکانی ژینگە، وە بیانکەن بە دەرگایەك و لێیانەوە بچنە ژورەوە، وە لەوێوە چارەسەری کێشەکانی ژینگە دەستپێبکەن، بێگومان دەگەنە چارەسەرێکی بنەڕەتی.

---

١ـ الفرقان: ٤٨

٢ـ پێشەوایان ابو داود و ابن ماجە گێڕاویانەتەوە.

# شێواندنی ژینگە حەرامە

ئاینی پیرۆزی ئیسلام بە پێی ئەوەی تێرترین تەواوترین ئاینە، وە بە پێی ئەوەی ئاینی سروشت ـ فیطرة ـ ە، وە سروشتی مرۆڤیش حەز بە ژینگەیەکی پاك و بێ وەی دەکات، لەبەر ئەوە زانایانی سەردەم بابەتی ژینگە دەبەستنەوە بە مەبەستەکانی شەرع ـ مقاصد الشریعە ـ وە، دکتۆر وەهبە زوحەیلی دەفەرموێت: پاراستنی ژینگە یەکێکە لەو مەبەستانەی کە شەریعەتی ئیسلام بۆی هاتووە کە پاراستنی ژیانە، وە پاراستنی ژیانیش واجبە، بێگومان ژیانیش پارێزراو نابێت ئەگەر ژینگەکەی پاك نەبێت، لەبەر ئەوە هەر کەسێك ژینگە بشێوێنێت و پیسی بکات ئەوە واجبێکی تەرك کردووە و سەرپێچی شەرعی خودای کردووە.[1] وە خودای پەروەردگار ئەو کەسانەی بە خراپەکار (مفسد) ناو بردووە کە ژینگە تێك دەدەن و دەیانهەوێت خراپەکاری لە سەر زەوی بڵاو بکەنەوە، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَبْغِ الْفَسَادَ فِي الْأَرْضِ إِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾[2] واتا: نەکەیت هەوڵی خراپەکاری و تێکدانی ژینگەی مرۆڤایەتی و گوناهو تاوان بدەیت لەسەر زەوی، چونکە بەڕاستی خودای گەورە خراپەکارانی خۆشناوێت.

وە هەروەها ئیسلام بە حەرام و ناپەسەندی داناوە لە ناوبردن و شێواندن و پیس کردنی هەرشتێك کە ژینگەی جوان و خۆش کردبێت، وە هانی موسڵمانانیشی داوە بۆ پارێزگاری لێکردن و بەدیهێنانی بۆنمونە:

* ژینگە بە گیاندارانەوەجوانە. لەبەر ئەوە نابێت هیچ کەسێك بەبێ پاساو گیاندارێك بکوژێت: گەورەمان عبداللە ی کوڕی عمر رضي الله عنهما لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ما مِنْ إنسانٍ يَقْتُلُ عُصفُوراً فَما فَوقَها بِغَيرِ حَقِّها إلا يَسألُ اللهُ عَنها يَـــــومَ

---

١ـ موسوعة الفقه الإسلامي و القضايا المعاصرة: ١٢/ ٨٠٥

٢ـ القصص: ٧٧

الْقِيامَةِ، فَقِيلَ يا رَسُولَ اللهِ وَما حَقُّها؟ قال حُقُّها أَنْ تَذبَحَها فَتأْكُلَها وَلا تَقطَع رَأْسَها فَتَرمي بِهِ)[1]واتا: هەر مرۆڤێك چۆلەكەیەك یان گیاندارێكی گەورەتر لە چۆلەكە بە ناحەق بكوژێت" ئەوە خودای پەروەردگار لە قیامەتدا لێپرسینەوەی لێدەكات، گووتیان: ئەی پێغەمبەری خودا كوشتنی چۆلەكە و گیاندارانی تر بەحەق چۆنە؟ فەرمووی: بە حەق ئەوەیە كەسێك سەری ببڕێت و بیخوات، نەوەكو هەر بۆ كەیف و ئارەزو سەری هەڵقەنێت و فڕێیبدات. بەواتای: كوشتنی گیانداران كاتێك دروستە كە بۆ خواردن پێویستت پێی بێت، ئەگەرنا كوشتنیان حەرامەو قەدەغەیە.

* ژینگە بە دار و درەختەوە جوانە: شەریعەتی ئیسلام نكۆڵی كردووە لە بڕینی دارو درەخت هەتا ئەگەر ئەم دار و درەختە لە وولاتی دوژمنیش بێت و لە كاتی جەنگیشدا بێت، پێشەوا ابوبكری صدیق رضي الله عنه كاتێك سوپای بەڕێ دەكرد بۆ غەزایەك پێیانی دەفەرموو: (اغزُوا بِاسمِ اللهِ، لا تَقتُلُوا وَليداً وَلا إمرأَةً، ولا شَيخاً مُسِناً، ولا تُهدِموا بيتاً، ولا تَقطَعوا شجرةً)[2]واتا: بەناوی خودا بجەنگن، وە منداڵ وئافرەت مەكوژن، وە پیاوی بە ساڵاچوو مەكوژن، وە هیچ خانویەك مەڕوخێنن، وە هیچ دارێكیش مەبڕن.

* ژینگە بە ڕێگاو بانی پاك و خاوێن و ڕێك و پێكەوە جوانە، ئیسلام نكۆڵی كردووە لەوەی كەسێك ڕێگاو بانەكان پیس بكات، بۆنمونە: یەكێك لە تاوانەكانی ئوم جەمیلی خێزانی ابو لهب ئەوەبو چقڵ و چاڵی دەهێنایە سەر ڕێگای پێغەمبەر ﷺ و ڕێگاوبانی پیس دەكردن، ﴿وَامْرَأَتُهُ حَمَّالَةَ الْحَطَبِ﴾[3] وە لەبەرامبەریشدا ئیسلام هانی مرۆڤایەتی دەدات بۆ پـــــاك

1- پێشەوا نسائی گێراویەتەوە.

2- مسند أبي بكر 1/ 72، وە پێشەوا نسائیش هاوشێوەی گێراوەتەوە.

3- المسد: 4

ڕاگرتنی ژینگەی ماڵ و شوێنە گشتیەکان و ڕێگا و بانەکان، پێغەمبەری خوداﷺ دەفەرموێت: (الْإِيمَانُ بِضْعٌ وَسَبْعُونَ أَوْ بِضْعٌ وَسِتُّونَ شُعْبَةً، فَأَفْضَلُهَا قَوْلُ: لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ، وَأَدْنَاهَا إِمَاطَةُ الْأَذَى عَنْ الطَّرِيقِ، وَالْحَيَاءُ شُعْبَةٌ مِنْ الْإِيمَانِ)[1]واتا: باوەڕ حەفتاو ئەوەندە، یان شەست و ئەوەندە بەشەیە، بەرزترینیان گووتنی: (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ)یە، وە نزمترینیان لادانی ئازارێکە لەسەر ڕێگایەك، وە شەرم و شکۆش یەکێکە لە بەشەکانی باوەڕ. جا لێرەدا خودای پەروەردگار پاك ڕاگرتنی ڕێگاوبانەکانی بە یەکێك لە بەشەکانی باوەڕ ئەژمار کردووە.

وە لە فەرموودەیەکی تردا گەورەمان ابو هریرەرضي الله عنهلە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (بَيْنَما رَجلٌ يَمشِي بِطَرِيقٍ إذْ وَجَدَ غُصْنَ شَوكٍ عَلى الطَّرِيقِ فَأَخَذَهُ ، فَشَكَرَ اللهُ لَهُ فَغَفَرَ لَهُ)[2]واتا: جارێکیان پیاوێك بە ڕێگایەکدا دەڕۆیشت چاوی بە لقە دارێکی دڕکاوی کەوت لەسەر ڕێگایەکە بوو، ئەویش لەسەر ڕێگاکە دوری خستەوەو فڕێیدا، خودای گەورەش لە پاداشتی ئەو کارەیدا سوپاسی کردو لێشی خۆشبوو.

* سەیرانگاکان ملکی گشتین و ئیسلام نکوڵی کردووە لە پیس کردنیان: لەم ڕۆژگارەدا بەهۆی دوو نیعمەتەوە کە بریتین لە: ئەمن و ئاسایش و تێر و پڕی، خەڵکی زیاتر لە جـــاران گەشت و سەیران ڕێکدەخەن و ڕوو دەکەنە سەیرانگاکان چ لە ناوەو چ لە دەرەوەی وڵات، بەشێوەیەك ئێستا گەشت و گوزار بۆتە یەکێك لە سەرچاوە سەرەکیەکانی داهاتی بەشێك لە وڵاتانی دونیا، بەڵام ئەوەی جێگای هەڵوەستە لەسەر کردنە زۆرینەی گەشتیاران کاتێك دەچن بۆ گەشت و سەیران ڕەچاوی یاساکانی ئیسلام و دەوڵەتیش ناکەن، لە سەفرەکانیاندا چەندین سەرپێچی شەرعی دەکەن و خودای پەروەردگار دەڕەنجێنن، یەکێکیش لـە سەرپێچیە شەرعیەکان

٢- پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٣- پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

بریتیە لە پیس کردن و شێواندنی سەیرانگاکان، کە ئەمەیان لەشەرعدا حەرامە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (اتَّقُوا المَلاعِنَ الثَّلاثَ: البَرَازَ فِي المَوَارِدِ، وَقَارِعَةِ الطَّرِيقِ، وَالظِّلِّ)[1] واتا: خۆتان بپارێزن لەو سێ شتانەی کە نەفرینیان لێکراوە: پیسایی کردن و پیس کردنی سەرچاوەی ئاو، وە پیسایی کردن لە سەر رێگا، وە پیسایی کردن لە ژێر سێبەر.

جا ئەگەر سەیری ئەم فەرموودەیە بکەین دەبینین حیکمەت لە نکۆڵی کردن و نەفرین کردن لەو کارانە ئەوەیە: ئەو سێ شتانە یەکەمیان پێداویستیەکی سەرەکی زیندەوەرانە کە ئاوە دووەمیان جێگای هاتوچۆی زیندەوەرانە، سێهەمیشیان جێگای پشودان و ئارامگرتنی مرۆڤەکانە، بێگوومان سەیرانگاکانیش هەم بە ئاوەوە جوانن، وە هەم جێگای پشووی مرۆڤەکانیشن،لەبەر ئەوە هەر کەسێك پیسیان بکات وبیان شێوێنێت دەچێتە ژێر ئەم نەفرینەوە.

## کێ بەرپرسە لە پیس کردنی ژینگە؟

خودای پەروەردگار ئادەمی باوکمانی لە ژینگەیەکی پاکدا دروستکرد کە بەهەشت بوو، پاشان دایبەزاندە سەر زەویەکی پاك، لەسەر زەویش هەموو شتێکی پاکی پێداو ژینگەیەکی پاکی بۆ فەراهەم کرد، وە فەرمانی بە ئەو و نەوەکانی کرد کە پارێزگاری لەو ژینگە پاکە بکەن و ئەو ژینگە پاکە نەشێوێنن، بەڵام ئێمەی نەوەکانی ئادەم فەرمانی خودامان شکاندو زەویمان بە جۆرەها شێوە پیس کرد، پیسمان کرد بە بێباوەڕی، بە تاوان، بە شەڕ و ئاژاوە، بە پیس کردنی ژینگە.... هتد، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ لِيُذِيقَهُم بَعْضَ الَّذِي عَمِلُوا لَعَلَّهُمْ يَرْجِعُونَ﴾[2] واتا: تاوان و خراپە دەرکەوتووە و هەموو زەوی و دەریاکانی گرتۆتـــەوە، بەهۆی ئەو گوناهو تاوانانەی مرۆڤەکان دەستیان داوەتێ،

---

١ـ ابو داود گێڕاویەتەوە.

٢ـ الروم: ٤١

سەرەنجام دەبێت تالآوی بەشێك لە کردەوەکانیان بچێژن، ئەوەش بەهۆی بەرپا بونی جەنگ و کوشتار و کارەساتە سروشتیەکان..، ئەم ڕوداوانەش ئاگادار کەرەوەن بۆ مرۆڤەکان، بۆئەوەی بگەڕێنەوە بۆ خوداناسی و ئەو مەبەستەی کە بۆی دروستکراوە کە ئاوەدان کردنەوەی زەویە بە شێوەیەکی جوان و چاك.

جا ئەم ئایەتەی قورئان بەڵگەیە لەسەر ئەوەی کە ئێمە بەرپرسین لە پیس کردنی ژینگە، ئەم بەر پرسیارەیەتەش لە کەسێکەوە بۆ کەسێکی تر جیاوەزە، خەڵکانێك هەن گەڕەکێك پیس دەکەن، خەڵکانێکی تر هەن شەقامێك، خەڵکانێکی تر هەن شارێك، خەڵکانێك هەن وولآتێك، خەڵکانێکیش هەن هیچ سنورێکیان نیە و هیچ بەهایەکی ئاینی و مرۆیی و ویژدانی ڕێگریان لێناکات و دنیا پیس دەکەن، ئەوانەش ئەو کەسانەن کە بەرپرسن لە هەڵگریساندن چەندەها جەنگی جیهانی، ئەو کەسانەن کە بەرپرسن لە قەلآچۆ کردنی ملیۆنەها مرۆڤی بێتاوان، ئەو کەسانەن کە ئێستاش هەڕەشە لە جیهان دەکەن و ئامادەن بۆ هەڵگریساندنی چەندین جەنگی جیهانی تر و وێرانکردنی ژینگەی چەندین وولآتی تر، ئەو کەسانەن کە بۆ پاراستنی بەرژەوەندی تایبەتی خۆیان ئامادەن جۆرەها چەکی قەدەغە کراو بەکار بهێنن و ژینگەی ملیۆنەها کەس پیس بکەن، وەهەر ئەو کەسانە بوون کە چەکیان بە ڕژێمی بەعس فرۆشت و دەستیان بە پشتیدا دەهێناو ژینگەی پاکی کوردستانیان پێ پیس کرد و سەدان هەزار مرۆڤی بێ تاوانیان پێ قەلآچۆ کرد.

جا ئەگەر ئێمەی مرۆڤ مان هەوێت پاکی ژینگە بپارێزین" ئەوە دەبێت هەر کەسەو بە پێی ئەو ئەرکەی لەسەر شانیەتی هەوڵبدات بۆ پاراستنی ژینگە، نەوەکو وەك کەسانێك بین کە لە ژێرەوە بەر پرسن لە پیس کردنی ژینگە و لەسەرەوەش خۆیان بە فریاد ڕەسی ژینگە پیشان دەدەن!!

# ٦/٢٠ ڕۆژی

# پەنابـــــەران

خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾

# ٦/٢٠ ڕۆژی پەنابەران

ساڵانەو لە ڕۆژی ٦/٢٠دا بەشێك لە وولاتانی جیهان یادی ڕۆژی پەنابەران دەکەنەوە، وە لە جیهاندا ئەم ڕۆژە تەرخان کراوە بۆ باس کردن و لێکۆڵینەوە لە ژیانی پەنابەران و خستنە ڕوی کێشەکانیان، بەتایبەت ئەو پەنابەرانەی کە لە وولاتەکانی خۆیانیان توشی هەڕەشە بوونەوە و ژیانیان لە مەترسیدایە، وە چەندین توێژینەوە دەکرێت لەسەر ئەوەی چۆن زۆرترین خزمەت بە پەنابەران بکرێت، ئەوەش لە ڕێگای کۆمسیۆتی باڵای کار و باری پەنابەرانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان (UNHCR)، جا بۆ یەکەم جار یادی ڕۆژی پەنابەران لە ساڵی ٢٠٠١دا کرایەوە، کە هاوکات بوو لەگەڵ یادی پەنجا ساڵەی ڕێکەوتننامەی جنێفی تایبەت بە کاروباری پەنابەران، ئەوەش دوای ئەوەی کە کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتوەکان لە ٢٠٠٠/١٢/٤دا بڕیاریدا کە ڕۆژی ٦/٢٠ هەموو ساڵێك دیاری بکات بۆ ڕۆژی پەنابەران، وە جێگای ئاماژەیە پێشتریش بەشێك لە وولاتانی ئەفریقیا لەم ڕۆژەدا ئاهەنگیان دەگێڕاو یادی ڕۆژی پەنابەرانیان دەکردەوە.[1]

جا بە پشتیوانی خودای گەورە ئێمە لێرەدا تیشك دەخەینە سەر مافی پەنابەران لە ئیسلامدا و حوکمی کۆچ کردن لە وولاتێکەوە بۆ وڵاتێکی ترو، حوکمی وەرگرتنی ڕەگەزنامەی وولاتێکی کافر.

## پەنابەر لە ئیسلامدا

ئەگەر سەیری مێژو بکەین دەبینین لە مێژودا نەبووە کە گەلێك یان وولاتێك وەکو گەلی ئیسلام و دەوڵەتی ئیسلام ڕێزی پەنابەران بگرێت و مافی پەنابەران بدات، بەشێوەیەك کاتێك باسی کۆچکەرە موسڵمانەکان لە مەککەوە بۆ مەدینە دەخوێنیتەوە و پێشوازی خەڵکی مەدینە لە کۆچکاران دەبیستی سەرت دەسوڕمێت و بە خۆت دەڵێیت: تۆ بڵێی ئەو مرۆڤانە لە

١- سایتی نەتەوە یەکگرتووەکان (un) و ویکیدیا موسوعة الحرة.

هەسارەیەکی ترەوە نەهاتبن؟ چونکە لەسەر زەوی مرۆڤی ئاوامان دەست ناکەوێت، مرۆڤێك زۆر بەخۆشحاڵیەوە پێشوازی بکات لە برایەکی موسڵمانی کە هەرگیز نەیدیوە، نەیناسیوە، مامەڵەی لە گەڵیدا نەبووە، چاوەڕێی هیچ سودێکی دونیایی لێناکات، لە گەڵ ئەوەشدا پێشوازیەکی گەرمی لێبکات و زۆر بە ڕێزو دڵخۆشیەوە بەخێری بهێنێت، بیکاتە هاوبەشی ماڵ و سەروەت و سامانی لەگەڵدا بەش بکات، لەوەش زیاتر و گەورەتر پێشنیاز بکات بۆ برا کۆچبەرە ڕەبەنەکەی کام خێزانە لە خێزانەکانم دەست نیشان دەکەیت هەتا دەستی لێهەڵبگرم و پێشکەشی تۆی بکەم!! پاشان بەرگری لێبکات و لەگەڵیدا دژی دوژمنانی بجەنگێت، لەگەڵ ئەوەشدا دڵی هیچ گەردێك نەگرێت!! ئایا مرۆڤی ئاوا لە کوێ دەست دەکەوێت؟ تۆ بڵێی مرۆڤی ئاوا لەسەر زەوی هەبێت؟ بەڵێ، مرۆڤی ئاوا زۆرن، لە کوێن و کێن؟ ئەو مرۆڤانە موسڵمانە ڕاستەقینەکانن، ئەو موسڵمانانەن کە لە زانکۆی محمد المصطفیﷺ دەرچوون و شەهادەی باوەڕیان بە پلەی نایاب وەرگرتووە!!

جا خوێنەری بەڕێز تەنها چۆنیەتی پێشوازی خەڵکی مەدینە لە برا کۆچکارەکان جوانترین دەستور و یاسایە و هەموو مافێکی پەنابەریەتی تێدایە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئێمە لێرەدا چەند مافێکی پەنابەران باس دەکەین لە ئیسلامدا کە خودای گەورە لە ئایەتی نۆی سورەتی حەشر و چەند ئایەتێکی تردا باسی کردوون ، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ مِن قَبْلِهِمْ يُحِبُّونَ مَنْ هَاجَرَ إِلَيْهِمْ وَلَا يَجِدُونَ فِي صُدُورِهِمْ حَاجَةً مِّمَّا أُوتُوا وَيُؤْثِرُونَ عَلَى أَنفُسِهِمْ وَلَوْ كَانَ بِهِمْ خَصَاصَةٌ وَمَن يُوقَ شُحَّ نَفْسِهِ فَأُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾[1] واتا: ئەو کەسانەی کەوا پێشتر ماڵ و شوێنی خۆیان ئامادە کرد بۆ پێشوازی لە کۆچبەران و دڵ و دەرونی خۆیان ڕازاندەوە بـــە ئیمان، ئەوانەشیان خۆشدەوێت کە کۆچ دەکەن بۆ لایان، وە دڵیـــان جێگای

١- الحشر : ٩

هیچ بەخیلی و حەسودیەکی تێدا نابێتەوە لە بەرامبەر ئەوەی کە بەشی کۆچبەران دراوەو بەشی ئەوان نەدراوە، وە کۆچبەران بەسەر خۆیاندا پێش دەخەن هەر چەندە بۆخۆشیان هەژارن و پێویستیان پێیەتی، جا هەر کەسێك وەك ئەوانە خۆی لە ڕەزیلی نەفسی بپارێزێت و زاڵ بێت بەسەریدا ئەوە سەر فراز و بەختەوەر دەبێت. جا لەم ئایەتەدا خودای پەروەردگار چەند مافێکی پەنابەرانی باس کردووە کە بریتین لە:

١ـ پێشوازی کردن لە پەنابەران بە دڵخۆشی و ڕوو خۆشیەوە.

٢ـ چاکە کردن لەگەڵیاندا و فەزڵ دانیان بەسەر خۆدا.

٣ـ وەرگرتنی هەر پەنا بەرێك دەوڵەمەند بێت یان هەژار.

٤ـ بە هیچ شێوەیەك نابێت پەنابەر ڕەت بکرێتەوە. وە یەکسانە مرۆڤ بەهەر هۆکارێك داوای پەنابەریەتی بکات.

٥ـ پێدانی مافی مانەوە و ڕەگەزنامە، ئەمەش بەبەڵگەی ئەم بەشەی ئایەتەکە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ﴾

٦ـ مافی جێگای نیشتەجێبون، دیسان هەر بەبەڵگەی ئایەتی: ﴿وَالَّذِينَ تَبَوَّءُوا الدَّارَ وَالْإِيمَانَ﴾ لە ئیسلامدا جێگای نیشتەجێبون بۆ پەنابەر دیاری دەکرێت.

٧ـ پاراستن و بەرگری کردن لە پەنابەران، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ آمَنُوا وَهَاجَرُوا وَجَاهَدُوا فِي سَبِيلِ اللَّهِ وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا أُولَئِكَ هُمُ الْمُؤْمِنُونَ حَقًّا لَّهُم مَّغْفِرَةٌ وَرِزْقٌ كَرِيمٌ﴾[1] واتا: ئەو کەسانەی باوەڕیان هێناوە و کۆچیان کردووە و تێکۆشاون لە پێناوی خودادا، وە ئەوانەش کە جێگەی کۆچبەرانیان کردەوە و یارمەتیان دان، ئائەوانە بڕواداری ڕاستەقینەن، وە خودای گەورە لێیـان خۆشدەبێت و لــە نــاو بەهەشتیشدا ڕزق و ڕۆزیەکی پــڕ

١ـ الأنفال: ٧٤

بەرەکەت و بەرفراوانیان پێدەدات.

جا ئەم بەشەی ئایەتەکە کە دەفەرموێت: ﴿وَالَّذِينَ آوَوا وَّنَصَرُوا﴾ بەڵگەیە کە پێویستە پەنابەر جێگاشی بۆ بکرێتەوە و یارمەتیشی بدرێت و بەرگریشی لێبکرێت.

٨ـ ئاساییە پەنابەر لەسەر هەر ئاینێکە، وە مافی خۆیەتی هەموو ڕەسم و یاساکانی دینەکەی جێبەجێ بکات، چونکە لەسەردەمی دەوڵەتی ئیسلامدا لە هەموو دنیاوە ڕویان کردۆتە وولاتی ئیسلام، لە هیچ کەسێکیش نەپرساوە تۆ لەسەر چ ئاینێکی و چ نەتەوەیەکی، بەڵکو هەرچی مرۆڤ بوبێت مافی جێنشینی هەبووە لە وولاتی ئیسلامدا. بەڵام بەو مەرجەی نابێت هیچ پەنابەرێك لە دژی ئیسلام کار بکات و کار بکات بۆ پشێوی ناو موسڵمانان.

جا ئەمەی ڕابرا بەشێك لەو مافانە بوون کە لە وولاتی ئیسلامدا بە پەنابەران دەدرێت، وە ئەم مافانە لە سەردەمی دەوڵەتی ئیسلامدا بە شێوەیەکی کردەیی بە پەنابەران دراوە، بەڵام لەم ڕۆژگارەدا کە خەڵکی وا دەزانێت ئەوروپا و وولاتانی کوفر بەهەشتن، وە لە کاتێکدا نەتەوە یەکگرتوەکان و وولاتانی ئەوروپا دەهۆڵ بە مافی مرۆڤ و مافی پەنابەرانەوە دەکوتن" کەچی زۆرینەی پەنابەران ناتوانن لە ڕێگای ئاساییەوە بچنە ناو وولاتانی ئەوروپاوە، بەڵکو لە ڕێگای قاچاغ و پڕ مەترسیەوە دەچنە ناوی، بەم هۆیەشەوە ساڵانە چەندین ڕوداوی نەخوازراوی جەرگ بڕ لە ڕێگا قاچاخەکاندا لە پەنابەران ڕودەدات، لەم ساڵانەی ڕابردودا هەزاران پەنابەر لە دەریاکان و ئۆتۆمبیلە کەپسەکاندا خنکان، وە چەندینی تر لە شاخ و کێوەکاندا گورگ و دڕندەکانی تر خواردنی، وە چەندین کەسی تر لە ڕێگادا دەستگیر کراو بە سوکایەتی پێکردنەوە ڕەوانەی وولاتەکەی خۆی کرایەوە، وە چەندینی تر بەهۆی فێڵی قاچاخچیەکانەوە سەرگەردان بوون، ئەمە جگە لەوەی دوای ئەوەی دەگەنە ناو وولاتەکانیشەوە مافی پەنابەری و ڕەگەزنامە بەهەموو کەس نادرێت، بەڵکو ئەو کەسەی کە مافی پەنابەری پێدەدرێت دەبێت مەترسی لەسەر ژیانی هەبێت و بە درۆ کەیسێك بۆ خۆی دروست بکات. وەیان منداڵ بێت، ئەمە جگە لەوەی ساڵانە چەندین

جار وولاّتانی ئەورووپا هەڕەشەی ناردنەوە لە پەنابەران دەکەن، وە بەهۆی خراپی گوزەرانیانەوە ساڵانە چەندین جار پەنابەران خۆپیشاندان سازدەکەن و ناڕەزایی دەردەبڕن..... لەگەڵ چەندین نەهامەتی تردا کە تەنها ئەو کەسانە دەتوانن دەریببڕن کە ئەم سەفەرەیان کردووە و ئەم نەهامەتیانەیان بینیوە.

## حوکمی کۆچ کردن لە وولاّت

کۆچ کردن لە وولاّت و نیشتمان بۆ وولاّتێکی تر دەکرێت بە سێ جۆرەوە:

**یەکەم/** کۆچ کردن لە وولاّتێکی موسڵمان بۆ وولاّتێکی تری موسڵمان، ئەم جۆرەی کۆچیش دیسان دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١ـ کۆچ کردن لە وولاّت بۆ وولاّتێکی تر لە ترسی لەدەستدانی ئاین، وە یان لە ترسی لە دەستدانی گیان و مردن، هەروەك چۆن لە بەشێك لەو وولاّتە موسڵمانانەی کە سەرۆك و سەرکردەکانیان دیکتاتۆر و عەلمانین زۆر جار مەترسی لەسەر گیانی بەشێك لە بانگخواز و کەسە ئاینینەکان دروست دەبێت، لەو کاتەدا مرۆڤ لەسەری واجبە کە کۆچ بکات بۆ ئەوەی ژیان و دینی پارێزراو بێت و بتوانێت زیاتر خزمەت بە دین بکات.

٢ـ کۆچ کردن لە وولاّت بۆ وولاّتێکی تری موسڵمان بۆ هەر مەبەستێکی خێر، ئەم جۆرەیان ڕێگا پێدراو ـ مباح ـ ە، چونکە دوای ئەوەی زەوی موسڵمانان بەر فراوان بوو زۆرێك لە هاوەڵە بەرێزەکان لە مەککە و مەدینەوە کۆچیان کرد بۆ ویلایەت و ولاّتەکانی تری ژێر دەسەلاّتی ئیسلام وەك یەمەن و میصر و بەحرەین... هتد.

**دووەم/** کۆچ کردن لە وولاّتی موسڵمانان بۆ وولاّتێکی کوفر، بەهەمان شێوە ئەمەشیـــان دەکرێت بە دوو بەشەوە:

١ـ کۆچ کردن بۆ وولاتێکی کوفر بۆ کارێکی زۆر پێویست، وەك چارەسەری نەخۆشی کە چارەسەری لە وولاتی موسڵمانان نیە، وە یان بۆ وەرگرتنی زانست و زانیاری، وە یان فێربونی پیشەیەك کە سودی بۆ موسڵمانان هەیە و تەنها لە وولاتی کوفریش بەردەست دەکەوێت، وە هاوشێوەی ئەوانەش، ئەم جۆرەی کۆچ زانایانی ئیسلام بە سێ مەرج ڕێگایان پێداوە:

١ـ پێویستە ئەو کەسەی بۆ ئەو مەبەستانەی سەرەوە کۆچ دەکات بۆ وولاتێکی کوفر باوەڕو عەقیدەیەکی تەواو دامەزراوی هەبێت، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە خۆی بپارێزێت لە هەر شك و گومانێك کە ڕوو لە بیر و باوەڕەکەی دەکات.

٢ـ پێویستە زانستێکی تەواوی هەبێت بە حەلاڵ و حەرام، بۆ ئەوەی بەهۆیەوە خۆی بپارێزێت لە حەرام و کردەوە قەدەغە کراوەکان.

٣ـ ئەو کار و مەبەستەی بۆی دەچێت پێویستی پێیبێت و لە ناو وولاتانی موسڵمانیش دەستەبەر نەبێت.[1]

دووەم/ کۆچ کردن بۆ وولاتی کوفر بۆ مەبەستی خۆشگوزەرانی و بەدەستهێنانی سود و قازانجی دوونیایی. ئەم جۆرەی کۆچ حەرامە و نابێت موسڵمان ئەنجامی بدات، زانایانی سەردەم وەك: دکتۆر وەهبە زوحەیلی و محمد تقی عثمانی و زین العابدینی ئامدی فتوای لیژنەی بەردەوامی فتوای سعودی دەفەرموون: بە هیچ شێوەیەك دروست نیە و حەرامە ئەگەر موسڵمانێك بچێت لە وولاتێکی کوفر نیشتەجێ بێت،[2] بە تایبەت ئەگەر بێت و ئەم مرۆڤە گەنج بێت و زانستێکی تەواو و باوەڕێکی دامەزراوی نەبێت، چونکە ئەمەیان زیاتر گومانی تاوان و هەڵدێر بوونی پێدەبرێت.

---

١ـ شرح رياض الصالحين : ١/ ٣١

٢ـ بڕوانە بۆ : الفتاوى الآمدية: ٢١٢/٢. وە الفتاوى العصر: ٢٢٦. وە قضايا فقهية معاصرة: ٣٣٠.

# وەرگرتنی ڕەگەزنامەی وولاتێکی کوفر

دکتۆر وەهبە زوحەیلی و محمد تقی عثمانی و زین العابدینی ئامدی و فتوای لیژنەی بەردەوامی فتوای سعودی و بەشێکی تر لە زانایانی سەردەم دەفەرموون: بە هیچ شێوەیەك دروست نیە و حەرامە ئەگەر موسڵمانێك بچێت لە وولاتێکی کوفر نیشتەجێ بێت و ڕەگەزنامەی ئەم وولاتە وەربگرێت، چونکە وەرگرتنی ڕەگەزنامەی ئەم وولاتە ژمارەی بێباوەڕان زیاد دەکات، وە ئەم موسڵمانە پەیوەست دەکات بە هەندێك یاساو داب و نەریتی ئەم وولاتە کە بەهیچ شێوەیەك لەگەڵ یاساو نەریتەکانی ئیسلام ناگونجێن، وە جێگیر بوون لە ناو وولاتانی جگە موسڵمان سەردەکێشێت بۆ خۆشویستنی داب و نەریتی بێباوەڕان و فەزڵدانی بەسەر داب و نەریتە ئیسلامیەکاندا، وە زۆر جار ئەو کەسەی ڕەگەزنامەی وولاتێکی بێباوەڕان وەردەگرێت خۆی پێوە هەڵدەکێشێت و پێی باشترە لە ڕەگەزنامەی وولاتێکی موسڵمان، ئەمەش فەزڵدانی نیشتیمان و وولاتانی کوفرە بەسەر نیشتمان و وولاتانی ئیسلامیدا[1]

بەڵام دکتۆر عەلی جومعە موفتی میصر زیاتر لەم بابەت وردبۆتەوە و دەفەرمووێت: (قَضِيةُ التَجَنُّسِ قَضيَّةٌ بَحَثَها علماءُ المُسلِمينَ المُعاصِرِين في المجامعِ الفقهيَةِ المُختلِفة واختَلفَ رَايهُم فيها، و خلاصَةُ القَولِ: أنَّهُ إذا كانَ هذا التَجَنُّس تقويَةٌ للمُسلمين و تحصيلاً لمواطِنِ القُوَّةِ لَهم" حتى لَو انضَمَّ إلى هذا الْغَرَض غَرضَ الفكري أو مالي أو عَمَلي إلى آخِرِهِ فهوَ جائِزٌ، أمّا إذا كانَ في ذلك إضعافٌ للمُسلِمينَ و حالِهم فلا يَجوزُ)[1] واتا: بابەتی وەرگرتنی ڕەگەزنامەی وولاتێکی کوفر بابەتێکە زانایانی موسڵمانی سەردەم لە ناوەندە شەرعیە جیا جیاکان قسەیان لەبارەوە کردووە، وە زانایانی سەردەم دەربارەی ئەم بابەتە جیاران، بەڵام پوختەی

١ـ بڕوانە بۆ : الفتاوى الآمدية: ٢/٢١٢. وة الفتاوى العصر: ٢٢٦. قضايا فقهية معاصرة: ٣٣٠.

٢ـ الكلم الطيب، فتاوى عصرية، دكتور علي جمعة: ٢/ ٤٠٠

قسەکان ئەوەیە: ئەگەر وەرگرتنی ڕەگەزنامەی وولاتێکی کوفر ببێتە هۆی بەهێز بوونی موسڵمانان و پێگەیان پتەو بکات ئەوە دروستە" هەتا ئەگەر لەگەڵ ئەو مەبەستەدا مەبەستی تری دنیایشی بێتە پاڵ" وەك مەبەستی بەدەستهێنانی زانست و مەبەستی دارایی و... هتد، بەڵام ئەگەر بێت و وەرگرتنی ڕەگەزنامەی وولاتێکی کوفر ببێتە هۆی لاوازبونی موسڵمانان و کار و بارەکانیان ئەوە دروست نیە.

جا بەڕاستی ئەم ووتەیەی دکتۆر عەلی جومعە ووتەیەکی تەواوە و نزیکترە لە پێکان، چونکە ئەم بابەتە پێویستی بە ورد بونەوە هەیە، بێگوومان ئەگەر کەسێك تەنها بۆ خۆشگوزەرانی خۆی و مەبەستی دوونیایی ڕەگەزنامەی وولاتێکی کوفر وەر بگرێت و دینیشی پارێزراو نەبێت" ئەوە قەدەغەیە و حەرامە، بەڵام لە بەرامبەریشدا چەندین موسڵمان هەیە بوونی لە ئەورووپا و وولاتانی کوفر پێویستە، چونکە سودی زۆر بە ئیسلام دەگەیەنن و دەبنە هۆکاری هیدایەتی چەندین کەسی بێباوەڕ، وەك مامۆستای خۆشەویست احمد موفتی کە کوردێکی کوردستانی خۆمانە و نیشتەجێی وولاتی سویدە، سەنتەرێکی ئیسلامی داناوە بەردەوام ڕۆژانە خەڵکی لە ڕێی ئەم سەنتەرەوە موسڵمان بونی خۆیان ڕادەگەیەنن و دێنە ناو دینی ئیسلامەوە. وە بیرشیمان نەچێت زۆرێك لە وولاتانی دنیا وەك (ڕوسیا و مالیبار مالدیف و تبت و صین و وولاتانی باشوری ڕۆژهەلاتی ئاسیا وەك مالیزیا و ئەندۆنیسیا و بەشێك لە وولاتانی ئەفریقیا وەك غینیا و سیرالیۆن و لیبریە و تۆغـــەندا...) جگە لەمـــانەش لە ڕێی بازرگانە موسڵمانەکانەوە کە چوونە ناویان موسڵمان بوون و هاتونەتە ناو ئیسلامەوە.(١)

سێهەم/ کۆچ کردن لە وولاتی کوفرەوە بۆ وولاتی ئیسلام، ئەم جۆرەی کۆچ واجبە لەسەر کەسێك کە لـــە وولاتی کوفردا بژیت و مەترسی هەبێت لەسەر ئاینەکەی، وە یان نەتوانێت بـــە

١ـ أطلس إنتشار الإسلام، دكتور شوقي ابو خليل: ١٣٨و١٥٠ و ١٦٢و ١٦٧و ١٧٦و ٢٢١و ٢٣٠

ئاشکرا ڕێو ڕەسم و ڕێساکانی ئاینەکەی جێبەجێ بکات، بە شێوەیەك کۆمەڵی زانایانی ئیسلام کۆ دەنگن لەسەر ئەوەی: ئەگەر کەسێك لەوە بترسێت لە دینەکەیدا توشی فیتنەو ئاشوب دەبێت" ئەوە لەسەری واجبە وڵاتی کوفر بەجێبهێڵێت و کۆچ بکات بۆ وڵاتێکی ئیسلامی. ابن حجری عەسقەلانی رحمه‌الله دەفەرموێت: (فالهِجْرَةُ واجبةٌ منها على من أَسْلَمَ و خَشي أنْ يُفتِنَ في دينه)[1] واتا: کۆچکردن واجبە لەسەر کەسێك ئەگەر لە وڵاتی کوفردا بژیت و لەوە بترسێت کە توشی کێشە ببێت لە دینەکەیدا.

بەڵام ئەگەر کەسێك بتوانێت ڕێوڕەسم و ڕێساکانی دینەکەی جێبەجێ بکات و مەترسیش لەسەر ئاین و گیانی نەبێت وە سودی هەبێت بۆ ئیسلام ئەوە دەتوانێت لە وڵاتی خۆیدا بمێنێتەوە.

# ڕونکردنەوەیەك

دوای ئەوەی پێغەمبەری خوداﷺ مەککەی پیرۆزی لە دەستی بێباوەڕان ڕزگار کرد فەرمووی: (لا هِجْرَةَ بَعدَ الفَتْحِ)[2] واتا: لە دوای ڕزگار کردنی مەککەوە کۆچ کردنی واجب نەما، بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ لە فەرموودەیەکی تردا دەفەرمـــوێت: (لا تَنقطعُ هِجرَةُ)[3] واتا: کۆچ کردن بەردەوامە و کۆتایی نایەت. جا بەڕوی ئاشکرا ئەم دوو فەرموودەیە پێچەوانە و دژیەکی یەکترن، بەڵام زانایان لێکدانەوە بۆ ئەم دوو فەرموودەیە دەکەن و دەفەرموون: مەبەستی پێغەمبەرﷺلە فەرموودەی یەکەم ئەوەیە کە: لە سەرەتای ئیسلامدا کۆچ کردن بۆ لای پێغەمبـــەرﷺ و بۆ جیهاد و سەرخستنی دین واجـــب بوو، بـــەڵام دوای ڕزگار کـــردنی مەککە

---

١- فتح الباري: ٢٨٦/٧.

٢- پێشەوا بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٣- پێشەوایان ابو داود و نسائي و احمد گێڕاویانەتەوە.

ئیسلام بەهێز بوو و کۆچ کردنی واجب نەما. وە مەبەست لە فەرموودەی دووەم ئەوەیە کە: هەموو کاتێك کۆچ کردن لە سەر کەسێك واجبە کە لە وولاتێکی کوفر دا بژیت و لە لەدەستدانی دین و رەوشتە ئیسلامیەکانی بترسێت،[1] بەلاّم بەداخەوە وەك باسمان کرد لەم رۆژگارەدا موسلْمانان بە پێچەوانەی فەرمانی پێغەمبەرەوەﷺ و بۆ بەدەستهێنانی کەمێك لە سودی دوونیایی لە وولاّتی ئیسلامەوە کۆچ دەکەن بۆ وولاّتانی کوفر، لەگەلْ ئەوەی چەندین مەترسیش لەسەر ئاین و رەوشتە ئیسلامیەکانیان درووست دەبێت.

جا خوێنەری بەڕێز: ئێستا بۆمان ڕون بۆوە کە تەنها ئیسلامە بە شێوەیەکی کردەیی مافی پەنابەرانی داوە، وەهەرچی وولاّتانی کوفرن تا ئێستاش نەیانتوانیوە چارەگی مافەکانی ئیسلامیش بە پەنابەران بدەن، لەبەر ئەوە هەر موسلْمانێك ویستی یادی پەنابەران بکاتەوە با بچێت قورئان بخوێنێت، چونکە هەموو مافەکانیان لەوێدا جێگیرە، نەوەکو لە ٢٠/٦دا بەرنامەی تایبەتی لە ڕاگەیاندنەکان بۆ ئامادە بکرێت و کۆڕ و سیمینار وچالاکی تایبەتی لەسەر حیسابی بودجەی هاولاّتیان بۆ ساز بکرێت.



[1] ـ فتح الباری : ٧/ ٢٨٦.

# ٦/٢٦

# ڕۆژی جیهانی بەرەنگاربونەوەی مادده هۆشبەرەکان

ئوم سەلەمە رضي الله عنها فەرموویەتی:(أن النبيﷺ نهى عن كل مسكر ومفتر)

# ڕۆژی جیهانی بەرەنگار بونەوەی مادده هۆشبەرەکان

ساڵانە ڕۆژی ٦/٢٦ دیاریکراوە بۆ ڕۆژی بەرەنگار بونەوەی مادده هۆشبەرەکان، وە بیرۆکەی دیاریکردنی ئەم ڕۆژە دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ١٩٨٧، لە ١٩٨٧/٦/٢٦ لە فیەننای پایتەختی نەمسا کۆنگرەی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ بەرەنگاربونەوەی بازرگانیکردنی نایاسایی بە مادده هۆشبەرەکانەوە بەڕێوەچو، لەو کۆنگرەیەدا یەکێك لە وڵاتە بەشدار بووەکان پێشنیازی کرد کە لە ساڵدا ڕۆژێك دیاری بکرێت بۆ بەرەنگار بونەوەی مادده هۆشبەرەکان، ئەم پێشنیازەش لە لایەن هەموو وڵاتە بەشدار بووەکانی کۆنگرەکەوە پێشوازی لێکراو بە کارێکی باش ئەژمار کرا، دواتر بە ڕێککەوتنی هەموو وڵاتە بەشداربووەکان ڕۆژی ٦/٢٦ کە هاو کات بوو لەگەڵ ڕۆژی بەستنی کۆنگرەکە دیاری کرا بۆ ڕۆژی بەرەنگار بوونەوەی مادده هۆشبەرەکان، وە پاشان کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان بە بڕیاری ژمارە١١٢/٤٢لە بەرواری ٧کانونی یەکەمی ١٩٨٧ بڕیاریدا کە ڕۆژی ٦/٢٦ بکرێت بە ڕۆژی بەرەنگاربونەوەی مادده هۆشبەرەکان.[1]

## پێناسەی مادده هۆشبەرەکان

بەر لەوەی بێینە سەر باسی زیانەکانی مادده هۆشبەرەکان و حوکمی شەرعی بەکار هێنانی مادده هۆشبەرەکان با بزانین مادده هۆشبەرەکان ـ مخدرات ـ چین:

ـ مُخدِر: ووشەیەکی عەرەبیە و اسم فاعلی ووشەی (خدر)ە یە، وە (خدر) بەواتای (ستر) دێت، واتا داپۆشی. بە واتای مادده هۆشبەرەکان(مخدرات) عەقڵی مرۆڤ دادەپۆشن.

ـ وە لە ڕوی زانستی یەوە بەم شێوەیە پێناسەی مادده هۆشبەرەکان دەکرێت: ماددەی هۆشبەر ماددەیەکی کیمیاییە و دەبێتە هۆکاری وەنوزە و خەو و لە دەستدانی هۆشیاری، وە لەگەڵیدا ئـــازاری لاشە کەم دەکاتەوە، وە ووشەی(مخدر) واتای ووشەی(Narcotic)ی ئینگلیزیە و

١ـ سایتی الأمم المتحدة.

وەرگیراوە لە ووشەی(Narcosis)ی ئیغریقی، بەواتای هەرشتێك دێت کە عەقڵ دابپۆشێت و هۆش نەهێڵێت، جا بە پێی ئەم پێناسە زانستیە بێت مەیش دەچێتە ناو لستی مادده هۆشبەرەکانەوە، چونکە ئەویش هۆش ناهێڵێت و عەقڵ دادەپۆشێت.

- وە لە ڕوی یاساییەوە بەم شێوەیە پێناسەی ماددەی هۆشبەر کراوە: مادده هۆشبەرەکان کۆمەڵێك ماددەن دەبنە هۆکاری ئالودە بوون و ژەهراوی بوونی ئامێری دەماغ، وە لە ڕوی یاساییەوە ئالۆ گۆڕ کردن و مامەڵ پێوەکردن و چاندن و دروستکردنی قەدەغەیە، وە تەنها بەشێوەیەکی سنوردار نەبێت، ئەویش کە یاسا دیاری دەکات، وە نابێت بەکار بهێنرێت تەنها لە ڕێی کەسی ڕێگا پێدراوەوە نەبێت، وە بەم پێیەش ماددەی هۆشبەر هەر یەك لە (ئەفیون و عەشیش و عقاقیر و هەلوسە وکۆکائین و مادده وزە بەخشەکان و دروستکراوەکانی ئەمانەش دەگرێتەوە)[1]

## زیانەکانی مادده هۆشبەرەکان

لەڕێی توێژینەوە و بە دواداچون و لێکۆڵینەوەکانەوە دەرکەوتووە کە مادده هۆشبەرەکان چەندین زەرەد و زیانی تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئابوریان هەیە، ئێمە لێرەدا بەشێك لەو زەرەد و زیانانە دەخەینە ڕوو:

**یەکەم/ زیانە کۆمەڵایەتیەکان:** لەڕوی کۆمەڵایەتیەوە بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان چەندین زەرەد و زیانیان هەیە، ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەو زەرەدو زیانانە:

١- داڕوخان و تێکچونی شیرازەی کۆمەڵگا، چونکە تاکە مرۆڤێك وەك خشتی دیوارێك وایە، ئەگەر خانویەك خشتێکی تێدا نەبێت کەلێنی تێدەکەوێت، کۆمەڵگاش بە لە دەست دانی مرۆڤێکی ساغ کەلێنی تێدەکەوێت، وە ئەو زیانەش لە کەسێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ ماڵێك و لە

١- موقع مركز السموم والكيمياء الشرعية بمنطقة مكة المكرمة.

ماڵێکیشەوە بۆ کۆمەڵگایەك.

٢ـ بەکار هێنانی ماددەی هۆشبەر چەندین دەرئەنجامی کۆمەڵایەتی خراپی لێدەکەوێتەوە لەسەر بەکار هێنەر، وەك بێ متمانەیی و داڕوخانی پێگەی کۆمەڵایەتی و لە دەستدانی کار و ....هتد ئەمەش بەهۆی ئەوەی ماددەی هۆشبەر وا لە بەکار هێنەر دەکات کەسێکی تەمبەڵ بێت و کارەکەی پشت گوێ بخات و بیرۆکەی گێلانەی بۆ بێت و زوو هەڵبچێت،

٣ـ کەسێك کە ئالودە دەبێت بە ماددەی هۆشبەرەوە توانای کاری نامێنێت، وە بێچاریشە دەبێت بە هەر شێوەیەك بێت ماددەکە بەدەست بهێنێت، لەبەر ئەوە توشی چەندین کاری نەخوازراوی وەك دزی کردن دەبێت، وە ئەگەر لە فەرمانگەیەکیش کار بکات توشی وەرگرتنی بەرتیل و چەندین کاری تری نا یاسایی دەبێت.

٤ـ ماددەی هۆشبەر هۆکارێکی سەرەکیە بۆ تێکدانی شیرازەی ماڵ، چونکە ئەو تاکەی ماڵ کە ئالودە دەبێت بەم ماددانەوە لە تاکەکانی ماڵ دادەبڕێت، ماڵەوەشی بە ئەوەوە گیرۆدە دەبن و ئەوانیش لە کۆمەڵگا دادەبڕێن، ئەمەش دەبێتە هۆی دابڕانی کۆمەڵگا لە یەکتر، ئەمە جگە لەوەی ئەو کەسانەی کە مامەڵە بە ماددەی هۆشبەرەوە دەکەن بە پێی یاسا سزا دەدرێن، ئەم سزایەش جاری وا هەیە بە زیندانی کردنە بۆ ماوەی چەند ساڵێك، کە ماوەی ئەم ساڵانەی ئەم کەسە لە زیندان بەسەری دەبات لە کەس و کار و کۆمەڵگا دادەبڕێت، لەم ماوەیەدا خێزانی بەبێ سەرپەرشتی و خۆشەویستی هاوسەرەکەی و منداڵەکانی بەبێ سۆزی باوکایەتی بەسەر دەبەن، وە زۆر جار ئەم ماڵە بەبێ کاسبکار دەمێنێتەوە، کە ئەمەش دەبێتە هۆی ژیانێکی زۆر سەخت لەسەر خێزان و منداڵەکانی، کە بەداخەوە لەمڕۆدا زیندانەکانی کوردستان پڕن لە سزادراوانی ماددە هۆشبەرەکان، بەشێوەیەك لە بەرواری ٢٠١٤/٣/٢٧بەڕێوەبەری ئاسایشی سلێمانی بە سایتی شرۆڤەی ڕاگەیاند" بەکارهێنانی ماددە هۆشبەرەکان لە کوردستان بۆتە دیاردە، وە زۆربەی زیندانیەکانی ئێمە لەسەر ماددە هۆشبەرەکان گیراون!!

٥ـ ماددەی هۆشبەر ڕەوشتی تاکی کۆمەڵگا دادەڕوخێنێت و وەهای لێدەکات هەموو کارێکی نارێك و نەخوازراو ئەنجام بدات، وە لەم ڕۆژدا چەندین پەرتوکی تایبەت نوسراون لەسەر قوربانیەکانی ماددەی هۆشبەر و ئەو کەسانەی بەهۆی بەکارهێنانی ماددەی هۆشبەرەوە توشی تاوان بورن، ئێمە لێرەدا دوو ڕوداوی ڕاستەقینە وەك نمونە باس دەکەین بەڵکو ان شاء الله ببێتە پەند و ئامۆژگاری بۆ گەنجەکانمان:

یەکەم/ ابراهیم صالح الدرویش لە(قصص و عبر من الواقع)دا دەڵێت: یەکێك لە کارمەندانی ڕوبەڕو بونەوەی ماددەی هۆشبەر بۆی باس کردم، کە گەنجێکمان دەستگیر کرد کە ئالودە بوبو بە ماددەی هۆشبەر، ئەم گەنجە هەرچی سەروەت و سامانی هەبوبو هەمووی بە هەدەر دابو بۆ کڕینی ماددەی هۆشبەر، دوای ئەوەی هیچی بە دەستەوە نەمابوو، دەستی کردبوو بە دزینی زێڕ و خشڵی دایك و خوشکەکەی و لەم ڕێیەوە پارەی پەیدا کردبوو بۆ کڕینی ماددەی هۆشبەر، پاشان دوای ئەوەی زێڕ و خشڵەکانی دایك و خوشکەکەشی تەواو بوو، دەستی کردبوو بە تاوانێکی یەکجار گەورە و قێزەون، ئەویش ئالودەکردنی خوشکەکەی بوو بە ماددەی هۆشبەر، ئینجا هەر جارێك ماددەی هۆشبەرەکەی دەدا بەخوشکەکەی و خوشکەکەی هۆشی نەدەما کاری لەش فرۆشی بە خوشکەکەی دەکرد و لەم ڕێگایەوە پارەی پەیدا دەکرد بۆ کڕینی ماددە هۆشبەرەکان، پاشان ئەم گەنجە داڕوخاوە پێویستی بە پارەی زیاتر بوو، لەبەر ئەوە هەستا بەکارێکی نامەردانەی تر ئەویش ئەوەبو ئەو دایکەی نۆ مانگ و نۆ ڕۆژ لە سکی خۆیدا هەڵیگرت و دوو ساڵ شیری پێدا، خۆشیەکانی خۆی بە لاوە نا بۆ خۆشبەختی کوڕەکەی، کەچی ئەم کوڕە نمەك بە حەرامە بە فێڵ ماددەی هۆشبەری بۆ دایکیشی بەکار هێنا و ئەویشی ئالودە کرد و کردی بە کاڵای لەش فرۆشی، هەتا پۆلیس دەستگیری کرد. إنا لله و إنا إليه راجعون.

دووەم/ دکتۆر یوسف حاج احمد لە کتێبی (قوربانیەکانی شەیتاندا) بەسەر هاتێکمان بۆ باس دەکات و دەڵێت: (ن،م) گەنجێك بو ئالودە بوبو بە ماددە هۆشبەرەکانەوە، ئەم گەنجە دەڵێت:

لەگەڵ خوشکێکم دا زۆر بە ئاسودەی و نازداری دەژیاین، هەر شتێکمان ویستبایە بۆمان جێبەجێ دەکرا، بە تایبەت لە لایەن دایکی بە سۆزمانەوە کە بەدەست دوری باوکمانەوە گیرۆدە بوو، چونکە بەردەوام باوکمان گەشتی دوری دەکرد، دەڵێت بۆ یەکەم جار لە گەشتێکمدا بۆ دەرەوەی وولات" بەهۆی ئافرەتێکەوە کە ناوی(جاکلین) بوو توشی بەکار هێنانی ماددە هۆشبەرەکان بووم، لەگەڵ ئەم کچەدا پەیوەندیەکی گەرمم هەبوو، ئەویش چەند بم ویستبایە ماددەی هۆشبەری پۆ پەیدا دەکردم، بە تایبەت کاتێك کاری داوێن پیسیم لەگەڵدا دەکرد، پاشان دوای گەڕانەوەشم بۆ وولات لەسەر بەکارهێنانی ئەو ماددانە هەر بەردەوام بووم، پاشا ماوەیەك دایکم لێم کەوتە گومان، بەردەوام پرسیاری لێدەکردم، بە تایبەت کاتێك دەچومە گەرماوەکە و زۆر دەمامەوە لێی دەپرسیم بۆ ئەوەندە لە گەرماوەکەدا دەمێنیتەوە؟ وە دەیپرسی بۆ نان بە باشی ناخۆیت؟ بۆ بەردەوام ماندو دیاری؟ ... هتد، منیش لەم پرسیارانە بێزار بووم، لەبەر ئەوە بڕیارمدا بگوازمەوە بۆ ماڵی پورم، ئەو پورەم بێوەژن بوو، تەنها دوو کەسی لەگەڵ دەژیا، ئەویشیان کارەکەرێك و مێردی کارەکەرەکەی بوون، ژورێکی جیای بۆ دروست کردبوون، ماڵی پورم زۆر گونجاو بوو بۆ من بۆ ئەوەی ماددە هۆشبەرەکان بەکار بهێنم، کەس پرسیاری لە هەڵسو کەوتم نەدەکرد، وە پوریشم زۆر منی خۆش دەویست، لەم ماوەیەدا لە خوێندنی زانکۆ دابڕام، وە بەردەوام هەستی ماددە هۆشبەرەکانم بەرز دەبۆوە بەشێوەیەك توشی حاڵەتی هستریا بویوم، دایکیشم لەم لاوە زۆر نا ئارام بوو، چونکە هەم لە دووری من، وە هەم باوکیشم هەواڵی پێدابوو کە ژنێکی تری هێناوە، پاش ماوەیەك دایکم ژن هێنانی باوکمی لا بوو بە ئاسایی، بەڵام بە باوکمی گووت: دەبێت ژنەکەت بهێنیت بۆ پاڵ خانوەکەی خۆمان بۆ ئەوەی تۆ زیاتر لە لامان بیت، باوکیشم بەوە ڕازی بوو، ئەوەش بۆ من نە گونجاو تر بوو، چونکە ماڵمان قەرەباڵغتر بوو، وە باوکیشم هەر چەندە نەیزانی بوو کە من ئالودە بووم، بەڵام بەردەوام سەرزەنشتی دەکردم پێی دەگووتم تۆ کەسێکی فاشلی، لەبەر ئەوە بڕیارمدا بەردەوام لە ماڵی پورم بمێنمەوە، پوریشم

دەرگای بۆ من لەسەر پشت بوو، جا کاتێك لە ماڵی پورم دەمامەوە، شەوێکیان تراژیدیایەك ڕویدا کە ژیانی منیش و پورە بەستەزمانەکەشی بەیەکجاری تێك شکاند، با گوێبگرین بۆ ئەم کارەساتە: شەوێکیان ماددە هۆشبەرەکان یاری بە سەرم دەکرد هەروەك چۆن یاریزان یاری بە تۆپ دەکات، منیش حەبێکی سڕکەرم هێناو خستمە ناو شەربەتێکەوە و پاشان دەرخواردی پورمدا، ئەویش خەوی لێکەوت، ئەوجا شەیتان بەرەو کارێك جوڵاندمی کە موچوڕکە بە لاشەی مرۆڤدا دەهێنێت!! کە سەیری پورم دەکرد لەسەر جێگای خۆی ڕاکشابوو، شەیتان لەبەر چاومی وەکو بوکی یەك شەوە ڕازاندیەوە، خۆشم وەکو زاوا دەهاتە بەرچاو، لێی نزیك بومەوە، ئەویش بەهۆی حەبە سڕکەرەکەوە هیچ جوڵەیەکی نەبوو، پاشان وەك هاوسەری خۆم مامەڵەم لەگەڵدا کرد، دوای تەواو بونم هەموو ئاسەوارێکم لادا کە ئاماژە بوون بۆ ئەو کارە، بەم شێوەیە یەکەم شەو ڕۆیشت، بە داخەوە دوای دوو شەو هەمان کارم دوو بارە کردەوە کە یەکەم شەو ئەنجامم دابوو، بەم شێوەیە ماوەیەك بەردەوام بووم، لەگەڵ هەر شەربەتێکدا حەبێکی سڕکەرم بۆ پورم تێدەکرد و پاش ئەوەی بێهۆش دەبوو، کاری ناشەرعیم لەگەڵیدا دەکرد، پاش ماوەیەك پورم هۆگر بوو بە ماددە هۆشبەرەکانەوە، وای لێهاتبوو بۆ خۆی داوای ئەم شەربەتەی دەکرد، بێ ئەوەی پوری بەستەزمانم بزانێت کە هۆگر بووە، منیش لەسەر کارە قێزەونەکەم بەردەوام بووم، هەتا شەوێکیان پەرداخە شەربەتەکەم بۆ پورم برد، بەڵام نەمزانی کە پورم پەرداخە شەربەتەکەی لە دەست بەربۆتەوە و نەیخواردۆتەوە، وە داوای شەربەتی تریشی نەکردبوو، لەبەر ئەوە کاتێك پورم خەوی لێکەوت، من وامزانی سڕ بووە، جلەکانی خۆم داناو لە پورم نزیك بومەوە بۆ ئەوەی جلەکانی ئەویش دابکەنم، بەڵام لەناکاودا ڕوداوێکی چاوەڕوان نەکراو ڕویدا، پورم بە ترسەوە ڕاپەڕی و لە جێگاکەی هەستاو بە دەنگێکی بەرز هاواری کرد، ئیتر نەم دەزانی چیبکەم، بەتایبەت کە من بەهۆی ماددە هۆشبەرەکانەوە هەستم بە قورسیەکی زۆر دەکرد لە لەشمدا و سەرم بە گێژەوە دەهات، ئەو شەوە شەوێکی ترسناك بوو لە لای منیش و پوریشم، بەشێوەیەك

هەرگیز بە خەیاڵیدا نەدەهات، بۆ بەیانی گەڕامەوە بۆ ماڵی خۆمان، پوریشم تەندروستی زۆر خراپ بوو، ڕۆژێکیان توشی خوێن بەربونێکی زۆر هاتبوو، لە نەخۆشخانە چارەسەری وەرگرتبو، پزیشکەکە تێی گەیاندبوو کە ئەو خوێن بەربونەی لە ئەنجامی سکپڕ بونەوە بووەو منداڵەکەی لەبار چووە کە پێش سێ مانگ سکی لێی پڕ بوبوو!

پورم ڕاستیە تاڵەکەی بۆ دەرکەوت، دەیزانی کە داوێن پیس نیە و هیچ کەسێکیش جگە لە من ئەو کارەی لەگەڵدا نەکردووە، لەبەر ئەوە توشی داڕوخانی دەرونی بوو، بۆ ماوەی مانگێك چارەسەری بەکار هێنا، بەردەوام لە خۆی دەپرسی: چۆن بۆ کوڕی براکەم ئاسان بوو بم کاتە ژنی خۆی؟ خۆ دەیزانی کە من بۆ ئەو حەرامم، پاش مانگێك خەفەت و بیر کردنەوە کارەساتێك ڕویدا، پورە بەستەزمانەکەم لە داخ و پەرژارەی ئەو دەستە ناپاکە کە چاکەی بە خراپە وەڵام دایەوە مرد و گیانی سپارد.

لەگەڵ مردنی پورم من کەوتمە بارێکی دەرونی زۆر ترسناکەوە، لەبەر ئەوە بڕیارمدا بچمە دەرەوەی شانشینی سعودیە بۆ وەرگرتنی چارەسەری ئالودە بونەکەم، لە دەرەوەی وولات و لە نەخۆشخانە بۆ ماوەی ساڵێکی تەواو مامەوە، ئێستا دەبینن بەرەو باشی دەڕۆم، بەڵام هەرگیزاو هەرگیز برینەکانم چارەسەر نابێت، وازم لە خوێندن هێنا، هۆگری ماددە هۆشبەرەکان بووم، لە هەموشیان قورستر و گرانتر لەسەرم ئەوەیە پورم بۆ خۆم حەڵاڵ کرد و ژیانی ئەوم تێکشکاند!![1]

جا ئەمەی ڕابردووو دوو ڕوداو بوون لە هەزاران ڕوداوی لەم شێوەیە کە لە دەرئەنجامی بەکار هێنانی ماددە هۆشبەرەکاندا ڕویانداوە،جا ئەی گەنجی خۆشەویست با ئەم ڕوداوانە بۆ تۆی بەڕێز ببنە وانەیەك و بە هۆیانەوە پەند وەربگریت و بڕیار بدە هەرگیزاو هەرگیز نەبیتە کاڵا بەدەستی ماددەی هۆشبەرەوە، وە بڕیار بدە هەرگیز بە دەستی خۆت عەقڵی خۆت لەدەست مەدە و ژیانی

---

١ـ قوربانیەکانی شەیتان: ٢١٦ـ٢٢٠.

خۆت و دەور و بەرو دۆست و خۆشەویستانیشت مەکە بە دۆزەخ.

دووەم/ زیانە لاشەیی و تەندروستیەکان: هەروەك چۆن بەکار هێنانی مادده هۆشبەرەکان زیانی کۆمەڵایەتی هەبوو، بەهەمان شێوە چەندین زیانی لاشەیی و تەندروستیشی هەیە، ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لەم زیانانە:

١ـ لە دەستدانی حەز و ئارەزوی خواردن، ئەوەش دەبێتە هۆی داڕوخان و لاواز بون، پاشان سەر دەکێشێت بۆ زەرد و ڕەش هەڵگەڕانی دەم و چاو، وە هەروەها بەکار هێنانی ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆی کەمبونەوەی توانا و جوڵە و لاوازی بەرەنگار بونەوەی نەخۆشی، ئەوەش دەبێتە هۆکاری داڕوخان و سوربونەوەی چاو، وە دەبێتە هۆی شێواندنی هاو سەنگی و تێکدانی هەستیاری بیستن.

٢ـ بەکار هێنانی مادده هۆشبەرەکان دەبێتە هۆی تێکدانی ئامێری هەرس کردن، ئەوەش دەبێتە هۆی خراپی هەرس کردن و هەڵاوسانی گەدە، وە پاشان دەبێتە هۆکاری سکچون و سوتانەوەی گەدە و گەدە بە شێوەیەکی باش خواردن هەرس ناکات، وە بەهەمان شێوە دەبێتە هۆی (إلتهابی غودەی بەنکریاس) و لەکاری دەخات.

٣ـ ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆی زۆرێك لە نەخۆشیەکانی جگەر، وەك زیاد بونی ڕێژەی شەکر و هەڵاوسان و إلتهاب و ژەهراوی بونی جگەر ... هتد.

٤ـ بەکار هێنانی ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆی إلتهابی مێشك و تێکشکاندن و خواردنی ملیۆنەها خانەی هەستیار، کە ئەوانەش دەبنە هۆکاری لە دەستدانی بیرەوەری و لاواز بونی بیستن و بینین و بیرکردنەوە.

٥ـ ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆکاری نەخۆشیەکانی دڵ و لەدەستدانی هاوسەنگی لێدانی دڵ، هەروەك چۆن دەبێتە هۆی بەرز بونـــەوەی پاڵەپەستۆی خـــوێن و تەقینی خوێنبـــەرەکان و

ژەهراوی بونی مۆخی ناو ئێسقانەکان.

٦ـ ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆی کەم بونەوەی توانای ڕەگەزی ـ جنسی ـ

٧ـ بەکار هێنانی ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆی چەندین کێشەی تەندروستی بۆ ئافرەتی سکپڕ وەك: کەم خوێنی و نەخۆشی دڵ و شەکرە و إلتهابی سیەکان و جگەر و لەبار چونی منداڵ و لە دایکبونی منداڵەکەی بە سەرەوبنی و ئەمە ئەگەر لە ناو ڕەحمی دایکیدا نەشمرێت.

٨ـ بەکار هێنانی ماددەی هۆشبەر هۆکاری سەرەکیە بۆ توشبون بە نەخۆشی کوشندەی شێرپەنجە.

٩ـ دەبێتە هۆکاری هەڵچونی بەردەوام، بەشێوەیەك کەسی ئالودە لە کۆمەڵگا دادەبڕێت.

١٠ـ بەکارهێنانی کەمێکی زیاتر لە ماددەی هۆشبەر دەبێتە هۆی خۆ کوشتن.[١]

**سێهەم/ زیانە ئابوریەکان/** هەروەك چۆن ماددە هۆشبەرکان چەندین زیانی کۆمەڵایەتی و تەندروستیان هەبوو، بەهەمان شێوە چەندین زیانی ئابوریشیان هەیە، بەڵام بە پێی ئەوەی کە مامەڵەکانی ماددە هۆشبەرەکان بە نهێنی دەکرێت، لەبەر ئەوە ئەستەمە کە بەشێوەیەکی سنوردار بزانرێت کە ساڵانە چەند سەروەت و سامانی گشتی و تاکی بە هەدەر دەڕوات، وە بە تایبەت کە لە کوردستان کە هەتا ئێستا ئامارێکی باوەڕ پێکراو لەبەر دەستدا نیە، بەڵام ئێمە لێرەدا ئاماژە بەو ڕێگایانە دەدەین کە بەهۆیانەوە سەروەت و سامانی گشتی ـ دەوڵەت ـ و تاکی ـ هاوڵاتی ـ بەهەدەر دەچێت:

١ـ بەهەدەردانی سامانی تاکە کەس بۆ بەدەستهێنانی ماددەی هۆشبەر.

٢ـ بەهەدەردانی سامانی تاکە کەس بۆ وەرگرتنی چارەسەر پێویست بۆ ئەو نەخۆشیانەی کە بەهۆی ماددەی هۆشبەرەوە توشیان دەبێت، وە یاخود بۆ وەرگرتنی چارەسەری پێویست دوای

١ـ الفقه الإسلامي و أدلته : ٦/ ١١٩و مجلة جالك.

ئەوەی کە واز دەهێنێت لە بەکار هێنانی مادده هۆشبەرەکان.

٣ـ بەهەدەرچونی سامانی گشتی بۆ دەزگا پەیوەندی دارەکان بە ڕوبەڕو بونەوەی مادده هۆشبەرەکان.

٤ـ بەهەدەرچونی سامانی گشتی بۆ ئەو دەزگا و ڕێکخراوانەی کە لە ڕێیانەوە هۆشیاری بڵاو دەکرێتەوە لەسەر زیانەکانی مادده هۆشبەرەکان.

٥ـ بەهەدەرچونی سامانی گشتی بۆ ئەو توێژینەوە و لێکۆڵینەوانەی کە تایبەتن بە دیاردە و بەکارهێنەران و زیانەکانی مادده هۆشبەرەکان ئەنجام دەدرێن.

٦ـ بەهەدەر چونی سامانی تاکە کەسی و گشتی لە بواری دادگاکانی تایبەت بە مادده هۆشبەرەکان، کە ئەو ماڵەش لە ڕێی کردنەوەی کەیسی تایبەت بە ئەم بابەتەو، دادوەری تایبەت و داواکاری گشتی پارێزەر و ....هتد بەهەدەر دەچێت.

٧ـ بەهەدەر چونی سامانی گشتی لە ڕێی تەرخان کردنی بودجەی تایبەت بۆ زیندانیانی مادده هۆشبەرەکان و زیندانە چاکسازیەکان، لە کاتێکدا کە ئێستا لە زۆرێك لە وڵاتانی دوونیا بەشێکی زۆری زیندانیەکان بریتین لە تاوانباران و سزادراوانی  ماددەی هۆشبەر.

٨ـ بەهەدەرچونی سامانی گشتی بۆ بەدەستهێنانی دەرمان و چارەسەری پێویست بۆ ئەو کەسانەی کە ئالودە بوون بە ماددەی هۆشبەرەوە.

جا ئەوانەی سەرەوە بەشێك لەو ڕێگایانە بوون کە لە ڕێیانەوەو بە هۆی مادده هۆشبەرو سڕکەرەکانەوە سامانی گشتی و تاکە کەسی بەهەدەر دەچێت، وە هەروەك گووتمان هەرچەندە ئامارێکی فەرمی لە کوردستان لەبەر دەستدا نیە، زیانی مادده هۆشبەرەکان بخەملێنیٚ، بەڵام لە بەشێك لە وڵاتان لە ڕێی هەندێك توێژینەوەوە بەشێك لە زیانە ئابوریەکانیان خەملاندووە، بۆ نموونە: دکتۆر وەلید ناجی حەییانی توێژینەوەیەکی لە وولاتی ئەردەن کردووە، بۆی دەرکەوتووە کە تەنها لە ساڵی ١٩٩٧دا مادده هۆشبەرەکان بڕی (١٢٣٩٤٥٩٥)دیناری ئەردەنی زیانی

ئابوری بە وولاّتی ئەردەن گەیاندووە. ئەم زیانانەش تەنها لە ڕێی کڕین و چارەسەر و دەزگا و ڕێکخراوەکانی ڕوبەڕو بونەوەی مادده هۆشبەرەکانەوە بەری کەوتووە.[1]

## حوکمی شەرعی بەکار هێنانی مادده هۆشبەرەکان

دیارە مادده هۆشبەرەکان لە سەدەی شەشەمی کۆچیەوە پەیدا بوون، لەبەر ئەوە زانایانی پێشینەی ئوممەت لە (هاوەڵان و شوێنکەوتوان و شوێنکەوتوی شوێن کەوتوان) قسەیان لێوە نەکردووە، بەڵام دوای پەیدابون ودەرکەوتنی زەرەدو زیانەکانی مادده هۆشبەرەکان، زانایان کۆدەنگن کە بەکارهێنانی ئەم مادده هۆشبەرانە حەرامە و نابێت مرۆڤ بەکاریان بهێنێت، ابن حجر لە کتێبی (الزواجر)دا دەفەرموێت: قرافی و ابن تەیمیە کۆدەنگی زانایان ـ إجماع ـ یان گواستۆتەوە کە حەشیش حەرامە، وە هەر کەسێك بە حەلاّلی بزانێت کافر دەبێت. حەشیشیش یەکێکە لە مادده هۆشبەرەکان، کەواتا بەکۆدەنگی زانایان بەکارهێنانی مادده هۆشبەرەکان حەرامە، جا زانایان بۆ حەرام کردنی مادده هۆشبەرەکان چەندین بەڵگەیان بە دەستەوەیە، ئەمانەی خوارەوە بەشێکن لە بەڵگەکانیان:

١ـ ئوم سەلەمە رضي الله عنها فەرمویەتی: (أن النبيﷺ نهى عن كل مسكر ومفتر)[2] واتا: پێغەمبەری خوداﷺ نکوڵی کردووە لە بەکارهێنانی هەموو سەرخۆشکەر و هۆشبەرێك.

٢ـ زانایان مادده هۆشبەرەکانیان لە ڕیزی مەی و خراپتر لە مەی ئەژمار کردووە، ابن حجری عەسقەلانی رحمه الله دەفەرموێت: (واستدل بمطلق قولهﷺ كُلُّ ما يُسكِرُ حَرامٌ،على تحريمِ المُسكرِ وَلو لم يكنْ شراباً فيدخل في ذلك الحشيشة)[3] واتا: ڕەهایی فەرموودەی پێغەمبەرﷺ کە

١ـ سايتى مقاتل من الصحراء

٢ـ پێشەوایان أحمد و ابو داود و بیهقی گێڕاویانەتەوە.

٣ـ فتح الباری: ١٠/ ٥٧

دەفەرموویت: هەموو سەرخۆشکەرێك حەرامە" بەڵگەیە لەسەر ئەوەی هەر شتێك سەرخۆشت بکات حەرامە، با ئەو سەرخۆشکەرە شلەمەنیش نەبێت، بەم پێیەش حەشیشیش دێتــە ناو ئەم حەرامانەوە، چونکە سەرخۆشکارە.

گەورەمان ابو موسای ئەشعەریﷺ دەفەرموویت: لە پێغەمبەری خوداﷺ پرسی و گووتم: ئەی پێغەمبەری خودا: (إِنَّ شَرَابًا يُصْنَعُ بِأَرْضِنَا يُقَالُ لَهُ الْمِزْرُ مِنْ الشَّعِيرِ ، وَشَرَابٌ يُقَالُ لَهُ الْبِتْعُ مِنْ الْعَسَلِ، فَقَالَ: (كُلُّ مُسْكِرٍ حَرَامٌ)[1] واتا: بەڕاستی لە لای ئێمە لە یەمەن خواردنەوەیەك دروست دەکرێت لە جۆ پێی دەگووترێت:(میزر) وە جۆرێکی تری خواردنەوە لە هەنگوین دروسدەکرێت پێی دەگوترێت: (بیتع) ئایا حوکمیان چیە؟ ئەویش فەرمووی: (هەر شتێك سەرخۆشت بکات ئەوە حەرام و قەدەغەیە.

جا لەم فەرموودەیەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت کە مەرج نیە کە مەی تەنها لە ترێ و جۆ دروست بکرێت وەك هەندێك وای بۆ دەچن، بەڵکو جگە لەمانەش هەر ماددەیەکی تر سەرخۆشت بکات ئەوە حەرامە، جا ئەو ماددەیە خواردنەوە و شلە مەنی بێت یان خواردن یان بۆن کردن، وە یان دوکەڵ، وە یان هەر شتێکی تر بێت، وە لە هەر ماددەیەکیش دروست بکرێت، چونکە پێشەوا عمرﷺ فەرموویەتی: (والخمرُ ما خامَرَ الْعَقْلَ)[2] واتا: مەی بە هەر شتێك دەگوترێت کە عەقڵ داپۆشێت و هۆش نەهێڵێت. وە بە پشتیوانی خودا دواتر لە باسی مەیدا باسی گەورەیی تاوانی مەی خواردنەوە دەکەین.

٣ـ بەکار هێنانی ماددە هۆشبەرەکان زیانی تەندروستی و ئابووریان هەیە بۆ خودی بەکار هێنەر وە بۆ کۆمەڵگاش بەگشتی، لە ئیسلامیشدا هەر شتێك زەرەد و زیانی هەبێت حەرامە،

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (لا ضَرَرَ وَلا ضِرارَ)[1] واتا: زیان بەکەس مەگەیەنە و زیانیش لەکەس قبوڵ مەکە.

٤ـ کڕینی ماددە هۆشبەرەکان" سەرف کردنی ماڵ و سامانە بۆ جگە لە سود و قازانج، ئەمەش لە شەرعدا پێی دەگوترێت ماڵ بەهەدەر دان ـ تبذیرـ خودای پەروەردگاریش ئەو کەسانەی بە برای شەیتان ئەژمار کردووە کە ماڵ و سامانیان بە هەدەر دەدەن: ﴿ولا تُبذّر تبذيرًا، إنّ المبذّرين كانوا إخوان الشّيطان﴾[2] واتا: ماڵ و سامان بە هەدەر مەدە، چونکە بەڕاستی ئەوانەی ماڵ و سامان بە هەدەر دەدەن وەك برای شەیتان وەهان، وە شەیتانیش لەبەرامبەر ناز و نیعمەتەکانی خودادا زۆر ناشکور و بێ ئەمەکە. وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (لا تزولُ قَدمَا عَبدٍ يَومَ القيامةِ حَتى يُسألَ عَنْ أربَعٍ: عَن عُمرهِ فيما أفناهُ، وَعَنْ شَبابِهِ فِيما أبلاهُ، وَعَنْ عِلمِه ما عَمِلَ فيهِ، وَعَنْ مالِهِ مِن أينَ اكتَسَبهُ وَفِيمَ أنفقَهُ)[3] واتا: هیچ بەندەیەك لە ڕۆژی قیامەتدا قاچەکانی ناجوڵێنێت هەتا دەربارەی چوار شت پرسیاری لێدەکرێت: یەکەم/ ئەو تەمەنەی خودا پێیدابوی لە چیدا سەرفت کرد؟ دووەم/ گەنجیت لە چیدا سەرف کرد؟ سێیەم/ ئەو زانستەی هەتبوو چیت پێکرد؟ چوارەم/ ئەو سەروەت و سامانەی هەتبوو چۆن و لە کوێت پەیدا کرد، وە لە چیدا سەرفت کرد؟

جا ئەی ئەو کەسەی ماددەی هۆشبەر بەکار دەهێنیت کاتێك خودای پەروەردگار پرسیاری لێکردی: ئەو تەمەنی خودا پێیدابوی لە چیدا سەرفت کرد؟ چی وەڵامی خودا دەدەیتەوە؟ ئایا لە ڕوت دێت بڵێیت: لە بێ ئاگای و بەکار هێنانی ماددەی هۆشبەر؟! وە ئەگەر لێـــی پرسی: ئایا

١ـ پێشەوایان احمد و ابن ماجە گێڕاویانەتەوە.

٢ـ الإسراو: ٢٦ـ ٢٧

٣ـ پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە و (حسن)

سەروەت و سامانەکەت لە چیدا سەرف کرد؟ تۆ چی وەڵام دەدەیتەوە؟ چۆن لە ڕوت دێت بڵێیت: خودایە ئەو سامانەی تۆ پێت دابوم بەکارم هێنا بۆ ئەوەی گەورەترین نیعمەتی تۆی پێ تێکبدەم کە عەقڵە!!

## حوکمی ئەو کەسەی ماددەی هۆشبەر بەکار دەهێنێت

زانایان جیاڕان دەربارەی حوکمی ئەو کەسەی ماددەی هۆشبەر بەکار دەهێنێت بەشێکیان دەفەرموون: حوکمی مەی خۆری هەیە، بەشێکی تریان دەفەرموون: تەمبێ ـ تعزیرـ دەکرێت، بەشێکی تریشیان دەفەرموون: دەکوژرێت، ئەمەی خوارەوەش ڕای زانایانە دەربارەی ئەم بابەتە:

ڕای یەکەم/ بەشێك لە زانایان دەفەرموون: هەر کەسێك ماددەی هۆشبەری بەکار هێنا" ئەوە حوکمی حوکمی مەی خۆرە، چونکە ماددەی هۆشبەریش وەکو مەی عەقڵی مرۆڤ لا دەدات، لەبەر ئەوە دەبێت ئەوکەسەی ماددەی هۆشبەر بەکار دەهێنێت چل داری لێبدرێت، ئەوەش ڕای زانایانی مەزهەبی شافعی یە.

ڕای دووەم/ بەشێکی تری زانایان دەفەرموون: هەر کەسێك ماددەی هۆشبەر بە بێ هیچ هۆیەکی شەرعی بەکار بهێنێت ـ وەك چارەسەر(تداوی)ـ ئەوە دەبێت تەمبێ ـ تعزیرـ بکرێت، جا ئەم تەمبێ کردنەش بە سەرزەنشت یان لێدان یان دەستگیر کردن یان ناو زڕاندن وە یان بە سزای دارایی دەدرێت.

ڕای سێهەم/ بەشێك لە شەرع زانانی مەزهەبی ابو حەنیفە و مالك دەفەرموون: دەکرێت تەمبێ کردنی ئەو کەسەی کە ماددەی هۆشبەر بەکار دەهێنێت بە کوشتن بێت، ئەمەش ئەگەر پێویستی کرد و حاکمیش بە مەصلەحەتی زانی.[1]

---

١ـ الفقه الإسلامي و أدلته: ٦/ ١٢٥

# هۆکارەکانی وازهێنان لە مادده هۆشبەرەکان

هەر کەسێك دەستی داوەتە مادده هۆشبەرەکان، وە یان ئالودە بووە پێیانەوە پێویستە لەسەری بۆ ئەوەی وازبێنێت لەم ماددانە ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکات.

١ـ ترس لە خودا و بیر کردنەوە لە گەورەیی تاوانی بەکار هێنانی ماددەی هۆشبەر و سزای قیامەت، ئێمە گوتمان کە زانایان مادده هۆشبەرەکانیان لە ریزی مەی و خراپتریش لە مەی نەژمار کردووە، خودای پەروەردگاریش دەربارەی مەی دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِنَّمَا الْخَمْرُ وَالْمَيْسِرُ وَالْأَنصَابُ وَالْأَزْلَامُ رِجْسٌ مِّنْ عَمَلِ الشَّيْطَانِ فَاجْتَنِبُوهُ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ﴾[1] واتا: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە بزانن و دڵنیا بن کە مەی و قومار و ئەو ماڵاتەی بۆ جگە لە خودا سەر دەبڕدرێن و پشکە کردن کارێکی پیسەو لە کردەوەی شەیتانن، لەبەر ئەوە خۆتانی لێبپارێزن بۆ ئەوەی سەر بەرز و سەرفراز بن لە هەردوك جیهاندا. وە پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (و مُدمِنُ الخَمرِ حقاً على الله أن يسقيَهُ نهرَ الخَبالِ، قيلَ يا رَسُولَ اللهِ وما نهرُ الخَبالِ؟ قال: صَديدُ أَهلِ النارِ)[2] واتا: خودای گەورە لەسەر خۆی پێویست کردووە ئەو کەسەی ئالودە بووە بە مەیەوە لە ڕوباری(خبال)ی بداتێ لە دۆزەخدا، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ڕوباری (خەبال) چیە؟ فەرمووی: کێم و زوخاوی خەڵکی دۆزەخە!!

٢ـ پێویستە ئەو کەسەی ماددەی هۆشبەر بەکار دەهێنێت بەردەوام بیر بکاتەوە لە زیانە تەندروستی و کۆمەڵایەتی و ئابوریەکانی ئەو ماددانە.

٣ـ پێویستە بەکارهێنەری مادده هۆشبەرەکان بزانێت کە ماددەی هۆشبەر دەردە نەوەکو دەرمان، بەشێوەیەك کێشەکانی ژیانی زیاتر دەکات نەوەکو چارەسەریانی بکات.

---

١ـ المائدة: ٩٠

٢ـ پێشەوا طبرانی گێراویەتەوە.

٤ـ پێویستە مرۆڤی گیرۆدە بەم ماددانەوە هیممەتی بەرز بێت، قەناعەت بەخۆی بکات کە دەتوانێت ئەم دۆخە تێبپەڕێنێت، چونکە هیچ شتێك لە هیممەتی مرۆڤ گەورەتر نیە.

٥ـ بەکارهێنەری چارەسەری پزشکی پێویست بۆ ڕزگار بوون لەم ماددانە.

٦ـ پێویستە مرۆڤی ئالودە خۆی دابڕێت لە و برادەرانەی کە لە ڕێیانەوە فێری بەکارهێنانی ئەم ماددانە بووە، وە یاخود لەگەڵیاندا بەکاری هێناون، وەهەروەك چۆن پێویستە خۆی دابڕێت لەو جێگایانەی کە لێیانەوە ئەو ماددانەی بەدەست کەوتوون، وە یاخود تێیاندا بەکاری هێناون.

٧ـ پێویستە کاتە بەتاڵەکانی بە خواپەرستی یان کارێك بەسەر بەرێت، چونکە کاتی بەتاڵ یارمەتی دەرە بۆ فێر بوونی چەندان کار و خوی خراپ.

٨ـ دروست کردنەوەی متمانە لە نێوان خۆی دۆست و خۆشەویستە دڵسۆزەکانی، بە تایبەت ماڵ و خێزانی و قەرەبو کردنەوەی کاتە بەفیڕۆچوەکانی بۆ ماڵ و خێزان و منداڵەکانی.[1]

وصلی الله علی سیدنا محمد وعلی آله وصحبه وسلم



١ـ سایتی الوحدە بە دەستکاری و لێ زیادکردنەوە.

# ١٠/٥ ڕۆژی

# جیهانی مامۆستایان

خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾

# ١٠/٥ ڕۆژی جیهانی مامۆستایان

ساڵانە لە ڕۆژی ١٠/٥دا لە بەشێك لە وولاّتانی جیهان مامۆستایان ئاهەنگ دەگێڕن بە بۆنەی ڕۆژی جیهانی مامۆستایانەوە، جا ئەم ڕۆژە بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٩٤ز دا یادی کرایەوە، دوای ئەو مێژووە زۆر بە خێرایی ڕۆژی جیهانی مامۆستایان بە جیهاندا بلاّو بویەوە، بەشێوەیەك ئێستا زیاتر لە سەد وولاّتی جیهان ساڵانە و لە ڕۆژی ١٠/٥دا یادی ڕۆژی جیهانی مامۆستایان دەکاتەوە، وەهەر ساڵە و لە ژێر دروشمێکدا یادی ئەم ڕۆژە دەکرێتەوە، بۆ نمونە لە ساڵی ٢٠١٢ز دا لە ژێر دروشمی (دەی با هەمومان پشتیوانی مامۆستایان بین) وە لە ساڵی ٢٠١٣ز دا لە ژێر دروشمی: (بانگەوازێك لە پێناوی مامۆستایاندا) یادی ئەم ڕۆژە کرایەوە، وە جێگای ئاماژەیە ڕێکخراوی (إدیوکشن إنترناشونال) دەورێکی بالاّی هەبوو لە بلاّو کردنەوەی ئەم یادە بۆ زۆرێك لە وولاّتانی جیهان، وە لەم ڕۆژەدا ڕێکخراوی جیهانی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ پەروەردە و زانست و ڕۆشنبیری(یونسکۆ) بە هەماهەنگی لەگەڵ ڕێکخراوەکانی: (کاری نێودەوڵەتی و بەرنامەی گەشەپێدانی سەر بە نەتەوە یەکگرتووەکان و ڕێکحراوی نەتەوە یەکگرتووەکان بۆ کارو باری منداڵ ـ یونسیف ـ و یەکیەتی مامۆستایانی جیهانی) چەندین کار و چالاکی و کۆڕ و سیمینار و ئاهەنگ ساز دەکەن لە زۆرێك لە وولاّتانی جیهان دا، وە لەم کارو چالاك و کۆڕ و سیمنارانەدا پشتیوانی خۆیان بۆ مامۆستایان دوپات دەکەنەوە و باس لە کەم و کوڕیەکانی بواری پەروەردە و فێر کردن دەکەن، وە هەنگاوەکان بەرەو بەدەستخستنی پەروەردەو فێرکردنێکی هاو چەرخ دەخەنە ڕوو لەگەڵ چەندین کارو چالاکی تردا.[1]

# حوکمی شەرعی ئەو جەژنە

پێشتر لە باسی حوکمی جەژن و یاد و بۆنە جیهانیەکان باسمان کرد و گوتمان: زانایان دەربارەی

١ـ پێگەی منظمة الأمم المتحدة للتربیة والعلم والثقافة (یونسکۆ)

ئەو جەژن و یاد و بۆنانەی کە جیهانین و تایبەت نین بە کافرانەوە جیاڕان، بەشێکیان ڕێگایان پێداوە، بەڵام بەو مەرجەی موسڵمانان لە کاتی یادکردنەوەیاندا خۆیان لە کار و کردەوە و شتە ناپەسەندەکان بپارێزن، وە بەشێکی تر لە زانایان بە شێوەیەکی یەکجاری ڕێگری یادکردنەوەیان دەکرد و بە کارێکی قەدەغە ـ حەرامیان دەزانی، جەژنی مامۆستایانیش بە هەمان شێوە: لیژنەی بەردەوامی فتوای سعودی لە فتوای ژمارە(٢١٦٠٩)دا و زانایانی سعودیە و خەلیج یادکردنەوەی بە کارێکی حەرام دادەنێن، لە بەرامبەریشدا زانایانی ئەزهەر و چەند زانایایەکی تری سەردەم دەفەرموون: ئەم جەژن و یادانە لە چوارچێوە نەریتەکاندان و یاد کردنەوەیان قەدەغە نیە.

## ڕێز و گەورەیی مامۆستا لە ئیسلامدا

ئاینی پیرۆزی ئیسلام زۆر ڕێزی تایبەتی لە مامۆستا ناوە و پلەی تایبەتی پێداوە، بە شێوەیەك پلە و پایەی مامۆستا و زانای خستۆتە سەروی هەموو مرۆڤەکانەوە، ئەمانەی خوارەوەش چەند تایبەتمەندی و ڕێزکی مامۆستایە کە لە قورئان و سوننەتدا باس کراون:

١ـ مامۆستایان بە چەند پلەیەك لەسەروی باوەڕدارانەوەن. خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾[1] واتا: خودای پەروەردگار لە ناو ئێوەدا باوەڕدارانی بەرز کردوتەوە، وە لە ناو باوەڕدارانیشدا ئەوکەسانەی خاوەنی زانستن چەند پلەیەك بەرزتری کردونەوە. ابن مسعود رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ دەفەرمووێت: ئەم ئایەتە مەدحی خودایە بۆ زانایان.وە پێشەوا قرگبی دەفەرمووێت: (أی فی الثوابِ في الآخرة و في الكرامةِ في الدنيا)[2] واتا: زانایان لە قیامەتدا پاداشتیان زیاترە، وە لەدونیاشدا ڕێزیان زیاترە.

١ـ المجادلة: ١١

٢ـ الجامع الأحكام، تفسير القرطبي: ٢٥٣/١٧

٢ـ زانا و نه‌زان له‌ لای خودای گه‌وره‌ یه‌كسان نین. خودای گه‌وره‌ ده‌فه‌رمووێت: ﴿قُلْ هَلْ يَسْتَوِي الَّذِينَ يَعْلَمُونَ وَالَّذِينَ لَا يَعْلَمُونَ﴾[1] واتا: ئه‌ی پێغه‌مبه‌رﷺ پێیان بڵێ: ئایا مرۆڤی زانا و مرۆڤی نه‌زان وه‌كو یه‌كه‌؟ لێره‌دا ئه‌م پرسیاره‌ پێی ده‌گوترێت: پرسیاری نكوڵی (إستفهام الإنكار) به‌واتای: بێگومان یه‌كسان و وه‌كوو یه‌ك نین زانایان پاداشتیان زیاتره‌ و پله‌یان به‌رزتره‌!!

٣ـ خودای گه‌وره‌ سۆزی خۆ ده‌بارێنێت بۆ مامۆستایان! وه‌ فریشته‌كان و هه‌رچی له‌سه‌ر زه‌وی و له‌ ئاسمانه‌كان و له‌ ناو ده‌ریاكاندایه‌ دووعای خێر بۆ زانا و مامۆستایان ده‌كه‌ن!.گه‌وره‌مان ابی ئومامه‌ی باهیلیرَضِيَ اللهُ عَنْهُده‌فه‌رمووێت: باسی دوو پیاویان كرد لای پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ یه‌كێكیان خودا په‌رست ـ عابد ـ ئه‌وی تریان زانا ـ عالم ـ پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رمووی: (فَضْلُ الْعَالِمِ عَلَى الْعَابِدِ كَفَضْلِي عَلَى أَدْنَاكُمْ ثُمَّ قَالَ رَسُولُ اللَّهِﷺ إِنَّ اللَّهَ وَمَلَائِكَتَهُ وَأَهْلَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرَضِينَ حَتَّى النَّمْلَـةَ فِي جُحْرِهَا وَحَتَّى الْحُوتَ لَيُصَلُّونَ عَلَى مُعَلِّمِ النَّاسِ الْخَيْرَ)[2]واتا: رێز و گه‌وره‌یی زانا به‌سه‌ر خودا په‌رستدا" وه‌ كو رێزی من وایه‌ به‌سه‌ر نزمترین كه‌ستاندا، پاشان پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رمووی: به‌ڕاستی خودای گه‌وره‌ و فریشته‌كان و خه‌ڵكی حه‌وت ئاسمانه‌كان و حه‌وت ته‌به‌قه‌ی زه‌وی، وه‌ هه‌تا مێرو له‌ كونه‌كه‌یدا، وه‌ نه‌هه‌نگ له‌ ده‌ریادا دووعا ده‌كه‌ن بۆ ئه‌وكه‌سه‌ی كه‌ مامۆستایه‌ و چاكه‌ فێری خه‌ڵكی ده‌كات.

٣ـ زانایان و مامۆستایان میراتگری پێغه‌مبه‌رانن. پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رموویه‌تی: (وإنَّ العالِمَ لَيَستَغفِرُ لَهُ مَنْ في السَّماواتِ وَمَنْ في الأَرضِ وَالحِيتانُ في جَوفِ الماءِ وَإنَّ فَضلَ الْعالِمِ على العابِدِ كَفضلِ القَمَرِ لَيلةَ الْبَدرِ على سائِرِ الْكَواكِبِ وَإنَّ الْعُلَماءَ وَرَثَةُ الأنبياءِ وَإنَّ الأَنبياءَ لَمْ يُوَرِّثُوا دِيناراً وَلا دِرهَماً وَرَّثُوا الْعِلمَ.فَمَنْ أَخَذَهُ أَخَذَ بِحَظٍ وافِرٍ)[3]واتـــا: به‌ڕاستی هـــه‌رچی لــــه‌

---

١ـ الزمر: ٩

٢ـ پێشه‌وا ترمذی گێڕاویه‌تەوه‌ و ده‌فه‌رمووێت: (هَذَا حَدِيثٌ حَسَنٌ غَرِيبٌ صَحِيحٌ)

١ـ پێشه‌وا ابو داود گێڕاویه‌تەوه‌.

ئاسمانەکان و زەویدا هەیە، وە نەهەنگ لە دەریادا، دووعا دەکەن بۆ مرۆڤی زانا، وە رێز و گەورەیی زانا بەسەر خواپەرستدا وەکو گەورەیی مانگ لە شەوی چواردەدا وەهایە بەسەر ئەستێرەکانی تردا، وە بێگومان زانایان میراتگری پێغەمبەرانن، چونکە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام دینار و درهەمیان بە میرات بەجێ نەهێشتووە" بەڵکو زانست و زانیاریان بە میرات بەجێهێشتووە، جا هەر کەسێك زانست و زانیاری بەدەستبهێنێت" ئەوە بەشێکی باشی بەرکەوتووە.

٤ـ پاداشتی مامۆستا بە مردنی کۆتایی نایەت"بەڵکو بەهۆی ئەو زانستەی کە فێری خەڵکی کردووە بەردەوام لە ناو گۆڕەکەیدا خێری بۆ دەچێت، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إذا ماتَ ابنُ آدمَ انقَطَعَ عَمَلُهُ إلا مِن ثَلاثٍ: ...أو عِلمٌ يُنتَفَعُ بهِ...)[1] واتا: کاتێك ئادەمیزادێك دەمرێت کردەوەکانی بلۆك دەکرێن و هیچ خێرێکی بۆ نوێ نابێتەوە تەنها سێ کەس نەبێت:.... یەکێك لەوانە: مامۆستایەك کە خەڵکی فێری زانست و زانیاری کردووە... ئەوە بەردەوام بەهۆی قوتابیەکانیەوە خێری بۆ دەچێت.

٥ـ مامۆستا کێڵگەی دوونیای بە باشترین شێوە خستۆتە خزمەتی قیامەت و بەهۆیەوە بەرزترین پلە لای خودای پەروەردگار بەدەست دەهێنێت. ابی کەبشەرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إنَّمَا الدُّنيا لأَربَعَةِ نَفَرٍ، عَبْدٌ رَزَقَهُ اللهُ مالاً وَ عِلماً فَهُوَ يَتَّقِي فِي مالِه رَبَّهُ وَيَصِلُ فِيهِ رَحِمَه، وَيُعَلِّمُ لِلهِ فِيه حَقَّه، فَهذا بِأَحسنِ المَنازِلِ عِندَ اللهِ جَلَّ وَعَلا...)[2] واتا: بەڕاستی دوونیا تەنها بۆ چوار کەس واتای هەیە، یەکێك لەوانە: بەندەیەك خودای پەروەردگار ماڵ و دارایی و زانستی پێبدات، ئەویش لە خودا بترسێت و بە ماڵ و

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان احمد و ترمذی گێڕاویانەتەوە.

داراییەکەی خێرو چاکە بکات و یارمەتی خزم و دۆست و فەقیران بدات، وە بەزانست و زانیاریەکەشی لە پێناوی خودادا خەڵکی فێر بکات" ئائەو کەسە باشترین پلەو پایەی هەیە لای خودای گەورەو باڵا دەست...

٦ـ وانە گوتنەوە و فێرکردنی خەڵکی بە زانست خێر و چاکەیە و لە عیبادەت گەورەترە. پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (تَعَلموا الْعِلْمَ"فَإِنَّ تَعَلُّمَهُ لِلهِ خَشيةٌ،وَطَلَبُهُ عِبادَةٌ، وَمُذاكَرَتُهُ تَسبيحٌ، وَالبَحثُ عَنهُ جِهادٌ، وتَعلِيمَهُ لِمَنْ لا يَعلَمُهُ صَدَقَةٌ)[1]واتا: فێری زانست و زانیاری بن، چونکە فێربوونی ترسی خودا زیاد دەکات، وە داواکردنی خواپەرستی یە، وە یادکردنەوە و گوتنەوەی تەسبیحاتە، وە بە دوادا گەڕانی جیهاد و تێکۆشانە،وە فێرکردنی کەسێك کە نایزانێت خێر و چاکە و بەخشینە. وە ابن عباسرَضِيَ اللهُ عَنهُ لە پێغەمبەری خوداوەﷺبۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (إنَّ طَلَبَ الْعِلمِ ساعة خَيرٌ مِنْ قِيامِ لَيلةٍ، وَطَلَبَ الْعِلمِ يوماً خَيرٌ مِنْ صِيامِ ثَلاثةِ أَشهُرٍ)[2]واتا: بەڕاستی داواکردنی کاتژمێرێکی زانست و زانیاری خێری زیاترە لە عیبادەتی شەوێکی تەواو، وە داواکردنی ڕۆژێکی زانست و زانیاری خێری زیاترە لە سی مانگ بە ڕۆژ و بون.

جا ئەمانەی ڕابران چەند ئایەت و فەرموودەیەك بوون دەربارەی گەورەیی و ڕێزی مامۆستا، ئێستاش دەچینە سەر باسی ماف و ئەرکەکانی مامۆستا لە ئیسلامدا.

## مافەکانی مامۆستا لە ئیسلامدا

پێشەوا علی کوڕی ابی طالبرَضِيَ اللهُ عَنهُ لە فەرموودەیەکدا چەند مافێکی مامۆستای باس کردووە و دەفەرموێت: (مِنْ حَقِّ الْعالِمِ عَلَيكَ أَنْ لا تُكثِرَ عَلَيهِ السُّؤالَ وَلاتُفشِينَ لَهُ سِراً وَلا

١ـ پێشەوایان دەیلەمی و ابن عبدالبر گێڕاویانەتەوە، وە ابن عبدالبر دەفەرموێت: (حدیث حسن)

٢ـ ئەم فەرموودە لە مسندی (فردوس)دا باس کراوە.

تَغتابِنَ عِندَهُ أَحَداً ولاتَطلُبَنَ عَثرَتَهُ وَإِنْ ذَلَّ قَبِلتَ مَعذِرَتَهُ وعَليكَ أَنْ تُوَقِّرَهُ وَتَعظِمَهُ لِلهِ مادامَ يَحفِظُ أَمرَ اللهِ ولاتَجلِسَنَّ أَمامَهُ وَإنْ كانَتْ لَهُ حاجةٌ سَبقتَ الْقَومَ)واتا: بەشێك لە مافەكانی زانا بریتین لەوانە: زۆر پرسیاری لێمەكە بە تایبەت پرسیاری بێكەڵك، نهێنیەكانی ئاشكرا مەكە، لە لای ئەو باسی هیچ كەسێك مەكە، وە حەز مەكە هەرگیز تێبكەوێت، وە كاتێك تێكەوت و توشی نەكسەیەك بوو پوزشی قبوڵ بكە، وە پێویستە رێزی بگریت و بە گەورە سەیری بكەی مادام ئەو سنورەكانی خودا دەپارێزێت، وە هەرگیز لە پێشی دامەنیشە، وە هەر كات پێویستیەكی هەبوو هەوڵبدە لە پێش هەموو كەسێكدا بۆی جێبەجێ بكەیت.

ئەمانەی سەرەوە بەشێك بوون لە مافانەی كە فەرمانڕەوای باوەڕداران علی كوڕی طالب ﷺ ئاماژەی پێكردوون ئێمەش بەشێك لەو مافانە باس دەكەین:

١ـ پێویستە لەكاتی هەڵسوكەوت كردن لەگەڵ مامۆستادا ڕەچاوی پێگە و پلەو پایەكەی بكرێت، پاشان پێویستە هەموو ماف و ئیمتیازاتەكانی بەپێی ئەو پلەو پایەی بێت كە هەیەتی، پێشتریش گەورەمان خودای پەروەردگار پلە و پایەی مامۆستای لە سەروی باوەڕدارانەوە داناوە: ﴿يَرْفَعِ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنكُمْ وَالَّذِينَ أُوتُوا الْعِلْمَ دَرَجَاتٍ﴾[1]كەواتا پێویستە لە هەموو كات و ساتێكدا ڕەچاوی ئەو پێگەیەی مامۆستایان بكرێت، چ لە لایەن خوێندكار و كەس و كاریەوە، وە چ لە لایەن كۆمەڵگاو دەسەڵاتەوە، چونكە هەموو كۆمەڵگا بە جیاوازی پلە و پایەیان هەموویان قەرزداری مامۆستان!!

٢ـ ڕێز گرتن لە مامۆستا: گەورەمان خودای پەروەردگار ڕێزی تایبەتی لە مامۆستا ناوە و چەند پلەیەك بەرزی كردوتەوە بەسەر باقی بڕواداراندا، وە پێغەمبەری خوداش ﷺ زۆر بەڕێـــز

١ـ المجادلە: ١١

بووە لەگەڵ مامۆستاکەیدا جوبرائیل، بەشێوەیەك خاتوو عائیشەی دایکی باوەڕداران رضي الله عنها دەفەرمووێت: (وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ ، وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا)[1] واتا: پێغەمبەری خودامﷺ بینی لە ڕۆژێکی زۆر سارددا سروشی بۆ دەهات، کاتێك سروشەکە تەواو دەبوو، دەمبینی ناو چاوانی عەرەقی کردبوو، وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (تَعَلَّمُوا الْعِلمَ وَتَعَلَّمُوا لِلعِلمِ السَّكِينَةَ وَالوِقارَ وَتَواضَعُوا لِمَنْ تَعَلَّمُونَ مِنهُ)[2] واتا: فێری زانست و زانیاری بن، وە لەگەڵ زانستیش دا فێری لەسەر خۆیی و شکۆ بن، وە بەڕێز بن و مل کەچ بن بۆ ئەو کەسانەی کە لێیانەوە فێر دەبن.

وە زانایان و پیاوە چاکەکانی ئوممەتیش سوننەتی خودا و پێغەمبەرەکەیانﷺ بە جوانترین شێوە جێبەجێ کردووەو زۆر بەڕێز بوون لەگەڵ مامۆستاکانیاندا، بۆ نمونە: پێشەوا شافعی رحمه الله دەفەرمووێت: (كُنتُ أَتَصَفَّحُ الْوَرَقَ بَيْنَ يَدَي مالِك رَحِمَهُ اللهُ صَفحاً رَقِيقاً هَيبَةً لَهُ لِئَلَّا يَسْمَعُ وَقْعَها)[3] واتا: من لەبەر دەمی مامۆستاکەم پێشەوا مالکدا رحمه الله پەڕی کتێبەکەم زۆر بە نەرمی هەڵدەدایەوە" نەوەکو دەنگی پەڕەکان ئازاری بدات!! وە پێشـــەوا ڕەبیع رحمه الله دەفەرمووێت: ( واللهِ ما اجْتَرَأتُ أَنْ أَشرَبَ الْماءَ والشَّافِعِيُّ يَنْظُرُ هَيبَةً لَهُ)[4] واتا: سوێند بە خودا هەرگیز زاتی ئەوەم نەکردووە کە ئاو لەبەر چاوی شافعی بخۆمەوە، ئەوەندە شەرمم لێیکردووە.

عەمماری کوڕی ابی عەممار دەفەرمووێت: (أَنَّ زيدَ بنَ ثابت رَكِبَ يَوْمًا ، فَأَخَذَ ابْنُ عَبَّاسٍ بِرِكَابِهِ، فَقَالَ: تَنَحَّ يَـــا ابْنَ عَمِّ رَسُولِ اللَّهِ ﷺ فَقَالَ: هَكَذَا أُمِرْنَا أَنْ نَفْعَلَ بِعُلَمَائِنَا وَكُبَرَائِنَا

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوا طبرانی گێڕاویەتەوە.

٣ـ محمد منير سعد الدين ، المدرسة الإسلامية: ١٤٥

٤ـ محمد منير سعد الدين ، المدرسة الإسلامية: ١٤٥

**فَقَالَ زَيْدٌ : أَرِنِي يَدَكَ" فَأَخْرَجَ يَدَهُ فَقَبَّلَهَا، فَقَالَ: هَكَذَا أُمِرْنَا أَنْ نَفْعَلَ بِأَهْلِ بَيْتِ نَبِيِّنَا ﷺ)[1]**

واتا: ڕۆژێکیان زەیدی کوڕی ثابت ویستی سواری ئەسپەکەی ببێت، ابن عەبباس رضي الله عنهما ڕێشمەی وولاخەکەی بۆ گرت و دەستی بۆ ڕاگرت بۆ ئەوەی بەسەریدا سەر بکەوێت، زەید رضي الله عنه فەرمووی: دەست لادە ئەی ئامۆزای پێغەمبەری خودا ﷺ، ئەویش فەرمووی: نەخێر" ئێمە فەرمانمان پێکراوە ئاوا بین لەگەڵ زاناکانماندا، زەیدیش فەرمووی: دەستتم بدەرێ، ابن عباسیش رضي الله عنهما دەستی هێنایە پێش، زەید دەستی ابن عەبباسی ماچ کردو فەرمووی: ئێمەش فەرمانمان پێکراوە ئاوا بین لەگەڵ بنەماڵەی پێغەمبەردا ﷺ.

پێشەوا کسائی رحمه الله مامۆستای هەردوو کوڕەکەی ئەمیری باوەڕداران هارونە ڕەشید (ئەمین و مەئمون) بوو، ڕۆژێکیان دوای تەواو بوونی دەرس هەردووك کوڕەکەی پێشبڕێکیان کرد بۆ ئەوەی پێڵاوەکانی بۆ دابنێن و لەسەر دانانی پێڵاوەکانی کێشەیان تێکەوت، دواتر لەسەر ئەوە ڕێککەوتن کە هەر یەکەیان تاکە پێڵاوێکی بۆ دابنێن، دواتر هەواڵەکە گەیشتــەوە بە هارونە ڕەشید، ئەویش بانگی پێشەوا کەسائی کردو فەرمووی: کێ لە هەموو کەس ڕێزدار ترە، پێشەوا کەسائیش فەرمووی: نەم بیستووە کەس لە ئەمیری باوەڕداران ڕێزدار تر بێت، ڕەشیدیش گووتی: بەڵێ ئەو کەسە لە ئەمیری باوەڕداران بەڕێزترە کە کاتێك لە دانیشتگایەك هەڵدەستێت هەردووك کوڕەکەی ئەمیری باوەڕداران شەڕ دەکەن لەسەر ئەوەی پێڵاوەکانی بۆ دابنێن، دواتر لەسەر ئەوە ڕێك دەکەون کە هەر یەکەی تاکێکی بۆ دابنێن!! پێشەوا کەسائی وای زانی کە هارونە ڕەشید ئەم کارەی پێناخۆش بووە، لەبەر ئەوە پۆزشی هێنایەوە، ڕەشــــید گووتی: ئەگەر ڕێگریان بکەی لەم کارە ئەوە لۆمەت دەکەم، چونکە ئەم کارەیان ڕێزیان زیاد دەکات.

---

١ـ پێشەوا مالك لە (موطأ)دا گێڕاویەتەوە.

جا پێویستە هەموو کەسێك لە هەر پلە و پایەیەك دابێت ڕێزی مامۆستا بگرێت، چونکە مرۆڤ هەر چەندە زانا بێت، وە هەرچەندە دانا بێت وە چەند پلە و پایەی هەبێت"هێشتا ڕۆژگارێك هەبووە کە قوتابی مامۆستا بووە!!

٣ـ هەرگیز نابێت دڵخۆش بیت بە دۆڕان وخلیسکانی مامۆستاکەت،وە هەرکاتێك خلیسکاو تێکەوت" پێویستە پۆزشی قبوڵ بکەیت و بەرگری لێبکەیت: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَنْ ذَبَّ عن عرضِ أخيهِ بالغيبةِ، كان حقاً على اللهِ أنْ يَعتِقهُ مِنَ النار)[1] واتا: هەر موسڵمانێك پشتەملە بەرگری لە کەسایەتی برایەکی موسڵمانی بکات" ئەوە پێویستە لەسەر خودای گەورە کە لە ئاگری دۆزەخ ڕزگاری بکات.

٤ـ پێویستە موسڵمانان بە گشتی و قوتابیان بە تایبەتی بەردەوام گومانی چاك بە مامۆستایان و زانایان بەرن. پێغەمبەری خوداﷺدەفەرمووێت: لە شەوی میعراجدا کۆمەڵێـــك خەڵکم بینی نینۆکی درێژیان هەبوو، بەو نینۆکە درێژانە دەم و چاو و سینگی خۆیان دەڕوشـاند و برینداریان دەکردن، منیش گووتم: ئەی جوبرائیل ئەوانە کێن؟ ئەویش فەرمووی: (هؤلاءِ الذين يَاكلونَ لُحومَ الناسِ، و يقعونَ في أعراضِيهم)[2]واتا: ئەوانە ئەو کەسانەن کەوا گۆشتی خەڵکی دەخۆن و باسی کەسایەتی و ناموسیان دەکەن.

جا بە تایبەت خواردنی گۆشتی مامۆستایان و زانانیان و باس کردنیان زۆر ترسناکە، چونکە هەروەك حافظی دیمەشقی رحمه الله فەرموویەتی: گۆشتی زانایان ژەهراویە،[3] هەر کەسێکیش گۆشتی ژەهراوی بخوات مەترسی لەسەر تەندروستی توشدەبێت، بەواتای: هەر کەسێك پشتەملە باسی زانایان بکات و دوژمنایەتیان بکات ئەوە کێشە لە باوەڕ و عەقیدەیدا دروست دەبێت.

---

١ـ پێشەوا طبرانی بە سەنەدێکی(صحیح) گێڕاویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان ابوداود و بیهقی بە سەنەدێکی(صحیح) گێڕاویانەتەوە.

٣ـ تبيين الكذب المفترى: ٢٩ـ ٣٠

وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ تعالى قال: مَنْ عادى لِي وَلياً فَقَدْ آذَنْتُهُ بِالْحَرْبِ)[1] واتا: خودای پەروەردگار فەرموویەتی: هەر كەسێك دوژمنایەتی دۆستێكی من بكات" ئەوە من شەڕی لەگەڵ ڕادەگەیەنم، ابو حەنیفە رحە الله دەفەموێت: (إنْ لم يَكُنِ العلماءُ أولياءُ اللهِ" فليس لله وليّ)[2] واتا: ئەگەر زانایان دۆستی خودا نەبن" ئەوە خودای گەورە هیچ دۆستێكی نیە. كەواتا: هەر كەسێك بەهەر شتێك دژایەتی و ڕكابەری زانایان و مامۆستایان بكات" ئەوە دوژمنایەتی خودای ڕاگەیاندووە.خودا بمانپارێزێت.

٥ـ نابێت بە هیچ شێوەیەك پرسیاری بێكەڵك لە مامۆستا بكرێت، وە پێویستە پرسیاری پێویستیش لە كاتی گونجاو و بەشێوەكی جوان ئاڕاستەی مامۆستا بكرێت: خودای پەروەردگار نكوڵی كردووە لە پرسیاری بێكەڵك و دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَسْأَلُوا عَنْ أَشْيَاءَ إِن تُبْدَ لَكُمْ تَسُؤْكُمْ﴾[3] واتا: ئەی ئەو كەسانەی باوەڕتان هێناوە پرسیار دەربارەی شتێك مەكەن ئەگەر بۆتان دەر بكەوێت لەسەرتان گران بێت و سەغڵەتتان بكات. وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ كَرِهَ لَكُم ثَلاثاً قِيلَ وقالَ وَكَثْرةَ السُّؤالِ وإضاعَةَ الْمالِ)[4] واتا: بێگومان خودای پەروەردگار ڕق و كینەی لە سێ شت دەبێتەوە: گوتیان و دەڵێن، زۆر پرسیار كردن، وە ماڵ بە هەدەر دان.

٦ـ پێویستە لەسەر حكومەت و كاربەدەستی موسڵمانان بژێوی ژیان و هەموو پێداویستیەكانی تری مامۆستایان دابین بكات، بۆ ئەوەی مامۆستایان یەكلا ببنەوە بۆ گەیاندنی پەیامی زانست و زانیاری و تێگەیاندن و پێگەیاندنی ڕۆڵەكانی كۆمەڵگا، ئەمەش لە ئیسلامدا مافێكی سەرەتایی و ڕەوایە و بە مامۆستایان دراوە. پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (أحقُّ ما أَخذتُم علَيهِ أجراً، كِتابَ اللهِ)[5] واتا: باشترین شت كە كرێی لەسەر وەردەگرن" وەرگرتنی

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

٢ـ تبصرة الأنام بالحقوق في الإسلام: ٤٠٦

٣ـ المائدة: ١٠١

٤ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٥ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

کرێیە لەسەر فێر کردنی کیتابی خودا، وە وەضیتی کوڕی عطاء رحمه الله دەفەرمووێت: (كانَ بالمدينةِ ثلاثةُ مُعَلِّمينَ يُعَلِّمُونَ الصِّبيانَ، فكانَ عمرُ بن الخطاب يَرزُق كلَّ واحدٍ مِنهُم خَمسةَ عشَرَ كلَّ شهرٍ)[1] واتا: لە مەدینەدا سێ مامۆستا هەبوون منداڵەکانیان فێری خوێندەواری دەکرد، پێشەوا عمر موچەی بۆ بڕیبونەوە و مانگانە یەکی پازدە دیناری دەدانێ.

جا ئەمانەی ڕابران بەشێك بوون لە مافەکانی مامۆستا لەسەر قوتابی و کۆمەڵگا و کار بەدەستی وولات ئێستاش دەچینە سەر باسی ئەرکەکانی مامۆستا.

## ئەرکەکانی مامۆستا

هەروەك پێشتریش گوتمان ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی ئەرك و مافە، کاتێك ماف هەیە ئەگەر ئەرکەکانی خۆت جێبەجێ کردن، جا ئەو مافانەی سەرەوە بۆ مامۆستایەکە ئەو ئەرکانەی خوارەوە جێبەجێ بکات:

١ـ دڵسۆزی و نیەت پاکی: پێویستە لەسەر مامۆستایان بە دڵسۆزی و نیەت پاکیەوە کارەکەیان جێبەجێ بکەن بۆ ئەوەی لە لایەن خوداوە پاداشتیان بۆ بنوسرێت و لەلایەن خەڵکیشەوە سوپاس بکرێن و کارەکەشیان بە باشی ڕاپەڕیت،پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (إنَّما الْأعمالُ بالنِّيَّاتِ)[2] واتا: بنچینەی گیرا بونی هەر کارێك نیەت و مەبەستی دڵە. وە جابری کوڕی عبدالله رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (العِلمُ عِلْمانِ، عِلمٌ في الْقَلبِ فَذاكَ الْعِلمُ النّافع، وَعِلمٌ على الْلسانِ فَذاكَ حُجَّةُ اللهِ عَلى ابنِ آدَمَ)[3] واتــا: زاست دوو جۆرە: یەکێکیــان ئــەو زانستەیە کە لە دڵدایەو لە دڵیش دێتە دەرەوە"

١ـ پێشەوا ابن ابی شیبة گێراویەتەوە.

٢ـ پێشەوایان بوخاری ومسلم گێراویانەتەوە.

٣ـ پێشەوا دارمی گێراویەتەوە.

ئەوە زانستی سود بەخشە، وە دووەمیان ئەو زانستەیە كە لەسەر زمانە و لە زمانیش دێتە دەرەوە" ئەوەشیان بەڵگە خودایە بەسەر بەندەكانیەوە.

٢ـ پێویستە لەسەر مامۆستا ئەركی سەر شانی بە باشترین شێوە ئەنجام بدات و دەرونی خۆی ئاسودە بكات بەرامبەر پیشەكەی: پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (إنَّ اللهَ يُحِبُ إذا عَمِلَ أحَدُكُم عَمَلاً أنْ يُتقِنَهُ)[1] واتا: خودای گەورە پێیخۆشە هەر یەكێك لە ئێوە كارێكی كرد" بە باشترین شێوە ئەنجامی بدات.

٣ـ پێویستە لەسەر مامۆستا بە ئەندازەی تێگەیشتویی و هۆشیاری و ڕۆشنبیری قوتابیەكان و بە پێی شوێن و كات بدوێت و قسە بكات، چونكە مامۆستاكانی مرۆڤایەتی كە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام بە ئەندازەی هۆشیاری گەلەكانیان قسەیان كردووە، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (أُمِرنا أنْ نُكَلِّمَ النَّاسَ على قَدَرِ عُقُولِهِم)[2] واتا: ئێمەی پێغەمبەران فەرمانمان پێكراوە بە ئەندازەی هۆشیاری خەڵكی قسە بكەین.

٤ـ پێویستە لەسەر مامۆستا چەند جارێك وانەكەی دووبارە بكاتەوە هەتا ئەو كاتەی قوتابیەكانی تێدەگەن. گەورەمان ئەنەسی كوڕی مالك رضي الله عنه باسی پێغەمبەری مامۆستامان بۆ دەكات و دەفەرموێت: (وَإذا تَكَلَّمَ بِكَلِمَةٍ أعادَها ثَلاثاً)[3] وە لە گێڕانەوەیەكی تری بوخاریدا دەفەرموێت: (حَتَّى تُفْهَمَ مِنْهُ) واتا: كاتێك پێغەمبەری خودا ﷺ قسەی دەكرد سێ جار دووبارەی دەكردەوە، بۆ ئەوەی خەڵكی تێبگەن.

٥ـ پێویستە لە ڕوی زانست و ڕەوشت و هەڵسو كەوتەوە مامۆستا بۆخۆی پێشەنگ بێت بۆ

١ـ پێشەوایان طبرانی و أبو یعلی بە سەنەدێكی صحیح گێڕاویانەتەوە.

٢ـ پێشەوا دەیلەمی گێڕاویەتەوە.

٣ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە.

قوتابیەکانی، چونکە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (وَإِنَّما بُعِثْتُ مُعَلِّماً)[1] واتا: بێگومان من وەکو مامۆستایەك نێردراوم، خودای پەروەردگاریش دەربارەی ئەو مامۆستایە دەفەرمووێت: ﴿لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ اللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ﴾[2] واتا: بە ڕاستی لە پێغەمبەری خوداداﷺ جوانترین و چاکترین نمونە هەیە هەتا ئێوە چاوی لێبکەن.

٦ـ پێویستە مامۆستا لەگەڵ قوتابیەکانیدا بە سۆز و نەرم و نیان بێت و وەکو منداڵی خۆی مامەڵە لەگەڵ قوتابیەکانیدا بکات، دیسان پێغەمبەری خوداﷺ لەم خاڵەشدا جوانترین پێشەنگە بۆ مامۆستایان، معاویەی کوڕی حەکەم دەفەرمووێت: (فَما رَأَيتُ مُعَلِّماً قَطُّ أَرْفَقُ مِنْ رَسُولِ اللّهِﷺ)[3] واتا: هەرگیز نەم بینیوە هیچ مامۆستایەك ئەوەندەی پێغەمبەرﷺ نەرم و نیان بێت.

٧ـ پێویستە لەسەر مامۆستا پەیوەندیەکی توند و تۆڵی هەبێت لەگەڵ قوتابیەکانی" بۆ ئەوەی بە باشترین شێوە پەیامەکەی بگەیەنێت و ئەوانیش لێی وەربگرن، بۆ ئەو مەبەستەش پێویستە هەموو هۆکارێکی نزیکبونەوە لە قوتابیان بگرێتە بەر، وەك: لەبەر کردنی ناوی قوتابیان و دەم بەخەندەیی و نزیکبونەوە لە قوتابیان و هەواڵ پرسین و گوێدان بە کێشەو تەنگ و چەڵەمەکانیان و.....هتد

٨ـ خۆ بەکەمزانی و ملکەچی: یەکێکی تر لە ئەرکەکانی سەر شانی مامۆستا بریتیە لە خۆ بەکەمزانی و ملکەچی، بەواتای نابێت ئەو پێگەیەی کە مامۆستا هەیەتی وای لێبکات توشی لە خۆبایی بون و خۆ بەزلزانی بکات،چونکە خۆ بەکەم زانی و ملکەچی و خاکی بوون لە کەسانی

---

١ـ پێشەوا ابن ماجة گێراویەتەوە.

٢ـ الأحزاب: ٢١

٣ـ پێشەوا ابوداود گێراویەتەوە.

گەورە جوانە، وە پاشان خاکی بوون کەسی گەورە گەورەتر دەکات. پێغەمبەری خۆشەویستﷺ فەرموویەتی: (وما تَواضَعَ أحَدٌ لِلهِ إلا رَفَعَهُ اللهُ)[1]واتا: هەر کەسێك لەبەر خودا ملکەچی بنوێنێت" ئەوە خودای گەورە بەرزی دەکاتەوە. بە پێچەوانەوەش هەر کەسێك خۆ بەزلزانی تێدابێت ئەوە خودای پەروەردگار بچوکی دەکاتەوە، وە لە قیامەتدا خراپترین دەرئەنجامی پێدەدات و دەیباتە دۆزەخ، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿فَادْخُلُوا أَبْوَابَ جَهَنَّمَ خَالِدِينَ فِيهَا فَلَبِئْسَ مَثْوَى الْمُتَكَبِّرِينَ﴾[2]واتا: لە ڕۆژی قیامەتدا بە خۆ بەزلزان و تاوانبار و بێباوەڕان دەگوترێت: لە دەرگاکانەوە بچۆنە دۆزەخەوە و تێیدا بمێننەوە، تای بەڕاستی دەرئەنجامی خۆ بەزلزانان ناخۆش و پڕ ناسۆر و خراپە.

جا ئەوانەی ڕابران بەشێك بوون لە ماف و ئەرکەکانی مامۆستا لە ئیسلامدا، ئێمەش لە کۆتایی ئەم باسەدا بە دووعای پێغەمبەرﷺ دووعا دەکەین و دەڵێین: (اللهُمَّ إنا نَعُوذُ بِكَ مِنْ عِلمٍ لا يَنفَعُ، وَمِنْ قَلبٍ لا يَخشَعُ، وَمِنْ أُذُنٍ لا تَسْمَعُ، وَمِنْ عَينٍ لا تَدْمَعُ، وَمِنْ نَفسٍ لا تَشْبَعُ)[3]واتا: ئەی خودایە من پەنات پێدەگرین لە زانستێك کە هیچ سودێکی نەبێت، وە لە دڵێك کە ملکەچی تۆ نەبێت، وە لە گوێیەك حەق و ڕاستی نەبیستێت، وە لە چاوێك لە ترسی تۆ نەگریەت، وە لە دەرونێك کە قەناعەتی نەبێت و تێر نەبێت.



١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

٢ـ النحل: ٢٩

٣ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە.

# ڕۆژی جیهانی بەرەنگار بونەوەی ئایدز

ئایدز: ڤایرۆسێکە هێرش دەکاتەسەر ئەو سیستەمەی بەرگری لەش کە بەرپرسە لە پاراستنی جەستە لە میکرۆبە جیاوازەکان و هەندێك جۆری شێر پەنجەش. ئەم ڤایرۆسە وا لە مرۆڤ دەکات کە توانای بەرگریکردنی لە ناو جەستەیدا بۆ میکرۆب و شێر پەنجە نەمێنێت . جا بەم ڤایرۆسە دەگوترێت : ڤایرۆسی نە هێشتنی بەرگری لە مرۆڤ ـ Human Immune Deficiency Virus. کە کورتکراوەتەوە لە (HIV)[1]. وە ئەم نەخۆشیە ساڵانە هەڕەشە لە ژیانی ملیۆنەها مرۆڤ دەکات و هەتا ئێستاش بێ چارەسەر ماوەتەوە .

# ڕۆژی جیهانی ئایدز

نەخۆشی ئایدز ـ ڤایرۆسی (HIV)ـ بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٨١دا لە لایەن لێکۆڵەرەوە ئەمریکیەکانەوە دۆزرایەوە، وە دوای ئەوەی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی هەستی کرد بە مەترسی ئەم نەخۆشیە، بڕیاریدا ساڵانە ڕۆژی ١ی ١٢ بکاتە ڕۆژی جیهانی ئایدز، جێگای باسە ساڵانە وولاتانی دوونیا لەم ڕۆژەدا بە چەندین چالاکی یادی ئەم ڕۆژە دەکەنەوە و ڕێنمایی تایبەت بڵاو دەکەنەوە بۆ خۆ پاراستن لە هۆکارەکانی توشبون بەم نەخۆشیە، وە لە هەندێك وولات یادی ئەو کەسانە دەکەنەوە کە بە هۆی ئەو نەخۆشیەوە گیانیان لە دەستداوە، وە لەگەڵ چەندین چالاکی تری جۆراو جۆر.

# هۆکارەکانی توشبون و گواستنەوەی ئەم نەخۆشیە

زانایان و پزیشکەکان دوای لێکۆڵینەوە بۆیـــان دەرکەوتووە کـە هۆکارەکانی توشبون بەم

---

١ـ ئایدز و نەخۆشیە درمەکان ، دانانی لیژنەیەك لە پزیشکان : ١٨ .

نه‌خۆشیه‌ بریتین له‌مانه‌ی خواره‌وه‌ :

١ـ هۆكاری سه‌ره‌كی بۆ توشبون و گواستنه‌وه‌ی ئه‌م ڤایرۆسه‌ بریتیه‌ له‌ په‌یوه‌ندی جنسی ناشه‌رعی ـ زینا ـ ، كه‌ له‌ ٩٠٪ ی به‌م هۆكاره‌ ده‌گوازرێته‌وه‌ .

٢ ـ به‌ هۆی گواستنه‌وه‌ی خوێن و شله‌مه‌نیه‌كانی تر كه‌ ئه‌م ڤایرۆسه‌یان تێدایه‌.

٣ـ گواستنه‌وه‌ی ئه‌ندامه‌كانی له‌ش وه‌ك: (گورچیله‌ و جه‌رگ و دڵ) له‌ به‌خشه‌رێكی توشبوو به‌م ڤایرۆسه‌وه‌.

٤ـ ئالوده‌ بون به‌ مادده‌ هۆشبه‌ره‌كان. به‌كارهێنانی مادده‌ هۆشبه‌ره‌كانیش یه‌كێكی تره‌ له‌ هۆكاره‌ سه‌ره‌كیه‌كانی توش بون به‌ نه‌خۆشی ئایدز. وه‌ له‌كوردستان به‌ پێی رۆژنامه‌ی (إتحاد) مادده‌ هۆشبه‌ره‌كان له‌گه‌ڵ په‌یوه‌ندی جنسی به‌ هۆكاری سه‌ره‌كی داده‌نرێن بۆ بڵاوبونه‌وه‌ی ئایدز.

٥ـ به‌كارهێنانی ده‌رزی یان ئامرازی ده‌متیژ یان كونكه‌ری پێست كه‌ ئه‌م ڤایرۆسه‌یان پێوه‌ بێت، وه‌ك : موسی ریش تاشین و ئامرازه‌كانی كوتانی پێست و گوێ كون كردن .

٦ـ له‌ دایكه‌وه‌ بۆ كۆرپه‌كه‌ی له‌ كاتی دووگیانیدا، یان بۆ منداڵه‌كه‌ی له‌ كاتی له‌ دایكبونیدا، یان له‌ رێی شیردانی سروشتیه‌وه‌ له‌ مه‌مكه‌كانی [(١)].

## ئایدز و ئاماره‌ ترسێنه‌ره‌كان

به‌راستی كاتێك ساڵانه‌ ئاماری توشبوان به‌ نه‌خۆشی ئایدز بڵاو ده‌كرێته‌وه‌ له‌لایه‌ن رێكخراوی ته‌ندروستی جیهانیه‌وه‌" مرۆڤ له‌ ناخیه‌وه‌ ده‌هه‌ژێت و هه‌ست به‌ ترس ده‌كات، چونكه‌ به‌ راستی ئاماره‌كان ترسناكن، ئه‌مه‌ی خواره‌وه‌ به‌ شێكن له‌و ئامارانه‌:

* لـه‌ رۆژی سه‌رهه‌ڵدانی نه‌خۆشی ئایدزه‌وه‌ هه‌تا ساڵی ٢٠١٣زیاتر له‌ ٧٠ملیـۆن توشبوو به‌

---

١ـ ئایدز و نه‌خۆشیه‌ درمه‌كان :٢٤ ـ ٢٥

نەخۆشی ئایدز لە لایەن ڕێکخراوی تەندروستی جیهانیەوە تۆمارکراوە، لەم ڕێژەیە زیاتر لە ٣٦ ملیۆنیان بەهۆی ئەم نەخۆشیەوە بە خراپترین شێوە مردوون.

* ڕۆژانە زیاتر لە هەشت هەزار کەس و مانگانە زیاتر لە دوو سەد و پەنجا هەزار کەس بە هۆی ئەم نەخۆشیەوە دەمرن.

* ساڵانە ڕێژەی توشبوان بە نەخۆشی ئایدز بە شێوەیەکی بەرچاو و ترسناك بەرز دەبێتەوە، بە شێوەیەك لە هەندێك وڵاتی عەرەبی ساڵانە بە ڕێژەی لە ٣٠٠٪ بەرز دەبێتەوە!

* ڕۆژانە شەش هەزار منداڵ و گەنجی تەمەن (١٤ـ٢٤) توشی ئەم نەخۆشیە دەبن لە جیهاندا.

* ڕۆژانە هەزارەها منداڵ بێناز ـ بێ دایك و باوك ـ دەبن لە جیهاندا بە هۆی ئەوەی دایك و باوکیان بە هۆی ئەم نەخۆشیەوە دەمرن، کە ئێستا ژمارەی ئەو منداڵانە دائەنرێت بە ١٣ملیۆن منداڵ لە جیهاندا.

* ئەم نەخۆشیە کاری کردۆتە سەر زۆرێك لە بوارەکانی ژیان، بەتایبەت بواری دارایی و خوێندن...، ساڵانە بە ملیۆنەها دۆلار سەرف دەکرێت بۆ دەرمانە کاتیەکان و بڵاو کردنەوەی ڕۆشنبیری دەربارەی ئەم نەخۆشیە، هەتا ئەگەر بێت و هیچ چارەسەرێکی بۆ نەدۆزرێتەوە ئەوە تا ساڵی ٢٠٢٥ بەشێك لە وڵاتانی ئەفریقیا و ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبێت لە ٣٥٪دەستکەوتی وڵاتەکانیان بۆ ئەم نەخۆشیە تەرخان بکەن. وە لە ڕوی خوێندنەوە چەندین خوێندکارو مامۆستا لە جیهاندا بە دەست ئەم نەخۆشیەوە دەناڵێنن، بۆ نمونە تەنها لە ساڵی ٢٠٠٤دا چوار هەزار مامۆستای کوشتووە [(١)].

---

١ـ ئەم ئامارانەم لە سایتی ڕێکخراوی تەندروستی جیهانی و کتێبی بەرەو ئیسلامی ئەندازیار عثمان و ئاسودەیی ئیسلام وەرگرتوە.

# ئایدز لە کوردستان

سوپاس بۆ خودا لە کوردستان رێژەی توش بون بە ئایدز لە رۆژی سەرهەڵدانیەوە هەتا ئێستا چەند سەدکەسێکی تێنەپەڕاندووە، وە زۆرینەی ئەوانەی توشی ئەم نەخۆشیەش بوون کورد نەبوون بەڵکو خەڵکی وولاتانی تر بوون، بۆ نمونە لە ساڵی ۲۰۱۰ دا لە کوردستان ۷۷کەس هەڵگری ڤایرۆسی (HIV)بون، لەم رێژەیە تەنها ۸کەسیان کورد بون، ئەوانی تر خەڵکی وولاتانی بیانی بون و رەوانەی وولاتەکانیان کرانەوە. بۆیە دەکرێت بڵێین ئایدزمان لە دەرەوە بۆ هاتووە نەوەکو دروستکراوی کورد بێت، هەوەك چۆن دوای ئەوەی سەربازانی بیانی چونە کەمبۆدیا لە جیاتی ئاشتی ئایدزیان بڵاوکردەوە(نشروا الآیدز بدلاً من أن ینشروا السلام)،ئاواش دوای کرانەوەی کوردستان بە رووی وولاتانی بیانیدا ئایدز لە کوردستان بڵاو بویەوە، ئەگەرنا سوپاس بۆ خودا کوردانی موسڵمان لە کوردستان هەتا ئێستاش رێگایان نەداوە تەنها جێگایەکی تایبەتیش بکرێتەوە بۆ کاری داوێن پیسی ـ زینا ـ کە وەك باسمان کرد هۆکاری سەرەکیە بۆ ئایدز، بەڵام بەداخەوە بەم دواییانە واخەریکە لە ژێر هەندێك ناوی وەك ( رێستورانت و مەلەوانگە و ئوتێلی پێنج ئەستێرە و ... هتد) دا خەریکە گەشە بە ئاوانی داوێنپیسی و زینا دەدرێت، جا ئەگەر بێتو ئەم جێگایانە چاودێریەکی ئیسلامیانەیان نەخرێتە سەر بێگومان لە ساڵانی ئایندەدا رێژەی توشبوان بە ئایدز لە کوردستان بەرز دەبێتەوە.

## پێویستە موسڵمانان خۆیان بپارێزێن

پێغەمبەری خۆشەویستﷺلە چەندین فەرمووەدەدا فەرمانمان پێدەکات کە خۆمان بپارێزین لە هۆکارەکانی توشبون بە نەخۆشی و بە تایبەت نەخۆشیە درم و کوشندەکان، گەورەمان أبو هریرەرَضِيَ اللَّهُ عَنْهُلە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (فِرَّ مِنَ الْمجذُومِ كَما

ئَفِرُّ مِنَ الأَسَدِ)[1] واتا: ڕابکە لەبەر کەسی توشبوو بە نەخۆشی گولی هەروەك چۆن ڕادەکەی لەبەر شێر. وە پێغەمبەری خوداﷺ دەربارەی نەخۆشی طاعون فەرموویەتی:( فاذا سَمِعتُمُوهُ بأرضٍ فَلا تُقَدِّمُوا عَلَيهِ وَإذا وَقَعَ بِأَرضٍ وَأَنتُم فِيها فَلا تُخرِجُوا فِراراً مِنهُ)[2] واتا: ئەگەر بیستتان نەخۆشی طاعون لە جێگایەك بڵاوبۆتەوە بۆی مەچۆن، وە ئەگەر لە جێگایەك بڵاو بویەوە ئێوە لێی نیشتەجێ بون لێی ڕامەکەن، جا ئەم فەرموودەی پێغەمبەرﷺ دوو سودی لێوەردەگیرێت:

١ـ کە دەفەرمووێت: مەچۆنە جێگایەك کە طاعونی لێ بڵاو بۆتەوە"بۆ ئەوەیەتی خۆمان بپارێزین و نەوەك بە چونمان توشی ئەم نەخۆشیە ببین .

٢ـ کە دەفەرمووێت: کە لە جێگایەك طاعون بڵاوبویەوە و ئێوە لێی نیشتەجێ بون لێی ڕامەکەن" ئەمەشیان دوو سودی هەیە:

یەکەم/ بۆ ئەوەی بە چونە دەری مەترسی بڵاوبونەوەی ئەم نەخۆشیە لەسەر موسڵمانانی دەرەوە دروست نەکات.

دووەم/ هەرکەسێك لە جێگای خۆی مایەوەو بە نەخۆشیەکە گیانی لەدەستدا ئەوە شەهیدە.

وە هەتا پێغەمبەری خوداﷺ نکوڵی کردووە لەوەی مەڕو ماڵات و حوشتری نەخۆشیش تێکەڵی مەڕو ماڵات و حوشتری ساغ بکرێت، أبو هريرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوەﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی : (لا يوردَنّ ممرضٌ على مصح)[3] واتا: حوشتری نەخۆش تێکەڵی حوشتری ساغ مەکەن .

جا ئەم فەرموودانەی ڕابردوو بەڵگەن لەسەر ئەوەی: ئەگــەر لە جێگایەك نەخۆشیەکی درم و

١ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە .

٢ـ پێشەوا یان بوخاری و مسلم گێراویەتەو.

٣ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە .

گواستراوە پەیدا بو پێویستە مرۆڤ خۆی لەو جێگایەو هەموو هۆکارێکی تری توشبون بەو نەخۆشیە بپارێزێت. جا نەخۆشی ئایدزیش نەخۆشیەکە دەگواسترێتەوە، لەبەر ئەوە پێویستە مرۆڤ خۆی لەم هۆکارانەی رابردوو بپارێزێت، بۆ ئەوەی توشی ئەم نەخۆشیە نەبێت. وە ئەگەر هاتوو کەسێکی موسڵمان بێ ئەوەی توشی هیچ سەرپێچیەکی شەرعی وەك زینا و مادده هۆشبەرەکان و ... بوبێت و خۆشی لە هۆکارەکان پاراستبێت، لەگەڵ ئەوەشدا توشی نەخۆشی ئایدز بوو و بەهۆیەوە گیانی لە دەستدا " إن شاءالله شەهیدە بە قیاس بۆ سەر نەخۆشی طاعون، چونکە لە ئێستادا لە بەر زوو بڵاوبونەوە و کوشندەیی نەخۆشی ئایدز " پێی دەگوترێت: طاعونی سەردەم! پێغەمبەری رێزدارﷺدەربارەی کەسێك کە بەنەخۆشی طاعون دەمرێت فەرموویەتی: (وَمَنْ ماتَ فِي الطّاعونِ فَهُوَ شَهيدٌ)[1]واتا: هەر کەسێك بە طاعونی بمرێت ئەوە شەهیدە.

## داوێن پیسی ـ زینا ـ هۆکاری سەرەکی یە

پێشتر باسمان کرد کە لە٩٠٪ بەرەو سەری هۆکاری توشبون بە نەخۆشی ئایدز بریتیە لە داوێنپیسی و زینا، وە پێغەمبەری خوداﷺچوارده سەدە پێش ئێستا فەرموویەتی: (لَم تَظهَرِ الْفاحِشَةُ فِي قَومٍ قَطُّ حَتى يُعلِنوا بِها، إلا فَشا فِيهِمُ الطّاعونُ، والأوجاعُ التِي لَم تكنْ مَضَتْ فِي أَسلافِهِم الذينَ مَضَوا)[2]واتا: لەناو هەر گەلێکدا داوێنپیسی بڵاو ببێتەوە و ئاشکرای بکەن، ئەوە خودای گەورە طاعون و چەند نەخۆشیەکی تریان لەناودا بڵاو دەکاتەوە کە خەڵکانی پێش ئەوان نەیان بیستبێت.

جا بەڕاستی لەم رۆژگارەدا دوای ئەوەی بە ئاشکرا بنکەی داوێن پیسی لە وڵاتانی دوونیادا کرایەوە، خودای گەورە لە تۆڵە و سزایاندا طاعونی سەردەم ـ ئایدزـ ی بۆ ناردن، کـە هەرگیزاو

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە .

٢ـ إبن ماجە بە سەنەدێکی صحیح گێراویەتەوە .

هەرگیز باوك و باپیران و چینی پێش ئێمە ئەو نەخۆشیەیان نەبیستووە!!

جا بە پشتیوانی خودا ئێمە لێرەدا تیشکێکی خێرا دەخەینە سەر باسی تاوانی زینا و حوکمی زینا کاران لە ئیسلامدا،بەلکو بەهۆیەوە مرۆڤەکان بە گشتی و گەنجان بە تایبەتی ترسی خودایان لێبنیشێت و دوور بکەونەوە لەم کارە قێزەونە و لەم تاوانە گەورەیە.

# زینا خراپترین ڕێگایە

خودای پەروەردگار دەفەرمووێت : ﴿لا تقربوا الزنا إنه كانَ فاحشةً وساءَ سبيلاً﴾[1] واتا: نزیك مەکەونەوە لە زینا چونکە کارێکی زۆر خراپە،وە لە هەموو ڕێگایەك خەراپترە بۆ دامرکاندنەوەی هەوەس و ئارەزو.

جا بۆیە خودای گەورە زینای بە خەراپترین ڕێگا ناو بردووە چونکە:

١ـ دەبێتە هۆکاری نانەوەی وەچەی ناتەندروست و ناشەرعی.

٢ـ زینا چەندین تاوانی تری لەسەر بنیات دەنرێت وەك: کێشەی کۆمەڵایەتی زۆر جار لەسەر ئاشکرا بونی تاوانی زینا دوژمنایەتیەك ڕویداوە کە بە دەیان کەسی تێدا کوژراوە، کەواتا زینا ڕۆڵی فیتنەیەکی گەورەش دەبینێت. وە زۆر جار کەسی زیناکار لەسەر زیناکردنەکەی کوژراوە، پێغەمبەری خۆشەویستیش ﷺ فەرموویەتی:(من ماتَ على شيءٍ بَعثه الله عليه)[2] واتا: هەرکەسێك لەسەر هەر کردەوەیەك بمرێت خودای پەروەردگار لەسەر ئەم کردەوەیە زیندوی دەکاتەوە !! جا ئایا تۆ زیناکار ناترسیت کە یەکێك بیت لەو کەسانەی لە کاتی زینادا گیانت دەردەچێت، یان لەسەر زینا دەکوژرێیت، ئایا چۆن لەڕوت دێت بەدەم زیناوە بەبەرچاوی هەموو بونەوەرەوە بچیتە بەردەمی خودا لە ڕۆژی قیامەت ؟!! پاشان زۆر جار هەبووە ژن و پیاوی

---

١ـ الإسراء : ٣٢

٢ـ پێشەوا احمد گێراویەتەوە .

زیناکار بۆ شاردنەوەی تاوانەکەیان ئەو منداڵەشیان کوشتووە کە لە دەر ئەنجامی زیناکەیان پەیدا بووە، بێگومان کوشتنی منداڵیش یەکێکی ترە لە تاوانە گەورەکان. کەواتا: زینا تاوانێکەو چەندین تاوانی تریش بە دوای خۆیدا دەهێنێت.

٣ـ زینا دەبێتە هۆکاری ناردنی بەڵاو موصیبەت لەلایەن خوداوە، عبدالله ی کوڕی مسعود رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (ما ظَهَرَ في قَومٍ الرِّبا وَالزِّنا إلا أَحلوا بِأَنفُسِهِم عِقابَ اللهِ عَزَّ وَّجَلَّ)[1] واتا : ڕیبا و زینا لە ناو هەر گەلێکدا بڵاو ببێتەوە، ئەوە تۆڵە و سزای خودا بۆ خۆیان مسۆگەر کردووە.

٤ـ تاوانی زینا یەکێکە لەو تاوانانەی کە باوەڕ لە مرۆڤی موسڵمان دادەڕنێت، گەورەمان أبوهريرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (لا يَزني الزّاني حِينَ يَزني وَهُوَمُؤمِنٌ)[2] واتا: هیچ زیناکارێك زینا ناکات " مەگەر لە کاتی زیناکەیدا ئەو کەسە بێباوەڕە .

وە لە فەرمودەیەکی تردا پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (إذا زَنَى الْعَبدُ خَرَجَ مِنهُ الإيمانُ فَكانَ عَلَى رَأسِهِ كَالظُّلَّةِ فَإذا أَقلَعَ رَجَعَ إلَيهِ)[3] واتا: کاتێك بەندەیەکی خودا زینا دەکات، ئەوە باوەڕەکەی لە لاشەی دەچێتە دەرەوە و وەك هەورێك لەسەری دەوەستێت، کاتێك لە کارەکەی بویەوەو وازی لە تاوانەکەی هێنا ئەوکات بۆی دەگەڕێتەوە.

٥ـ تاوانی زینا لە دوای هاوبەش دانان بۆ خودا لە هەمو تاوانێك گەورەترە. پێغەمبەری خودا ﷺ فەرموویەتی: (ما مِنْ ذَنبٍ بَعدَ الشِّركِ بِاللهِ أَعظَمُ عِندَ اللهِ مِنْ نُطفَةٍ وَضَعَها رَجُلٌ في

---

١ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە .

٣ـ پێشەوایان أبو داود و ترمذی بە سەنەدێکی صحیح گێڕاویانەتەوە .

فَرجٍ لا یَحِلُّ لَهُ)[1]واتا: لە دوای هاوبەش دانان بۆ خوداجل جلاله هیچ تاوانێك گەورەتر نیە لەوەی پیاوێك ئاوی پیاوەتی ـ منی ـ بخاتە ناو دامێنی ئافرەتێکەوە کە بۆی حەڵاڵ نیە.

٦ـ مرۆڤی زیناکار بەهۆی زیناکەیەوە ئەگەر هەیە توشی چەندین نەخۆشی کوشندە ببێت، لە هەموویان کوشندەتر و پیسترە نەخۆشی ئایدز.

٧ـ زینا دەبێتە هۆکاری لە دەست دانی شەرم و حەیا و ڕێزو ئابڕو و کەسایەتی لەناو کۆمەڵگەدا. کاتێك کەسێك تاوانی زینای لێ ئاشکرا دەبێت بێگومان ئەم کەسە لە ناو کۆمەڵگادا حەیا و ئابڕوی دەچێت و ڕێزی نامێنێت، لە ئیسلامیشدا پاراستنی حەیاو ئابڕو و کەسایەتی واجبە.

جا ئەمانەی سەرەوە بەشێك بون لەو خراپانەی کە لەسەر زینا بنیات دەنرێن، لەبەر ئەوە خودای پەروەردگار بە ﴿ساءَ سبیلاً﴾ ناوی بردووە.

## چەند زینایەکی خراپتر

گووتمان زینا خراپترین ڕێگایە بۆ دامرکاندنەوەی حەزو ئارەزوی جنسی،جا لەناو زیناکانیشدا کۆمەڵێك زینا هەن کە تاوانەکەیان لە تاوانی زینای ئاسایی زیاترە و خودای پەروەردگار زیاتر ڕقی لێیان دەبێتەوە، ئەوانەی خوارەوەش خراپترین جۆری زیناکانن:

١ـ زینا لەگەڵ کەسێکی مەحرەمدا وەك: زینا لەگەڵ دایك ، خوشك ، پور ، خێزانی باوك ، یان کەسێك شیرت لێی خواردبێت...هتد. هاوەڵی بەڕێز إبن عباس رضي الله عنهما لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مَنْ وَقَعَ عَلَى ذاتِ مَحرَمٍ فَاقْتُلُوه)[2]واتا: هەرکەسێك

---

١ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوایان ابن ماجە و احمد گێڕاویانەتەوە .

لە گەڵ مەحرەمێکی خۆیدا زینای کرد بیکوژن.

٢ـ زینا کردن لەگەڵ مەحرەم و خێزانی دراوسێدا: ڕۆژێکیان پێغەمبەری خوداﷺ بەهاوەڵە بەرێزەکانی فەرموو: (ماتَقُولُونَ فِي الزِّنا؟)واتا: ئایا دەربارەی زینا چی دەڵێن؟ ئەوانیش گووتیان: (حَرامٌ حَرَّمَهُ اللهُ وَرَسُولُهُ فَهُوَ حَرامٌ إِلى يَومِ الْقِيامَةِ) واتا: زینا حەرامە و خوداو پێغەمبەرەکەیﷺ حەرامیان کردووە، لەبەر ئەوە هەتا ڕۆژی قیامەت حەرامە. پێغەمبەریشﷺ فەرمووی: (لَأَنْ يَزنِيَ الرَّجُل بِعَشَرِ نِسوَةٍ أَيسَرُ عَلَيهِ مِنْ أَنْ يَزنِيَ بِإمرأةِ جارِهِ)[1] ئەگەر پیاوێك زینا لەگەڵ دە ئافرەتدا بکات ئەوە تاوانەکەی لەسەری ئاسانترە لەوەی زینا لەگەڵ ئافرەتی جیرانەکەیدا بکات.

٣ـ زیناکردنی پیاو و ژنی پیر و بە ساڵاچوو: پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (لا يَنظُرُ اللهُ يَومَ الْقِيامَةِ إِلى الشَّيخِ الزَّاني وَ لا الْعَجوزِ الزَّانية)[2]واتا: خودای گەورە لە ڕۆژی قیامەتدا بە چاوی ڕەحمەت سەیری پیرە پیاوی زیناکاری پیرەژنی زیناکار ناکات. گەورەمان أبو ذری غفاریرضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: سێ کەس هەن خودای گەورە ڕقی لێیان دەبێتەوە، یەکێك لەوانە :(الشيخ الزاني)[3]واتا: پیرێکی زیناکار.

٤ـ ژن و پیاو دوای ئەوەی هاوسەرگیریان کردووە لەگەڵ کەسێکی تردا زینا بکەن" ئەمەشیان یەکێکە لە خراپترینی جۆرەکانی زینا و داوێن پیسی، دواتر إن شاء الله باسی حوکمەکەی دەکەین.

٥ـ چونـە لای پیاوێك یان ئافرەتێك لــە دواوە. هەرچەندە زۆرینەی زانایان ئەمە بـە زینـا

١ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە و صحیح.

٢ـ پێشەوا طبراني بە سەنەدێکی حسن گێڕاویەتەوە .

٣ـ پێشەوایان ترمذ ی و نسائي و احمد گێڕاویانەتەوە.

ئەژمار ناکەن و حوکمی زینای بۆ جێگیر ناکەن، بەڵام ابن قدامە رحمه الله بە شێکی تر لە زانایان ئەمەشیان بە زینا ئەژمار کردووە[1]،جا ئەمە زینا بێت یان نا،هەر یەکێکە لەو تاوانە گەورانەی کە بە دامێن ئەنجام دەدرێن، گەورەمان ابو هریرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خۆشەویستەوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی:(...من أتى امرأته في دبرها فقد برىءَ مما أنزلَ الله على محمدٍ)[2] واتا: هەر پیاوێك بچێتە لای خێزانەکەی لە دواوەڕا ئەوە بێ بەش بووە - بریء - بووە لەو دینەی بۆ پێغەمبەر محمد ﷺ دابەزیوە. وە لە فەرموودەیەکی تردا هاوەڵی بەڕێز رضي الله عنه ابن عباس لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (مَلعُونٌ مَن عَمِلَ عمَل قَومَ لوط)[3] واتا: نەفرین لێکراوە - دوورە لە ڕەحمەتی خودا - هەر کەسێك کردەوەی گەلی لوط ئەنجام بدات و لە دواوە بچێتە لای پیاوێك .

وە جێگای ئاماژەیە زانایان جیاڕان دەربارەی کەسێك کە تاوانی گەلی لوط ئەنجام بدات:

* پێشەوا مالك رحمه الله فەرموویەتی: هەرکەسێك کاری گەلی لوط بکات دەبێت ڕەجم بکرێت، جا ئەم کەسە هاوسەرگیری کردبێت یان نا یەکسانە. وە ئەگەر ئەوکەسەی کارەکەشی لەگەڵ کراوە ئەگەر باڵغ بوبێت دەبێت ئەویش ڕەجم بکرێت. وە لە ووتەیەکی تریدا پێشەوا مالك رحمه الله دەفەرمووێت : ئەگەر کارکەرە هاوسەرگیری کردبوو" ئەوە ڕەجم دەکرێت، وە ئەگەر هاوسەرگیری نەکردبوو ئەوە سجن دەکرێت و تەمبێ دەکرێت، ئەوەش ڕای زانایان : (عطاء و النخعي و ابن مسيب )ە رحمهم الله .

* پێشەوا ابو حنيفة رحمه الله فەرموویەتی: هەر کەسێك کاری گەلی لوط ئەنجام بدات، ئـــەوە

1- مغني ابن قدامە : ٨/ ١٨١

2- پێشەوایان ابو داود احمد گێڕاویانەتەوە .

3- پێشەوا ترمذي گێڕاویەتەوە

ئاگادار دەکرێتەوە بەوەی دووبارەی نەکاتەوە و هەڕەشەی لێدەکرێت ـ تعذیر ـ دەکرێت، جا ئەو کەسە هاوسەرگیری کردبێت یان نا یەکسانە .

* پێشەوا شافعی رحمه الله فەرموویەتی: حوکمی زینای بەسەردا جێبەجێ دەکرێت، بە قیاس بۆ سەر زینا. ئەمەی ڕای ابن عباسیشە رضي الله عنه.

* وە لە گەورەمان ابوبکری صدیق رضي الله عنه گێڕدراوەتەوە کە پیاوێك لە سەردەمی ئەودا کاری گەلی لوطی کرد بو، فەرمانی کرد بە ئاگر بیسوتێنن، وە ئەمە ڕای گەورەمان علی کوڕی ابوطالیبشە رضي الله عنه.(١)

## سزای تاونبارانی زینا

لە بەر گەورەیی تاوانی زینا خودای پەروەردگار لە دوونیاو لە قیامەتدا حوکم ـ حد ـ وسزای تایبەتی بڕیارداوە بۆزیناکاران ، ئەمەی خوارەوە حوکمی زیناکارانە لە دوونیا قیامەت :

## حوکمی زیناکاران لە دوونیا

زیناکاران دوو جۆرن:

١ـ زیناکاری (غیر محصن) : کەسێك پێش هاوسەرگیری زینا بکات.

٢ـ زیناکاری (محصن) : کەسێك دوای هاوسەرگیری زینا بکات.

یەکەم/ زیناکاری (غیر محصن): هەرکەسێك بەر لەوەی هاوسەرگیری زینا بکات" خودای پەروەردگار ئەم سزایانەی بۆ داناوە:﴿الزَّانِيَةُ وَالزَّانِي فَاجْلِدُوا كُلَّ وَاحِدٍ مِّنْهُمَا مِائَةَ جَلْدَةٍ وَلَا تَأْخُذْكُم بِهِمَا رَأْفَةٌ فِي دِينِ اللَّهِ إِن كُنتُمْ تُؤْمِنُونَ بِاللَّهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ وَلْيَشْهَدْ عَذَابَهُمَا طَائِفَـةٌ

---

١ـ جامع الأحكام القرآن : ٢١٧/٧

مِّنَ الْمُؤْمِنِينَ﴾[1] واتا: هەرکەسێك کچ بێت یان کوڕ زینا بکات دەبێت ئەم سزایەی خوارەوەی بە سەردا جێبەجێ بکەن:

١ـ سەد شوترکی لێبدەن و بەزەیتان پێیاندا نەیەتەوە، چونکە ئەمە حوکمی خودایە.

٢ـ وە دەبێت کۆمەڵێکیش لە موسوڵمانان ئامادەی جێ بەجێ کردنی سزاکەیان بن.

٣ـ دورخستنەوەی لە شاری خۆی و شاربەدەرکردنی ـ نفی ـ بۆ ماوەی ساڵێك، ئەمەش ڕای زۆرینەی زانایانە لە ناویاندا پێشەوایان (مالك و شافعي و احمد) رحمهم الله[2]. خالدی کوڕی زەید لە پێغەمبەری خودا ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە: (أنّه أمرَ فيمن زني وَلَم يُحصِنْ بجلد مائة وتغريبِ عامٍ)[3] واتا: فەرمانی دەکرد ئەوکەسانەی زینایان کردووە و ژنیان نەهێناوە" سەد داریان لێبدەن و ساڵێکیش شاربەدەریان بکەن.

دووەم/ زیناکاری (محصن) کەسێك کەسێك دوای هاوسەرگیری زینا بکات: کەسێك دوای ئەوەی ژیانی هاوسەری پێك هێنا زینا بکات " ئەوە بێگومان تاوانەکەی لە تاوانی کەسێك قورسترە کە هاوسەری نیە، چونکە : هەم ناپاکی هاوسەری کردووە ـ خيانه الزوجيه ـ وە هەم دوای ئەوەی ڕێگای شەرعی لە بەردەستە بۆ خاڵی کردنەوەی ئارەزوی جنسی" لە ڕێگای ناشەرعیەوە ئارەزوی جنسی خاڵی کردوتەوە، لەبەر ئەوە ئاینی پیرۆزی ئیسلامیش سزایەکی قورستری بۆ داناوە، ئەویش ڕەجم کردنە. ئەو حکومەش بە گوفتار و کرداری پێغەمبەر ﷺ و کۆدەنگی هاوەڵان و شوێنکەوتوان ـ تابعين ـ جێگیر بووە.[4]

---

١ـ النور: ٢ .

٢ـ تفسير آيات الأحكام ٢/ ٢٣.

٣ـ پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە.

٤ـ تفسير آيات الأحكام : ١٧/٢

*أبو هريرە رضي الله عنه بۆمان دەگێڕێتەوە کە: دوو پیاو هاتنە لای پێغەمبەری خودا ﷺ و گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ هاتووین بۆ ئەوەی بە پەرتوکی خودا حوکمان بکەی، وە یەکێکیان گووتی ڕێگەم پێبدە قسەت بۆ بکەم، پێغەمبەریش ﷺ فەرمووی: قسە بکە، پیاوەکە گووتی: کوڕەکەم لای ئەم پیاوە کرێکار بووە و دواتر زینای لەگەڵ خێزانەکەیدا کردووە، منیش پرسیارم کرد پێیان گووتم دەبێت کوڕەکەت ڕەجم بکرێت، منیش سەد سەر حوشتر و مەڕو ماڵاتم بۆی لە ڕزگارانە ـ فدیە ـ داوە، پاشان پرسیارم لە خەڵکی خاوەن زانست ـ أهل العلم ـ کرد" گووتیان کوڕەکەت تەنها لەسەری پێویستە کە سەد داری لێبدرێت وساڵێکیش شار بەدەر بکرێت، وە لەسەر خێزانی ئەم پیاوەش پێویستە کە ڕەجم بکرێت؟ پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: (والذي نفسي بيده لأَقضيَنَ بينكما بكتاب الله، الوَلِيدةُ وَالغَنَمُ ردٌ، وَ عَلى ابنِكَ جَلدُ مائةٍ وَ تَغريبُ عامٍ، اغدُ يا أُنيس إلي امْرَأةِ هذا فَإنْ اعتَرَفَتْ فَارجُمها) واتا: سوێند بەو کەسەی گیانی منی لەبەر دەستە کە زاتی (الله) یە، بە پەرتوکی خودا حوکمتان دەکەم، حوکمەکەش ئەوەیە: ئەو حوشتر و مەڕانەی بەخشیوتن بۆ ڕزگارانەی کوڕەکەت وەرناگیرێن ـ چونکە هیچ سودێکیان نیە ـ وە لەسەر کوڕەکەت پێویستە سەد داری لێبدرێت و ساڵێکیش شاربەدەر بکرێت، وەئەی ئونەیس تۆش بچۆ بۆلای خێزانی ئەم پیاوە ئەگەر دانی نا بە تاوانەکەیدا ڕەجمی بکەن، ئەنەسیش رضي الله عنه چو بۆ لای و پرسیاری لێکرد، ئافرەتەکە دانی نا بە تاوانەکەدا، پێغەمبەریش ﷺ فەرمانی کرد ڕەجمیان کرد[1].

* وە پێغەمبەری خودا ﷺ لە سەردەمی خۆیدا فەرمانی بە ڕەجم کردنی چەند کەسێکی تر کردووە لەوانە: ماعزی ئەسلەمی و غامیدیە. بەڵام ئەوەی جێگای هەڵوەستە لەسەر کردنە

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە .

هەموو ئەوكەسانەی كەلەسەردەمی پێغەمبەری خوداﷺ و هاوەڵاندا رضی الله عنهم ڕەجم كراون ژمارەیان لە پەنجەكانی دەست تێناپەڕێت، وە زۆرینەی هەرە زۆری ئەوانەش بۆخۆیان هاتوون بۆ لای پێغەمبەرﷺ و دانیان ناوە بە تاوانەكانیاندا و داوای جێبەجێ كردنی حوكمی خودایان كردووە بەسەریاندا، لەكاتێكدا سەردەمی پێغەمبەرﷺ زۆریش لەسەردەمی نەفامی نزیك بووە، بەڵام بەهۆی ئەم هێزە ئیمانیەی پێغەمبەری خوداﷺلای موسڵمانان دروستی كردبو، موسڵمانان زۆرینەیان دور كەوتبونەوە لەم تاوانە، وە ئەوكەسانەی شەیتانیش فریوی دەدان و توشی ئەم تاوانە گەورەیەی دەكردن" زۆر بەپەلە دەهاتنە خزمەتی پێغەمبەرﷺ و دانیان دەنـــا بـــە تاوانەكانیاندا و داوایان دەكرد حوكمی خودایان بەسەردا جێبەجێ بكرێت، بۆ ئەوەی پاك ببنەوە و بە پاكی بچنەوە خزمەتی خودای گەورە، من لێرەدا دوو نمونە باس دەكەم لە پەرۆشی موسڵمانان بۆ پاك بونەوە لە تاوانی زینا، ئەوانیش بەسەرهاتی ماعزی ئەسلەمی و غامیدیەن.

## بەسەرهاتی ماعزی ئەسلەمی

ماعزی كوڕی مالكی ئەسلەمی گەنجێكی بێ باوك بو لای هوزالی كوڕی نعیم بو، ئەم گەنجە دوای هاوسەرگیری زینای كرد لەگەڵ كەنیزەكێكی هۆزەكەی، هوزال فەرمانی پێكرد ئەگەر بچێت بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ و هەواڵی بدەیە بەو كارەی كردووتە، بەڵكو داوای لێخۆشبونت بۆ بكات لای خودای پەروەردگار، ئەویش هات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ لە كاتێكدا كە لە مزگەوت بوو، بانگی كرد و گوتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ زینام كردووە، پێغەمبەریشﷺ ڕوی لێوەرگێڕا و فەرمووی: تیابچیت ـ ویحك ـ بگەڕێوە تەوبە بكە و داوای لێخۆشبون بكە لە خودای پەروەردگار، بەڵام ئەم گەنجە هەڵسوڕا بۆ ئەو لایەی كە پێغەمبەرﷺ ڕووی بۆ وەرگێڕابوو و دووبارە هاتەوە بەردەمی و گووتی: من زینام كردووە، دیسان پێغەمبەری

خوداﷺ رووی لێوەرگێڕایەوە، بەڵام دیسان ئەم گەنجە هاتەوە بەردەمی و گووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ پاکم بکەوە چونکە من زینام کردووە، أبوبکری صدیقرضي الله عنه فەرمووی: واز بێنە، چونکە ئەگەر جارێکی تر دان پێدانانەکەت دووبارە بکەیتەوە" ئەوە پێغەمبەرﷺ فەرمانی ڕەجم کردنت دەدات، بەڵام ئەم گەنجە هەر سور بو لەسەر پاك بوونەوەی لەم تاوانە، لەبەر ئەوە دیسان هاتەوە بەردەمی و گووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ زینام کردووە و پاکم بکەرەوە. بەڵام پێغەمبەری خوداﷺ هەر دەیویست وەهای لێبکات کە لەدان پێدانانەکەی پەشیمان ببێتەوە و تاوانەکەی داپۆشێت " بۆیە چەند پرسیارێکی لێکرد و فەرمووی: پێدەچێت تۆ ئەم کچەت ماچ کردبێت و لێت تێکچوبێت وابزانیت زینات کردووە؟ گووتی نەخێر زینام لەگەڵی کرد. دیسان فەرمووی: پێدەچێت دەستبازیت لەگەڵ کردبێت؟ گوتی: نەخێر زینام لەگەڵی کرد! دیسان فەرمووی: پێدەچێت تەنها سەیرت کردبێت؟ گووتی نەخێر زینام لەگەڵی کرد! ئینجا پێغەمبەری خوداﷺ لێی پرسی: ئایا دەزانی زینا چی یە؟ گووتی: بەڵێ ، زینا ئەوەیە ئەندامی زاووزێی پیاو بچێتە ناو دامێنی ئافرەتەوە بە حەرامی، لە گێڕانەوەیەکی تری (مسلم)دا هاتووە: پێغەمبەرﷺ لە هۆزەکەی ماعزی پرسی (أبه جنون؟) واتا: ئایا ئەم پیاوە شێت نیە؟ گووتیان نەخێر کەسێکی تەواوە، ئینجا پرسی: (أشرب خمراً؟) واتا: ئایا مەی نەخواردوتەوە؟ کەسێك هەستاو بۆنی کرد" گووتی: نەخێر ئەی پێغەمبەری خوداﷺ. ئینجا: پێغەمبەری خوداﷺ فەرمانی کردوو ڕەجمیان کرد، جا خەڵکی دەربارەی ئەم کارەی ماعزی ئەسلەمی بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکیان دەیانگووت: بەڕاستی ماعز بەهیلاك چو بەهۆی ئەم تاوانەیەوە، بەشێکی تر دەیانگووت: بەڕاستی هیچ تەوبەیەك لە تەوبەکەی ماعز گەورەتر نیە" چونکە ئەو بۆخۆی هات و داوای پاك بوونەوەی لە پێغەمبەرﷺکرد، ئەم گووتانە هەتا دوو سێ ڕۆژ بەردەوام بوو، پاشان پێغەمبەری خوداﷺ هات و سەلامی لێکردن و فەرمووی: (اِستَغفِروا لِماعِزِ بنِ مالِك) واتا:

داوای لێخۆشبون بکەن بۆ ماعزی کوڕی مالك، ئەوانیش داوای لێخۆشبونیان بۆکرد، پاشان پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: (لقد تابَ توبةً لو قُسِمَتْ بَيْنَ أُمةٍ لوَسِعَتهم)[1] واتا: بەڕاستی ماعز تەوبەیەکی وەهای کردبوو" ئەگەر ئەو تەوبەیە بەسەر یەك گەلدا دابەش بکەیت بەشی هەموویان دەکات!!

## بەسەرهاتی غامیدیە

ئافرەتێك کە ناوی غامیدیە بوو هاتە لای پێغەمبەری خودا ﷺ و گووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ زینام کردووە پاکم بکەرەوە، پێغەمبەری خودا ﷺ ناردیەوە بۆ ماڵەوە، بەیانی ئافرەتەکە هاتەوە و گووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ بۆ دەمنێریتەوە؟ پێدەچێت بمنێریتەوە هەروەك چۆن دەتویست ماعز پەشیمان بکەیتەوە، بەڵام سوێند بە خودا من سکپڕم بە زینا!! پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی کەواتا ئێستا بڕۆرەوە بۆ ماڵەوە هەتا منداڵەکەت دەبێت، ئافرەتەکەش گەڕایەوە ماڵەوە، پاش ئەوەی منداڵەکەی بوو" منداڵەکەی لەناو پارچە پەڕۆیەکدا هێنایە خزمەت پێغەمبەر ﷺ و گووتی: ئەوە منداڵەکەیە لە دایکبووە، پێغەمبەری خوداش ﷺ فەرمووی: بڕۆ منداڵەکەت بەرەوە بۆ ماڵەوە شیری پێبدە هەتا پێویستی بە شیر نامێنێت، ئەویش گەڕایەوە، پاشان دوای ماوەیەك دوای ئەوەی منداڵەکەی پێویستی بە شیرخواردن نەما هاتەوە بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و منداڵەکەی بە باوەشەوە بوو و پارچە نانێکی بەدەستەوە بوو ـ بۆ ئەوەی بەشێوەیەکی کردەیی بە پێغەمبەری خودا ﷺ بڵێت: ئەوە منداڵەکەمە نان دەخوات و پێویستی بەشیر نەماوە ـ گووتی: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ ئەوە منداڵەکەمە و لە شیر بۆتەوە و ئێستا نان دەخوات، پێغەمبەری خوداش ﷺ منداڵەکەیە دایە دەست پیاوێك لە موسڵمانان و

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە .

فەرمانی کرد ڕەجمی بکەن، ئەوانیش چاڵێکیان بۆ هەڵکەند هەتا سینگی پاشان ڕەجمیان کرد، پرنچکە خوێنێك بەر خالدی کوڕی وەلید کەوت ئەویش قسەیەکی ناشیرینی پێگووت، پێغەمبەریشﷺ گوێی لێبوو لەبەر ئەوە فەرمووی: (مهلاً یا خالدُ فَوالذی نَفسِی بِیَدِهِ لَقَدْ تابَتْ تَوبةً لَو تابَها صاحبُ مکسٍ لغفرَ له،ثُمَّ أَمَرَ بها فَصَلَّی عَلیها وَ دُفِنَتْ)[1]واتا: لەسەر خۆ و هێمن بە ئەی خالد، سوێند بەو کەسەی گیانی منی بەدەستە ئەم ئافرەتە تەوبەیەکی کردبوو ئەگەر باج وەرگر ئەو تەوبەیەی کردبا خودا لێی خۆش دەبوو، پاشان فەرمانی کرد نوێژیان لەسەر کرد و ناشتیان .جا لەم دوو بەسەرهاتە چەند شتێکمان بۆ دەردەکەوێت:

١ـ جێبەجێکردنی حوکمی خودا بۆ پاك بوونەوەیە، نەوەك ڕق لێبونەوە. هەر بۆیە تاوانباران بۆخۆیان دەهاتن و دەیانگوت: (طَهرنی) پاکم بکەرەوە، وە پێغەمبەری خوداشﷺ دوای پاك بونەوەیان هەرگیز ڕێگای نەدەدا کەسێك قسەی ناشیرینیان پێبڵێ و باسی باشی تەوبەکەیانی دەرکردن.

٢ـ ڕەجم کردن پێشێل کردنی مافی مرۆڤ نیە وەك هەندێك کەس تێیگەیشتوون، بەڵکو ڕەجم کردن ڕەحمەتە بۆ مرۆڤەکان بەگشتی چونکە:

یەکەم/ بەهۆی جێبەجێ کردنی ئەم حوکمە بەسەر کەسێکدا هەزاران کەس لەم تاوانە دوور دەکەونەوە، چونکە هەرکەسێك بزانێ کە بەهۆی زینایەکەوە ئەگەر ئاشکرا ببێت ڕەجم دەکرێت" ئەوە ئەگەر لە ترسی خوداش نەبێت لەترسی گیانی خۆی خۆی لەم تاوانە دەپارێزێت، ئەم ئەزمونەش بەسەرکەوتوویی لە سەردەمی پێغەمبەرﷺ و هاوەڵاندا تاقیکراوەتەوە.

دووەم/ ئەمە ڕەحمەتی خودایە کە لەدوونیادا ڕێگاچارەی پاك بوونەوەی داناوە لە تاوان، چونکە هەموو موسڵمانێکی ڕاستەقینە ئامادەیە هەموو قوربانیەك بدات لە دوونیا تەنها لە بەر

---

١ـ پێشەوا مسلم گێڕاویەتەوە .

ئەوەی بە پیسی نەچێتە خزمەتی خودا،

٣ـ ئەم دوو بەسەرهاتە باوەڕی ڕاستەقینەی هاوەڵان و سوربون لەسەر پاکبوونەوەمان بۆ نمایش دەکەن، فێرمان دەکەن ئێمەی موسڵمان هەموو کاتێك بە دوای بەدەستهێنانی ڕەزامەندی خودادا بین و هیچ شتێك ساردمان نەکاتەوە، بەڕاستی بەردەوامی غامدیە لەسەر پاك بوونەوە بۆ ماوەی زیاتر لە دوو ساڵ پێشەنگە بۆ ئێمەی موسڵمان، زیاتر لە دوو ساڵ پێغەمبەری خودا ﷺ ماوەی پێدا بەڵام ئەو هەر سور بوو لەسەر پاك بوونەوە و بیری لەوە نەکردەوە کە گیان چەند شیرنەو بێت و بڵێت: لە دان پێدانانەکەم پەشیمان بوومەوە، بەمەش گیانی خۆی ڕزگار دەکرد، بەڵام ڕزگاربونی لە ئاگری دۆزەخ هەڵبژارد بەسەر ڕزگاربونی گیانی لە دوونیایەکی فانی.

٤ـ لەم سەردەمەدا کە بە داخەوە حوکمی ئیسلام نەماوە" باشترین ڕێگاچارە بۆ ئەو کەسانەی کە دەکەونە تاوانی زیناوە ئەوەیە: تاوانەکەیان بشارنەوە و تەوبەیکی ڕاستەقینە بکەن، بەڵکو خودای باڵادەست بە میهرەبانی خۆی بیان بەخشێت، لەبەر ئەوەی ئاشکرا کردنی تاوانەکەیان هیچ سودێکی نیە، چونکە ئیسلام لەمەیدانی حوکمدا نەماوە بۆ ئەوەی حوکمی خودایان بەسەردا جێبەجێ بکرێت، وە بەئاشکراکردنیشی شاهید لەسەر خۆیان پەیدا دەکەن بۆ قیامەت، أبو هریرە رضي الله عنه لە پێغەمبەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرموویەتی: (كُلُّ أُمَّتي مُعافَى إلا الْمُجاهِرين، وَإنَّ مِنَ المجاهرةِ أنْ يعمَلَ الرجلُ بالليلِ عَملاً، ثُم يُصبِحُ وَقَد سَتَرَهُ اللهُ، فَيقولَ: يا فُلانُ عَملتُ الْبارِحةَ كذا وكذا، وَ قَدْ باتَ يستُرهُ ربُه، ويُصبحُ يَكشِفُ سِترَ اللهِ عنهُ)[1] واتا: هەموو ئوممەتەکەم لێخۆشبون دەیانگرێتەوە تەنها ئەو کەسانە نەبێت کە تاوانەکانیان ئاشکرا دەکەن، وە یەکێك لە تاوانەکان و ئاشکراکردنی تاوانەکان ئەوەیە کەسێك شەوێ تاوانێك بکات، پاشان بەیانی بکاتەوە" لە کاتێکدا خودای گەورە تاوانەکەی بۆ داپۆشیوە

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

ئەو ئاشکرای بکات و بڵێت: ئەی فلاّنە کەس ئەمشەو من ئەم تاوانە و ئەم تاوانەم کرد، بەڕاستی خودا شەو تاوانەکەی بۆ داپۆشی بو" بەلاّم ئەو بەندەیە بەیانی کردەوە و پەردەی خودای لەسەر تاوانەکەی لاداو ئاشکرای کرد .

## سزای زیناکاران لە ڕۆژی قیامەت

خودای پەروەردگار دەربارەی سزای زیناکاران فەرموویەتی: ﴿وَالَّذِينَ لَا يَدْعُونَ مَعَ اللَّهِ إِلَهًا آخَرَ وَلَا يَقْتُلُونَ النَّفْسَ الَّتِي حَرَّمَ اللَّهُ إِلَّا بِالْحَقِّ وَلَا يَزْنُونَ وَمَن يَفْعَلْ ذَلِكَ يَلْقَ أَثَامًا يُضَاعَفْ لَهُ الْعَذَابُ يَوْمَ الْقِيَامَةِ وَيَخْلُدْ فِيهِ مُهَانًا﴾[1] لەم ئایەتەدا خودای پەروەردگار پێمان دەفەرموێت: هەرکەسێك جگە لە خودا کەسێکی تر بپەرستێت، وە کەسێك بکوژێت کە خودا کوشتنی حەرام کردووە، وە زینا بکات " ئەو کەسە خۆی توشی تاوان کردووە و بە تاوانباری دەگەڕێتەوە بۆ لای خودا، خودای گەورەش لە قیامەتدا چەند قات سزایان لەسەر قورس و گران دەکات و دەبێت بەسەر شۆڕی و زەلیلی و خەجاڵەتی لە جەهەننەمدا بمێنێتەوە. جا بابزانین سزاکەیان چی یە:

١ـ لە ناخۆشترین و گەرمترین و بۆگەنترین دەرگای جەهەننەمەوە دەیانبەنە ژورەوە، خودای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَهَا سَبْعَةُ أَبْوَابٍ لِّكُلِّ بَابٍ مِّنْهُمْ جُزْءٌ مَّقْسُومٌ﴾[2] واتا: دۆزەخ حەوت دەرگای هەیە لە هەر دەرگایەکەوە چەند دەستەیەك لە تاوانبارانی لێوە دەچێتە ژورەوە .

* عطاء: فەرموویەتی:(أشدُ تِلكَ الأبواب ِغماً وحراً وكرباً وأنتنها ريحاً للزناة)[3] واتا: لە هەموو دەرگایەکان ناخۆشتر و گەرمتر و خەماوی تر، وە لە هەموویان بۆگەنتر ئەو دەرگایەیە

١ـ الفرقان : ٦٨ـ ٦٩

٢ـ الحجر : ٤٤

٣ـ حلية الأولياء لأبي نعيم : ٥/ ١٨٥

کە زیناکارانی لێوە دەبەن ژوورەوە !!

٢ـ بە ڕووتی دەخرێنە ناو چاڵێکی دۆزەخەوە کە شێوەکەی لە تەندور دەچێت، پێغەمبەری خوداﷺ لە فەرموودەی اسراء و میعراجدا[١] بۆمان دەگێڕێتەوە کە: (فَانطَلَقنا فأَتَينا على مثلِ التنورِ، ـ قال :فأحسبُ أنّه كان يقول: فإذا فيه لغطٌ و أصواتٌ ـ قال : فاطلعنا فيه فإذا فيه رجالٌ ونساءٌ عراةٌ، وإذا هم يأتيهم لهبٌ من أسفلِ منهم ، فإذا أتاهم ذلك ضَوضَوا، قال: قلت لهما: ما هؤلاءِ؟ قال: قالا لى: انطَلق ...وأما الرجالُ والنساءُ العراةُ الذين فى مثلِ بناءِ التنورِ، فإنهم الزُناةُ والزَواني)[٢]واتا: لەگەڵ دوو فریشتە ڕۆیشتین گەیشتینە شوێنێك شێوەکەی لە شێوەی تەنور دەچوو، قاوو قیژ و هاوار هاواری لێدەهات، کاتێك سەیرمان کرد بینیمان چەندین پیاو و ئافرەتی تێدان بە ڕووتی، سەلکە بزوت و کڵپەی ئاگریان لە ژێرەوە بۆ دەهێنن، جا هەرکاتێك ئەم سەلکە بزوت و کڵپە ئاگرەیان بۆ دەهات هاواریان دەکرد و دەیان قیژاند لە بەر زۆری تین و گەرمیەکەیان!! منیش پرسیم ئەوانە کێن بۆ ئاوایان لێدەکرێت؟ گووتیان با بڕۆین ...پاشان گووتیان: ئەو پیاو و ئافرەتانەی سەلکە بزوت و کڵپەی ئاگرەکەیان بۆ دەبردن لە ناو تەنورەکەدا ئەوانە پیاوان و ئافرەتانی زیناکار بوون.

٣ـ دامێنی پیاوان و ئافرەتانی زیناکار لە دۆزەخدا بۆگەن دەکات" بەشێوەیەك خەڵکی دۆزەخ سەرەڕای ئەشکەنجە و ئازاری خۆیان لەم بۆگەنەش بێزار دەبن، ئەمەش هەم ئابڕوچونە بۆ زیناکاران لە قیامەت ، وەهەم ئازارو ئەشکەنجەشە، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (وإنّ فروج الزناةِ لَيؤذى أهلَ النارِ نَتَنُ رِيحِها)[٢]واتا: بە ڕاستی دامێنی زیناکاران لە بەر بۆگەنیان خەڵکی دۆزەخ ئازار دەدەن .

جا برای بەڕێز خوشکی ئازیز: بیر بکەرەوە لەم سزا تۆقێنەرانەی خودای گەورە و پرسیارێك لە

---

١ـ پێشەوا بوخاری گێڕاویەتەوە .

٢ـ پێشەوا البزار گێڕاویەتەوە .

خۆت بكه‌ ئایا به‌رگه‌ی ئاگری دۆزه‌خ و ئه‌م نه‌هامه‌تیانه‌ ده‌گریت؟ وه‌ ئه‌م پرسیاره‌ به‌شێوه‌یه‌كی كرده‌یی جێبه‌جێ بكه‌ بچۆ ته‌نها ده‌نكه‌ شخارته‌یه‌ك بخه‌ره‌ ژێر بچوكترین ئه‌ندامی لاشه‌ته‌وه‌ هه‌ڵیبكه‌و لێی بگه‌ڕێ هه‌تاوه‌كو خامۆش ده‌بێت، ئینجا بزانه‌ به‌رگه‌ی ئازاره‌كه‌ی ده‌گریت؟ ئه‌ی ئه‌گه‌ر به‌رگه‌ی گه‌رما و سوتانی ده‌نكه‌ شخارته‌یه‌ك نه‌گریت كه‌ به‌شێكی زۆر زۆر كه‌مه‌ له‌ ئاگری دوونیا، له‌ كاتێكدا ئاگری دوونیاش به‌شێكه‌ له‌ حه‌فتا به‌شی ئاگری دۆزه‌خ، پاشان ئه‌م به‌شه‌ش دوو جار به‌ ئاوی ده‌ریا سارد كراوه‌ته‌وه‌!! ئه‌ی چۆن به‌رگه‌ی ئاگری دۆزه‌خ ده‌گریت كه‌ ئه‌وه‌نده‌ گه‌رمه‌ و سوته‌مه‌نیه‌كه‌شی مرۆڤ و به‌رده‌؟! بۆیه‌ خۆت بپارێزه‌ له‌ داوێن پیسی بۆ ئه‌وه‌ی خودای بالاده‌ست له‌م سزایه‌ بتپارێزێت. إن شاءالله.

## چه‌ند قه‌ڵغانێك بۆ خۆ پاراستن له‌ زینا

لێره‌دا چه‌ند قه‌ڵغانێك ده‌خه‌ینه‌ به‌رده‌ستی موسڵمانان به‌گشتی و گه‌نجان به‌تایبه‌تی بۆئه‌وه‌ی به‌م قه‌ڵغانانه‌ خۆیان بپارێزن له‌ تاوانی زینا و داوێن پیسی:

**قه‌ڵغانی یه‌كه‌م/ هه‌ست كردن به‌ مه‌ترسی و ده‌ر ئه‌نجامه‌كانی زینا له‌ دوونیاو له‌ قیامه‌ت:** كه‌ بریتین له‌: حه‌یا چون و فه‌قیری و ته‌مه‌ن كورتی له‌ دوونیاو توڕه‌یی خودای گه‌وره‌ و لێپێچینه‌وه‌ی خراپ و سزای دۆزه‌خ له‌ قیامه‌ت، پێغه‌مبه‌ری خوداﷺ فه‌رموویه‌تی: (یا معشرَ الناسِ، اتَّقوا الزِّنی، فإنَّ فیه ستَ خصالٍ ثلاثاً فی الدُّنیا و ثلاثاً فی الآخرةِ، أما التي في الدُّنیا: فَیذهبُ البهاءَ، و یورثُ الفقرَ، ویَنقصُ العُمرَ، أَما التي في الآخرةِ: فسخط الله، و سوءُ الحسابِ، و عذاب النار)[1] واتا: ئه‌ی كۆمه‌ڵی خه‌ڵكی خۆتان له‌ زینا بپارێزن، چونكه‌ زینا شه‌ش تایبه‌تمه‌ندی به‌ دوای خۆیدا ده‌هێنێت، سێیان له‌ دوونیا و سێیان له‌ قیامه‌ت، هه‌رچی سیانه‌كانی دوونیان بریتین له‌وه‌ی‌نرێز و شكۆ ناهێڵێ، هه‌ژاری و نه‌داری به‌دوای خۆیدا ده‌هێنێت،

---

١- پێشه‌وایان بیهقی و سیوطی گێڕاویانه‌ته‌وه‌.

وە تەمەن کورت دەکات، وە ئەوانەی قیامەتیش بریتین لە: تورەیی خودای گەورە، لێپێچینەوەی خراپ، وە ئاگری دۆزەخ، وە جگە لەوەی کە مرۆڤی زیناکار لە دوونیادا بەردەوام مەترسی توشبونی بە طاعونی سەردەم ـ ئایدز ـ لەسەرە.

قەڵغانی دووەم/ هەست کردن بە چاودێری خودا. ئەی موسڵمانی بەڕێز بیر لەوە بکەرەوە کە هەموو کات خودای گەورە دەتبینێت، ئینجا لە خۆت بپرسە: ئایا چۆن لە ڕوت دێت بە بەرچاوی خوداوە زینا بکەیت، لە کتێبەکانی (قصص) دا هاتووە: ئافرەتێك بۆ هەندێك پێویستی خۆی بەشەو لە ماڵ هاتبۆ دەرەوە، پیاوێکیش دوای کەوت هەتا گەیشتنە جێگایەکی چۆڵ، لە جێگا چۆڵەکە پیاوەکە پەلاماری ئافرەتەکەیدا بۆ ئەوەی دەستدرێژی بکاتە سەر، ئافرەتەکەش گووتی: لە شەرم و حەیای خۆت ناترسی؟ سەیرکەو بزانە ئاخۆ هەموو خەڵکی نوستوون؟ پیاوەکە بەم لاو بەو لای خۆیدا چاوی گێڕا، بینی هەموویان خەویان لێکەوتووە، ئینجا ئافرەتەکە ڕوی کردە پیاوەکەو گووتی: ئایا چی دەڵێی سەبارەت بە خودا، ئایا خودا خەوی لێکەوتووە یان نا؟ پیاوەکە گووتی: نەخێر خودای گەورە وەنەوزە خەو و نوستنی نیە، جا خودا چۆن دەخەوێ؟! ئافرەتەکە گووتی: کەواتا بزانە ئەو خودایەی کە نەخەوتووە و خەوی نیە ئەو دەمان بینێت، ئایا باشتر نیە لە جیاتی خەڵکی خەوتوو شەرم لە خودایەك بکەین کە نەخەوتووە و خەوی نیە و بە ئاگایە؟! پیاوەکە خەجاڵەت بویەوە و لە کارەکەی پەشیمان بوویەوە و تەوبەی کرد و بەڕاستی گەڕایەوە بۆ لای خودا، دوای مردنی خەویان پێوە بینی، لێیان پرسی: خودا چی پێکردی؟ گووتی: خودا لە گوناهی من خۆش بوو، لە بەرئەوەی ئەو شەوە من بەڕاستی لە خودا ترسام و بەڕاستیش تەوبەم کرد و گەڕامەوە بۆ لای ئەو.[1]

کەواتا: با ئێمەش شەرم لەو خودایە بکەین کە ﴿لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ﴾[2]واتا: نە وەنەوزە

١ـ بەسەرهات و پەند وەرگرتن: ٣٩ـ ٤٠

٢ـ البقرة : ٢٥٥

خەوی هەیەو نە دەشخەوێت !!

قەڵغانی سێ یەم/ هەست کردن بەوەی کە زینا قەرزە و وەریدەگریت، دانەوەی ئەم قەرزەش لە سەر مەحرەمەکانی تۆیە ، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (برُّوا آباءكم تبرُّكُم أبناءُكُم، وعِفوا تعُفُّ نساؤكم)[1] واتا: چاکە لەگەڵ دایك و باوکتان دابکەن، منداڵەکانتان لەگەڵتان چاك دەبن، وە داوێن پاك بن خێزانەکانتان داوێن پاك دەبن!!

گەورەمـــان أبو أمامةرضي الله عنهبۆمان دەگێڕێتەوەو دەفـــەرمووێت: گەنجێك هـــات بۆ لای پێغەمبەری خوداﷺ گووتی: ئەی پێغەمبەری خوداﷺ ڕێگام پێبدە زینا بکەم!! ئەو خەڵکەی لای پێغەمبەرﷺ بوون ڕویان کردە ئەو گەنجەو سەرزەنشتیان کرد و گووتیان بێدەنگ بە بێدەنگ بە، بەڵام پێغەمبەری ڕەحمەتﷺ فەرمووی: ئەم گەنجەم لێنزیك بکەنەوە، گەنجەکەیان لێنزیك کردەوە، پێغەمبەری خوداﷺ بە گەنجەکەی فەرموو: (أتحبه لأُمِكَ؟) واتا: ئایا پێت خۆشە زینا لەگەڵ دایکت دا بکرێت؟ گەنجەکە گووتی: (لا واللهِ جَعَلَنِيَ اللهُ فِداكَ) واتا: نەخێر سوێند بەخودا پێم خۆش نیە خودا بمکاتە فیدات، فەرمووی: (ولا الناس يحُبُونَه لأُمَهاتِهم ) واتا: کەواتا بزانە خەڵکیش پێی خۆش نیە زینا لەگەڵ دایکیدا بکرێت، ئینجا فەرمووی: (أفتحبه لأبنَتِك؟) واتا: ئا پێت خۆشە زینا لەگەڵ کچەکەتدا بکرێت؟ گەنجەکە گووتی: (لا واللهِ جَعَلَنِيَ اللهُ فِداكَ) واتا: نەخێر سوێند بەخودا پێم خۆش نیە خودا بمکاتە فیدات، فەرمووی: (ولا الناس يحُبُونَه لِبَناتِهم)واتا: کەواتا بزانە خەڵکیش پێی خۆش نیە زینا لەگەڵ کچەکەیدا بکرێت، دواتر فەرمووی: (أفتحبُهُ لأختِكَ؟) واتا: ئایا پێت خۆشە زینا لەگەڵ خوشکتدا بکرێت؟ گەنجەکە گووتی:(لا واللهِ جَعَلَنِيَ اللهُ فِداكَ) واتا: نەخێر سوێند بەخودا پێم خۆش نیە خودا بمکاتە فیدات،

١- پێشەوا طبرانی گێڕاویەتەوە.

فەرمووی: ( ولا الناس يحُبُونَه لأخَواتِهِم )واتا: کەواتا بزانە خەڵکیش پێی خۆش نیە زینا لەگەڵ خوشکیدا بکرێت، پاشان فەرمووی: (أفتحبه لعمَتِك) واتا: ئایا پێت خۆشە زینا لەگەڵ پورت ـ خوشکی باوکت ـ دا بکرێت؟ گەنجەکە گووتی: (لا والله جَعَلَنِيَ اللهُ فِداكَ) واتا: نەخێر سوێند بەخودا پێم خۆش نیە خودا بمکاتە فیدات ، فەرمووی : ( ولا الناس يحُبُونَه لعَماتِهِم ) واتا: کەواتا بزانە خەڵکیش پێی خۆش نیە زینا لەگەڵ پوریدا بکرێت ، لە کۆتا پرسیاردا فەرمووی: (أفتحبُهُ لخالتِكَ) واتا: ئایا پێت خۆشە زینا لەگەڵ پورت ـ خوشکی دایکتدا ـ بکرێت ، گەنجەکە گووتی: (لا والله جَعَلَنِيَ اللهُ فِداكَ) واتا: نەخێر سوێند بەخودا پێم خۆش نیە خودا بمکاتە فیدات ، فەرمووی : ( ولا الناس يحُبُونَه لخالاتهم )واتا: کەواتا بزانە خەڵکیش پێی خۆش نیە زینا لەگەڵ پوریدا بکرێت، ئینجا پێغەمبەری خوداﷺ دەستی خستە سەر ئەم گەنجە و دووعای بۆ کرد و فەرمووی: (اللهم اغفر ذنبَه و طَهِّر قلبَه و حَصِّنْ فرجَه قال: فَلَم يَكُنْ بعدَ ذلكَ يلتفتُ إلى شيءٍ)[1]واتا: خودایە لە تاوانەکانی ئەم گەنجە خۆش ببە، وە دڵی پاك بکەرەوە و داوێنی بپارێزە، أبو أمامە رضي الله عنه دەفەرموێت: دوای ئەمە ئەم گەنجە نەبینرا ڕوی بەلای داوێنپیسی و خراپەدا وەر بچەرخێنێت.

جا لەم فەرموودە دوو شتمان پێدەڵێت:

١ـ نەرم و نیانی و جوانی هەڵسو کەوتی پێغەمبەری خوداﷺ هەتا لەگەڵ ئەو کەسانەشدا کە سنوری ڕێز و ئەدەبیان بەرامبەر بەڕێزیان شکاندووە، وە لە هەمان کاتدا جوانی شێوازی تێگەیاند و قەناعەت پێکردنی بەرامبەرەکانی و دڵسۆزی پێغەمبەرﷺبۆ تاکەکانی ئومەتەکەی.

٢ـ ئەم فەرموودەیە ئەوەش دەگەیەنێت کە: هەرکەسێك زینا لەگەڵ مەحرەمی کەسێکدا بکات" ئەوە زینا لەگەڵ مەحرەمێکی ئەودا دەکرێتەوە. پێشەوا شافعی رحمه الله لە شیعرێکدا

١- پێشەوا احمد گێراویەتەوە.

جوان ئەم بابەتەی شیکردوتەوەو دەفەرمووێت:

عِفوا تعف نساؤكم في المحـــــرم وتجنبوا ما لا يليق بمسلـــــمِ

من يزني في بيتٍ بألف درهـــــمٍ في بيته يُزنى بغير الدرهـــــمِ

من يَزني يُزني به ولو بجــــــداره إن كنت يا هذا لبيباً فافهـــمِ

إن الزنا دَينٌ فإن أقرَضــــــته كان الوفا من أهلِ بَيتِك فاعلم

قەڵغانی چوارەم/ بیرکردنەوە لەگەورەیی داوێنپاکی و پاداشتی داوێنپاکان لە قیامەتدا، پێغەمبەری خۆشەویستﷺ هەواڵی پێداوین کە لە ڕۆژی قیامەتدا لە کاتی ئەم هەموو ناخۆشی و گەرمایەی دەشتی مەحشەردا" چەند کۆمەڵێك لە خۆشی و کامەرانیدان و ترسیان لەسەر نیە، چونکە ئەوانە لە ژێر سێبەری عەرشی خودا دان، یەکێك لەو کۆمەڵە کەسانە کەسێکە کە (...و رجل دعتهُ امرأةٌ ذات منصبٍ و جمالٍ إلى نفسها قال إني أخافُ اللهَ ربَّ العالمين)[1]واتا: پیاوێك ئافرەتێکی جوان و پلە دار داوی لێبکات بۆ کاری داوێن پیسی" ئەویش بڵێت من لە ترسی خودا ئەم کارە ناکەم.

وە پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (من يَضمَنُ لي ما بَين لحيَيهِ و ما بينَ رِجليهِ أضمَنُ له الجَنة)[2]واتا:هەرکەسێك دڵنیاییم پێبدات لەپاراستنی ئەو ئەندامەی لە نێوانی دەمیدایە- زمانی - و ئەو ئەندامەی لە نێوانی قاچەکانی دایە - دامێنی -، ئەوە من دڵنیایی پێدەدەم بە بەهەشت

قەڵغانی پێنجەم/ دور کەوتنەوە لە پێشەکیەکانی زینا،خودای پەروەردگار دەفەرمووێت:﴿وَلَا تَقْرَبُوا الزِّنَا﴾[3]واتا: لە زینا نزیك مەکەونەوە" بەواتەیەکی تر: هەر شتێك نزیکتان بکاتەوە لە

---

١- پێشەوا بوخاری گێراویەتەوە .

٢- پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

٣- الإسراء :٣٢

زینا" ئەوە خۆتانی لێبپارێزن. جا پێشەکیەکانی زینا زۆرن بەڵام دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەن کە شاعیر لەم شیعرەدا کۆی کردونەوە:

نظرةٌ فابتِسامةٌ فسلامٌ فكلامٌ فموعدٌ فلقاءٌ

واتا: زینا سەرەتا لە نیگایەکەوە دەست پێدەکات، پاشان لە نیگای دووەم خەندەیەکیش بەدوای خۆیدا دەهێنێت، پاشان ئەم خەندەیە دەبێت بە سڵاوکردن، وە ئەم سڵاوە گفتوگۆ و قسەکردن بە دوای خۆیدا دەهێنێت، وە لەم گفتوگۆ و قسەکردنەدا بڕیاری ژوانێك دەدرێت، لەم ژوانەشدا کوڕو کچێکی نا مەحرەم بەیەکەوە کۆ دەبنەوە و شەیتان دەبێت بە سێهەمیان، پێغەمبەری خوداﷺفەرموویەتی:(لا يخلوَنَّ رجلٌ بامرأةٍ إلا كانَ ثالثهُما الشيطنُ)[1]واتا: هەر کاتێك ژن و پیاوێکی نامەحرەم بەتەنیا لە جێگایەك کۆ ببنەوە" ئەوە شەیطان سێیەمیانە .

قەڵغانی شەشەم/ چاودێرکردنی وردی ئامێرە ئەلکترۆنیە سەردەمیەکانی ناو ماڵ: لەم ڕۆژگارەدا پێویستە سەرۆکی خێزان بە وردی چاودێری سەتەلایتی ماڵەوە و کۆمپیوتەر و ئینتەرنێتی منداڵەکانی بکات، بزانێت لە سەتەلایتەکەی ماڵەوە چ کەناڵێکی تێدایە؟ وە منداڵەکانی کام سایتانەی ئینتەرنێت دەکەنەوە. حوزەیفەی کوڕی یەمانرضي الله عنه فەرموویەتی: (ليوشكنَّ أن يُصِبَكم الشرُّ منَ السماءِ حتى يَبلُغ الفيافيَ ،قيل: وما الفيافيَ يا أبا عبدالله ؟ قال: الأرضُ القفرُ)[2]واتا: دور نیە لە ئاسمانەوە خراپەتان بەسەردا بڕژێت، تەنانەت (فیافی) دەگرێتەوە ، گووتیان (فیافی) چیە ئەی باوکی عبدالله؟ فەرمووی: زەوی وشك ـ بیابان ـ جا بەشێك لە زانایان دەفەرموون: ئەم خراپەی لە ئاسمانەوە دێت بریتیە لە: کەناڵە ئاسمانیەکان کە لە ڕێگای سەتەلایت و ئینتەرنێتەوە دێنە ماڵەکانمانەوە.[3]

---

١- پێشەوا ترمذی گێڕاویەتەوە و دەفەرموێت: (حسن صحیح).

٢- پێشەوا ابن ابی شیبە بە سەنەدێکی(حسن) گێڕاویەتەوە .

٣- کۆتایی جیهان محمد عریفی: ٥٧

جا برای بەڕێز خوشکی ئازیز: ئێستا بۆت دەرکەوت کە ئاینی پیرۆزی ئیسلام زیاتر لە ١٤٠٠ساڵ بەر لە ئێستا فەرمانی بە موسڵمانان کردووە کە خۆیان بپارێزن لە هۆکارەکان توشبون بە نەخۆشی ئایدز، لەبەر ئەوە تۆی موسڵمان پێویستت بەوە نیە کە وولاتانی کوفر رۆژێکت بۆ دیاری بکەن بۆ بەرەنگار بونەوەی ئایدز، پێویستت بەوە نیە کە ئەوان بێنە رێگا نیشان دەرت بۆ خۆ پاراستن لە ئایدز، بەڵکو بچۆ قورئان و فەرموودە بخوێنەرەوە، ئەم دوانە باشترین رێ نیشاندەرن بۆ خۆپاراستن لە ئایدز، وە بە پێی شەریعەتی ئیسلام ژیان بەرێبکە ئەوە دڵنیابە کە پارێزراو دەبیت لەم نەخۆشیە کوشندەیە ان شاء الله.



# ١٢/٩ ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕو بونەوەی گەندەڵی

دوای ئەوەی گەندەڵی لە زۆرێك لە وڵاتانی دونیا بوو بە دیاردەیەکی ترسناك و زۆرێك لە جومگەکانی دەسەڵاتی گرتەوە، کۆمەڵەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان هەستی بە گەورەیی ئەم مەترسیە کرد، لەبەر ئەوە لە ڕۆژی ٢٠٠٣/١٠/٣١دا دەستەی گشتی نەتەوە یەکگرتووەکان ڕێکەوتن نامەیەکیان پەسەند کرد بۆ ڕوبەڕو بونەوەی گەندەڵی، وە بۆ ئەوەی زیاتر خەڵکی هۆشیار بکرێتەوە دەربارەی مەترسی گەندەڵی، بڕیاردرا کە ساڵانە ١٢/٩بکرێت بە ڕۆژی ڕوبەڕ و بونەوەی گەندەڵی، وە ئەم بڕیارەش لە مانگی ١٢ی ٢٠٠٥دا کەوتە بواری جێبەجێ کردنەوە، لە دوای ئەم بەروارەوە ساڵانە بەشێك لە وولاتانی جیهان لە ڕۆژی ١٢/٩دا بە چەندین چالاکی یادی ئەم ڕۆژە دەکەنەوە و تیایدا هۆشیاری بڵاو دەکرێتەوە دەربارەی گەندەڵی،[1] بەڵام جێگای ئاماژەیە دیاریکردنی ئەم ڕۆژە و یادکردنەوەی هیچ کاریگەریەکی ئەوتۆی نەبووە لەسەر کەمکردنەوەی گەندەڵی، بەڵکو لە بەشێك لە وڵاتان دوای ئەم بەروارە گەندەڵی زیاتر بووە، نەوەکو کەم بکات!!

## پێناسەی گەندەڵی

ڕێکخراو و نوسەرەکانی بواری ڕوبەڕوبونەوەی گەندەڵی یەکدەنگ نین دەربارەی پێناسەیەکی دیاریکراو بۆ گەندەڵی، بەڵکو هەر ڕێکخراوە و نوسەرەی پێناسەیەکی تایبەتی بە خۆی کردووە بۆ گەندەڵی، ئێمە لێرەدا بەشێکیان باس دەکەین:

بەشێکیان دەڵێن: گەندەڵی بریتیە لە بەکارهێنانی دەسەڵاتی گشتی و پۆستی گشتی بۆ سودی تاکە کەس و تایبەت.[٢]

١- ویکیدیا: الموسوعة الحرة.

٢-یاسر خالد برکات الوائلي-الفساد الاداري مفهومه واسبابه – نوسینێکە بڵاوکراوەتەوە لە: www.annabaa.org –

بەشێکی تریان کەمێك دەستکاری ئەم پێناسەیان کردوەو دەڵێن: گەندەڵی بریتیە: لە خراپ بەکارهێنانی داهات و دەسەڵاتی گشتی بۆ سودی تایبەت.[1]

وە بانکی گشتی نێو دەولەتی بۆ گەشەپێدان بەم شێوەیە پێناسەی گەندەڵی کردووە و دەڵێت: بریتیە لە خراپ بەکارهێنان و قۆرخ کردنی دەسەڵات بۆ بە دەستهێنانی سود و قازانجی تایبەتی.[2]

وە رێکخراوی رەوشەنی - شفافیە - نێو دەولەتی دەڵێت: گەندەڵی بریتیە لە خراپ بەکار هێنانی دەسەڵاتی راسپێردراو بۆ سودی تاکە کەس.[3]

جا ئەمانەی سەرەوە بەشێك بوون لەو پێناسانەی کە بۆ گەندەڵی کراون، کە سەیریان بکەین هەموویان لە چوارچێوەیەکدا هەڵدەخولێن کە بریتیە(لە بەکارهێنانی پۆست و دە سەلات بۆ سودی تاکە کەس و تایبەت) کەواتا: هەر کەسێك لە هەر پلە و پۆستێکدا بێت بەرز یان نزم، ئەگەر پلەو پۆستەکەی بۆ سودی تاکە کەس بەکار هێنا، وە یان بۆ جگە لە کاری یاسایی خۆی بەکاری هێنا، ئەوە پێی دەگوترێت گەندەڵکار.

وە پێناسەیەکی تری گەندەڵی کە لەم چوارچێوەی پێناسەکانی تر دەچێتە دەرەوە دەڵێت: گەندەڵی بریتیە لە: دەرچون لە یاساو چوارچێوەی رەوشتە بەرزەکان و خۆ دزینەوە لەو بەها بەرزانەی کە پێویستە مرۆڤ پێیانەوە پەیوەست بێت، لەگەڵ سەرپێچی کردنی ئەو مەرجانەی کە دانراون بۆ بەرێوەبردنی کار.[4]

جا بە پێی ئەو پێناسەیە بێت هەر کەسێك کارێك و پلە و پۆستێك بەرێوە بەرێت و مافی

١- الفساد تعريفه، و أسبابه و آثاره ووسائله مكافحته، القاضي رحيم حسن المكيلي: ٣

٢- د. سيف راشد الجابري و د. كامل صكر القيسي – كيف واجه الاسلام الفساد الاداري – ٢٨

٣- منظمة الشفافية الدولية – تقرير الفساد العالمي لە ساڵی ٢٠٠٧

٤- . الفساد تعريفه، و أسبابه و آثاره ووسائله مكافحته، القاضي رحيم حسن المكيلي: ٣

خۆی پێنەدات و مەرجەکانی بەڕێوە بردنی جێبەجێ نەکات پێی دەگووترێت گەندەڵکار.

## گەندەڵی لە دیدی ئیسلامەوە

دکتۆر وەهبە زوحەیلی دەفەرمووێت: گەندەڵی لە شەریعەتی ئیسلامدا یەکێکە لە تاوانە گەورەکان و بە کۆدەنگی زانایان ـ إجماع ـ حەرامە، چونکە چەندین بەڵگەمان بەدەستەوەیە لە قورئان و سوننەت کە گەندەڵی بە حەرام دادەنێن، وە چونکە زیانی هەیە بۆ موسڵمانان و جگە لە موسڵمانانیش،[1] ئەمانەی خوارەوەش چەند بەڵگەیەکن لەقورئان وسوننەت:

١ـ خودای پەروەردگار لە چەندین جێگا لە قورئانی پیرۆزدا گەندەڵی بە حەرام داناوە، وە هەڕەشەی سزا و تۆڵەی کردووە لە گەندەڵکاران، وە ڕایگەیاندووە کە گەندەڵکارانی خۆشناوێت، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿وَلاَ تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلاَحِهَا﴾[2] واتا: خراپە و گەندەڵی لە زەویدا بڵاو مەکەنەوە دوای ئەوەی خودای پەروەردگار لە ڕێی پێغەمبەرانەوە علیهم الصلاه والسلام چاکسازی لە زەوی بڵاو کردەوە.وە دەفەرمووێت: ﴿وَاللّهُ لاَ يُحِبُّ الْمُفْسِدِينَ﴾[3] وە دە فەرمووێت: ﴿وَاللَّهُ لَا يُحِبُّ الْفَسَادَ﴾[4]واتا: خودای پەروەردگار گەندەڵی و گەندەڵکارانی خۆشناوێت. وە خودای پەروەردگار کاتێك باسی ئەو تاوانانە دەکات کە بەهۆیانەوە فیرعەون توشی سزای خودابوو دەفەرمووێت: ﴿فَأَكْثَرُوا فِيهَا الْفَسَادَ﴾[5]واتا: یەکێك لە تاوانەکانی فیرعەون و داروودەستەکەی ئەوەبوو: خراپە و تاوانی زۆریان ئەنجام دەداو دەسەڵاتیان بۆ کاری دروست بەکار نەدەهێنا.

---

١ـ موسوعة الفقه الإسلامي والقضايا المعاصرة: ١٢/ ١١٣

٢ـ الأعراف: ٥٦

٣ـ المائدة: ٦٤

٤ـ البقرة: ٢٠٥

٥ـ الفجر: ١٢

٢ـ پەیامی هەموو پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام چاکسازی بووە کە پێچەوانەی گەندەڵیە، خودای پەروەردگار لەسەر زاری پێغەمبەرشوعەیبەوە علیه السلام دەفەرمووێت: ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا الْإِصْلَاحَ مَا اسْتَطَعْتُ﴾[1] واتا: ئەی گەلەکەم من لە چاکسازی بەو لاوە هیچی ترم لە ئێوە ناوێت، وە هەرچەندێك بتوانم چاکسازی دەکەم لە ناوتاندا.

٣ـ پێغەمبەری خوداﷺ هەڕەشەی کردووە لەو کەسانەی کە پۆست و پلە و پایەکەیان بە گەندەڵی بەڕێوە دەبەن و بۆ مەبەستی تایبەت بەکاری دەهێنن و پشت دەکەن جێبەجێکردنی کارو باری موسڵمانان و دەفەرمووێت: (مَنْ وَلَّاهُ اللَّهُ عَزَّ وَجَلَّ شَيْئًا مِنْ أَمْرِ الْمُسْلِمِينَ فَاحْتَجَبَ دُونَ حَاجَتِهِمْ وَخَلَّتِهِمْ وَفَقْرِهِمْ احْتَجَبَ اللَّهُ عَنْهُ دُون حَاجَتِهِ وَخَلَّتِهِ وَفَقْرِهِ)[2] واتا: هەرکەسێك خودای پەروەردگار کردی بە کاربەدەست بەسەر موسڵمانانەوە، ئەویش پشتی کردە جێبەجێکردنی پێداویستی و کارو بارەکانیان و هەژارەکانی پشتگوێ خست" ئـەوە خودای پەروەردگار لە قیامەتدا پێداویستیەکانی جێبەجێ ناکات و بە هەژاری دەیهێڵێتەوە و دەرگای بەسەردا دادەخات. وە پێغەمبەری خوداﷺ دووعای کردووە لەو کاربەدەستانەی کە کارو بار لەسەر موسڵمانان گران دەکەن و دەفەرمووێت: (اللَّهُمَّ مَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَشَقَّ عَلَيْهِمْ فَاشْقُقْ عَلَيْهِ وَمَنْ وَلِيَ مِنْ أَمْرِ أُمَّتِي شَيْئًا فَرَفَقَ بِهِمْ فَارْفُقْ بِهِ)[3] واتا: ئەی خودایە هەر کەسێك کارو باری ئومەتەکەمی گرتە دەست" ئەگەر کارو باری لەسەر قورس و گران کردن" ئەوە تۆش کاروباری لەسەر قورس و گران بکە، وە ئەگەر کاروباری لەسەر سوك و ئاسان کردن و لەگەڵیان بە سۆز بوو" تۆش کارو باری لەسەری سوك و ئاسان بکە و لەگەڵی بەسۆز بە.

٤ـ گەندەڵی هۆکاری سەرەکیە بۆ خواردنی ماڵی یەکتر بە بێ بەرامبەر، ئەمەش لە

١ـ هود: ٨٨

٢ـ پێشەوا أبو داود گێراویەتەوە.

٣ـ پێشەوا احمد گێراویەتەوە.

ئیسلامدا حەرامە، خودای پەروەردگار دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُم بَيْنَكُم بِالْبَاطِلِ وَتُدْلُوا بِهَا إِلَى الْحُكَّامِ لِتَأْكُلُوا فَرِيقًا مِّنْ أَمْوَالِ النَّاسِ بِالْإِثْمِ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[1] واتا: نەکەن ماڵ و دارایی یەکتر لە نێوانتاندا بە ناحەق بخۆن ـ وەك بەرتیل و سو، وە یان داگیر کردن و فروفێڵ...ـ وە نەکەن هەندێکی لێبدەن بە کاربەدەستان و بۆ ئەوەی هەندێکتان ماڵی خەڵکی بخۆن لە ڕێگەی ناحەق و تاوانەوە، لە کاتێکدا خۆشتان دەزانن ئەو کارە ڕەوا نیە.

## هۆکارەکانی بڵاوبونەوەی گەندەڵی

هۆکارەکانی بڵاوبونەوەی گەندەڵی زۆرن، دیارترینیان ئەمانەی خوارەوەن:

١ـ جێبەجێ نەکردنی حوکمی خودا و کار نەکردن بە یاساکانی قورئان وسوننەت و وەدەر نانی شەریعەتی خودا لە مەیدانی کار.

٢ـ لاوازبونی ئادابە جوانەکان و بەها بەرزەکانی مرۆڤایەتی و بڵاوبونەوەی دنیاگەری.

٣ـ دەستگرتنی کار بەدەستان بە کورسی دەسەڵات و گرتنەبەری هەر ڕێگایەك بۆ مانەوەیان لەسەر کورسی دەسەڵات.

٤ـ جێبەجێکردنی سیاسەت بۆ سودی تاکە کەس و گواستنەوەی کەرتی گشتی بۆ کەرتی تایبەت و هەوڵدان بۆ بەدەستهێنانی زۆرترین سود و قازانج.

٥ـ هەستکردنی هاووڵاتی بەوەی کە یاسا تەنها بەسەر چینی خوارەوەدا جێبەجێ دەکرێت و چینی سەرەوە لە سەروی یاساوەن.

٦ـ جیاوازی زۆر لە نێوان موچە و دەرماڵەی فەرمانبەرانی پلە باڵا و پلە نزم.

٧ـ زاڵبونی پەیوەندیە تایفی و کۆمەڵایەتیەکان بەسەر یاسادا.

٨ـ بڵاوبونەوەی نەزانی و هەست نەکردن و نەزانینی ئەرك و مافەکان.

٩ـ نەبونی دەزگای چاودێری و لێنەپرسینەوە لە گەندەڵکاران.

١٠ـ لاوازبونی دەسەڵاتی دادوەری و یاسادانان و ملکەچبونی بۆ دەسەڵاتی جێبەجێکار.[١]

ئەمانەی سەرەوە بەشێك بون لە هۆکارەکانی بڵاونەوەی گەندەڵی، وە لە باسکردنی هۆکارەکانی چارەسەری گەندەڵی چەند خاڵێکی تریشمان بۆ دەردەکەوێت، چونکە پێچەوانەی هۆکارەکانی چارەسەر یەکسانە بە هۆکاری گەندەڵی.

## هۆکارەکانی چارەسەر کردنی گەندەڵی

پێشتر باسی گرنگترین هۆکارەکانی بڵاوبونەوەی گەندەڵیمان کرد، جا پێچەوانەی هەر هۆکارێکی گەندەڵی یەکسانە بە هۆکاری چارەسەری گەندەڵی، بەڵام جگە لەم هۆکارانەش چەند هۆکارێکی تر باس دەکەین بۆ چارەسەری گەندەڵی کە دەیسەلمێنن ئیسلام چارەسەرە:

١ـ هەست کردن بە چاودێری خوداو بونی ترسی خودا: چونکە هەرکەسێك لە خودا بترسێت و بزانێت کە خودای پەروەردگار بەردەوام چاودێریەتی ئەوە هەرگیز ناتوانێت گەندەڵی بکات، پێشەوا عمری کوڕی خەططاب رضي الله عنه عەییاضی کوڕی غەنەمی رضي الله عنه کرد بە والی بەشێکی شام، دوای ئەوەی عەییاض رضي الله عنه بوو بە بەوالی پێنج لەئامۆزاکانی و خزمە نزیکەکانی تری هاتن بۆ لای و چەند شەوێك لای مانەوە، عەییاضیش رضي الله عنه زۆر ڕێزی گرتن، پاشان داوایان لە عەییاض کرد شتێکیان بداتێ، عەییاضیش رضي الله عنه یەکەی دە دیناری دانێ، ئەوانیش تورە بوون و گوتیان ئێمە لەم دورەوە هاتووین تۆ چۆن تەنها دە دینارمان دەدەیتێ؟! ئەویش گووتی: ئامۆزاکانم بم بورن کە کەمم پێدان، چونکە من نکۆڵی لە خزمایەتی ئێوە ناکەم، وە دەزانم ڕێگاشتان دورە، بەڵام سوێند بەخودا ئەو پارەیەی کە پێمدان هی ئەوە بوو کە چوم خزمەتکارەکەم و ئەو شتانەی ناومالم فرۆشت کە پێویستیم پێیان نەبوو، بەهاکەیشم دا بە

١ـ مفهوم الفساد و كيف عالجه الإسلام، بقلم الأستاذ المنصف بوصرصار، سايتى حركة اللقاء. بە دەستکاریەوە.

ئێوە!! ئەوانیش گوتیان: سوێند بە خودا ناتبورین، تۆ والی نیوەی شامی کەچی تەنها دە دینارمـــان پێدەدەیت کە بەشی مەسـرەفی ڕێگاشمان ناکات؟ عـــەییاضیش گوتی: دەتانهەوێ لە ماڵی موسڵمانان بۆتان بدزم و بیدەم بە ئێوە؟! دە سوێند بە خودا ئەگەر بە موشار بمبڕنەوە و بمکەن بە چەند پارچەیەك لام خۆشترە لەوەی کە ناپاکی بکەم لە موسڵمانان و لەو کەسانەی لە ژێر دەستمدان و بە ستەم فلسێکیان لێبسەنم و لێیان بدزم!![1]

سبحان الله!! کێ دەتوانێ بەراوردی بەر پرسانی ئەوکات و ئێستا بکات؟ ئەو کات لە ترسی خودا ئامادە نەبوون تەنها فلسێك ناپاکی لە گەلەکەیان بکەن" کەچی لەم ڕۆژگارەدا چەند کەسێکی دیاریکراو داهاتی میللەتێك بۆ خۆیان بە ڕەوا دەبینن و هیچ بایەخیش بەوە نادەن کە ڕۆژگارێك دێت دەمرن و دەگەڕێنەوە بۆ لای خودا، وە لەبەردەم خودادا ملیۆنەها کەس سکاڵایان لەسەر تۆمار دەکات و ئەوانیش سەر شۆڕ و بێ وەڵام دەبن.

٢ـ هەستکردن بەوەی ئەم پلەو پایە و دەسەڵات و فەرمانبەریە سپاردەیە، بە زایەدانی سپاردەش تاوانێکی گەورەیە، خودای پەروەردگار دەفەرمووێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَخُونُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ وَتَخُونُوا أَمَانَاتِكُمْ وَأَنتُمْ تَعْلَمُونَ﴾[2] واتا: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ناپاکی مەکەن بەرامبەر بە خودا و پێغەمبەر ﷺ ـ بەوەی کە کەمتەرخەم بن بەرامبەر فەرمانبەرداریان ـ وە ناپاکیش مەکەن بەرامبەر بەو سپاردانەی پێتان دەسپێردرێت، لە کاتێکدا ئێوە دەزانن ئەو کارەتان ناپاکیەو تـــاوانە. وە گەورەمان ابو هریرە لە پێغەمبـــەری خوداوە ﷺ بۆمان دەگێڕێتەوە کە فەرمویەتی: (آيةُ المنافقِ ثلاثٌ:...و إذا ائْتُمِنَ خانَ)[3] واتا:

١ـ پێشەوایان ابن جوزی و ابن عساکر گێراویانەتەوە.

٢ـ الأنفال: ٢٧

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێراویانەتەوە.

نیشانەکانی مرۆڤی دوو ڕوو سیانن: .... یەکێك لەوانە ئەگەر کرا بە ئەمیندار و سپاردەی پێدرا" ناپاکی لێدەکات.

٣ـ بونی دەزگای چاودێری کارا و لێپرسینەوە لە گەندەڵکاران. ئەگەر سەیری سەردەمی جێنشینایەتی پێشەوا عمری کوڕی خەتتاب ﷺ بکەین"دەبینین کەهۆکاری سەرەکی سەرکەوتنی پێشەوا عمر ﷺ لە کارەکەیدا بریتی بووە لە لێپرسینەوە لە کاربەدەستان و دانانی دەزگای چاودێری و دەزگای هەواڵگری بەسەر والی و کار بەدەستانەوە، وە محمدی کوڕی مەسلەمەی دیاری کردبو بۆ بەدواداچونی کار و باری والیەکان، وە بۆخۆشی هەرکاتێك سکاڵایەکی لەسەر کار بەدەستێکی دەوڵەت پێگەیشتبا دەستبەجێ بەدواداچونی بۆ دەکرد و سزای کاربەدەستی کەم تەرخەمی دەدا بە پێی قەبارەی کەمتەرخەمیەکەی، بۆ نمونە: عەمری کوڕی عاص ﷺ کە والی میصر بوو، مینبەرێکی بۆخۆی دروستکرد، پێشەوا عمر ﷺ نامەیەکی بۆ نارد و فەرمووی: هەواڵم پێگەیشتووە کە میبنەرێکت بۆ خۆت دروستکردووەو بەرزی بەسەر موسڵمانانداا، ئەوەندەت بەسە کە تۆ بەپێوە بیت و موسڵمانانیش لەبەر دەمتا دابنیشن، لەبەر ئەوە من بڕیاری خۆم لەسەر داوی کە ئەو مینبەرە بشکێنن!![٢]

وە پیاوێکی قیبطی میصری سکاڵای لای پێشەوا عمر ﷺ کرد لەسەر کوڕێکی عەمری کوڕی عاص ﷺ کە بە قامچی لە کوڕەکەی دابوو، پێشەوا عمریش ﷺ بانگهێشتی عەمر و کوڕەکەی کرد و قامچیەکی دایە دەست کوڕی پیاوە قیبطـــیەکە و فەرمانی پێکرد تۆڵەی خۆی لە کوڕی عەمر بکاتەوە، ئەویش بە قامچیەکە لە کوڕی عەمڕی داو تۆڵەی خۆی کردەوە، پاشان پێشەوا عمر فـــەرمووی: ئەگەر لە عەمری کوڕی عاصیشت دابایـە دەستم نەدەگـــرتیت،

١ـ ژیانی ئەمیری باوەڕداران خەلیفەی دووەم عمری کوڕی خطاب، صلابی ، وەرگێرانی عەفان شێخ صدیق: ٤١٤.

چونکە کوڕەکەی عەمرِ بەهۆی دەسەڵاتی باوکیەوە لە تۆی داوە!! عەمریش‌رضي الله عنه گووتی: ئەگەر عەمریش لە باوکی ئەو کوڕەی بدایە ئەوە کارمان نەدەگەیشتە ئەمە!! لەم کاتەدا پێشەوا عمررضي الله عنه لای کردەوە بەلای عەمردا و ووتە بەناو بانگە جیهانیەکەی فەرموو: (متى استعبدتم الناس و قد وُلدوا أحراراً)[1] واتا: ئەوە لە کەیەوە خەڵکیتان کردووە بە بەندە لە کاتێکدا بە ئازادی لە دایکبوون.

وە جورەیری کوڕی عبداللە ی بەجلی دەفەرمووێت: پیاوێکی دەنگ زل و جەربەزە لەگەڵ ابو موسای ئەشعەریدا بوو، کاتێك کە دەستکەوتێکیان دەستکەوت، ئەبو موسا هەندێکی لە بەشەکەی خۆی پێدا، بەڵام پیاوەکە داوای هەمووی دەکرد، لەبەر ئەوە ابو موسا بیست قامچی لێداو سەری تاشی، پیاوەکە موەکانی سەری کۆکردەوە و چو بۆ لای پێشەوا عمررضي الله عنه، جورەیر دەفەرمووێت من نزیکترین کەس بووم لە پێشەوا عمررضي الله عنه، پیاوەکە دەستی کرد بە گیرفانیدا و مووەکانی دەرهێنان و دای بە سینگی پێشەوا عمردارضي الله عنه و گووتی: سوێند بە خودا ئەگەر ئاگر نەدەبوو..پێشەوا عمر فەرمووی: ڕاست دەکات ئەگەر ئاگر نەدەبوو..! پاشان پیاوەکە گووتی: ئەی ئەمیری باوەڕداران من پیاوێکی دەنگ زل و جەربەزە و لێهاتوم... چیرۆکەکەی بۆ گێڕایەوە، گووتی: ئەبوو موسا بیست قامچی لێداوم و سەری تاشیوم، وا دەزانێت تۆڵەی لێناکرێتەوە، پێشەوا عمررضي الله عنه فەرمووی: هەر کەسێك ئاوا ئەترسانە سکاڵا بێنێت بۆ لام" پێم خۆشترە لە هەموو ئەو دەستکەوتانەی کە خودا دەمانداتێ، دواتر پێشەوا عمر نامەیەکی نوسی بۆ ابو موسا و تێیدا نوسیبوو: سلاوت لێبێت، فلان کەس هەواڵی پێداوم بە چەند شتێك، ئەگەر تۆ ئەو کارەت لە نێو قەرەباڵغید کردووە" ئەوە بڕیارم لەسەر داوی کە لە نێو قەرەباڵغی خەڵکدا

---

[1] - ژیانی ئەمیری باوەڕداران خەلیفەی دووەم عمری کوڕی خطاب، صلابي: ٤١٤- ٤١٥.

دابنیشیت، تا تۆڵەت لێبکاتەوە، وە ئەگەر تۆ ئەو کارەت لە چۆڵیدا کردووە، ئەوە بڕیارم لەسەر داویت کە لە چۆڵیدا دابنیشیت هەتا تۆڵەت لێبکاتەوە، جا پیاوەکە گەڕایەوە بۆ لای ابو موسا، ابو موسا هاتە ناو خەڵك بۆ ئەوەی پیاوەکە تۆڵەی لێبکاتەوە، پیاوەکەش هاتە پێش بۆ ئەوەی تۆڵەی خۆی بکاتەوە، خەڵکی پێیان گووت: بیبەخشە، پیاوەکە گووتی: نا سوێند بە خودا نایبەخشم، کاتێك ابو موسا دانیشت بۆ ئەوەی پیاوەکە تۆڵە لێبکاتەوە، پیاوەکە سەری بەرز کرد بۆ ئاسمان و گووتی: ئەی خودای گەورە ئەوە لەبەر خاتری تۆ بەخشیم.!![1]

جا لەهەر جێگایەکدا دەزگای چاودێریەکی کارا و سەربەخۆ هەبێت بێگومان لەوێ گەندەڵی بونی نابێت، چونکە بەشێکی خەڵکی لە ترسی خودا و لێپرسینەوەی قیامەت گەندەڵی ناکەن" بەشەکەی تریشی لە ترسی لێپرسینەوەی دونیایی.

٤ـ دانانی یاساو سزای تایبەت بۆ گەندەڵکاران: پێویستە یاسای تایبەت و سزای تایبەت دیارە بکرێت بۆ ئەو کەسانەی گەندەڵی دەکەن، ئەو سزایەش بە پێی گەورەیی و قەبارەی گەندەڵیەکە دیاری بکرێت و جێبەجێش بکرێت.

٥ـ دانانی کەسی شیاو بۆ جێگای شیاو، لەسەر بنەمای شیاوی و تایبەتمەندی، دور لە خزمایەتی و دۆستایەتی، أبو زەڕی غەففاری رضي الله عنه داوای پۆستی لە پێغەمبەری خودا ﷺ کرد، پێغەمبەری خوداش ﷺ دەستی لە شانی داو فەرمووی: (یا أبا ذرٍّ إنَّك ضَعیفٌ، و إنَّهاأمانةٌ، و إنَّها یَومَ القیامة خزیٌ و ندامَةٌ، إلآ مَنْ أَخَذها بِحَقِّها و أدَّی الذی عَلیهِ فیها)[2] واتا: ئەی ئەبا زەڕ تۆ کەسێکی لاوازیت، کار بەدەستیش سپاردەیە، وە لە ڕۆژی قیامەتیش سەر شۆڕی و پەشیمانیە، تەنها بۆ کەسێك نەبێت کاتێك کرا بەکار بەدەست مافی خۆی پێبدات.

---

١ـ ژیانی ئەمیری باوەڕداران خەلیفەی دووەم عمری کوڕی خطاب، صلابی : ٤١٥.

٢ـ پێشەوا احمد گێڕاویەتەوە.

جا لێرەدا پێغەمبەری خوداﷺ نەیفەرموو: ئەوە ئەبو زەڕڕەو هەر لە زوەوە موسڵمان بووە و لە کۆچکارانە و بەشداری غەزاکانی کردووە و کەسێکی دڵسۆزە..هتد با بیکەم بە کاربەدەست و پاداشتی بدەمەوە، بەڵکو ئامۆژگاری کردو تێیگەیاند کە کاربەدەستی بۆ ئەو نابێت، چونکە کاربەدەستی بە خزمایەتی و نزیکایەتی نیە، بەڵکو بە لێهاتوویی و تایبەتمەندیە،

پاشان پێویستە ئەو کەسانەی پلە و پۆستیان پێدەدرێت لە پاڵاوگەکانی دەستەی ئەستۆپاکی ـ نەزاهەـ دەرچوبن و هیچ تێبینیەکیان لەسەر نەبێت. دیسان کاتێك سەیری مێژوی ئیسلام دەکەین دەبینین ئەستۆپاکترین کەسەکان کاندید کراون بۆ پلە و پۆست، بۆ نمونە: کاتێك پێشەوا عمر بریندار کرا شەش کەسی دوای خۆی کاندید کرد بۆ جێنشینایەتی، کە بریتی بوون لە عثمانی کوڕی عەففان و علی کوڕی أبوطالب و عبدالرحمن کوڕی عەوف و سعدی کوڕی أبی وەققاص و طەلحەی کوڕی عبداللە و و زوبەیری کوڕی عەووام رضي الله عنهم. کە ئەوانە هەموویان شاهیدی ئەستۆ پاکیان لە لایەن پێغەمبەرەوەﷺ بۆ درابوو، چونکە هەموویان موژدەی بەهەشتیان پێدرابوو.

وە بەتایبەت پلە باڵاکانی دەوڵەت پێویستە کەسی شیاو و بەدین و ئەستۆ پاکیان بۆ دابنرێت، چونکە وەك گوتراوە: (النَّاسُ علی دِینِ ملوکِهِم) وە (الموظفین علی دین رؤسائهم)واتا: خەڵکی لەسەر دینی کاربەدەستانن، بە هەمان شێوە فەرمانبەرانیش لە سەر شێوازی کارو کردەوە و بەرنامەی بەڕێوەبەرەکانیان کار دەکەن، ئەگەر کاربەدەست و بەڕێوەبەر چاك و باش بوو" ئەوە فەرمانبەریش چاك و باش دەبێت، وە ئەگەر کاربەدەست و بەڕێوەبەر لار و چەوێڵ و گەندەڵ بوو" بێگومان فەرمانبەریش لارو چەوێڵ و گەندەڵ دەبێت.

٦ـ بێلایەنی دادگاکان و جێبەجێکردنی یاسا بە یەکسانی بەسەر هەر هاووڵاتیەك، جا ئەو هاووڵاتیە پلە بەرز بێت یان پلە نزم. جا کە سەیر دەکەین ئەم خاڵەشیان لە سەردەمی زێڕینی

ئیسلامدا دەدرەوشێتەوە، لە سەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئافرەتێکی مەخزومی دزی کردبوو، قورەیشیەکان زۆر خەمیان بوو پێیان ناخۆش بوو کە دەستی ببڕدرێت، لەبەر ئەوە گوتیان: دەبێت کێ بتوانێت قسە لەگەڵ پێغەمبەردا ﷺ بکات بۆ ئەوەی ئەم سزایە ـ حد ـ ە جێبەجێ نەکات، هەندێکیان گوتیان هیچ کەسێك لە ئوسامەی کوڕی زەید باشتر نیە بۆ ئەوەی پێغەمبەر ﷺ ڕازی بکات، چونکە ئوسامە رضي الله عنه خۆشەویستی کوڕی خۆشەویستی پێغەمبەرە، جا ئوسامە قسەی لەگەڵ پێغەمبەردا کرد، پێغەمبەری خودا ﷺ فەرمووی: ئەی ئوسامە تۆ چۆن تکا دەکەی بۆ ئەوەی حوکمێکی خودا جێبەجێ نەکرێت؟! پاشان چۆ سەر مینبەر و فەرمووی: (إنّما أَهْلَكَ الذينَ مَنْ قَبْلَكُمْ أَنَّهُم كانُوا إِذا سَرَقَ فِيهِمُ الشَّرِيفُ تَرَكُوهُ، وَإِذا سَرَقَ فِيهِمُ الضَّعِيفُ أَقامُوا عَلَيهِ الْحَدُّ ، وَايْمَ اللهِ: لَو أَنَّ فاطِمَةَ بنتَ مُحَمَّدٍ سَرَقَتْ لَقَطَعْتُ يَدَهَا)[1] واتا: بێگومان ئوممەتانی پێش ئەوە بەوە لە ناو چوون کە ئەگەر کەسێکی پلە بەرزو خاوەن شان و شکۆ دزی کردبا ئەوە وازیان لێدەهێنا، بەڵام ئەگەر کەسێکی لاواز و بێکەس و پلە نزم دزی کردبا ئەوە حوکمی خودایان لەسەر جێبەجێ دەکرد، جا سوێند بە خودا ئەگەر فاطمەی کچی محمد دزی بکات دەستی دەبڕم.

جا بەداخەوە ئەم ڕۆژگارە وەکو ڕۆژگاری ئوممەتانی پێش ئیسلامی لێهاتۆتەوە، بەشێوەیەك یاســـاو دادگا تەنها بۆ لاواز و بێدەسەڵاتەکانە، هەرچی کاربەدەست و پلە باڵاکانن ئەوە لە سەرووی یاساوەن، وە حوکمی یاسا تەنها بەسەر دزە بچوکەکاندا جێبەجێ دەکرێت، هەرچی دزە گەورەکانن ئەوە حوکم و یاسا نایانگرێتەوە، بەڵکو ئەوان یاسا دادەنێن و هەر بۆ خۆشیان جێبەجێی دەکەن!!

---

١ـ پێشەوایان بوخاری و مسلم گێڕاویانەتەوە.

٧ـ بلاو کردنەوەی هۆشیاری تایبەت بە مەترسی و دەرئەنجامەکانی گەندەڵی، ئەمەش لە ڕێی ڕۆژنامە و گۆڤار و دەزگاکانی ڕاگەیاندنەوە، جا دیسان ئەگەر سەیری قورئان و سوننەت بکەین دەبینین کە خودا و پێغەمبەرﷺ لە چەندین ئایەت و فەرمودەدا هۆشیاری دەدەن بە موسڵمانان دەربارەی مەترسی و دەرئەنجامەکانی گەندەڵی، پێشتر لە باسی گەندەڵی لە دیدی ئیسلامەوە هەندێك لەو ئایەت و فەرمودانەمان باس کرد.

جا خوێنەری بەڕێز موسڵمانی خۆشەویست: ئێستا بۆمان دەرکەوت کە تەنها ئیسلام و جێبەجێکردنی شەریعەتەکەی دەتوانێت چارەسەری گەندەڵی بکات، وە بۆمان دەرکەوت کە ئێمەی موسڵمان هیچ پێویستیمان بەوە نیە کە ڕۆژێك دیاری بکەین بۆ ڕوبەڕوبونەوەی گەندەڵی، چونکە ئاینەکەی ئێمە هەموو ڕۆژێك و لە هەموو دەقەیەکدا ڕوبەڕوی گەندەڵی دەبێتەوە.



# جەژنی لە دایکبونی منداڵ

# (عیدالمیلاد للطفل)

# جەژنی لە دایکبونی منداڵ (عید المیلاد للطفل)

ساڵانە و لە ڕۆژی ساڵوەگەڕی لە دایکبونی منداڵدا بەشێك لە موسڵمانان خزم و دۆستان بانگهێشت دەکەن و خواردنێکی تایبەت سازدەکەن و میوە و شیرینی دادەنێن، وە کێکێکی گەورە دروست دەکەن و بە دەوری کێکەکەدا بە ژمارەی ساڵەکانی منداڵەکە مۆم دادەگیرسێنن و پاشان بە فوو دەیان کوژێننەوە، وە لەم ڕۆژەدا چەند وێنەیەکی یادگاری منداڵەکە دەگرن و گۆرانی جەژنی لە دایکبوون بە کۆمەڵ دەڵێن. جا بابزانین ئەم یادکردنەوە لە کوێوە هاتووە و ڕای زانایانی ئیسلام بەرامبەر ئەم یادکردنەوەیە چیە.

سەرەتا: پێویستە ئەوە بزانین کە یادکردنەوەی جەژنی لە دایکبونی منداڵ هیچ بنەمایەکی نیە لە ئیسلامدا، وە لە هیچ کامێك لە سەردەمەکانی پێشینەی ئوممەت ئەم کارە ئەنجام نەدراوە، لەبەر ئەوە زانایانی پێشینەی ئوومەت قسەیان لەسەر ئەم بابەتە نەکردووە، بەڵکو ئەم نەریتە لەسەردەستی فەڕەنگیەکان هاتۆتە ناو موسڵمانان، وە لەسەردەمی تازەشدا دوای ئەوەی کەناڵە ئاسمانیەکان پەیدا بوون، وە بەشێك لە موسڵمانان کۆچیان کرد بۆ وڵاتانی ئەمریکا و ئەوروپا ئەم نەریتە زیاتر لە ناو موسڵمانان پەرەی سەند، بەشێوەیەك خەریکە وەهای لێدێت هەر کەسێك جەژنی لە دایکبون بۆ منداڵەکەی دەکات بە کەسێکی ڕۆشنبیر سەیری دەکرێت، بە پێچەوانەشەوە هەرکەسێك جەژنی لە دایکبون بۆ منداڵەکەی نەکات ئەوە بە کەسێکی دوا کەوتوو ئەژمار دەکرێت" بەڵام پێویستە مرۆڤی موسڵمان بزانێت کە پێشکەوتنی موسڵمان پەیوەست بونیەتی بە ئاینەکەیەوە، ئەمەش بە تاقیکردنەوەی مێژوو سەلمێنراوە" ئەو کاتەی موسڵمانان دەستیان بە ئاینەکەیانەوە گرتبوو دەسەڵاتیان بەسەر هەموو دونیادا هەبوو" ئەوەك هەر دەسەڵاتی سیاسی بەڵکو دەسەڵاتی زانستی و ئابوری و فەرهەنگی و کلتوری و بازرگانی و...هتد ، بە شێوەیەك بێباوەڕان لە زۆر داب و نەریتدا لاسای موسڵمانانیان دەکردەوە،

ڕۆبەرت بریفۆلت لە پەڕتوكەكەیدا بەناوی: (The Making of Humanity)دا دەڵێت: هیچ لایەنێك لە لایەنەكانی پێشكەوتنی ئەوروپا نیە كە چاكەی شوێنەواری كاریگەریتی ژیاری ئیسلامی بەسەرەوە نەبێت) لە شوێنێكی تردا دەڵێت: ( ژیاری ئیسلامی هەر لەو ڕۆژەی كە گزنگی بەسەر ئەوروپادا پەخش كردووە كاریگەری گەورەو جۆراو جۆری خستۆتە سەر ژیانی ئەوروپا)[1] بەڵام بەداخەوە ئەمڕۆ هاوكێشەكە پێچەوانە بۆتەوە، موسڵمانان وادەزانن كە ئەمریكا و ئەوروپا چۆن لە ڕوی پێشەسازی و بیناسازیەوە پێشكەوتوون" وە چۆن لە ڕوی سەربازیەوە بەهێزن" ئاواش لەڕوی فەرهەنگی و كلتوریەوە بەهێزن و ئەوان لە ئێمە ڕۆشنبیر ترن!! نەخێر و سەد جار نەخێر هیچ ئاینێك نیە فەرهەنگ و كلتور و ڕۆشنبیری لە هی ئیسلام بەهێز تر بێت، وەك لە پێشەكی كتێبەكەشدا باسمان كرد چەند سەد ساڵێك بەر لەئێستا ئەوان چاویان لە داهێنانەكانی ئێمە دەكرد، ئەوان فەرهەنگ و كلتوری ئێمەیان هەڵدەگرت و ئێمە پێشەنگیان بووین، بەڵام ئەوكات موسڵمانان یەك ڕیز بوون و دەستیان بە ئاینەكەیانەوە گرتبوو و چالاك بوون، بەڵام ئێستا موسڵمانان پەرتەوازەن و پشتیان كردۆتەوە ئاینەكەیان و شانی تەمبەڵیان دادەوە، لەبەر ئەوە ئێستا بووینەتە پاشكۆی ئەوروپا و ئەمریكا.

## حوكمی شەرعی جەژنی لە دایكبون

زۆرینەی زانایانی سەردەم یادكردنەوەی ساڵوەگەڕی لە دایكبونی منداڵ و جەژنی لە دایكبون ڕەتدەكەنەوە و بەكارێكی حەرام و قەدەغەی دادەنێن، بە بەڵگەی ئەوەی ئەم جەژنە لاسایی كردنەوە و خۆچواندنە بەكافران، پێغەمبەری خوداﷺ فەرموویەتی: (مَنْ تَشَبَّهَ بِقَومٍ فَهُوَ مِنْهُم)[2]واتا: هەر كەسێك خۆی بچوێنێت بەهەر گەل و نەتەوەو ئوممەتێك " ئـەوە لـەوان ئەژمار

١ـ ماذا خسر العالم بإنحطاط المسلمین ،أبو الحسنی نەدەوی ، ئارامی گەلالی كردویەتە كوردی: ١٩٢

٢ـ پێشەوا ابو داود گێراویەتەوە .

دەکرێت . ئەوەی خوارەوەش بەشێکە لە ڕای زانایان :

* دکتۆر عبدالحی یوسف مامۆستای ڕۆشنبیری ئیسلامی لە زانکۆی خرطوم دەڵێت: (فإن المعلومَ لدى كلِ مسلمٍ أن الإحتفالَ بيوم الميلاد لم يعهد عن سلفِ هذهِ الأمةِ فعلهُ، بل إنَّ أجدادنا و آباءَنا ما كان يعرفونَهُ، وإنّما هو منَ العاداتِ الإفرنجيةِ التي وفدت الى بلادِ المُسلمينَ مَعَ غَيرِها، فَحاكاهُم المسلمونَ فيها، تحقيقاً لِما تنبأ به النبيُّ ﷺ حين قال: لتتبعُنَّ سننَ من كان قَبلَكُم حَذو القذةِ بالقذةِ حَتّى لَو دَخَلوا جُحرَ ضبٍ لدَخلتموهُ، قالوا: اليهودَ والنصارى؟ قال: فَمَنْ)[1] واتا: هەموو موسڵمانێك دەزانێت كە ئاهەنگ گێڕان بە بۆنەی ساڵیادی لەدایكبونی منداڵەوە لە هیچ كامێك لە سەدەكانی پێشینەی ئوممەت نەبیستراوە، هەتا باوك و باپیرانیشمان نەیان بیستووە، بەڵكو ئەوە نەریتێكە لە فەرەنگیەكانەوە هاتۆتە ناو موسڵمانانەوە، موسڵمانەكانیش لە ئەوانەوە وەریانگرتووە، ئەمەش هاتنەدی فەرموودەكەی پێغەمبەرە ﷺ كە فەرموویەتی: ڕۆژگارێك دێت هەنگاو بە هەنگاو شوێن ئوممەتانی پێش خۆتان دەكەون و لاسایان دەكەنەوە، هەتا ئەگەر یەكێكیان بچێتە كونی بزنەمژەیەكەوە ئێوەش وەك لاسایی كردنەوە بە دوایـــدا دەچن، گوتیان: ئەی پێغەمبەری خودا ﷺ مەبەستت جولەكە و گاورەكانە؟ فەرمووی: ئەی جگە لەوان كێ هەیە؟

* زين العابدين الآمدي دەفەرموێت: (الإحتفالُ السنوي بالكيفيةِ الشائعةِ التقليديةِ للغربِ الآن من حيثُ إيقاد الشموعِ واعتمادِ يومٍ بعينهِ و تسميتهِ عيدميلادٍ ممنوعٌ)[2] واتا: ئاهەنگ گێڕانی ساڵانە بەم شێوە بەربڵاوەی ئێستا" بەشێوەیەك كە مۆمان دادەگریسێنن و ڕۆژێكی تایبـــەت دیاری دەكـــەن لە ساڵداو ناوی دەنێن جـــەژنی لە دایكبوون، ئەوە لاسایی

١- سایتی : منارات

٢- فتاوى الآمدية: ٢/١٧٦

کردنەوەی ڕۆژ ئاوایەو قەدەغەیە لە شەرعدا.

وە لە وەڵامی پرسیارێکی تردا زین العابدین الآمدی دەفەرموێت:( **إذا كان القَصدُ تقليد الأجانبِ فيما تَعارَفوا عليهِ فَيحرمُ ، كان اعتقدَ أن ذلك مشروعٌ في ذاتِهِ وأنّه مقيّدٌ بيومٍ معيَّن وهو يوم ولادتِهِ، و أرادَ بذلك تعظيم نفسهِ، والمباهاة، و تخلّل تِلكَ الاحتِفالات منكراتٌ غَيرُ مَشروعَةٍ كَإختِلاطِ الرِّجالِ بِالنساءِ والرقصِ والغناءِ و شُربِ الخمرِ والتبذير.**)[1]واتا:ئەگەر یادکردنەوەی یادی لەدایکبونی منداڵ مەبەست پێی لاسایی کردنەوەی بێگانە بێت وەك ئەوەی ئێستا دەبینرێت، وە یان کەسێك وابزانێت کە ئەم کارە لە خودی خۆیدا کارێکی شەرعیە، وەیان ڕۆژێك دیاری بکات بۆ ئەم یادە ئەویش ڕۆژی لەدایکبونی منداڵەکە بێت، وە مەبەستی بەم یاد کردنەوەیە بەگەورە زانینی دەرونی خۆی و شانازی بەخۆوە کردنی بێت، ئەوە حەرامە، وە هەندێك کردەوەی ناپەسەند و حەرامیش تێکەڵاوی ئەم ئاهەنگانە دەبن وەك: تێکەڵاوی کورو کچ وە سەما کردن وگۆرانی گوتن و مەی خواردنەوە و ماڵ بەهەدەردان، کە ئەمانە زیاتر زیان بەشەرعیەتی ئەم جۆرە جەژنانە دەگەیەنن.

بەڵام زین العابدنی الآمدی : زیاتر درێژەی بەم باسە داوەو دەفەرموێت: ئەگەر مەبەست لە جەژنی لەدایکبوونی منداڵ سوپاسکردنی خودا بێت لەسەر بونی ئەو منداڵە و تەمەن درێژ کردنی بۆ ئەم ساڵە، وە خزم و دۆستانیش بە مەبەستی بەجێهێنای صیلەی ڕەحم سەردانیان بکەن و ئەوانیش وەك ڕێزگرتنی میوان پێشوازیان لێبکەن" ئەوە دروستەو ڕێگری شەرعی نیە.

کەواتا: ئەم زانا بەرێزە ڕێگای داوە لەو ڕۆژەدا یادی لە دایکبونی منداڵ بە سوپاسگوزاری خودا بکرێتەوە، بەڵام وەك لە سەرەتای باسی جەژنە جیهانیەکان باسمان کرد وازهێنان باشترە لە

---

١ـ الفتاوى الآمدية: ٢/١٧٥

٢ـ الفتاوى الآمدية' ٢/ ١٧٥ـ ١٧٦

ئەنجامدانی ئەم بۆنانە ، چونکە هەرجۆرێك بێت هەر چاولێکەری و لاسایی کردنەوەی بێباوەڕانە . والله أعلم.

* وە لیژنەی بەردەوامی زانستی و فتوای سعودی ئەم جۆرە جەژنانە ڕەتدەکەنەوە و بە کارێکی حەرام و قەدەغەی دەزانن، لیژنەی بەردەوامی زانستی و فتوای سعودی لە فتوای ژمارە (١٩٥٠٤)دا و لە وەڵامی پرسیاری: ئایا دروستە خوێندنگایەك بە بۆنەی جەژنی لە دایکبونەوە دیاری بەسەر خوێندکاراندا دابە شبکات؟ دەفەرمووێت:(تَقديمُ الهَدايا و قَبُولُها بِمُناسبةِ أعيادِ الميلادِ لا يجوز، لأنَّها أعيادٌ مُحرَّمةٌ في الإسلامِ، و ما بُنِيَ على المُحرَّمِ فهوَ مُحرَّمٌ)واتا: پێشکەش کردن و وەرگرتنی دیاری به بۆنەی جەژنەکانی لە دایکبوونەوە دروست نیە، چونکە ئەم جەژنانە جەژنی حەرامن لە ئیسلامدا، هەر شتێکیش لە سەر حەرام بنچینە بگرێت ئەوە هەر حەرامە .



# جەژن و یاد و بۆنە جیهانیەکانی تر

ئەوانەی ڕابران دیارترین و بەربڵاوترین جەژن و یاد و بۆنە جیهانیەکان بوون، ئێستاش بەپێی خشتەیەك سەرجەم ئەو ڕۆژانە دەخەینە ڕوو کە لە لایەن ڕێکخراوە جیهانیەکانەوە بۆ بۆنەیەکی تایبەت یان بۆ چین و توێژێکی تایبەت دیاری کراون، تۆی خوێنەری بەڕێزیش دەتوانی حوکمی ئەم ڕۆژانە قیاس بکەی بۆ سەر حوکمی ئەو جەژن و یادانەی کە باسمان کردن، پاشان دەتوانیت هەر یەکێك لەو یادوبۆنانەی کە لەو خشتەیەدا ناویان هاتوە بەراوردیان بکەیت لەگەڵ شەریعەتی ئیسلامدا، بێگومان دەبینیت هەر یەکێك لە هۆکاری ئەو یاد و بۆنانە، وە یاخود ئەو چین و توێژانەی ئەو یادو بۆنانەیان بۆ دانراوە لە ئیسلامدا ١٤٠٠ساڵ زیاتر پێش ئێستا بە شێوەیەك لە شێوەکان باسیان کراوە و مافیان پێدراوە!!

| ڕۆژەکان | جەژن و یاد و بۆنەکان |
|---|---|
| مانگی یەك (کانونی دووەم) | |
| ١/١ | ڕۆژی جیهانی ئاشتی + ڕۆژی جیهانی خێزان |
| ١/٦ | ڕۆژی جیهانی بێباوکانی جەنگەکان. |
| یەك شەممەی سێهەمی مانگی١ | ڕۆژی جیهانی ئاینەکان. |
| مانگی دوو (شباط) | |
| ٢/٢ | ڕۆژی جیهانی شوێنە شێدارەکان. |
| ٢/٤ | ڕۆژی جیهانی بەرەنگار بونەوەی نەخۆشی شێرپەنجە. |
| ٢/٦ | ڕۆژی جیهانی ڕەتکردنەوەی خەتەنەی ئافرەتان. |
| ٢/١٢ | ڕۆژی جیهانی منداڵە بەکارهاتوەکانی جەنگ+ ڕۆژی داروین. |

| ٢/٢٠ | ڕۆژی جیهانی دادپەروەری کۆمەڵایەتی. |
|---|---|
| ٢/٢١ | ڕۆژی جیهانی زمانی دایك. |
| مانگی سێ (ئازار) | |
| ٣/١ | ڕۆژی جیهانی بەرگری مەدەنی. |
| ٣/٨ | ڕۆژی جیهانی مافەکانی ئافرەت. |
| ٣/٢١ | ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕو بونەوەی ڕەگەز پەرستی+ ڕۆژی جیهانی شیعر+ ڕۆژی جیهانی بۆ دار و دارستان. |
| ٣/٢٤ | ڕۆژی ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕوبونەوەی نەخۆشی سیل |
| ٣/٢٧ | جیهانی شانۆ. |
| مانگی چوار(نیسان) | |
| ٤/١ | ڕۆژی جیهانی درۆ(درۆی سپی). |
| ٤/٢ | ڕۆژی جیهانی بۆ نوسینی منداڵ. |
| ٤/٤ | ڕۆژی جیهانی بلاوکردنەوەی هۆشیاری لەسەر زیانەکانی مین. |
| ٤/٧ | ڕۆژی جیهانی تەندروستی. |
| ٤/١٧ | ڕۆژی بەندکراوە فەلەسـطینیەکان. |
| ٤/١٨ | ڕۆژی کەلتوری جیهانی. |
| ٤/٢٢ | ڕۆژی جیهانی زەوی. |
| ٤/٢٣ | ڕۆژی جیهانی کتێب و مافەکانی دانەر. |
| ٤/٢٦ | ڕۆژی جیهانی خاوەنداریەتی بیرۆکەو بیرمەندی. |
| ٤/٢٨ | ڕۆژی جیهانی ڕوداوەکانی کارکردن. |
| مانگی پێنج (ئایار) | |
| ٥/١ | جەژنی جیهانی کرێکاران. |
| ٥/٣ | ڕۆژی جیهانی ئازادی ڕۆژنامەوانی. |

| | |
|---|---|
| ٥/٧ | ڕۆژی جیهانی بێباوکانی ئایدز. |
| ٥/٩ | ڕۆژی ئەوروپا. |
| ٥/١١ | ڕۆژی جیهانی بۆ ئەو بونەوەرانی هەڕەشەی لەناو چونیان لەسەرە. |
| ٥/١٥ | ڕۆژی جیهانی خێزان. |
| ٥/١٨ | ڕۆژی جیهانی مۆزەخانە. |
| ٥/٢٢ | ڕۆژی جیهانی هەمەچەشنی ژینگە. |
| ٥/٢٥ | ڕۆژی جیهانی منداڵە ونبوەکان. |
| ٥/٣١ | ڕۆژی جیهانی جگەرە نەکێشان. |
| مانگی شەش(حزیران) | |
| ٦/١ | ڕۆژی جیهانی منداڵ. |
| ٦/٤ | ڕۆژی جیهانی منداڵانی قوربانی دەستدرێژیەکان. |
| ٦/٥ | ڕۆژی جیهانی ژینگە. |
| ٦/٨ | ڕۆژی جیهانی زەریاکان. |
| ٦/١٢ | ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕوبونەوەی کارکردن بەمنداڵان. |
| ٦/١٤ | ڕۆژی جیهانی خوێن بەخشین. |
| ٦/١٥ | ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕو بونەوەی برسیەتی. |
| ٦/١٦ | ڕۆژی جیهانی منداڵانی ئەفریقیا. |
| ٦/١٧ | ڕۆژی جیهانی بە بیابان بوون و وشك بونەوە. |
| ٦/٢٠ | ڕۆژی جیهانی پەنابەران. |
| ٦/٢٦ | ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕوبونەوەی بەکارهێنان و بازرگانی کردن بە مادده هۆشبەرەکانەوە+ڕۆژی جیهانی نەتەوە یەکگرتوەکان بۆ یارمەتی قوربانیەکانی ئەشکەنجەو ئازار. |
| ٦/٢٩ | ڕۆژی جیهانی بۆ نواندنی خۆراك. |

| مانگی حەوت(تەموز) | |
|---|---|
| یەکەم شەمە | ڕۆژی جیهانی جۆرەکانی یارمەتیدان. |
| ٧/١١ | ڕۆژی جیهانی دانیشتوان. |
| ٧/٢٩ | ڕۆژی جیهانی جۆرەکانی ڕۆشنبیری و ڕوبەڕوبونەوەی ڕەگەز پەرستی. |
| مانگی هەشت(تاب) | |
| ٨/٩ | ڕۆژی جیهانی گەلە ئەصلیەکانی جیهان. |
| ٨/١٢ | ڕۆژی جیهانی گەنجان. |
| ٨/١٩ | ڕۆژی جیهانی کاری مرۋایەتی. |
| ٨/٢٣ | ڕۆژی جیهانی یادکردنەوەی قەدەغەکردنی بازرگانی کردن بە بەندەوە. |
| ٨/٢٩ | ڕۆژی جیهانی دژی تاقیکردنەوەی چەکی نەوەوی. |
| مانگی نۆ(ئەیلول) | |
| ٩/٥ | ڕۆژی جیهانی کاری چاکە خوازی. |
| ٩/٨ | ڕۆژی جیهانی سڕینەوەی نەخوێندەواری. |
| ٩/١٠ | ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕو بونەوەی خۆ کوشتن. |
| ٩/١٣ | ڕۆژی جیهانی یاسا. |
| ٩/١٥ | ڕۆژی جیهانی دیموکراسی. |
| ٩/٢١ | ڕۆژی جیهانی ئاشتی. |
| ٩/٢٧ | ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕوبونەوەی جەنگ و داگیرکاری. |
| مانگی دە (تشرینی یەکەم) | |
| ١٠/١ | ڕۆژی جیهانی بەساڵاچوان. |
| ١٠/٤ | ڕۆژی جیهانی ئاژەڵان. |
| ١٠/٥ | ڕۆژی جیهانی مامۆستایان. |
| ١٠/١١ | ڕۆژی جیهانی کچان. |

| | |
|---|---|
| ١١/١٤ | ڕۆژی جیهانی دەست شۆرین. |
| ١٠/١٧ | ڕۆژی جیهانی نەهێشتنی هەژاری. |
| ١٠/٢٤ | ڕۆژی جیهانی نەتەوە یەکگرتووەکان. |
| ١٠/٢٧ | ڕۆژی جیهانی بۆ کەلەپورە بینراو بیسراوەکان. |
| مانگی یازدە(تشرینی دووەم) | |
| ١١/٩ | ڕۆژی جیهانی ئازادی. |
| ١٠/١١ | ڕۆژی جیهانی گەشە پێدان و ئاشتی. |
| ١١/١٤ | ڕۆژی جیهانی نەخۆشی شەکرە. |
| ١١/١٦ | ڕۆژی جیهانی لێبوردەیی. |
| ١١/١٧ | ڕۆژی جیهانی قوتابیان. |
| ١١/١٩ | ڕۆژی جیهانی پیاوان. |
| ١١/٢٠ | ڕۆژی جیهانی مافەکانی منداڵ. |
| ١١/٢١ | ڕۆژی جیهانی تەلەفزیۆن. |
| ١١/٢٥ | ڕۆژی جیهانی نەهێشتنی توندوتیژی دژی ئافرەتان. |
| ١١/٢٩ | ڕۆژی جیهانی هاریکاری و هاوخەمی لەگەڵ گەلی فەلەستین. |
| مانگی دوازدە(کانونی یەکەم) | |
| ١٢/١ | ڕۆژی جیهانی ئایدز |
| ١٢/٢ | ڕۆژی جیهانی نەهێشتنی کۆیلایەتی. |
| ١٢ /٣ | ڕۆژی جیهانی کەمئەندامان. |
| ١٢/٥ | ڕۆژی جیهانی خۆبەخشین و پێشخستنی کۆمەڵایەتی. |
| ١٢/٩ | ڕۆژی جیهانی ڕوبەڕوبونەوەی گەندەڵی. |
| ١٢/١٠ | ڕۆژی جیهانی مافەکانی مرۆڤ. |
| ١٢/١٨ | ڕۆژی جیهانی کۆچبەران. |

# کۆتایی

لە کۆتایدا سوپاس بۆ ئەو خودایەی کە کۆتایی بۆ هەموو شتێك داناوە، بەڵام بۆ خۆی کۆتایی نیە، وە درودو سەلام بۆ سەر گیانی پاکی ئەو پێغەمبەرە ڕێزدارەی کە خودای گەورە بە ناردنی ئەو کۆتایی بە ناردنی پێغەمبەران هێناوە.

موسڵمانی بەڕێز گەنجی خۆشەویست: دوای ئەوەی کە بەشێك لە جەژن و یادو بۆنە ئاینی و جیهانی و نیشتیمانیەکانمان باس کردن و خستماننە ژێر تاقیگەی ئیسلامەوە، بۆمان دەرکەوت کە هەرگیزاو هەرگیز ئاینی پیرۆزی ئیسلام ئاینی داخران نیە، ئاینی دڵتەنگی وگۆشەگیری نیە، وە ئاینێکە لەگەڵ هەموو جۆرە فیترەتێکی باشدا دەگونجێت، هەر لەبەر ئەوەشە کەوا لە ساڵدا چەندین ڕۆژی تێدا دیاریکراوە بۆ جەژن و خۆشی، ئەوەش بۆ ئەوەی هەموو ئاین و گەلەکانی تر بزانن کە (أَنَّ فِي دِيننا فُسحةً) ئاینی ئێمە ئاینی کرانەوە و بەرفراوانیە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا ئاینی پیرۆزی ئیسلام سنوری بۆ ئەو کرانەوە و بەرفراوانیە داناوە، سنورەکەشی ئەوەیە: پێویستە ئەو کرانەوە و خۆشحاڵی و کەیف خۆشیانە لە چوارچێوەی ئیسلامدابن، لەبەر ئەوە بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نادات کەوا تۆی موسڵمان شوێن گاورو جولەکەکان بکەویت و یادی جەژن و بۆنەکانیان بکەیتەوە، وە بەهیچ شێوەیەك ڕێگا نادات یادی جەژن و بۆنە ئیسلامیەکانیش بەبێ شەرعی و لادان لە سنورەکانی شەرع بکەیتەوە، ئەمەش زۆر ئاسای و یاساییە لە هەر دین و یاساو شەریعەتێکی جگە لە ئیسلامیشدا، چونکە هەر شتێکی تۆ لەسەر ئەو زەویە دەیبینی یاسای خۆی هەیە، وە جوانی بونیشی پەیوەستە بە ملکەچی بۆ یاساکەی، بۆ نمونە: ئۆتۆمبیل کاتێك سود بەخشە بۆ کۆمەڵگا کە لە چوارچێوەی یاساکانی هاتوچۆ بەکاری بێ ،ی ، ئامێرێکی کارەبایی کاتێك سودبەخشە کە بەپێی ئەو بەرنامەی کارەی کە لە گەڵیدایە بەکاری بهێنی...هتد، بەهەمان شێوە جەژنەکانیش کاتێك خۆشی بەخشن کە لە چوارچێوەی یاسای

خودادا بەکار بهێنرێن، پاشان ئەگەر بێت و ئێمەی موسڵمان چاو لە وولاّتانی کوفر بکەین و هەر ڕۆژەی لە ژێر ناوێکدا بیکەین بە جەژن!! بەڕاستی جەژن بەهای نامێنێت و وەك هەر ڕۆژێکی تری ئاسایی جەژنیش ئاسایی دەبێتەوە، چونکە وە ئامێدی فەرمووی: ئەڵماس بۆیە گران بەهایە چونکە کەمە، ئەگەر هاتباو هەموو بەردێك ئەڵماس بوایە" ئەوە ئەڵماسیش دەبوو بە بەرد و هیچ بەهایەکی نەدەما. پاشان وەك باسمان کرد ئەو بابەتانەی کە ڕۆژی جیهانیان بۆ دیاریکراوە ئیسلام زیاتر لە ١٤٠٠ ساڵ بەر لە ئێستا یەکلایی کردونەوە و قسەی لێکردون.

لەبەر ئەوەی ئەی موسڵمانی بەڕێز گەنجی ئازیز: داوات لێدەکەم تەنها ئەو جەژن و یاد و بۆنانە بەهی خۆت بزانە کە پێغەمبەری خودا ﷺ دەربارەیان فەرموویەتی: (هذا عیدنا) وە تەنها ئەو یادانە بە هی خۆت بزانە کە زانایانی موجتەهیدی ئوممەت بە پشتیوانی بەڵگەکانی قورئان و سوننەت بە یادی شەرعیان داناون، چونکە بێگومان بە سوێند بەخودا تۆ لەبەر خاتری خودا واز لە هەر ئاوانێك بهێنیت خودای گەورە باشتر و چاکترت لە ئەو شتە پێدەدات، ئەمەش پەیمانی پێغەمبەری خۆشەویستە ﷺ: (إنك لا تدع شيئاً إتقاء الله تعالى إلا أعطاكَ اللهُ عَزَّ وَجَلَّ خيراً مِنهُ)[٣] واتا: بێگومان تۆ لەبەر خودا واز لە هەر شتێکی حەرام بهێنیت، ئەوە خودای گەورە باشتر لە ئەو شتەت پێدەدات.

وصلى الله على سيدنا و حبيبنا وقائدنا محمد و على آله وصحبه وسلم

سوپاس بۆ خودا لە ڕۆژی یەك شەممە بەرواری

٢٥ی شەعبانی ١٤٣٦ کۆچی بەرامبەر بە

٢٠١٤/٦/٢٣ لە نوسینی ئەم پەرتوکە

بومەوە.

# ناوەڕۆك